# ڕامان

86/87

- چاوپێکەوتنێک لەگەڵ شاعیری بەناوبانگ ئەحمەد هەردی
- دوو زستانە گەشت .. فەرهاد شاکەلی
- کۆمەڵگەی زانیاری نوێ و ئاکامی .. ئازاد حەمە
- ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان و موژدەیەک .. فەخرەدین تایەر
- لەپێناو بەرهەمهێنانی هونەرێکی ڕەسەنی .. کامەران تاهیر
- فەرهەنگی هاوواتەکانی کوردی و .. عەزیزی مەلای ڕەش
- پرۆژەی کوشتنی خۆ .. دڵشاد عەبدوڵڵا
- جلوبەرگی کوردی لە مێژوودا .. عەباس سلێمان سمایل



مانگانەیەکی ڕۆشنبیریی گشتییە

بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات




گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی گشتییە
بەڕێوەبەرایەتی گۆڤاری ڕامان دەری دەکات
خوولی دووەم - ساڵی نۆیەم
تەمموز / ئاب 2004

**خاوەنی ئیمتیاز**
شەوکەت شێخ یەزدین

**سەرنووسەر**
ئازاد عەبدولواحید

**بەڕێوەبەری هونەری**
سەرکەوت وەلی

**ناونیشان**
هەولێر - تەنیشت سینەما سەلاحەدین

**E-mail:**
raman@raman-media.net

**تەلەفۆنی گۆڤاری ڕامان**
٢٢٣٠٥٨٢

**تەلەفۆن و مۆبایلی سەرنووسەر**
٤٤٩٤٦٦٢
٢٢٣٢٣٨٥

**چاپ**
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**نرخ**
(١٠٠٠) دینار




# ناوەرۆک

لە پەراوێزی کولتوورەوە

# بەبۆنەی تەواوبوونی تەلاری کۆڕی زانیاری کوردستان-ەوە

ئازاد عەبدولواحید

* ئەمڕۆ کێشـەی کوردی نووسین و زاراوەسازی یەکێکە لەگرنگترینی ئەو کێشانەی ڕووبەڕووی بزاڤی ڕۆشنبیریی کوردیان دەبنەوە، تەنانەت کە من پێشتر ڕام وابووە کاتێ نووسەران و ڕۆژنامەنووسان زمانی نەتەوە ئیستیهلاک دەکەن، پێم وابووە شاعیران ئەو زمانە بە زیندوویی ڕادەگرن و نوێی دەکەنەوە، کە بە داخەوە ئەمڕۆکە بە پێچەوانەی ئەو بیروڕایەوە شاعیران بەناوی نوێخوازییەوە لە هەموو کەس زیاتر زمانی نەتەوەییمان فەلاقە دەکەن.

* ئەوەی بووە بەدیاردە و سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەمڕۆکە کەمترین ئاستی بایەخدان بە زمانەکەمان بەدی ناکەین کە ئەو زمانە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر لەگرێژەنە دەردەکرێ و کەس خۆی بە خاوەنی نازانێ و بەهیچ شێوەیەک لە غەمی پێشکەوتن و پاراستن و پەرەپێدانیدا نین، بۆیەش بەشێکی دواکەوتن و ون بوونی هۆشیاریی کۆمەلایەتی و فیکری کۆمەلگەی ئێمە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە کوڵەواری لە زماندا هەمیشە کوڵەواری بواری فیکرو مەعریفەیەکی هەژاری بەدوای خۆیدا هێناوە، چونکە زۆر نووسین و بۆچوونی جوان و بیروڕای ئامانجدار بەهۆی زمانێکی سەقەتەوە چەمک و پەیامی خۆی نەگەیاندووە، یان هەر لە بنەڕەتەوە وێرانیی زمانەکەی بووەتە هۆی ئەوەی ڕێگە لە بلاوبوونەوەی بابەتەکە بگرێ.

* پێم وایە بەر لە هەر شوێنێکی دی دەزگایەکی ئەکادیمی وەک (کۆڕی زانیاری کوردستان) دەبێ ڕووبەڕووی ئەم گرفتانە ببێتەوە، تا بەشێوەیەکی زانستیانە لەکێشەی کوردی نووسین بڕوانێ، کە بۆ خۆی وەک پێداویستییەکی گرنگ لە ژیانی ڕۆشنبیریدا خۆی سەپاند و دامەزرا، بۆیە تا زووتر ئەو دەزگایە و لیژنەکانی کارا بکرێن هەر درەنگە، چونکە ئەرکی زۆر گەورە چاوەڕێیەتی ڕاییبپەڕێنێ.

* ئەو ئەرکە لە وەرگێڕان و کوردی نووسینی کتێبەکانی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەییەوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە قۆناغی خوێندنی زانکۆ، بەتایبەتی بەشی زمانی کوردی، کە ئەو کتێبە دانراو و بە کوردی کراوانەی قۆناغەکانی خوێندن زۆر وێرانن و سەرلەبەریان پێویستیان بە پێداچوونەوە هەیە.

* لەم قۆناغەدا کە خەریکی سڕینەوەی ئاسەواری تەعریب و بەکوردی کردنی نووسراوی فەرمانگە و وەزارەتەکانین، دەبێ ئەو دەزگایە لا لە دانانی فەرهەنگی زاراوەی جۆراوجۆری کوردی بکاتەوە و بیر لە دانانی فەرهەنگێکی کوردی- کوردی فراوان بکاتەوە کە سەرجەم شێوەزارەکانی زمانی کوردی بگرێتە خۆی، چونکە ئەو فەرهەنگانەی تا ئێستا چاپکراون لەگەڵ هەموو ڕێزێکمان بۆ دانەرەکانیان هەوڵی تاکەکەسین و کەموکوڕی زۆریان تێدایە.

* ساڵانی سەرەتای حەفتایەکان کە کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا دەستبەکار بوو، لیژنەیەکیان بۆ کەلەپوور دانا بوو کە بەناو گوند و شارۆچکە و ناوچەکانی کوردستاندا دەگەڕان، دەستنووس و بەیازیان لە خەڵکی دەکڕییەوە و لەلای خۆیان دەیان پاراستن، کە پاشان کەس نازانێ چارەنووسی ئەو دەستنووسانە چییان لێ بەسەرهات، ئەمڕۆکە کە توانای ماددی و مرۆیی زۆر هەیە پێویستە لەوسا زیاترو گەرموگوڕتر بکەوینە خۆمان بۆ ئەوەی تا مەڵبەندێکی پاراستنی دەستنووس و بەڵگەنامە لە کوردستان دادەمەزرێ، هەرچی زووترە لیژنەیەکی چالاک و شارەزا بۆ ئەو مەبەستە لەلایەن کۆڕەوە دابنرێ و بەرگی سستی لەبەر خۆی دامالێ، خۆ ئەگەر بتوانن لەو گوندانەدا هۆشیاری پاراستنی سامانی نەتەوایەتی بلاو بکەنەوە ئەوە کارێکی پیرۆز ڕادەپەڕێنن.

* کەلەپووری نەخش و نیگار کە لەسەر بەڕە و مافوور و جاجم و پۆپەشمین و دووگرد و لاکێش و خورجی و دەسرازە و چنراوە دەستییەکاندا هەیە و بەدی دەکرێن، یان لەسەر خشڵی خۆڕازانەوەی ئەوسا کە بە زیو دروست کراون و لەسەر کەمەرە و هەیاسە و لاگیرە و گوێبەرۆک و کرمک و لوولە و زنجیر و تاس کڵاو و تاد. بەدەستی وەستای سەنعاتکاری دەست ڕەنگین دروست کراون، ئەمڕۆکە دەبینین ئەو زیوە دەتوێنرێتەوە و دەکرێنە قاڵب و وەک زۆر سامانی نیشتمانیی دیکەی ئەو وڵاتە بەتاڵان ئاودیو نەکرێ.

* بۆیە تا پەلە بکرێ لە بژارکردن و خزمەت کردنی زمانەکەمان لە وشەی لابەلاو و نامۆ و زاراوەی ناقۆلا و ڕەزاقوڕس و بە زۆر داتاشراو کە هەرکەسە و لەلای خۆیەوە و بە ئارەزووی خۆی دایاندەتاشێ، ئەوە زووتر زمانەکەمان لە پاشاگەردانی ڕزگار دەکەین.

ئیتر هەموو لایەک چاوەڕوانی کار و بەرهەمی زووبەزووی ئەو دەزگایەین کە لەو تەلارە نوێیەدا ئەنجامی بدەن و لەمەودواش هیچ بیانوویەک بۆ دواخستنی ئەو ئەرکانە نابینرێ.

# داهێنان لەنێوان تواناکانی لاوان و سیستمی پەروەردەدا

## توێژینەوەیەکی «سۆسیۆلۆژی تیۆری، پراکتیکییە»

ئا: جوان حوسێن
(سلێمانی)

**پێشەکی**

بۆ ئەوەی ژیان جۆرێکی تر بێت، پێویستمان بەوەیە قسەیەک لەو شتانە بکەین کە بوونیان نییە، دەرککردن بەو شتانەی کە نین پێویستی بە مەعریفەیەک هەیە بۆ ئەوەی ئیرادە بەرهەم بهێنێت.

لێرەوە دەکرێ قسە لە نەوەی نوێ بکەین، وەک نەوەیەک کە توانای خەون بینینی هەیە بەواقیعێکی جیاوازەوە لەوەی کە ئێستا هەیە، نەوەک دەکرێ هەندێ لە وەڵامەکانی لابێت، بەڵام پرسیاری لێ ناکرێت، دەکرێت پڕ بێت لە پرسیار، بەڵام گوێی بۆ ناگیرێت.

گەنج هێشتا خۆی نەسەلماندووە، چونکە هێشتا متمانەی پێ نەکراوە، ئەوەی ئەمڕۆ پێویستمانە ئیرادەی گۆڕانە، ئەو گەنجەی ئەمڕۆ خەونی هەیە گەنجێکە نایەوێت مومارەسەی سیاسەت بکات بە شێوە تەقلیدییەکەی، هەر بۆیە قورسە ئەم گەنجە لە ئێستادا ڕێگایەک بدۆزێتەوە بۆ گۆڕان، ئەگەر لە شتە هەرە بچووکەکانیشدا بێت، گۆڕانێک وا لە کۆمەڵگا بکات بڕوابهێنێت بە جیهانێک کە گەنج دەتوانێت لە دەرگاکانی بدات.

**بەشی یەکەم/ دەستپێک**
**گرنگی لێکۆڵینەوەکە**

ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکە بۆ قسەکردن لەسەر دیاردەیەکی سایکۆسۆسیۆلۆژی تایبەت بەگەنج، خوێندنەوەیەکە بۆ چەمکی داهێنان لەلای توێژێکی دیاریکراو کە بریتییە لە گەنج.

لێکۆڵینەوەیە سەبارەت بەو گۆڕانە کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەی لە ئەنجامی بەگەڕخستنی تواناو بەهرەی ئەم توێژەوە بەدەست دێت.

ئەوەی زیاتر باسی لێوە دەکەین بریتییە لە چۆنێتی مامەڵەکردن و ئاراستەکردنی ئەم توێژە لەلایەن کایەی کۆمەلایەتی و کایەی پەروەردەوە، چونکە گەنج هەمیشە خۆی لەنێوان سروشت و وابەستە بوونەکانی ئەم دوو کایەیەدا دەبینێتەوە، دواجاریش گەنج ئەو بەرهەمەیە کە کایەی کۆمەلایەتی بەهاوکاری کایەی پەروەردە پێشکەشی کۆمەڵگای دەکات، بەڵام ئایا داهێنان وەک توانایەکی سروشتکرد، دەکرێ پەروەردە بکرێ، یان بەپێچەوانەوە لەباربرێ، لەنێوان باڵادەستی ئەم دوو سیستمەدا چی بەسەر دێت؟!

ئەم توێژینەوەیە هەوڵ دەدات کاریگەرییەکانی ئەم دوو سیستمە لەسەر تواناو بەگەڕخستنی توانست و بەهرەی گەنج دەربخات.

**ئامانجی لێکۆڵینەوەکە**

مەبەست لە ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیە لەم چەند خاڵەدا چڕ دەبنەوە:

١- سەرنجڕاکێشانی کایەی کۆمەلایەتی، بە تایبەتتر کایەی پەروەردە بۆ خودی باسەکە، وەک مەسەلەیەکی فەرامۆشکراو.

٢- بەسەنتەڕاڵکردنی کاریگەرییەکانی کایەی پەروەردە لە پێکهاتەی کەسێتی گەنجدا.

٣- ئاشکراکردنی ئەو پلانە تەقلیدی و چەسپاوەی کایەی پەروەردە دریژەی پێ دەدات.

٤- بە ئاگاهێنانەوەی گەنج لە بوونی تواناو ئامادەییە عەقڵی و جەستەییەکان و تەمەنی گونجاو بۆ پرۆسەی داهێنان.

٥- پێشکەشکردنی چەند پێشنیارێکی پێوەندیدا بەکێشەکەوە.

## گرفتەکانی لێکۆڵینەوەکە

١- لەبواری تیۆریدا، کەمترین مامەڵەی تایبەت دەبینین لەگەڵ گەنجدا، چ لە رووی کولتووری یاسایی و چ لە رووی خوێندنەوەو شیکارکردنی کۆمەلایەتییەوە هەمیشە دۆسیەکانی گەنج تێکەڵ بە دۆسیەی منداڵ دەکرێت.

٢- لەبواری پراکتیکیدا، پێویست دەکات بابەتەکانی (زیرەکی- توانا عەقڵییەکان) بەوردی پێوانە بکرێت، بەلام ناتوانین هۆکارێک بدۆزینەوە کە زۆرترین دەرەنجامی واقعی و دروستی هەبێت، بۆیە هەمیشە گرفتی توێژینەوە سایکۆ- سۆسیۆلۆژییەکان بریتییە لە قسەکردنێکی رێژەیی لەسەر بابەتەکان و ئەگەری بەتاڵبوونەوەی گریمانەکان شتێکی ئاساییە.

## میتۆدی لێکۆڵینەوەکە

بۆ لێکۆڵینەوە لە هەر دیاردەیەکی کۆمەلایەتی پێویستمان بە خوێندنەوەی ئەو رەوشە تایبەتە دەبێت کە دیاردەکەی بەرهەم هێناوە، ئاشکراکردنی هۆکارو فاکتۆرەکان رێگایەکی گرنگە بۆ تێڕوانینێکی بابەتی لە دیاردەکان.

(پییر بوردیۆ) پێی وایە لە واقعدا جیاوازی لەنێوان هەردوو میتۆدی (بونیادگەرایی و خودگەرایی) نییە، بەڵکو یەک یەکتری تەواو دەکەن، هۆکەشی ئەوەیە واقعی کۆمەلایەتی دووالیزمی ئەزەلی هەیە، مرۆڤ بەسروشتی خۆی خودو بابەتە، کۆمەڵگاش بەهەمان شێوە.

بۆیە پێویستە رەچاوی هەردوو مەنهەجیەتەکە بکەین هەرچەندە وەسفی بابەتی پێش حوکمی فەردی دەکەوێت، بۆیە ئەولەویەت دەگەڕێتەوە بۆ مەنهەجیەتی یەکەم.(١) لایەنی پراکتیکی لێکۆڵینەوەکە، بەپێی جۆری لێکۆڵینەوەکە دیاری دەکرێت. لەم لێکۆڵینەوەیەدا رێبازی (مسح بالعینة) وەردەگرین، مەسحی کۆمەلایەتی، بۆ دەرخستنی لایەنە خراپەکانی رەوشە کۆمەلایەتییەکان بەکاردەهێنرێت، بەمەبەستی پێشکەشکردنی بەرنامەیەکی دارشتوو بۆ چاکسازی کۆمەلایەتی.

مەسح بەرێگای عەینە. بۆ جۆرێک لە لێکۆڵینەوە بەکاردێت کە لەدیاردەیەکی دیاریکراو بکۆڵێتەوە و لەسنووری تواناو بواری لێکۆڵینەوەکەدا بێت.(٢)

## پێناسەی چەمکە سەرەکییەکان

داهێنان: پێناسە دەکرێت، بەتوانای بەرهەم هێنانی شتێکی نوێ، نرخ و بەهایەکی تری هەبێت، لە داهێناندا توانا، یان ئامادەگی نابینرێت، بەڵکو پرۆسیسی پراکتیزە بوونی دەرەنجامە لەو رێگایەوە.

ماکینۆن. پێناسەی داهێنان دەکات بەوەی دیاردەیەکی فرە رەهەندییە. زیاتر لەوەی وەک چەمکێکی تیۆری دیاریکراو پێناسە بکرێت.

داهێنان، یەکەیەکی کامڵ بووە لەکۆمەڵێک فاکتۆری خودی و بابەتی لە پێناو پراکتیزە کردنی بەرهەمێکی نوێ و رەسەن کە بە هایەکی هەبێت بۆ تاک و کۆمەڵ.

داهێنان و چارەسەری گیرفتەکان لەناوەرۆکدا یەک دیاردە پێک دەهێنن.(٣)

## گەنج

گەنج تەمەنی لەنێوان (١٥- ٢٥) سالیدایە، لەکۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە سالی (١٩٨٥) بڕیاری لەسەردرا، لەخوار تەمەنی (١٤) سالەوە منداڵان دەگرێتەوە.(٤)

گەنج، کەسێکە لەماوەی تەمەنی نێوان (١٥- ٢٥) سالیدایە، گۆڕانێکی لاشەیی، فیسۆلۆژی و دەروونی و کۆمەلایەتی بەسەردێت، تا دەگاتە قۆناغێکی تارادەیەک سەقامگیر.(٥)

## بەشی دووەم/ ئامادەییە خودیەکان کاریگەری تەمەن لەسەر داهێنان

لەنێوان نزمترین و تەمەن و بەرزترین تەمەندا پێوانەیەکی وردبین نییە بۆ داهێنان.

بەپێی توێژینەوەکانی (لیمان) دەرەنجامە داهێنەرەکان بە بەردەوامی گەشە دەکات هەتا تەمەنی (٣٠- ٤٠) سالی، دوای ئەم تەمەنە دابەزین بەخۆیەوە دەبینێت.

ئەم پێوانەیە بۆ سەرجەم بوارەکانی داهێنان واقعی نابێت، لەبواری مۆسیقاو شیعردا هەمیشە داهێنان لەتەمەنی گەنجێتیدا دەردەکەوێت. (بتهۆڤن) تەمەنی نزیکەی (١٤) سال بوو چەندین ئاهەنگ مۆسیقی پێشکەش کردووە. بەلام کارە تەکنیکیەکان لە تەمەنێکی زۆردا بەرهەمی داهێنەرانەی تێدا دەردەکەوێت.

(لیمان) پێوەندییەکی پێچەوانە دەبینێت لەنێوان زیادبوونی تەمەن و داهێناندا، ئاماژ بەچەند هۆکارێک دەدات کە کاریگەریان لەسەر دابەزینی دەرەنجامی

داهێنەرانە هەیە، لەوانەیە کەم بوونەوەی چالاکی فیزیکی، لاوازبوونی توانای هەستەکان و تەندروستی گشتی، هەروەها زیادبوونی کارە ئیدارییەکان کەمترین کات دەهێڵێتەوە بۆ بیرکردنەوە. (٦)

(لوتوت) پێی وایە دەرەنجامی داهێنەرانە دەکرێت لەتەمەنێکی زۆریشدا بەدەست بهێنرێت، ئەوەتا نووسەرە ناودارەکانی دنیا توانیویانە لەتەمەنی پیریشدا شاکاری گرنگ بەرهەم بهێنن، ئەمەش پێوەندی بە چالاکی فکرەوە هەیە. هەروەها پسپۆری لەتەنیا بوارێکدا ڕەنگە ببێتە هۆی کەم بوونەوەی چالاکی داهێنەرانە، ئەو توێژەرانەی لەچەند بوارێکدا قسە و ئامادەییان هەیە هەمیشە بەرەنجامی باشتریان هەیە لەو تاکەی لەتەنیا بوارێکدا قووڵ دەبێتەوە. (٧)

لەنەستی مرۆڤەکاندا ئامادەییەک هەیە بۆ داهێنان، ئەگەر لەو تەمەنەی کە داهێنان تێیدا ڕوودەدات ئەو ئامادەییە هەستی پێ بکرێت.

تەمەنی گەنجێتی قۆناغێکی پڕ گۆڕان و ناجێگیرە، بۆیە بەردەوام گۆڕانکاری لەبیرو بۆچوون و ڕەفتاریاندا هەستی پێ دەکرێت. ئەم تەمەنە تایبەتەش پێویستی بە مامەڵەیەکی تایبەت هەیە لەلایەن ئەو کایەیەی گەنج تێیدا دەژی.

لەکۆمەڵگای ئێمەدا گەنج دەکەوێتە نێو ململانێیەکەوە کە خۆی لێ دەرباز ناکات، بەردەوام لەنێوان ئەوەی کۆمەڵگا چاوەڕێی دەکات و ئەوەی خۆی دەیەوێت دەستەوەستان دەبێت.

گەنجێتی دروست کردنی ئیرادەیەکی بەهێزە بۆ شکاندنی ئەو دیوارانەی لەنێوان ویستی خودو واقعی کۆمەڵایەتیدا هەیە. جیاوازی نێوان نەوەیەک و نەوەیەکی تر ئەوەیە کە هەمیشە ژیان لەلایەن نەوەی نوێوە دەستکاری دەکرێت، ئەم پرۆسەی دەستکاری کردنەش پێویستی بە ئیرادەی قسەکردن دەبێت. لەوساتەوەی گەنج قۆناغی بێدەنگی دەشکێنێت ئیتر تواناکانی بۆ گۆڕینی قەناعەتەکانی کۆمەڵگا دەردەکەوێت.

هەروەک لەدنیادا گەنج توانیویەتی ئیرادەی گۆڕینی هەبێت، ئەمەش مانای ئەوە نییە کورسی دەسەڵاتی گۆڕیبێت، بەڵکو ئەو دەتوانێت ژیان لەمانا وردەکانیدا دەستکاری بکات. ئەو دەتوانێت جووڵەیەک بێت بۆ کایە چەسپاوەکانی کولتوورو دابونەریتی کۆمەڵگا، نەوەی (١٩٦٨)ی ئەورووپا توانی بە قووڵی دەستکاری کۆی ماناکانی ئەو پەیمانە کۆمەڵایەتییە بکات کە تاک بەکۆمەڵگاوە دەبەستێتەوە بێ ئەوەی بتوانن ستراکتۆری سیاسی بگۆڕن. (٨)

هیواو خەون پێوەندییەکی توندیان هەیە بە تەمەنەوە، ئەم دوو پرەنسیپەش پاڵنەری سەرەکی شتانێکن کە پێشتر نەبووە، یان بەو جۆرە نییە کە گەنج دەیەوێت.

**توانا عەقڵییەکان**

داهێنان دەرەنجامی چەندین ئامادەیی عەقڵییە کە لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت.

یەکێک لەو توانایانە بریتییە لە زیرەکی،

لەلێکۆڵینەوەیەکی نوێدا (بیجان) دەیسەلمێنێت کە ئەو تاکەی ڕادەی زیرەکی کەمترە لە مامناوەندی، داهێنەرە، بەڵام ئەو کەسانەی زیرەکیان لە ئاستێکی ئاساییدایە، دەکرێت داهێنەر، یان داهێنەر نەبن. (٩)

زیرەکی یارمەتیدەرە بۆ تێگەیشتن، ئیرادەی تێگەیشتن هەمیشە پێوەندییەکی توندی بە ئیرادەی مەعریفەوە هەیە، هەر تێگەیشتنێک مەعریفەیەکی قووڵی لەپشتەوە نەبێت، تێگەیشتنێکی سەرپێیانەیە، چونکە تێگەیشتن دەبێت ڕێگایەک بێت بۆ گۆڕین.

زیرەکی ئازادی بیرکردنەوەیە، هەر کاتێک ئەم توانا عەقڵییە لاواز بوو، ئەوا دەرەنجامی داهێنەرانە کەمتر دەبێتەوە.

هەموو بابەتێکی داهێنەرانە دووردەکەوێتەوە لەسەرپێیی و لاوازی. هەر بۆیە تواناکانی وەک زیرەکی و نەرم و نیانی و توانای قسەکردن بە پلەی یەکەم جیهانبینی فراوان دەکەن ئەمەش چارەسەرێکی وردبین بۆ گرفتەکان دەدۆزێتەوە.

توانای دواندن، یان پاراوی لەگفتوگۆدا بەشێکە لە توانای قسەکردن کە پێوەندی بەکارتێکەرەکانی پەروەردە هەیە.

بوونی توانا عەقڵییەکان چەندە گرنگە لەپرۆسێسی داهێناندا، ئاشکراکردن و دۆزینەوەی ئەم توانایانە، گرنگی زیاتری دەبێت، ئەو مامەڵەیەی کایەی کۆمەڵایەتی لەگەڵ تاکدا دەیکات کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر بونیادی کەسێتی و زۆرێک لە سیفاتە مەزاجی و بۆ ماوەییەکان دەبەخشێتەوە بەتاکەکانی.

پرۆسەی داهێنانیش لەقۆناغەکانی منداڵییەوە سەرهەڵدەدات و میانڕەوی لەبیرومەزاجی تاکدا چەندین وەزیفەی جۆراوجۆر لەداهێناندا داگیر دەکەن.

کەسی داهێنەر بەنەرمی بیرو مەزاج دەتوانێت شتێک بەرهەم بهێنێت کە شێوازی ژیان و ستایلی فیکری بگۆڕێت، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لەکۆمەڵگایەکی ئارام و دوور لە جەنگدا دەردەکەوێت. ئەم جۆرە تاکانە دەیانەوێت ژیان بەستایلێک بگۆڕن بەبێ پەنا بردنە بەر جەنگێکی خوێناوی.

کایەی کۆمەڵایەتی ئەوکات دەتوانێت گەنجێک پێ بگەیەنێت کە گەنجانە بیربکاتەوە کە مامەڵەیەکی بێباکانەی لەگەڵدا نەکرێت. ئەو دەمەی گەنج لەلایەن خێزانەوە پەراوێز دەخرێت و لەناو وێنای منداڵدا ون دەکرێت ئەوە سەرەتای ون بوونی تواناکانی گەنجە لەناو بێ سەروبەری کایەی کۆمەڵایەتیدا.

## بەشی سێیەم/ ئاستەنگەکانی بەردەم داهێنان کایەی کۆمەڵایەتی

بەوپێیەی تاک لەنێو خێزاندا پەروەردە دەکرێت، ئەم کایە کۆمەڵایەتیەش زۆرترین کاریگەری لەسایکۆلۆژیای تاکی ئێمەدا داگیرکردووە، هەر بۆیە ئەو قسە باوە هەمیشە لەواقعدا ڕاست دەهێنێت کە دەڵێت: (هەموو تاکێک نوێنەرایەی خێزانەکەی خۆی دەکات).

لێرەوە دەکرێت باس لەو زەمەنە درێژە بکەین کە تاک لەمنداڵیەوە تا دواساتەکانی تەمەنی گەنجی لەنێو خێزاندا بەسەری دەبات، هەروەک دەشزانین پرۆسەی بەکۆمەڵایەتیبوون ئەو پرۆسە گرنگەیە کەتاک ئاشنای بیروباوەڕو مەیل و بەها و پێوەرو دابونەریتەکانی نێو کولتووری کۆمەڵگا دەبێت، لە ڕێگای ئەم پرۆسەیەوە تاک شارەزای کولتوور دەبێت. زانیاری و بەهاو پێوەرو چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگا وەدەست دەهێنێت.(١٠)

لەلایەکی ترەوە ئەو فۆرمی پێوەندییەی کە تاکەکان ڕێک دەخات، جۆری کردە کۆمەڵایەتییەکان دیاری دەکات، کۆمەڵگای ئێمە تا ئێستاش نەیتوانیوە پێوەندییەکانی لەسەر بناغەی خوێن و خزمخواهی تێ بپەڕێنێت جۆرێک لەپێوەندی کە ئامانج لەکردە کۆمەڵایەتیەکانیدا ببینرێت، بەرجەستە بکات هەربۆیە ئەم پێوەندییانە وابەستەیی تاک بە خزم و هاوسێ و هاو خوێنەکانیەوە توندتر دەکات و جۆرێک لە پەیمانی کۆمەڵایەتی لەنێوان تاکەکاندا بە دەست دەهێنێت، کە هەموویان هەوڵ بدەن بۆ پاراستنی ئەو بەهایانەو لەبەرامبەر گۆڕانکارییەکاندا بەرگریکەربن. ئەمە جگە لەوەی کایەی کۆمەڵایەتی هەمیشە سەنتەرێکی یەک جەمسەرییە و تەنیا کار بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکانە دەکات کە پێویستە تاکەکان لەبەرامبەر کەسانی ترو دەسەڵاتدا پراکتیزەی بکەن.

ئەم ناوەندە کۆمەڵایەتییەی کە تاکی تێدا گەورە دەبێت، تاکە ناوەندی گەشەکردنی تواناو بەهرەکانیەتی، کەشی داهێنەرانە ئەو ناوەندە ڕاستەوخۆیەیە کە فاکتۆرە کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەییەکان دروستی دەکەن.

چەندە خێزان ناوەندێک بێت بۆ دیالۆگ و ڕاگۆڕینەوە، هێندە بەشداریکردنی تاکەکان زیاتر دەبێت بۆ خۆ ئامادەکردن لە دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو بۆ کێشەکان.

پێویستە دڵنیابین لەوەی پرۆسیسی پێوەندییەکان چەندە فراوان بێت هێندە بەرەنجامی داهێنەرانە دەبینرێت نەک تەنیا لەڕووی گۆڕینەوەی بیروڕاوە، بەڵکو لەفۆرمی دیالۆگ و ڕەخنەدا دەبینرێت.

پاڵپشتکردنی تواناو بەهرەی منداڵ فاکتۆرێکی گرنگە بۆ بەردەوامی بەخشین بەداهێنان، لەلایەکی ترەوە هاندان کارێکی گرنگ دەکاتە سەر بیرکردنەوەی منداڵ بۆ ئەوەی شتێک بکات پێشتر نەیکردبێت. ئەو داهێنانەی لای منداڵ دەبینرێت جیاوازە لەداهێنانی گەنجەکان، چونکە لەلای منداڵ ئەو شتە تازەیە، مەرج نییە لەلای کۆمەڵ نوێ بێت، بۆ نموونە چارەسەرکردنی گرفتێکی ماتماتیک جیاوازە لەو شێوەیەی مامۆستا فێری کردووە بۆ خۆی داهێنانە، ئەگەر لەلایەن خودی زانستەوە نوێ نەبێت، دەرکەوتنی ئەم جۆرە داهێنانە دەبێتە ئاماژەیەک بۆ داهێنانی ڕاستەقینە، خاڵی گرنگ لێرەدا ئەوەیە چۆن هەست بە بوونی ئەم جۆرە توانایە بکەین لەلای منداڵ، کە زۆرجار ناودەبرێت بەداهێنانی، فەردی، یان سایکۆلۆژی.

ئەو وێنانەی منداڵ دەیکات بەشێوەیەکی عەفەوی و ئازادانە و (تایلەر) بەداهێنانی گوزارشتی ناوی دەبات، لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێت گەشە بە بەهرەی بدرێت، بە ئەندازەی ئەوەی منداڵەکە سەربەست بکرێت لە وێنەکردندا دەتوانرێت ئەوەندە دەرەنجامی داهێنەرانەی هەبێت. پرسیاری سەرەکی لێرەدا ئەوەیە، ئایا چۆن دەتوانرێت ئەم بەهرەیە نەکوژرێت و بەردەوامی پێ ببەخشرێت؟

(میها لیفتش) لەلێکۆڵینەوەکەیدا، دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە چالاکی داهێنەرانە لەلای تاکی پێگەیشتوو بەرهەمی پرۆسەیەکی درێژە، بەو مانایەی داهێنانی منداڵ پێگەی یەکەمی ئەم پرۆسیسەیە، گرفتی دەرنەکەوتنی بەهرەو توانای گەنج دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مامەڵە تەقلیدییەی خێزان لەگەڵ منداڵاندا دەیکات.(١١) خێزانی ئێمە هەمیشە شایستەی ئەو منداڵانە دەکات کە تەمەنی خۆیان ڕەت دەکەن و وەک منداڵ بیرناکەنەوە، هەمیشە پێیان دەوترێ (ئافەرین هەر ئاوا عاقڵ بە دەنگە دەنگ مەکەو شت مەشکێنە، چونکە خەڵک دەڵێت ئەو منداڵە چەند هارە) ئەمە ئەو فەلسەفە چەسپاوەیە کە هەمیشە لەمنداڵی ئێمەدا چەند بارە دەکرێتەوە و وامان لێ دەکات وەکو گەورەکان ڕەفتار بکەین، ئیشکالیاتی کایەی کۆمەڵایەتی ئێمە لەوەدایە کە نایەوێت منداڵ خۆی بێت، هەمیشە قەبارەی کەسێکی تر دەکات بە بەری منداڵداو ناهێڵێت کەسێکی ئازاد بێت.

لەو ساتەوەی بەمنداڵ دەوترێت، سەیرکە ئەو منداڵە چەند ئاقڵە هەموو کەس خۆشی دەوێت. ئەمە یەکەمین هەنگاوی سڕینەوەی هەموو جیاوازیەکانە، خاڵی کوشتنی خەونە ڕەنگاو ڕەنگەکانی منداڵە، لەوساتە بەدواوە منداڵ بیرلەوە دەکاتەوە چۆن ببێتە ئەو کەسەی خێزان خۆشی بوویت، یان باسی بکەن.

ئەو منداڵەی کە هەمیشە پرسیار لەو شتانە دەکات کە نەیبیستووە. کەسێکە توانای وێناکردن و بیرکردنەوەی هەیە، بۆیە پێویستە خێزان هەمیشە زانیاری دروستی پێ

بدات، بەڵام دەبینرێت پاش چەند پرسیارێک، ئیتر بێزاریەک دروست دەبێت و مامەڵەیەکی تووڕەو چەپاندن پیادە دەکرێت.

چەپاندن بە بڕوای (فرۆید) باشترین قەڵغانە کە کایەی کۆمەڵایەتی بەکاری دەهێنێت بۆ بەرگریکردن لە پرسیارو ئارەزووی تاکەکان. ئەندامانی خێزان پێویستە فێری پابەندبوون بە بەڵێن و دڵسۆزی و وەفاداری و هاوکاری بن، هەر یەکێک لەم خەسڵەتانە ئامانجن نەک هۆ، خێزان بنچینە سەرەتاییەکانی مەعریفەی ژیانی مرۆیی پێشکەش بەتاک دەکات. لەبەر ئەوەی وەک سیستمێکی سەربەخۆ نەناسراوە، هەر بۆیە هەمیشە پێویستی بە بڕیاری دەرەکی دەبێت لە هەر گۆڕانێک کە ڕوودەدات، لەلایەکی تردەوە ئەو پێوەندیە کۆمەڵایەتیەی تاک بە ئەندامانی خێزانەوە دەبەخشێت پێوەندیەکی ڕاستەوخۆی ڕووبەڕووە، ئەمەش وا دەکات خێزان نزیکترین چاودێر بێت بەسەر تاکەکانەوە زۆرترین داواکاری لەبەرامبەر کەمترین مافدا دەبێتە ئەو مامەڵەیەی کایەی کۆمەڵایەتی دروستی دەکات و کایەی پەروەردە درێژەی پێ دەدات.

خێزان لەکۆمەڵگا تەقلیدیەکاندا باشترین ناوەند بۆ بەمیکانیکبوونی بەهاو کولتووره باوەکان و باشترین فاکتۆری چەپاندنیشە لەبەرامبەر جیاوازیەکانی گەنج و ئەو ناکۆکیە سروشتیەیەی لەسروشتی لاوەکاندا دروست دەبێت، هەر بۆیە هەمیشە دووا لیزمەیەکی ئامادە لە کەسایەتی گەنجدا هەستی پێ دەکرێت لەنێوان ئەو شتەی خێزان دەیەوێت و ئەوەی خۆی دەیەوێت. دواجار نەمانی متمانە لەنێوان تاک و ئەم کایەیەدا دەبێتە خاڵی ئەو پێوەندیەی دەبێتە جەبرێک بەسەرتاکەوە و توانای دەربازبوونی لێی نییە،

ئەم پرۆسەیە بێ بڕواییەکی ئاشکرایە بەتواناو ئامادەیی گەنج لەلایەن خێزانەوە، بۆیە پێویستە هەمیشە لەژێر چاودێری و ئاراستە کردندا بێت دواجار ئەو دەمەی خێزان بڕوا بەوە دێنێ کە کایەی پەروەردە هاوکارێکی ڕاستگۆی ئەو پرۆسێسەیە، بۆیە بڕیار دەدات تاکەکانی خۆی پێشکەش بەو کایەیە بکات و زۆرترین دەسەڵات بەکایەی پەروەردە بدات لەبەرامبەر منداڵێکی ملکەچ و گوێڕایەڵ دەخاتە ناو ئەو کایەیەوە، بۆیە دەبینین ئەو دەمەی کایەی کۆمەڵایەتی متمانەی بەکایەی پەروەردە لەق دەبێت، یان لاواز دەبێت ڕێگا نادرێت ئەو کایەیە بچێتە ناو پرۆسەی پێگەیاندنەوە، هەر بۆیە لە ڕابردوودا زۆرترین ڕێژەی نەخوێندەوار لەکۆمەڵگا دەبینرا، بەڵام لەحاڵەتی بوونی هاوئاهەنگیەک لەنێوان ئەم دوو کایەیەدا بە متمانەیەکی زۆرەوە تاکەکان دەچنە نێو ئەم کایەوە و لەتەمەنێکی دیاریکراودا پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن دەست پێ دەکات، کە بێگومان منداڵ ئەم گۆڕان و گواستنەوەیە لەژیانی خۆیدا بەگۆڕانێکی جەوهەر دەبینێت، هەربۆیە سەرەتا بە پەرۆشەوە بەرەو ڕووی کایەی پەروەردە هەنگا و دەنێت. بەو ئومێدەی لەگەڵ تەمەنی گەنجێتیدا کە جیاوازە لەمنداڵی بەهەموو پێکهاتە و خەونەکانییەوە، مامەڵەیەکی جیاواز بنێت.

## کایەی پەروەردەیی

کایەی پەروەردە وەک بەشێک لە فەلسەفەی کۆمەڵایەتی دەچێتە نێو ئەو پرۆسەیەی کە کایەی کۆمەڵایەتی دروستی دەکات، لە قۆناغی سەرەتاییدا منداڵ وەک بوونەوەرێکی شاراوە لە تواناو بەهرە دەچێتە نێو ئەم کایەیەو تێکەڵ بە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن دەبێت. کاریگەرییە پەروەردەییەکان، بەتایبەت کاریگەری پرۆسیسی فێرکردن. دەبێتە هۆکاری گەشەکردنی ئامادەییە سروشتییەکان. ئەم کایەیە ناوەندێکی باش دەخوڵقێنێت بۆ سەرهەڵدان و پێگەیشتنی توانا سروشتی و بۆماوەییەکان، ئەم خوڵقاندنی ناوەندە تەنیا نابێتە هۆکارێک بۆ گەشەکردنی توانا بۆماوەیی و سروشتیەکان، بەڵکو سەرهەڵدان و گەشەکردنی تواناو بەهرەی تاک بەرەنجامی کۆمەڵێک فاکتۆری کۆمەڵایەتییە وەک، فاکتۆرە عەقڵییەکان، ئامادەییەکان، فاکتەرە هاندەرییەکان، خەسڵەتە مەزاجی و فاکتۆرە پەروەردەیی و کۆمەڵایەتییەکان کۆبوونەوەی ئەم خەسڵەتانەو تێکەڵاوبوونیان خاڵێکی بنچینەیی دروست دەکەن لە دەرەنجامە گرنگەکاندا.

(ڕوث) پێی وایە پێویستە قوتابخانە جێگای گەشەپێدان و بەگەڕخستنی بەهرەکان بێت، پێوەندی بەهرە بەفێرکردنەوە، گرنگترە لە پێوەندی بە تێگەیشتنی و بەو ناوەندەی تێیدا ژیاوە. ئەمەش وادەکات ڕێگاکانی فێرکردن چەندین مانای تریان هەبێت، (۱۲) پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە تا چەندە کایەی پەروەردەی ئێمە توانیویەتی ببێتە ئامرازێکی پشکنەر بۆ دۆزینەوەی توانا عەقڵییەکانی تاک، تاچەندە توانیویەتی ببێتە ناوەندێک بۆ بەگەڕخستنی ئەو توانایانەو بەدەست هێنانی دەرەنجامی داهێنەرانە.

فاکتۆرە عەقڵییەکان ناتوانن بەتەنیا بگەنە دەرەنجامی داهێنەرانە لە بوارێک لە بوارەکانی چالاکییە مرۆییەکاندا، بەڵکو ئەمە پێویستی بە بوونی فاکتۆرە هاندەرییەکان دەبێت.

کایەی پەروەردە لەلای ئێمە هێشتا نەیتوانیوە شتێک بێت جیاواز لەوەی کۆمەڵگا دەیەوێت، هەمیشە لەژێر چاودێری تاکەکان و دابونەریتە باوەکاندا بووە، لە بری ئەوەی کایەی پەروەردە ببێتە دەزگایەکی مەعریفی بۆ بەرهەم هێنانی تاکێکی خاوەن قسەو خاوەن بیری جیاواز.

لەو کاتەوەی منداڵ ڕووبەڕووی چەندین ئامۆژگاری

دەبێتەوە لەلایەن هەردوو کایەی کۆمەڵایەتی و پەروەردەوە، تووشی دواکەوتنێک دەبێت لە جێبەجێکردنی هەموو ئەو ئامۆژگارییانە، کایەی پەروەردە بەپلەی یەکەم پشت بە ئامۆژگاری دەبەستێت لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتیدا، لەکاتێکدا دەزانرێت ئەمە کەمترین بواری جێبەجێکردنی دەبێت لەواقعی تاکدا، بۆیە تائێستاش کایەی پەروەردە خاڵیە لە پێشکەشکردنی شانۆگەری و ئۆپەرێت و فیلمی منداڵان، کە ئەمە میکانیزمێکی کاریگەرە بۆ فراوانکردنی بیری منداڵ و وەڵام دانەوەی پرسیارەکانی.

لەم ڕێگایەوە منداڵ دەتوانێت بەدوای مانای جیاوازدا بگەڕێت ئەم ڕێگای خولقاندنە کەشێکی داهێنەرانەیە بۆ منداڵ، چونکە خۆی تەفسیر بۆ شتەکان دەکات و یادەوەری خۆی دەکاتەوە بۆ ئەو شتەی کە بەدوایدا دەگەڕێت، بە پێچەوانەوە کایەی پەروەردە تەنیا شێوازێکی هەیە لە گەیاندنی زانیاری و فێرکردندا، کە ئەمەش وادەکات منداڵ چاوەڕوانی شتێک نەکات کە پێشتر نەیدیوە، بەڵکو هەمان مامۆستا بەهەمان مەزاج و هەمان ئامۆژگارییەوە ڕۆژانە دەبینرێ.

لەلایەکی ترەوە ئەو سیستەمە چاودێرییەی لەناو پۆل و دەرەوەی قوتابخانە پراکتیزەی دەکەن، منداڵ والێ دەکات لە خەونیشدا بترسێت لەوەی چۆلەکەکەی، مامۆستا ئاگای لێیەتی.

نەبوونی پلانێکی گونجاو لە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردندا تاک والێ دەکات زۆرترین کاتەکانی خۆی ببەخشێت بەوانەکان و لە بەرامبەردا کەمترین شت لە یادەوەریدا بمێنێت.

زۆربەی وانەکانی زانست پێویستە قوتابی خۆی وێنای بکات، چونکە تاقیگەیەک نییە بۆ ئەوەی تۆ بزانیت چۆن هایدرۆجین و ئۆکسجین مادەیەکی لێ پێک دێت کە ئاوە، ئەمە (ئەلف و بێی) وانە زانستیەکانە.

تا دەگاتە زانکۆ نازانێت ئەوەی خوێندوویەتی بوونی هەیە یان نا ؟!

ئەم ناواقعیە هەر لە مەنهەجیەتدا نابینرێت، بەڵکو پەل دەهاوێتە ناو پێوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی.

هەمیشە فێری ئەوە دەکرێین کە گەورە قسەی کرد، پێویستە گوێی لێ بگرین و بەقسەی بکەین، بەڵام هەرگیز ناوترێت کە قوتابی قسەی کرد، پێویستە مامۆستا گوێی لێ بگرێت.

بۆیە ئەوکاتەی قوتابی لەوە دڵنیا دەبێت کە مامۆستا ئامادەی گوێگرتنی نییەو هیچ ئومێدێک نییە کە داخوازییەکانی بۆ بهێنێتە دی، ئەم سەرەتای نەمانی متمانەیە لەنێوان مامۆستاو قوتابیدا، دەبینرێت چەند قوتابیەک لە پۆلدا هەمیشە هەن کە بۆڵەبۆڵ دەکەن و مامۆستا دەڵێت ئەوانە ئاژاوەگێڕن، ئەم جۆرە قوتابییانە لەهەموو ناوەندەکانی خوێندندا بوونیان هەیەو هەرگیز مامۆستا پرسیارێک ناکات لەوەی بۆچی ئەم قوتابیانە وادەکەن، تاکە تەفسیری بۆ ئەوان ئەوەیە حەزیان لەوانەکە نییەو دەیانەوێت سەر لە قوتابیەکانی تر بشێوێنن، ئیتر ناپرسێت لەوەی ئەم قوتابیانە بێزاربوون لەو مامەڵەو مەنهەجە تەقلیدیەو کەسانێکی خاوەن ئیرادەن.

ئەگەرنا هەرگیز قوتابیەکی ترساو و تۆقیو ناتوانێت بچێتە ناو قوتابیە گێرەشێوێنەکان و بگرە هەمیشەش حاشایان لێ دەکات، ئەوان دەیانەوێت ئەو دەسەڵاتە لەق بکەن کە مامۆستا هەیەتی، دەیانەوێت کەشێکی جیاوازتر لەو کەشە بخولقێنت کە مامۆستا دەیەوێت، ئەو دەسەڵاتە ڕەهایەی مامۆستا لە ئاستی قوتابیدا پێی بەخشراوە لەبری ئەو مافە پیشەییە کە نەیدراوەتێ، (چونکە لەلای ئێمە مامۆستا هەرگیز وەک پێویست مافی پیشەیی خۆی نەدراوەتێ، بەڵام هەوڵ دراوە لە ڕێگەیەکی ترەوە ئەم کەلێنە لە ژیانیدا پڕ بکرێتەوە کە هەرگیز پڕنەکراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە بە خوێندکار دەوترێت مامۆستا کەسێکی پیرۆزە) (١٣) ئەم بە پیرۆز ڕاگرتنەی مامۆستا وادەکات خاڵی هاوبەش لەنێوان قوتابی و مامۆستادا نەبینرێت، هەر کاتێکیش پێوەندی لەنێوان مامۆستاو قوتابیدا لە ئاستێکی تەسکدا بێت، ئەوە داهێنان لە قەیراندایە، چونکە قوتابی پێش ئەوەی بیری لە داهێنان بکاتەوە، پێویستە بیر لەوە بکاتەوە چۆن تواناکانی خۆی بدۆزێتەوەو چۆن بیانناسێت.

زانکۆ و پەیمانگاکان دواخەونی گەنجە کە دەیەوێت پێی بگات، چونکە هەروەک پێشبینی دەکات ئەوێ جێگایەکە جیاواز لە جێگاکانی تر، بەڵام دواجار دەگاتە ئەو ڕاستیەی کە زانکۆ و پەیمانگاکان کایەیەکی جیاواز نین لە کۆمەڵگا، لەبری ئەوەی زانکۆ چاودێرێک بێت بەسەر کۆمەڵگاو دەسەڵاتەوە، دەسەڵاتێکی باڵاتر لە مامۆستا هەست پێ دەکات کە دەسەڵاتی سیاسیە.

ئەو سیستەمەی زانکۆکانی ئێمە جێبەجێی دەکەن، هەر لە سیستەمی غیاباتەوە تا دەگاتە حسابکردن بۆ تواناکانی گەنج، جۆرێک لە عەسکەرتاری و نائومێدی لێ دەبینرێت، کە هیچی کەمتر نییە لەو وابەستەبوونانەی کۆمەڵگا دەسەپێنێت.

ئەمە جگە لەوەی زانکۆکانی ئێمە، هێندە لە داخران و تەقلیدیەوە نزیکن، بوونەتە کولتوورێکی کۆمەڵایەتی، پاش ئامادەیی دەبێت زانکۆ و پەیمانگا تەواو بکەیت، ئیتر گرنگ نییە لە زانکۆ چی دەخرێتە سەر مەعریفەکانی گەنج، چ پانتاییەک هەیە بۆ نمایشکردنی تواناو بەهرەکان، دەتوانم بڵێم هێندەی کایەی پەروەردەی ئێمە قەیران دەخولقێنی لەبەردەم داهێنان، هێندە پاڵنەرێک نەبووە بۆ داهێنان، هەر بۆیە ئەو نائومێدییەی قوتابی لە

زانکۆ و پەیمانگاکـــاندا تووشی دەبێت جـــیـــاوازە لە نائومـێـدیەکـانی تر، چونکە لە پشت ئەم نائومـێـدیەوە، ئومـێـدێک نیـیــە، جگە لە گـەڕانەوە بۆناو کـۆمـەڵگا، گەنجیش لەنێوان نەبوونی جێگایەک پاش دەرچوونی لە زانکۆ و لەنێـــوان نەبوونی دەرفـــەت بۆ درێژکـــردنەوەی مـاوەی خـوێندن لە زانکۆ، لە پێناو نەگـەڕانەوە بۆ ئەو کـۆمـەڵگایەی نایخـوێنێـتـەوە، بۆ ئەو واقـیـعـەی ڕووی پرسـیـار لە ئەو ناکـات تەنیـا هەڵـبـژاردنێـک دەبینێت، ئەویش کـۆچە، ئەو ئومـێـدەی دنیـایەک نائومـێـدی لە پشتەوەی ئامادەیەو گەنج هەڵیٔ دەبژێرێت.

**بواری پراکتیکی لێکۆڵینەوەکە**

**بەشی چوارەم/ چوارچێوەی مەنهەجی لێکۆڵینەوەکە**

**نموونەی وەرگیراوی لێکۆڵینەوەکە**

نموونەی وەرگـیـراوی ئەم لێکۆڵـینەوەیە بریتـیـیـە لە خوێندکارانی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی.

جۆری عەینەکە(١٤)

ئەوەی لێکۆڵـینەوەی لەسەر کراوە بریتییە لە پەیمانگای هونەرە جوانەکان، نموونەی وەرگیراو بریتییە لەدوو بەشی دیاریکراو، ئەوانیش بەشی شـانۆ و بەشی شـێـوەکـاری، خـوێندکـارانی پەیمانگا تەمـەنیـان لەنێـوان (١٥- ٢٠) ســاڵدایە، ئەمـــەش نموونەیەکی گـــونجـــاوە لەگـــەڵ باسەکەدا.(١٥)

**ئامرازی لێکۆڵینەوەکە**

پرۆسـەی کـۆکـردنەوەی زانیـاری لەسـەر کـۆمـەڵگای لێکۆڵینەوە پێویستە دیاریکراوبێت.

لەم لێکۆڵـینەوەیەدا لیـسـتی کـۆکـردنەوەی زانیـاری (استـمـارة الأستـبـیـان) بەکارهێنراوە، کە پێک دێت لە کۆمەڵێک پرسیار هەموویان خزمەت بە دەرەنجامـەکانی لێکۆڵینەوەکە دەکەن.

**گریمانەکانی لێکۆڵینەوەکە**

هەموو لێکۆڵـینەوەیەکی سۆسیۆلۆژی، چەند گریمانەیەک دەخـاتە ڕوو فـۆرمی ڕاپرسی لەپێنـاو سـەرکـەوتن، یان بەتاڵ کـردنەوەی گریمانەکاندا بەکـاردەهێنرێت و دەرەنجام دیاری دەکات.

**گریمانەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەمانەن**

١- زۆربەی زۆری گەنجەکان توانای هونەرییان تێدایە، ئەم هۆکـارەش وای کـردووە بچـێـتـە پەیمانگای هونەرە جوانەکان.

٢- زۆربەی خێزانەکان هە... بەوە ناکەن ئایا منداڵ توانای هونەری تێدایە، یان نا؟

٣- زۆربەی زۆری گەنجەکان بیر لە چارەسەری کێشەی هاوڕێکانیـان دەکەنەوە، ئەمەش ڕەهەندێکی سەرەکییە لە پرۆسەی داهێناندا.

٤- کـەمـــتـــرین ڕێژەی خـــوێندکـــار ئارەزوو دەکـــات بیرکردنەوەکانی خۆی لەگەڵ مامۆستاکاندا باس بکات، ئەمــەش لەبەر لاوازی پێــوەندی نێــوانیــان و نەبوونی هۆکاری هاندان.

٥- گـەنجـان ئارەزوو دەکـەن مومـارەسـەی توانای کـاری خـۆیان بکەن، بەڵام نەبوونی جێگایەک بۆ خـسـتنەگەڕی تواناکانیان هۆکاری دوورکەوتنەوەیانە لە هونەر.

**خشتەکان و ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەیان**

خشتەی ژمارە(١) ڕەگەزی نموونە وەرگیراوەکە.

| ڕەگەز | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| نێر | ٣١ | ٦٢ |
| مێ | ١٩ | ٣٨ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

لەم خشتەیەدا دەردەکەوێت، ڕەگەزی نێرینە (٦٢٪)ی نموونە وەرگـیـراوەکـەیەو ڕەگـەزی مـێـینە (٣٨٪)ی نموونەکەیە، ئەمەش مـانای زۆری ڕێژەی ڕەگەزی نێرینەیە لە پەیمانگادا لەچاو ڕەگەزی مێینە.

خشتەی ژمارە(٢) تەمەنی نموونە وەرگیراوەکە.

| تەمەن | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ١٥-١٨ | ٢٤ | ٤٨ |
| ١٩-٢٢ | ٢٦ | ٥٢ |
| ٢٣-٢٦ | - | - |
| ٢٧-زیاتر | - | - |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

تەمەنی نموونە وەرگیراوەکە لەنێوان (١٥- ٢٢) ساڵیدایە.
خشتەی ژمارە(٣) باری ئابووری نموونە وەرگیراوەکە.

| باری ئابووری | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| باش | ١٧ | ٣٤ |
| مام ناوەندی | ٣٣ | ٦٦ |
| خراپ | - | - |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٦٦ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە باری ئابوورییان مام ناوەندیە، بەڕێژەی (٣٤ ٪)ی نموونەکە باری ئابوورییان باشە.
خشتەی ژمارە (٤) باری کۆمەڵایەتی نموونە وەرگیراوەکە.

| باری کۆمەڵایەتی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| سەڵت | ٥٠ | ١٠٠ |
| هاوسەردار | - | - |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (١٠٠ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە سەڵتن، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە ڕێژەی هاوسەرگرتن لەنێوان تەمەنی (١٥-٢٢) ساڵیدا، نابینرێت.
خشتەی ژمارە (٥) ئارەزووی نموونە وەرگیراوەکە لە هەڵبژاردنی پەیمانگادا.

| بە ئارەزووی خۆت هاتوویتە پەیمانگا | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٤٨ | ٩٦ |
| نەخێر | ٢ | ٤ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٩٦ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە بە ئارەزووی خۆی هاتۆتە پەیمانگا، واتە ئامادەییەکی خودی زۆر هەیە بۆ بە ئاکادیمی کردنی توانای گەنج، ڕێژەی تەنیا (٤ ٪) بە حەزی خۆی نەهاتووە کە ئەمەش ڕێژەیەکی کەمە.
خشتەی ژمارە (٦) بەرهەمی هونەری نموونە وەرگیراوەکە پێش خوێندن لە پەیمانگا.

| بەرهەمی هونەری پێش پەیمانگا | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٢٤ | ٤٨ |
| نەخێر | ٢٦ | ٥٢ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٤٨ ٪) نموونەکە بەرهەمی هونەری هەبووە، واتە هەوڵی فەردی هەبووە و ڕێژەی (٥٢ ٪) بەرهەمی نەبووە، ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە زۆربەی نموونە وەرگیراوەکە پێشتر بەرهەمی نەبووە، بەڵام پەیمانگای هەڵبژاردووە، چونکە حەزی تێدابووە.
خشتەی ژمارە (٧) هۆکاری چوونە ناو پەیمانگا لەلای نموونە وەرگیراوەکە.

| هۆکاری هاتنت بۆ پەیمانگا | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| توانایەکی هونەریم هەبوو | ٣٦ | ٧٢ |
| ئامادەییم پێ تەواو نەدەکرا | ٢ | ٤ |
| کچ و کوڕ تێکەڵن | ١ | ٢ |
|ماڵەوە ناردمیان | ٣ | ٦ |
| ڕێکەوت بوو | ٨ | ١٦ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٧٢٪)ی نموونە وەرگیراوەکە توانایەکی هونەری لەخۆیدا هەست پێ کردووە، بۆیە چۆتە پەیمانگا، ڕێژەی (٤٪) ئامادەیی پێ تەواو نەدەکرا، ڕێژەی (٢٪) دەڵێت لە پەیمانگا کچ و کوڕ تێکەڵن، ڕێژەی (٦٪) ماڵەوە ناردوویانە، ئەمەش مانای ئەوەیە گەنجەکان بەتەواوەتی ئازادنین لەلایەن خێزانەوە تەنانەت لە هەڵبژاردنی خوێندنیشدا، ڕێژەی (٨٪) دەڵێت بەڕێکەوت هاتووم.

خشتەی ژمارە(٨) بەشداریکردنی نموونە وەرگیراوەکە لەتەمەنی منداڵی لەکاری هونەریدا.

| بە منداڵی بەشداری کاری هونەریت کردووە | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆر | ١١ | ٢٢ |
| کەم | ٣٠ | ٦٠ |
| هیچ | ٩ | ١٨ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٢٢٪) لەزۆر کاری هونەریدا بەشداری کردووە، ڕێژەی (٦٠٪) بەشدارییەکی کەمی هەبووە، ڕێژەی (١٨٪) هیچ جۆرە بەشدارییەکی نەکردووە.

خشتەی ژمارە (٩) هەستکردنی خێزانی نموونە وەرگیراوەکە بەتوانای هونەری.

| خێزانەکەت هەستی کرد توانای هونەریت تێدایە | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٣٧ | ٧٤ |
| نەخێر | ١٣ | ٢٦ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٧٤٪)ی نموونەکە، لەلایەن خێزانەکانیانەوە هەست کراوە توانای هونەرییان تێدایە، ڕێژەی (٢٦٪) هەستیان بەبوونی توانا نەکردووە.

ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە زۆربەی نموونە وەرگیراوەکە توانایەکی هونەری ئاشکرای تێدابووە پێش هاتنی بۆ ناو پەیمانگا، واتە ئامادەییەکی زۆر هەبووە بۆ مومارەسەکردنی ئەو بوارەی خۆی توانستی تێدا هەبووە.

خشتەی ژمارە (١٠) پێوەندی نموونە وەرگیراوەکە لەگەڵ خوێندکارانی گرووپەکەی خۆی.

| ئاستی پێوەندی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| زۆرباش | ٣٢ | ٦٤ |
| پێوەندی کەمە | ١٨ | ٣٦ |
| پێوەندی نییە | - | - |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٦٤٪)ی نموونەکە پێوەندی زۆر باشە لەگەڵ خوێندکارانی بەشەکەی خۆی، ڕێژەی (٣٦٪) پێوەندییەکانی کەمترە، ڕێژەی (٠٪) پێوەندی نییە، ئەمەش ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە کەشێکی لەبار هەیە بۆ پێوەندی کردن و پێک هێنانی عەقڵی جەمعی و ڕاگۆڕینەوە.

خشتەی ژمارە (١١) پێوەندی نموونە وەرگیراوەکە لەگەڵ مامۆستاکانیان.

| جۆری پێوەندی لەگەڵ مامۆستایان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| وەک قوتابی و مامۆستا | ٢٢ | ٤٤ |
| وەک هاوڕێ | ٢٧ | ٥٤ |
| حەز دەکەم پەیوەندیان نەبێت | ١ | ٢ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٤٤٪)ی نموونە وەرگیراوەکە پێوەندی لەگەڵ مامۆستاکاندا وەک قوتابی و مامۆستایە، ڕێژەی (٥٤٪) وەک هاوڕێ، ڕێژەی (٢٪) حەز ناکات پێوەندی هەبێت.

ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە ڕێژەیەکی زۆری خوێندکاران تەنیا پێوەندی وەرگرو بەخشەر دەبینن لەنێوان خۆیان و ماموستاکاندا، ئەم کورتی هێنانە لەکارلێکی کۆمەڵایەتی، کاردەکاتە سەر داهێنان لەلای خوێندکار.

خشتەی ژمارە (١٢) چارەسەری کێشەی هاوڕێ لەلایەن نموونە وەرگیراوەکە.

| هەوڵ دەدەی کێشەی هاوڕێکەت چارەسەر بکەیت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٤١ | ٨٢ |
| نەخێر | ١ | ٢ |
| گرفتی خۆیەتی | ٨ | ١٦ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٨٢ ٪)ی نموونەکە، هەوڵ دەدات کێشە بۆ هاوڕێکەی چارەسەربکات، ڕێژەی (٢ ٪) هیچ هەوڵ نادات، ڕێژەی (١٦ ٪) دەڵێت گرفتی خۆیەتی.

ئەمەش ئەوە روون دەکاتەوە کە زۆرترین ڕێژە هەوڵی بیرکردنەوە و چارەسەری کێشەکان دەدەن.

خشتەی ژمارە (١٣) باسکردنی پرۆژەیەک لەلای نموونە وەرگیراوەکە.

| گەر پرۆژەیەکت هەبێت بۆ کێی باس دەکەیت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| هاوڕێ | ٢٤ | ٤٨ |
| مامۆستا | ٢١ | ٤٢ |
| باسی ناکەم | ٥ | ١٠ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٤٨ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە فکرەی کارەکانی خۆی لەگەڵ هاوڕێکانی باس دەکات، ڕێژەی (٤٢ ٪) لەگەڵ مامۆستاکان باسی دەکات، ڕێژەی (١٠ ٪) باسی ناکات.

ئەمە ئەوە روون دەکاتەوە کە ڕێژەیەکی زۆری نموونە وەرگیراوەکە، گەر فکرەیەکیان لەلا گەڵاڵە بێت باسی دەکەن.

خشتەی ژمارە (١٤) پشتگیری کارە هونەرییەکانی نموونە وەرگیراوەکە.

| پەیانگا پشتگیری لەکارەکان دەکات | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٤٠ | ٨٠ |
| نەخێر | ٧ | ١٤ |
| حەز ناکەیت کاری باش بکەیت | ٣ | ٦ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٨٠ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە پشتگیری لە کارەکانی دەکرێت، ڕێژەی (١٤ ٪) پشتگیری لێ ناکرێت، ڕێژەی (٦ ٪) پێی وایە حەز ناکەن کاری باش بکەن.

خشتەی ژمارە (١٥) کردنی کاری هونەری لەلای نموونە وەرگیراوەکە.

| لەپاش تەواوکردنی پەیانگاکاری هونەری دەکەیت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٢١ | ٤٢ |
| نەخێر | ٢ | ٤ |
| نازانم | ٢٧ | ٥٤ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٤٢ ٪) بەهیوایە کاری هونەری بکات، ڕێژی (٤ ٪) کاری هونەری ناکات، ڕێژەی (٥٤ ٪) دڵنیانییە لە پاشەڕۆژ، ئەمە ئەوە روون دەکاتەوە کە ڕێژەی زۆرینەی خوێندکاران نازانن دوای دەرچوونی چ کارێک بکەن، ئەمەش بەهۆی چەندین هۆکارەوە، کە هەندێکیان

پێـوەندی هەیە بەوەی کـاری هونەری ناتوانێت زامنی ژیانیان بکات، لەخشتەی ژمارە (١٦) دەبینین.
خشتەی ژمارە (١٦) کۆسپی، یان هۆکاری نەکردنی کاری هونەری لای نموونە وەرگیراوەکە.

| هۆکاری دڵنیانەبوون لەکردنی کاری هونەری | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەکاری هونەری ناژیم | ١٤ | ٢٨ |
| شوێنی گونجاو نییە تا کار بکەم | ٢٧ | ٥٤ |
| لەبوارەکەی خۆمدا شارەزانیم | ٩ | ١٨ |
| کۆ | ٥٠ | ١٠٠ |

ڕێژەی (٢٨ ٪) دەڵێت بەکـاری هونەری ناژیم، ڕێژەی (٥٤ ٪) شـوێنی گـونجـاو نابینێت بۆ کـارکـردن، ڕێژەی (١٨ ٪) شارەزانیە لەبوارەکەی خۆیدا، ئەمە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە زۆرترین ڕێژە هەست دەکات جێگا نییە بۆ مومارەسەکردنی پسپۆڕی خۆی، ئەگەرنا ئامادەییەکی زۆر هەیە بۆ کاری هونەری.

**بەشی پێنجەم/ دەرەنجام و پێشنیارەکان**

**دەرەنجامی لایەنی پراکتیکی**

دەرەنجـامی لایەنە پراکـتـیـکـیـیـەکـە لەم چەند خـاڵەدا دەخەینە ڕوو.

١- ڕێژەی ڕەگەزی نێرینە زۆر زیاترە لە ڕەگەزی مێینە لەنموونە وەرگیراوەکەدا.

٢- تەمـەنی نموونەکە لەنێوان (١٥-٢٢) سـاڵیـدایە، ئەم تەمـەنەش بەسـەرەتاو ناوەندی گـەنجـێـتـی دادەنرێت، بۆیە لە ڕووی تەمــەنەوە نموونەکـــە هاوتایە لەگـــەڵ لێکۆڵینەوەکە.

٣- زۆربەی زۆری نموونە وەرگـــیـــراوەکـــە بە ڕێژەی (٩٦ ٪) بە حـەزی خـۆیان پەیمانگایان هەڵـبـژاردووە، لەبەرئەوەی (٧٢ ٪)یان پێـــیـــان وایە توانای هونەریان تێدایە،

ئەمـەش ئەو گـریمانەیەمـان دەسـەلمێنێت کـە دەڵێین، زۆربەی گەنجەکان توانایان هەیە، هەر بۆیە پەیمانگایان هەڵبژاردووە. بۆ بەگەڕخستنی تواناکانیان.

٤- بەڕێژەی (٦٠ ٪)ی نموونە وەرگیراوەکە بەجۆرێک لەجـۆرەکـانی لەتەمـەنی منداڵـیـدا بەشـداری لەکـاری هونەریدا کـردووە، هەر ئەمـەش وای کـردووە (٧٤ ٪) خـێـزانەکـانـیـان هەست بە بوونی تواناو بەهرەیان بکەن، ئەمـەش ئەو گـریمانەیەمـان بەتاڵ دەکـاتەوە کـە دەڵێین، زۆربەی خـێـزانەکـان هەسـتـیـان بە بوونی تواناو بەهرەی منداڵەکانیان ناکەن.

٥- گـەنجـەکـان بەڕێژەی (٦٤ ٪) لەپێوەندییـەکی زۆر باشدان لەگەڵ هاوڕێ و خوێندکارانی گروپەکەی خۆیاندا، هەر ئەمەش وای کردووە بەڕێژەی (٨٢ ٪)یان ئامادەییان تێدا بێت بیر لەچارەسەرکردنی کێشەی هاوڕێکانیان بکەنەوە، ئەم خستنەگەڕەی فیکرە لەلای گەنج، یارمەتی دەدات بەرەو داهێنان و دەرەنجامی داهێنەرانە.

ئەمەش ئەو گریمانەیەمان دەسەلمێنێت کە دەڵێین زۆربەی گـەنجـەکـان بیـر لەچارەسـەری کـێـشـەی هاوڕێکـانیـان دەکەنەوە، ئەمەش ڕەهەندێکی سەرەکی داهێنانە.

٦- ڕێژەی (٥٤ ٪)ی نموونە وەرگـیـراوەکە، پێوەندییان لەگەڵ مامۆستـاکانیـان پێوەندییەکی هاوڕێیەتیە، بەڵام ڕێژەیەکی کـەمـتـر پرۆژەکـانیـان لەگەڵ مـامۆسـتـایان باس دەکەن،

ڕێژەی (٤٢ ٪)ی نموونەکە لەگەڵ مامۆستاکانی پرۆژەو بیرۆکـەی خۆی باس دەکات، ئەمەش ڕێژەیەکی کـەمە بە بەراورد لەگـەڵ ئەو واقـعـەی پێـویسـتــە پەیمانگایەکی هونەری بیخولقێنێت.

لەلایەکی ترەوە (٨٠ ٪)ی نموونە وەرگـیـراوەکـە پێی وایە ئەگەر پرۆژە پێشکەش بکات، ئەوا پشـتـگـیـری لێ دەکرێت..!

دەکـرێت بڵـێین کـێـشـەکـە لەوێوە دروست دەبێت کـە هۆکـاری هاندان زۆر لاوازە، هەروەها پێـوەندی نێـوان مامۆستاو خوێندکار هێشتا نەگەیشتۆتە پێوەندییەکی هاوڕێیەتی.

ئەمەش ئەو گریمانەیە دەسەلمێنێت کە دەڵێت، کەمترین ڕێژەی قـوتابی پرۆژەی هەیە و کـەمـتـرین هۆکـاری هاندانیش لەلایەن مامۆستایانەوە هەیە.

٧- ڕێژەی (٥٤ ٪)ی خـوێندکـاران نازانن دوای دەرچوون لە پەیمانگا مومارەسەی هونەر دەکەن، یان نەء، ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوەی گەنج شوێنێک نابینێـتەوە تا کاری تیا بکات، تا توانا عـەقڵـیـەکـانی خۆی بخاتە گەڕ،

ڕەنگە ئەگەر هەمـان پرسـیـار لە سـیـسـتـمی پەروەردە بکرێ سـەبارەت بە چارەنووسی دەرچووانی پەیمانگای هونەرە جوانەکـان، وەڵامێکی ئاشکرایان چنگ نەکەوێ، بۆیە ئاساییە گەر گەنجێک بەو جۆرە وەڵامی پرسیارێکی ئاوا بداتەوە، چونکە ئەو پێیدەوترێت تۆ جارێ بخوێنە هەر کاتێک دەرچوویت، جێگایەک هەر دەبێت.

ڕێژەی (٥٤ ٪)ی خوێندکـاران پێـیـان وایە کـارێکی گونجاو نییە لەگەڵ پسپۆڕی ئەواندا یەک بگرێتەوە. بۆیە پێیان باشە لەگەڵ تەواوبوونی پەیمانگا دەسبەرداری کاری

هونەری بن.
ئەمەش ئەو گریمانەیەمان دەسلمێنێت کە دەڵێین گەنجان گەر دڵنیابن و پێگەی خۆیان بزانن ئامادەن کاری هونەری بکەن، بەڵام پڕکردنەوەی شوێنی بەتاڵ لەقوتابخانەکەدا، گوایە ئەوان دەتوانن هەموو وانەیەک بڵێنەوە، وایان لێ دەکات لەکارو پسپۆری خۆیان دووربکەونەوە.

**دەرەنجامە سلبییەکان**

١- تەمەنی گەنجێتی ماوەیەکی دیاریکراوە، هەر ئەم تەمەنەش یارمەتی داهێنانە، بۆیە ئەگەر توانای گەنج لەو ماوەیەدا نەخرێتە گەڕ و دوابخرێت بۆ ماوەیەکی تر، هەرگیز بەرەنجامی داهێنەرانە بەدەست نایەت، چونکە تواناو بەهرە عەقڵییەکان پێوەندییەکی قووڵیان بە یادەوەری و فکرەوە هەیە.
٢- سیستمی پەروەردە نەک بواری نەڕەخساندووە بۆ بەگەڕخستنی تواناکان، بەڵکو هیچ جۆرە میکانیزمێکی نییە بۆ کەشفکردنی توانا عەقڵییەکانی گەنج.
٣- دیارینەکردنی پێگەی گەنج لەناو گۆڕانکاریەکان و بڕیارە سیاسیەکاندا، پەراوێز خستنی توێژێکی زۆر گرنگە، هەروەها دروست کردنی ململانێیەکی ناشەریفانەیە لەنێوان نەوەی پێشوو، نەوەی ئێستا. لەمەوە گەنج هەست بەبێ هوودەیی و نائومێدی دەکات، چونکە ئەو هەمیشە شوێنە بەتاڵەکانی پێ پڕدەکرێتەوە.
٤- سیستمی پەروەردە تەنیاکاری دامەزراندنی پەیمانگاو زانکۆ نییە، بەڵکو پێویستە پێش ئەم کارە بیر لە شوێنی کارکردن بکاتەوە بۆیان، نەبوونی پلانی گشتگیر کە ئامانجە ئایندەییەکانی گەنجی تیا پارێزراو بێت، سیستمی پەروەردەی تووشی بێ دەسەڵاتی کردووە.

**دەرەنجامە ئیجابیەکان**

١- ئامادەییەکی زۆر لەلای گەنجەکان هەستی پێ دەکرێت، ئەگەر بوار بۆ نمایشکردنی تواناکانیان بکرێتەوە.
٢- زۆربەی گەنجەکان دەتوانن خۆیان بناسن و بزانن لەچ بوارێکدا توانا و بەهرەیان هەیە، ئەمەش ئاماژەیەکی گرنگە بۆ پرۆسەی داهێنان، ئەگەر کایەی پەروەردە هۆکارێکی یارمەتی دەربێت نەک چەپاندن.
٣- ڕێژەیەکی زۆری گەنجان دەتوانن بیر لەو شتانە بکەنەوە کە لەدەرەوەی خودی خۆیانە، ئەمەش واتای بیرکردنەوە دەگەیەنێت لەکێشەو گرفتی خەڵکانی تر کە جۆرێکە لە داهێنان.
٤- گەنجەکان هەست دەکەن پشتگیری لە بیرۆکەو پرۆژەکانیان دەکرێت، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەو ڕاستییەیان تێنەگەیەنراوە کە پێویستە بیر لە پرۆژەو پلان بکەنەوە، بەوەی گوایە پێویستە خۆیان قسە لەسەر خۆیان بکەن خۆیان تەفسیری نائومێدی و بێ پێگەی خۆیان بکەن.

**پێشنیارەکان**

١- وەک چۆن ڕێژەیەکی زۆری خوێندکارانی پەیمانگای هونەرە جوانەکان بەحەزی خۆیان وەرگیراون، ئەم سیستمە لەزانکۆ و پەیمانگاکانی تریشدا جێبەجێ بکرێت.
٢- سیستمی پەروەردە خۆی بە بەرپرسیار بزانێت لەبەردەم نەبوونی پرۆژەو داهێنان لەلای قوتابی و گەنج، چونکە کایەی پەروەردەیی زۆرترین کاریگەری لەکەسێتی گەنجدا جێدەهێڵێت.
٣- کایەی پەروەردە بە جۆرێک مامەڵە لەگەڵ گەنجدا بکات وەک ئەوەی تاکێکە دەشێت دنیایەک بەهرەو توانای گرنگی لەناخی خۆیدا حەشاردابێت، کایەی پەروەردە ئەرکی ئاشکرا کردن و بەگەڕخستنی ئەو توانایەیە، نەک تەنیا فێرکردن و مومارەسەکردنی پرەنسیپەکانی پەروەردە.
٤- پێویستە تەمەنی گوێگر بزانرێت گەنج ئامادە نییە هەمیشە کەسێکی گوێگر بێت، ئەویش قسەی هەیە لەسەر شتەکان، هەر کاتێک مامۆستا بواری بە قسەنەدا، ئەوا ئاساییە کە خوێندکار وانەکە تێک بدات و بۆڵە بۆڵ بکات.
٥- سیستمی (غیابات) گۆڕانکارییەکی تێدا بکرێت، با چیتر سیستمێکی عەسکەرتاری نەبێت، دەشێت گەنجێک حەزی لەباسێک نەبێت و بۆی هەبێت نەیەتە ژوورەوە، نەک بە زۆر ئەو شتە بنساخنرێت بەمێشکیدا کە دواجار شتەکانی تریشی لێ تێک دەدات.

**پەراوێزەکان:**

١- هاشم صالح، ئارکیۆلۆژیای زانستە مرۆڤایەتییەکان، وەرگێڕانی شوان ئەحمەد، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ساڵی، (٢٠٠١)
٢- د. عبدالباسط محمد الحسن، اصول البحث الاجتماعي، قاهرة، (١٩٨٢)
٣- الكسندر روشكا، الابداع العام والخاص، ترجمة د. غسان عبدالحي أبو فخر، الكويت، (١٩٨٩).
٤- الإنترنيت، المواقع الدولية المتخصصة للقضايا الإنسانية (الشبابية).
٥- د. محمد سلام محمد غياري، الخدمة الاجتماعية ورعاية الأسرة و الطفولة و الشباب، اسكندرية، طبعة الاولى، سنة، (١٩٨٩).
٦- الكسندر روشكا، نفس المصدر.
٧- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٨- بەختیار عەلی، هەفتەنامەی هاوولاتی، (کێن ئەوانەی دەبنە نەوەیەکی دی) ژمارە (١٠١)، ڕۆژی، (٢٠٠٢/١٢/٣).
٩- الكسندر روشكا، نفس المصدر.
١٠- دەروازەکانی کۆمەڵناسی، نووسینی، مەنو چێهر موحسینی، وەرگێرانی، ڕێبوار سیوەیلی، موسڵح ئیروانی...تاد. دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠٢.
١١- الكسندر روشكا، نفس المصدر.
١٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٣- هەڵکەوت عەبدوڵلا، مێزگرد، گەشەپێدانی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن لەبەردەم پرسیارو ئەگەرەکاندا، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە (٢٨٥٣)، (٢٠٠٢/٩/٣).
١٤- د. عبدالباسط محمد الحسن، هەمان سەرچاوەی پێشوو.
١٥- کۆمەڵگای لێکۆڵینەوە پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانیە، ئەم پەیمانگایە ئەو گەنجانەی تێدا دەخوێنن کە بە حەزو هەڵبژاردن خۆیان پراکتیزەی توانا عەقڵییەکانیان دەکەن، لەم لێکۆڵینەوەیەدا وەک نموونەیەکی باش بەشەکانی ئەم پەیمانگایەمان وەرگرتووە، بەو پێودانگەی وزەیەک هەیە و ئامادەیە بۆ داهێنان، بەلام بەرهەم و دەرەنجامی داهێنەرانە لەنێو کۆمەڵگادا بەکەمی دەبینرێت.



# ئەحمەد هەردی: تا ئێستاش تەئسیری قۆناغی گۆران هەر ماوە

**هەڵپەیڤینی:**
**ئازاد عەبدولواحید**

مامۆستا (ئەحمەد هەردی) ناوێکی درەوشاوەو بەناوودەنگی نێو دنیای شیعری کوردی و بزاڤی ڕۆشنبیریی گەلەکەمانە، کە سیحری ئەو ناوە لە هەموو سەردەم و قۆناغێکدا هەردەمێنێ، ئەوەش نەک لەبەر ئەوەی شاعیرێکی داهێنەرو ڕووناکبیرێکی گەورەی گەلەکەمانە، بگرە لەبەر ئەوەش کە کەسایەتییەکی ڕاستگۆ و قورس و سەنگینی نێو بزاڤی سیاسی نەتەوەکەشمانە و هەردەم ڕێزی لەخۆی و بیروڕایەکانی گرتووە و ڕاستگۆیانە و دوور لە بەرژەوەندیی تەسکی شەخسی داکۆکی لەکێشەی ڕەوای نەتەوەکەی کردووە.

ئەم دەنگە زوڵاڵەی شیعری نوێباوی کوردیمان یەکێکە لەو شاعیرانەی شان بەشانی شاعیرانی وەک شێخ نووری و گۆران توانیویەتی زۆر داهێنەرانە قۆناغی ڕۆمانسییەت لەشیعری کوردیدا بەرجەستە بکا، کە هەرچەندە هاوچەرخی شاعیرانی گەورەش بووبێ، بەڵام هەوڵی داوە لەوان جیاوازتر بێ و شیعرەکانی تاموچێژی تایبەتی خۆیان هەبێ.

کۆ شیعری (ڕازی تەنیایی) کە چاپی یەکەمی لەساڵی (١٩٥٧) دەرچووە تا ئەمڕۆکە وێردی سەرزاری لاوان و ئەڤیندارانە و هونەرمەندانی دەنگخۆش ئەو شیعرانەیان کردووە بە گۆرانی و دڵی ئەو عاشقانەی پێ دەلاوێننەوە.

مامۆستا هەردی ئەگەرچی لەناو بزاڤی نوێخوازی شیعری کوردیدا دەورو پلەو پایە و جێ دەستی دیارە، بەڵام تا ئەمڕۆکەش کە ئەمڕۆیە بەپێی پێویست و بەقەد باڵای شیعرەکانی لەناو ڕەخنەی کوردیدا بەسەر نەکراوەتەوە و لێکۆڵینەوەی لەبارەوە نەکراوە و نەخراوەتە بەر تیشکی ڕەخنەوە. مامۆستا هەردی بێجگە لە شاعیرایەتی، خوێندەوارێکی باشی کوردە و ئەگەرچی کەم دەنووسێ، بەڵام کە دەنووسێ زۆر چاک دەنووسێ، قووڵ و ورد دەنووسێ، حیساب بۆ هەر ڕستەو وشەیەکی خۆی دەکات، هەمیشە ئاشناو هاوڕێیەکی نزیکی کتێبە و لێی جیانابێتەوە، کاتی وا هەبووە لە سلێمانی کە لەماڵەوە سەردانیم دەکرد لەناو جێگە کەوتووەو لەوپەڕی نەخۆشیشدا بووە، کەچی هەواڵی کتێب و سەرچاوەی نوێی لێ پرسیوم و لەسەرپێخەفی نەخۆشییەکەیدا لەخوێندنەوە نەپچڕاوە.

هەردی لەناو بزاڤی سیاسی و کوردایەتیدا پیاوێکی


ئازاد عەبدولواحید، ئەحمەد هەردی

خاوەن هەڵوێست و بیروڕای خۆی بووە و بەدرێژایی ژیانی قەت لە بزاڤی نەتەوەیی میللەتەکەی دانەبڕاوە و هەمیشە باج و سەرانەی هەڵوێستەکانی خۆی داوەو پریشکی ئازارو مەینەتی میللەتەکەی بەرکەوتووە. وەک لەنزیکەوە ئاگادارم دەمێک ساڵیشە بەدانانی کتێبێکەوە خەریکە کە لەبارەی عەرووزەوە نووسیویەتی، داخەکەم تائێستا دەستی لێ بەرنابێ تا لەژیاندایە چاپی بکات.

لەسەردانێکیدا بۆ شاری هەولێر مامۆستا هەردی بە لوتف و وەفای خۆی غەرقی کردم و زەنگی بۆ لێدام و پێی گوتم کە زۆر حەز دەکات ببینێ و بێتە لام، بەڵام لەبەر نەخۆشی و پیری ناتوانێ، لەدووره ولاتیشەوە فەرامۆشی نەکردووم و چ بەنامە یان بە هەواڵپرسین بەسەری کردوومەوە، بۆیە لە ماڵی د. شەفیق قەزاز سەردانم کردو شەوێکی خۆشمان لەگەڵ مامۆستا بەسەر برد بە ئامادەبوونی برایان: [د. شەفیق قەزاز- د. مارف خەزنەدار- د. عەزیز گەردی- ئەمین مەولوود- ئەحمەد سالار- فازڵ سۆرانی- ڕێبین و ئاسۆس هەردی] پاشان بەدەرفەتم زانی هەر لەو ماڵەدا ئەم چاوپێکەوتنەم لەگەڵ ساز کرد کە ئەمەی خوارەوە دەقی چاوپێکەوتنەکەیە:

**رامان:** ئەو هەوڵانەی کەموزۆر تا ئێستا لەبارەی لێکۆڵینەوە لە شیعری کلاسیکی کوردی دراون کە چەند هەوڵێکن بۆ خوێندنەوەی شیعری کلاسیکی، لەلای جەنابت ئەم هەوڵانە چۆن دەکەونەوە؟ لەوانە کامیان بەرچاون و لە شیعری کلاسیکی کوردی نزیک بووەتەوە؟

**ئەحمەد هەردی:** بەلای منەوە شیعری شاعیرانی وەک نالی و سالم و کوردی و لە بادینانیش مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و هاوەڵانیان پێویستە لەسەر هەر کەسێ کە خەریکی شیعرو ئەدەبیات بێت شارەزای ئەمانە بێت، ئەگەرنا دەست لەکاروباری شیعر وەرنەدا باشترە، شەخسی خۆم یەکەمجار کە دیوانی (نالی)م بەرچاوکەوت، چووم بەچوار عانە کریم، کە ئەوکاتە ئێزرەمێک یەک کیلۆ گۆشتی دەکرد، ئەوەی کوردی مەریوانی هەر ئەو هەبوو، بەبیرم دێ کە دەچوومە سەفەر ئەو دیوانەم دەخستە باخەڵمەوە، جارێکیان هاتمە هەولێر لە گیرفانمدا بوو، شیعری (نالی) زۆر ڕەوان و خۆشە، ئەوەی تێی ناگات دەتوانێ پرسیار بکات کە من خۆم وام دەکرد، کەسی واش نەبوو لێی بپرسم، خزم و کەسی ئێمە کەسی وایان تیانەبوو کە لە شیعری کۆن شارەزا بێت، باوکم نەبێ کە هاوەڵی کۆمەڵێ خوێنەواری ئەوسا بوو و زاکیرەشی باش بوو، گەلێ شیعری ئەزبەر بوو، بەرگدروو بوو لەسەر کارکردن و لەبەر خۆیەوە هەندێ مەقامی دەوت، ئێستاش بە بیرم دێ شیعری فارسیشی ئەزبەر بوو، هەرچەندە نەخوێندەواریش بوو، ئەو شیعرە فارسییانەی لەوم بیستووە، بەلامەوە سەیر بوو، دەیووت هاوڕێی خوێندەوارم هەبوو لە مەجلیس کە دادەنیشتن گوێم لێ دەگرتن و دەیانزانم.

**رامان:** شیعری نالی هەیە لەوانەیە بە پرسیار یەک تەفسیری بداتێ، بەڵام قابیلی ئەوەیە شیعرێ یان دوو سێ دێڕی شیعرێ بەدووسێ باردا لێک بدرێتەوە؟

**ئەحمەد هەردی:** بۆ شیعر خوێندنەوە بە چەند جۆرێ هەیە، بە نموونە تەشبیە ئایا ئەوە لەکوێوە هاتووە، لەبیرمە جارێکیان لە گرووپێکم پرسی:

**مونەجیم کەرگەش و لاشەی لەکن کێی کە نەیزانی**
**کە ئەم ئەفلاکە چەند لاکە کە ئەم گەردوونە چەند دوونە**

باشە ئەبێ مەبەستی چی بێ، مونەجیم تەشبیهە بە کەرگەش کە بەسەر لاک و ئەوانەوە دەنیشێتەوە، «لاشەی» لێرەدا تەوریە هەیە، واتە وشەکە دوو مانای هەیە، لاشەی تۆپیو یان لاشەی عەرەبی کە مانای نییە، ئەم ئەفلاکە چەند لاکە خۆی بۆگەنە... تاد ئەم جۆرە بابەتانە لە شیعری نالیدا زۆرن.

شیعری ڕەوانیشی هەیە کە پێویستی بە شیتەڵی وا نییە بۆ نموونە:

**لاو لاوە کە لەولاوە بە ئەولاوە کشاوە**
**یا یاسەمەنی خاوە لە ڕووی ڕۆژا ڕواوە**

ئەمە بەزوڵف و ڕوومەت دەڵێت، ئەمەیان ڕوونە:

**بۆچی نەگریم سەد کەرەتم دڵ دەشکێنی**
**مەی بۆ نەڕژێ شووشە لەسەد لاوەشکاوە**

بەڵام ئەو جۆرە شیعرانە کە بەدوایدا دەگەڕام کەسی وا نەبوو بیزانێ و بۆمی شی بکاتەوە. بەبیرم دێ ساڵێکیان کە وەزعی ئابووریمان باش نەبوو، هاوین بوو، خزمێکمان هەبوو ئەندازیاری ئەشغال بوو، باوکم وتی دەبێ ئەمەم بۆ دوور بخەیتەوە، چونکە سلێمانی ئەو زەمانە هەمیشە ئاشووبی تێدا بوو، منداڵی ئەو زەمانە هەمیشە جۆرەها بەیاناتیان بەسەر دیوارەکانی سەرادا دادەکوتا، پۆلیس دەکەوتنە قوتابی گرتن، وەزعەکە شلۆق بوو، ئەو دەمە بۆ ئەوەی دوورم بخاتەوە وتی دەبێ بچی بۆ ئەو شوێنەی جادەیان لێ دەکرد، دیوانەکەم بردو خستمە گیرفانمەوە،

ئەو زەمانەش کە حکومەت جادەیان لێدەدا پارەی زۆریان دەڕشت، چونکە عەشایەرو ئەمانە نەیاندەهێشت ئەم ڕێگایانە بکرێنەوە و بەخەتەریان دەزانی، بۆ نموونە ئەو ڕێگەی هاملتۆنە هەر وا کراوە، باوکم ناردمی بۆ ئەو ناوە و ویستی لەسلێمانی دوورم بخاتەوە، دیوانی نالیم خستە گیرفانمەوە، ڕێکەوت ئەو شەوە، جادەکە لەسەرەتای پشدەرەوە دەکرا لەماوەت و ئەو ناوەوە، زۆربەی عەشایەری کورد لەژێر دەستی میری بوون، بەڵام پشدەر تا ئەم دواییەش تا سییەکانیش وەک قەڵایەک بوو، شەوێک ئەندازیارەکە جەماعەتێکی دەعوەت کرد، مامۆستایەکی خۆمی بەناوی ساڵح سەعید تێدا بوو خوا عافوی بکات، مرۆڤێکی زۆر خوێنەوارو زیرەک بوو، ئینگلیزی چاکی دەزانی، زۆر سەرخۆش بوو لەناو ئەواندا شێخ کەریمی دوکان هەبوو برای گەورەی سەید نووری بابە ڕەسووڵ ئەوسا موڵکی لەدەوروبەری دوکان هەبوو، چاوی بەمن کەوت وتی ئەوە چییە بەدەستتەوە، وتم ئەوە دیوانی (نالی)یە، وتی لێی تێدەگەیت؟ وتم نەوەڵڵا لە هەندێکی تێناگەم، لەدەستی وەرگرتم و دەستی کرد بە لێدوان لەبارەیەوە، پێم سەیر بوو پیاوێکی عەشایەری خاوەن موڵک ئاوا شەرحی شیعر بکات، لە هەر شیعرێ لەو شیعرانە وشەیەک کە دوو مانا دەبەخشێ یان جیناسێکی شرۆڤە دەکرد، من ئەوسا لەسەرەتایی بووم، کە دوایی لەئامادەیی تەوریە و جیناس و ئەمانە دەخوێنرا، هەندێ لەو شیعرانەی بۆ ڕوون کردمەوە، زۆر عاشقی ئەو شیعرانە بووم، مانای ئەو شیعرانە ئاوها بە پرسیار فێر بووم.

**ڕامان:** بۆ شاعیرێکی لاوی ئەمڕۆکە (نالی) چەند پێویستە؟

**ئەحمەد هەردی:** گەنجێ خەریکی شیعری کوردی بێ، گرنگە شارەزای شیعری نالی بێت، بێ ئاگایی لە شیعری کلاسیک هۆی ئەوەیە شیعری هیچ و پووچ دەنووسن، لەناو گەنجەکاندا شیعری چاکیش هەیە من خۆم ماوەیەکی زۆر شتێکم لە دڵدا بوو بیکەمە چامەیەک، هەرچەندم کرد نەمتوانی، ڕۆژێ لەگۆڤاری (کاروان) کوڕێک وەک ئەو فیکرەیەی منی بە شیعری ئسلووبی تازە بەجوانی وتووە، بێ ئەوەی ئاگاداری یەکتر بین.

**ڕامان:** پێت وا نییە ڕەخنە هۆکارێ بێ کە شیعری کلاسیک خەڵک لێی نزیک نابنەوە، ڕەخنەکاران هەوڵیان نەداوە شیعری کلاسیکی کوردی حەقی خۆی پێ بدەن و لای لێ بکەنەوە، تا ئێستا دیوانی شاعیرانی گەورەی وەک سالم و شێخ ڕەزا بەتەحقیق کراوی لەبەردەستی خوێنەراندا نییە، مەبەستم لەو خوێندنەوانە ئەوەیە کەموکورتی لە خوێنەر خۆیەتی کە نایانەوێ لە دنیای ئەو شاعیرانە نزیک بینەوە، کەموکورتی دووەمیش لە ڕەخنەگرانە کە زۆرجار هەوڵیان نەداوە بینە پردێ لەنێوان خوێنەران و ئەو شاعیرانە تا چێژ لەو شیعرانە وەربگرن؟

**ئەحمەد هەردی:** تۆ تەماشای شیعرێکی سادەی مەحوی بکە کە کراوەتە گۆرانی

**لەڕێی ئەو شۆخەیدا خۆم کردە خاک پێی پیا نەنام جارێ**
**دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چیبکەم**

ئەگەر بە باشی لەم شیعرە ورد نەبیتەوە نازانی چی وتووە کە خۆی زۆر سادەو ڕەوان دێتە بەرچاو، هەندێ دەڵێن ئینجا ئەمە چییە؟ بەڵام ئەمە فکری تێدایە، جێگەیەکی بەر نەکەوتووە لەو خۆڵەی کە ئەو پێی پیادەنێ، ئەگەر خاکی عالەم بکا بەسەریا جێگە پێی ئەوی هەر پێوەیە، ئەم وردییە کەسێ شەرحی نەکردووە، ئەمە یەک بەیتە، دەڵێ دەمەوێ ئەو خۆڵە هیچ نەبێ ئەگەر قاچی ئەو بەر سەرم نەکەوێ پێم بەسەرا نەنێ هیچ نەبێ ئەو خۆڵەی کە ئەو پێی پیا نەناوە بیکەم بەسەرما، ئەمە زۆر سادەو ئاسانە، کەچی مانای قووڵی هەیە، زۆربەی شیعری کلاسیکی کۆن شتی وای تێدایە، ئەگەر ئەو شیعرە کلاسیکیانەم نەخوێندبایەوە شیعرەکانی من هیچ وپووچ دەبوون، چونکە مەعقوول نییە کوردێ هەموو ئەدەبییاتی بریتی بێ لە ئەحمەدی خانی و نالی و نەیخوێنێتەوە و تێی نەگات، دەبێ لەگەڵیدا هەڵچێ، ئەو شیعرانە مانای قووڵیان تێدایە، ئەمە تەنیا تەفاعیل ڕێکخستن نییە، هەندێ کەس هەوڵیان داوە ئەم ئەدەبە لە خەڵک نزیک بخەنەوە لەوانە مەلا کەریمی بیارە باوکی حەمەی مەلا کەریم کاری باشی کردووە کە خۆی و کوڕەکانی (دیوانی نالی)یان ساغ کردۆتەوە، ئەمان خستوویانەتە سەر زمانێکی کوردی ڕەوان و ئاسان، هەروەها مامۆستا مەسعوود محەمەد شتێکی وای کردووە لەوان بترازێ کەسی تر شک نابەم کاری شرۆڤەکارییان کردبێ..

**ڕامان:** لەزانکۆش لە بەشی ئەدەبیات نەیانتوانیوە ئەو ئەدەبە بەرزو ڕاقییە بەو شێوەیەی پێویستە بەقوتابیان بگەیەنن تا لە نووسیندا عەکسی بکەنەوە؟

**ئەحمەد هەردی:** ئەوە کەسێکی دەوێ عاشقی نالی بێ و دیوانەکەی لەگیرفاندا بێ و بیگێڕێ و لە خەڵک بپرسێ و خۆیشی لەگەڵیدا بەگۆرانی بیڵێ من وام دەکرد، وەختێ خۆی لە تیپی سروودا بووم.

**ڕامان:** زۆر کەس پێی وایە ڕۆمانسیەت لەشیعردا باوی نەماوە، جەنابیشت وەک یەکێک لە نوێنەرانی سەرکەوتووی ئەو ڕێبازە کە کۆمەڵێ نموونەی جوانی شیعری ڕۆمانتیکیت نووسیوە، بۆ ئەم قسەیە ڕاوبۆچوونت چییە؟

**ئەحمەد هەردی:** ڕۆمانسییەت و ڕۆمانتیکی وەک فیکرە هیچ کەسێ لەلای ئێمە باسی نەکردووە، ئەو ڕۆمانسییەتە بە قەستی دەستمان نەداوەتێ، هەر بە تەئسیری کەسانی تر ئەوەمان کردووە، ئەدەبیاتی

مەهجەری وەک: (جوبران خەلیل جوبران)م خوێندۆتەوە، هەندێ شیعریم لەبەرە، ئیلیا ئەبوو مازی، جەبران و میخائیل نوعەیمە و ئەمانەم خوێندۆتەوە و تەئسیریان تێکردووم، ئیتر نەمزانیوە ڕۆمانسیەت وەک فیکرە چییە، بینیومە لە ئینگلیزی و فەرەنسی بە تەرجەمە شەرحی کراوە، ئینجا زانیومە ئەمە مەزهەبە، واتە پێش ئەوەی بزانم ڕۆمانتیکیەت تەئسیری لەو شاعیرانە کردووە، کە هەمان خۆشەویستی بینیوە و هەمان شیعری وتووە..

**رامــان:** لەو کتێبەی «محەممەد غونیمی هیلال» دەڵێ سەدو پەنجا پێناسە بۆ ڕۆمانسییەت هەیە؟

**ئەحمەد هەردی:** ئێستاش ئەو کتێبەم هەیە، گەلێ شتی تێدایە، پێویستە مرۆڤێ حەز لەئەدەب دەکات بیزانێ، وەڵڵا ڕۆمانسییەت باوی نەماوە یان نا ئەوە شتێ نییە بە قسە بێ.

## چاکترین شیعر ئەوەیە بتوانێ خوێنەر بهەژێنێ، ئیتر بە چ قوتابخانەیەک دەیڵێ ئەوە بە لامەوە گرنگ نییە

**رامــان:** ئەگەر دوو شاعیری کلاسیکی کوردی بێنی بەراوردی بکەی لەگەڵ شاعیرێکی ڕۆژئاوا، کام شاعیری کلاسیک بەرانبەر شاعیری ئەوروپا دادەنێی، هەر لە مەولەوی یان نالی و مەحوی؟

**ئەحمەد هەردی:** زۆر شارەزای شاعیرانی ئەوروپایی نیم، چەند شیعرێکم تەرجەمە کردووە وەک: (کە جۆگە تێکەڵی چەم بێ و چەمیش تێکەڵ بەدەریا بێ شەماڵیش پڕ ئەشکی بێ.. تاد). بەقانونی خوا ئەشیا دەبێ تێکەڵ بەیەکتر بن، ئیتر بۆچی من و تۆ تێکەڵ بەیەکتر نەبین.. نابێ ئەمە فیکرەیەکی ئەورووپییە، لەزمانی خۆیان نەمدیوە چۆنە، من لە عەرەبییەوە تەرجەمەم کردووە، وابزانم سەرکەوتوو بووم تیایا، چونکە (ئیبراهیم ئەحمەد) لە ئینگلیزییەوە بە پەخشان کردبووی بە کوردی لە گەلاوێژدا بڵاوی کردبووەوە وتی زۆر جوانت کردووە، ڕۆژێکیان لەڕێی سەرچیمەن تووشم بوو، ئەوسا پارێزەر بوو، جانتایەکی بەدەستەوە بوو، وەستا وتی توخوا ڕاوەستە تۆ شیعرێکی (شیللی)ت تەرجەمە کردووە بۆم بخوێنەوە، پاشان وتی بە خەتی خۆت بۆم بنووسەرەوە، ئینجا ناردی بۆ گۆڤاری گەلاوێژ. وتی تۆ ئەو تەرجەمە چاکەی ئەو شاعیرەت بەشیعر کردووە عەرووزیشە، ئەو

زەمانە من نەعرووزم زانیوە نە ئەحمەدی فەراهیدیم ناسیوە، ئەوسا شیعری شاعیرانی کلاسیکم زۆر ئەزبەر بووە، بیرم دێ ئاوازی سروودێ کە مامۆستا دەیوت یەکسەر منی هەڵدەستاند، دەیوت بیڵێرەوە وەک ئەو دەموتەوە، ئەو ئەوزانانەم دەوت بێ ئەوەی بزانم ناویان چییە، کە گەورە بووم زانیم وەزنەکە ناوی ئەوەیە و لەم تەفعیلانە پەیدا دەبێ، لە شەستەکان لێی تێگەیشتم..

**رامــــان:** وتت ئەو لاوانە لەبەر ئەوەی لەشیعری کلاسیک ئاگادار نین و شیعرەکانیانت بەدڵ نەبوو، بەبۆچوونی خۆت شاعیری شاعیر کێیە کە بەدڵت بێ، مواسەفاتی چییە؟

**ئەحمەد هەردی:** هەر شیعرێ بتوانێ کار بکاتە سەر مرۆڤ، زمانی جوان و تەفعیلە و ئەوزانی جوان بێ، خۆ ئەگەر هەمووی بەیەکەوە بێ باشە، ئەوەی گوێیی بە شیعری عەرووزی ڕاهاتبێ ئەو شیعرانەی لا خۆش نییە، چونکە ئەو گونجانەی لە عەرووزدا هەیە جۆرێکە، ئەمەی لە هیجا هەیە جۆرێکی ترە، ئەگەر شارەزای عەرووز بی، تێ دەگەیت ئەو کابرایە بلیمەت بووە، مادام عەرەب بووە نابێ تەرجەمەی بکەین، ئێستا ئیسپات بووە کە لە بەسرە ژیاوە و هیندی زۆر لەو ناوە هەبوون، شتێک لە هیندی زانیوە، ڤێگا و مێگا هەیە لە ئەدەبیاتی کۆنی هیندی ئەوانەشی بۆ خۆی بردووەو ئەو ئەوزانانەی وەرگرتووە و تەرکیبەی عەرووزی داناوە، جگە لەوە ئێمە ئەگەر ئەو عەرووزە هەر خەسڵەتی زمانی عەرەبی هەبوایە لە شیعری کوردیدا دەوامی نەدەکێشا، لە مەلای جزیری دەوامی کردووە تا ئێستا، شیعرێ یان سیستمێ چوارسەد ساڵ دەوام بکات و شتی لەسەر بووترێ ئەمە وەرگرتن نییە لە خەڵک، با وەرگرتنیش بێ، ئەوەی شارەزای عەرووز بێ دەزانێ ئەو تەفعیلاتەی لە شیعری کوردیدایە ئەوانە نییە کە لە شیعری عەرەبیدایە، چونکە نزیکترە لە هی فارس.

**رامــان:** ئەگەر بە کورتی باسی چاوگەکانی ڕۆشنبیری خۆتمان بۆ بکەیت، یان دەربارەی فەلسەفەو فیکرو ئیستێتیکاو هەستی جوانی لە ئەدەبدا، چیت خوێندوونەتەوە، چ کتێبێ ڕێچکەی ئەدەبی تۆی گۆڕیوە؟

**ئەحمەد هەردی:** بەکورتی ئەو وەختەی کە وتم دیوانی (نالی)م لەگیرفاندا بووە، ئەدەبی کلاسیکی خۆمان کاری تێکردبووم لە (نالی) و (سالم) کە شان بەشانی ئەمان شاعیرانی تریش هەبوون لەوانە: حەمدی و پیرەمێردو ئەحمەد موختارو ناری و گەلێ لەو شاعیرانە، ئەمانەش زۆرتری (نەجمەدین مەلا) و پیرەمێردمان هەبوو کە ڕۆژنامەی (ژین)ی دەردەکرد، کە زۆربەی شتەکان خۆی دەینووسین، ڕۆژنامەکەی هەفتانە بوو، جۆرەها شتی دەنووسی، یاداشتی خۆی تێکەڵ دەکرد و شیعری شاعیرانی کۆنی دەنووسییەوە، شاعیرانی تر وەک شێخ نووری و فایەق بێکەس و زێوەر شیعریان بۆ دەنارد،

ئەمانە سەرچاوەیەک بوون، دوای ئەوە سەرچاوەیەکی تر (نەجمەدین مەلا) هەبوو، لە حوجرەیەکدا پیاوێکی سەڵت و تەنیا بوو، بە هاوینان قوتابیان دەچوونە لای و شتیان دەخوێندەوە و شیعری بە پارە بۆ خەڵک دەنووسییەوە، دیوانی (حەمدی)مان لەبەردەست بوو، ئەو پیاوە تاقەتی عەجایەبی هەبوو لەو ژوورە گەرمەدا ئەو دیوانانەی دەنووسییەوە، بەگران دەیدا، توانای کڕینیانم نەبوو، دیوانی پیرەمێرد یان حەمدی (٣٠٠-٤٠٠) پەڕەی گەورەبوو کە هەمووی دەنووسییەوە، داوای زۆری لێدەکرد دەیوت (١٠ دینار) ئەوەی دەوڵەمەند بووایە دەیکڕی، بە ئێمەشی دەدا بە دینارێک برادەرێکم هەبوو وابزانم هاندانی باوکی بوو کە ئەفسەری زەمانی تورک و شتی وابوو ئەو دیوانانەی دەسخەتی نەجمەدین مەلای هەبوو، ئیتر کەشکۆڵی ئەو بوو، دەسخەتی خەیامی هەبوو هی فارسی هەبوو، ئەمەش لەلایەک سەرچاوەیەک بوو، ئینجا دوای ئەوە کە قوتابی بووم، چوومە بەغداو فێری عەرەبی بووم و چیرۆکەکانی (الف لیلة و لیلة)م بە پێنج فلس و دەفلس دەکڕین، ئەمەی ئێستا لەخۆرئاوا کراون بە فیلم دەمخوێندنەوە دەماودەم دەهاتن، تا فێری عەرەبی بووم کەوتمە خوێندنەوەی شاعیرانی مەهجەرو ئەوانە، لەپێشدا (غربال)ی میخائیل نەعیمە کاریگەریی لەسەرم هەبوو، ئیتر بۆ شیعرو شتی وا (یادگاری لاوان و دیاری لاوان) کە لەسییەکان دەرچوو کە (ئیبراهیم ئەحمەد)و (شاکر فەتاح) و (حامید فەرەج) و ئەم جەماعەتە دەریان کرد کە لە ڕووی کوردییەوە ڕەوان بوو، ئەوەشم لە ڕێی ئەو کوڕەوە دەس کەوت لەپێشدا من (غربال)م خوێندەوە، ئیبراهیم ئەحمەد یەکێ لەوانەی کردووە بەکوردی کە ئیقتباسە لەوەوە، بەڵام کوردییەکەی لەگەڵ کوردی (نالی) جیاوازە عاشقی کوردییەکەی بووم، لەپاشدا زانیم هی ئیبراهیم ئەحمەدە، چونکە بەناوی خۆی نەیدەنووسی، لەمیسر گرووپێ هەبوون، عەقادو مازنی و شوکری و ئەمانە سێکوچکەیەک بوون، ئەوسا شەوقی و حافز کێوێ بوون، ئەمان ڕەخنەیان لەوان دەگرت، ئەو ڕەخنەیەی کە عەققادو ئەوانە دەیانگرت ئەوە ڕەخنەیە، عەقاد مامۆستای یەکەمیانە، ئەو لەگەڵ مستەفا سادق ڕافعی دەنگیان لە گۆڤاری (الرسالة) تێکەڵ بوو هەریەکە و کتێبێکیان لەسەر یەکتر داناوە و ئەمانەم خوێندۆتەوە و بە زۆری سەرچاوەکانی ئەوسای ئێمە بوون گۆڤاری (الرسالة)ی ئەحمەد حەسەن زەیات لەمیسر دەردەچوو، ئەم سێیانەی کە وتم بە ئیزافەی تەها حوسێن و تۆفیق حەکیم و تەیموورو مەیموورییەکان هەموو تیایاندا دەنووسی، من یەکێ بووم لەوانەی کە هەموو ژمارەیەکی کە دەهات دەمانکڕی، بەتایبەت تەماشای وەڵامدانەوەکانیانم دەکرد کە هی یەکتریان دەدایەوە..

**ڕامان:** لەڕووی فیکری و سیاسییەوە کێی تر هەبوو کە سەرچاوەی ڕۆشنبیریت بووبن؟

**ئەحمەد هەردی:** لەپێشدا هەر شانامەم دەخوێندەوە، عەشقی شیعری خەییام بووم کە سێ چوار عەرەب تەرجەمەیان کردووە «ئەحمەد حامید سەڕاف» لەمیسر کردوویە، ئەحمەد ڕامی لە ئینگلیزی کردوویەتی بە عەرەبی کە سێ لە فارسییەوە کردوویەتی بەناوی (ئەحمەد سافی ئەلنەجەفی) لە هەموویان چاکتری کردووە، زمانی عەرەبی و فارسی، زمانی سامی و ئاری دوورن لەیەکترەوە کەچی زۆر چاکی دەرهێناوە، سەردەمێ عاشقی خەیام بووم، هەر کەسێ تەرجەمەی بکردایە دەمخوێندەوە، هەندێک لە شیعری شاعیرانی گەنجم تەرجەمە کردبوو، ئینجا مەسەلەی فیکری و فەلسەفی و ئەمانەش، من لە گۆڤاری ڕیسالەوە کە کۆمەڵێ نووسەری چاکی ئەو زەمانە تێیدا دەیاننووسی وەک عەققادو تەها حوسێن و ئەحمەد ئەمین و تۆفیق حەکیم و ئەحمەد حەسەن ئەلزەیات کە خاوەنی گۆڤارەکە بوو، هەموو مانگێ دەردەچوو دەچووم لە (سوق السراي) دەمکڕی، ئینجا دەکەوتمە تەعقیبی ئەمانە تا بزانم چییان هەیە، هەرچی کتێبیان هەبوو دەمکڕین، عەقاد (سارە)ی هەبوو کە زۆرتر چیرۆک بوو، لەپاش ئەوە کۆمەڵێ ڕەخنەی هەبوو بەناوی (ساعات بين الكتب)، کتێبە بەناوبانگەکانی ئەو زەمانە کە ڕەخنەی لێدەگرتن، ئینجا (ئەحمەد ئەمین) گەڕام کە «ضحى الأسلام» و «فجر الأسلام»ی چاپ کردبوو، «مازنی» مێژووی ژیانی خۆی هەبوو لەشکڵی چیرۆکێکدا، ئەوەشم خوێندەوە، دوای ئەوە هەر لەسەر ڕای ڕەفائیل بووم کە موتەئەسیر بوو بە (لامارتین) کە ئەویش ژیانی خۆیەتی، لەسەرەتاکەیدا دەڵێ ڕۆژێکیان لە (لامارتین) یان پرسی تۆ حزبی چەپ و ناوەندو ڕاست و ئەمانە کامیانی، وتی من لەسەرووی ئەوانم، من زۆر گوێم نەدایە سیاسەت، منیش سیاسەتم هەر لەسەرەتای ژیانمدا کردووە، مەبەستم لەوەیە تەنیا ئەوە نەبوو گوتارێکی لە «رسالة» بخوێنمەوە، **دەگەڕام بەدوایدا ئەو کابرایە چەند کتێبی هەیە، بۆ نموونە (تۆفیق ئەلحەکیم)** ئەگەرچی چیرۆک و ڕۆمانی دەنووسی **بەناوی** شەهرەزاد و ئەمانە هەموویم بە خەڵک داو فەوتان، بەدوای کتێبەکانیان دەگەڕام، ماوەیەک لە هەولێر هاوڕێیەکم هەبوو بەناوی (جەلیل هوشیار) برای بچکۆلەی (عەونی یووسف) بوو، ئەوسا هەمیشە بەیەکەوە بووین، ڕۆژێک تووشی کوڕێکی باریکی درێژ بووم بەناوی (ساڵح حەیدەری) تێی گەیاندم کە ئەوانە مارکسین، وتم لەو بابەتە هیچت هەیە، کتێبێکی بۆ هێنام لێی نووسرا بوو «تعاليم ماركسية» و «ماهي الشيوعية» و «جواب هي معرفة تحرر شروط البروليتاريا» ئەوەی کە کاری خۆی بە سەرمایەداری دەفرۆشێت، ئینجا «ماهي الراسمالية» بەو شێوەیە، یەکەم جار بوو کە کتێبێکی مارکسی بخوێنمەوە کە هی

سالح حەیدەری بوو تا دوایی هەندێ هاوڕێم هەبوون خۆشم دەویستن لە ڕێی ئەوانەوە لەسلێمانی مارکسیەتم ناسی لەوانە نووری مەلا حەمە ئاغا و حەسیب شێخ ئەحمەد و ئەمانە تازە شانەیان دروست کردبوو، کەمتر دەیانخوێندو زۆرتر خەریکی سیاسەت بوون، هەوڵیان دا لە سلێمانی بزاڤێکی مارکسی دروست بکەن، ئەوەی ئێمە پێی دەڵێین «ڕێی ڕاست» ئەمە ئەوە نییە کە نووری شاوەیس لە یاداشتەکانیدا باسی دەکات، ئەمە ڕێکوپێکترو نهێنی تر بوو، لەوە نەبوو خەڵک بیانناسێ، لە کاتێکدا ئەوان شەڕە جنێویان دەکردو دەچوون بەگژیەکدا، جەماعەتی سەر بەخەتی ئەو کە پارتیش نەبوو لە دواییدا دامەزرا کە «ژێ کاف» نەما یان لەسەرەتادا بوو کە (مەلا مستەفای بارزانی) خوای لێ خۆش بێ لە سابلاغ بوو، لەوێوە هەواڵی بۆ هەمزە عەبدوڵلا ناردەوە، ئەوانیش کۆمەڵێ شانەیان دروست کردبوو کە لەپاشان پارتی لێ دروست بوو، ئەو (ڕێی ڕاستە)ی ئەوان بە ئاشکرا هەمووی یەکتریان دەناسی، بەڵام ئەمانە نهێنی بوون، هەر تەئسیری ڕەفیقایەتی ئەوان بوو کە من چوومە سەر ئەو فکرەیە، ئەو وەختە کتێب بەنهێنی هەبوو دەستی هەموو کەس نەدەکەوت، دوای ئەوە لە ساڵی (١٩٤٥) لەدوای خیتابی وەسی کە ئازادی ئەحزابی ڕاگەیاند کە لەگەڵ بارودۆخی جیهانیدا بێ، پێنج حزبی ئاشکرا پەیدا بوون، کامل چادرچی حزبی دیموکراتی و عەزیز شەریف حزبی شەعب و عەبدولفەتاح ئیبراهیم حزبێکی تری هەبوو، هەروەها ئیستقلالییەکان و حزبێکی تریش هەبوو لیبرالی بوو کابرایەکی تر بوو بەناوی سەعەد سالح سکرتێر بوو، نائبی مەجلیس بوو مرۆڤێکی زمان درێژی وریا بوو کە «صوت الأحرار» یان لەحزبی «أحرار» دەرکرد، ئەو پێنج حزبە لەو ساڵانە کە ساڵانی سەربەستی بوو لە عێراقدا زۆریان مارکسی بوون، لەمووسڵ لەو ساڵانەی گۆڤاری «المجلة» یان دەردەکرد کە هی (عەبدولحەق فازڵ) بوو، گرووپێکی هەبوو لەدەوری کۆببووبوونەوە و شتیان دەنووسی، ئەمە جگە لەوانەی عێراق لەو بارودۆخەدا هەندێ گۆڤاری مارکسی بەناوبانگ هەبوو لەوانە (الغد) لەفەلەستینەوە دەهات هی حزبی تەحەروری فەلەستینی بوو، فەرەنسی زانی باشی تێدابوو، ئەو گۆڤارانەم لەپارەی خۆم دەکڕی کە ئەوسا موعەلیم بووم، لەلوبنان جەماعەتی عومەر فاخووری «طريق» یان دەردەکرد، لەمیسر ئەو گۆڤارانەی کە دەهاتن ئەوانیشم دەکڕی، مرۆڤی ڕۆشنبیریان تێدابوو بەتایبەت گۆڤاری «الغد» نووسەری باشی تێدا بوو، شیوعیەکانی لای خۆمان پێیان ناخۆش بوو، ئەمان پێیان وابوو دەبێ تەنیا باس لە فەهەد بکرێت، من دەموت کاکە وانابێ.. کابرایەک هەبوو لە «الغد» جوان دەینووسی، من ئاوا تووشی مارکسیەت بووم، ئەمانە پەیتا پەیتا کتێبیان لەسەر بارودۆخی ئابووری و سیاسی و خۆرهەڵاتی ناوەند لە چاپ دەدا، کتێبەکانیشم دەخوێندەوە، هەر بۆیە لەڕێی ڕاست دەیانوت پیاوی چاک بە شتێکمان بۆ بنووسە بۆ شانەکان دەیخوێنینەوە، ئەو زەمانە کار هەمووی نهێنی بوو، بەڵام من ئەوانەم کە دەخوێندەوە لە هەندێ مەسائیلدا شارەزاتر بووم، زۆرجار شتم دەنووسییەوە، لەزەمانی ئەنوەری مەلا حەمە ئاغا بەرپرسمان بوو، ئەو دەورە وابوو، دوای ئەوە فەلسەفەی یۆنان و ئەمانەشم دەخوێندەوە، من باش لەگەڵ مارکسییەتدا نەدەگونجام، ئەمانە هەموو شتێکە کە ئەو فکرانەم لێ وەرگرتن.

**ڕامان:** قۆناغی گۆران ماوە یان نەماوە؟

**ئەحمەد هەردی:** لام وایە ماوە و تەئسیری هەر هەیە، چاکترین شاعیری ئەو قۆناغەیە، من سەردەمێک لەگۆرانەوە نزیک بووم، ماڵیان لەتەنیشت ماڵمان بوو، هاتوچۆمان هەبوو، لەیادمە ڕۆژێکیان کتێبێکی دامێ وتی پیاوی چاک بە ئەمەم بۆ بنووسەرەوە، چونکە من بۆم نانووسرێتەوە، بەداخەوە کە بۆم نووسییەوە بەسەریدا ڕۆیی بۆ «شرق أدنى» وەک بێژەر لەگەڵ «ڕەفیق چالاک و ڕەمزی قەزاز» چوون، ئیتر ئاگام لێی برا، لەبیرمە خۆی لەدیوانەکەشدا دەیڵێ، ڕۆژێکیان قادر دیلان پێی وتم شیعری شانۆییمان نییە، وتی منیش بڕیارم دا داستانێکی گەورە بە شیعر بۆ شانۆ دانێم، بەڵام من چاوەڕوانی ئەوە بووم قادر دیلان ئاوازی بۆ دابنێ ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیی، وەڵڵایی نەمتوانی هیچی بۆ دانێم و ساردی کردمەوە، من بڕوام وایە ئەگەر ئەوەی بکردایە و «قادر دیلان» نەبوایە شتێکی باشی دەکرد، ئەو پێی وتبوو ئەفسانەکەی (کاوەی ئاسنگەر)م بۆ دابنێ، ئەگەر گۆران ئەوەی دابنایە، ئەفسانەکە هەموو کەسێ دەیزانێ، بەڵام شاعیرێ چۆنی دەخوێنێتەوە ئەمە هەم شانۆ بوو هەم وەک ئەوەی فیردەوسی دایبنایە قیمەتێ بوو، بەداخەوە ئەمە قادر دیلان پێی تەواو نەکرد.

**ڕامان:** پێت خۆشە کە باس لەو قۆناغە دەکرێت لەگەڵ گۆران باس بکرێت، یان وەچەی دوای گۆران و ئیمتدادی گۆران؟

**ئەحمەد هەردی:** شیعرەکانی من جۆرێکی ترن، وەک تایبەتمەندیی شیعریی من جیاوازم لەو.

**ڕامان:** ئەگەر خۆت وەک ڕەخنەگرێ حیساب بکەی و چاپی یەکەمی ڕازی تەنیایی بەچاپی دووەمی بەراورد بکەیت، چۆنی دەبینی؟ پێت وایە بەچاپی دووەم ئیزافەت لەسەر چاپی یەکەم کردبێ؟

**ئەحمەد هەردی:** من ئەگەر باست بۆ بکەم چاپی یەکەمەکە چۆنە خۆی دەری دەخات، ئەوسا کە مامۆستا بووم، (مەحموود تۆفیق) لەپەروەردەی سلێمانی ژمێریار بوو، سەری مانگان سلفەیەکی بۆ دەکردم بۆی کۆ دەکردمەوە، منیش نەمدەزانی، تەماشا دەکەم دیوانێکی

بچکۆلەی کۆکردووەتەوە، وتی دەمەوێ شیعرەکانت چاپ
بکەم وتم نابێ! وتی نابێ چییە، مەحموود وتی هەموویم
پاراستووەو چاپیشی دەکەین، وتم چۆنی دەکەن من ئەو
شیعرانەم تەواو نەکردووە، وتی تۆ تەواوی دەکەی یان نا
لەسەر تۆ ناوەستم، دەبوایە مەنعم بکردنایە، وەلحاسڵ
چاپیان کرد،کە کردیان من کەوتمە بەر نەمری واقیع،
هەرچی دەیخوێنددوە دەیوت ئەمە بۆچی تەواو نەکراوە،
لە ئاخیردا تەواوم کرد، هەندێکی هەر تەواو نەکراوە
ئەوەی دواییان کە دەڵێ:

**کە جامت خستە سەر لێوت غەشیمانە**
**ئەگەر ژەهریشی تیابوو گوناحی خۆتە بیزانە**

تاقەتم نەبوو تەواویان بکەم، نازانم جیاوازی چییە،
هی وا هەیە دەڵێ بە نەفەسێ تەواو کراوە وەک عەلی
حوسێن بەگ، ئەگەر کەسێ بڵێ بەم نەفەسە تەواو
نەکراوە کەیفی خۆیانە.

**ڕامان:** کەواتە تۆ پێت وایە لەشیعر نووسیندا عەقڵ
بەسەر نووسینی شیعردا زاڵە، تەنانەت ئەدگار ئالان پۆ
پێی وایە شیعر نووسین جۆرێکە لەماتماتیک، جەنابت
پێت وایە ئەو ڕایە ڕاست بێ؟

**ئەحمەد هەردی:** ڕاستە وەک ماتماتیک وایە، یەکێ
وتی ئەمە ریازیاتە تۆ کردووتە و ئاساییە، ئەوەی پرۆژەی
شیعری هەبێ پرۆژەیەکی کاملە، کە تۆ بەشێکیت تەواو
کردووە، ئەگەر بەردەوام بیت بەشەکەی تریشی تەواو
دەکەیت.

**ڕامان:** بۆدلێر کە دیوانێکی هەیە بەناوی «ازاهیر
الشر» تا مردن ئەو دیوانەی دەستکاری کردووە؟

**ئەحمەد هەردی:** ڕاستە ئەوانەی بۆدلێر زۆر لە
شیعرەکانی خۆی دەسکاری کردوون، خۆ من فەرەنسی
نازانم، خۆیان ئەوانەی کە لە شیعر دەزانن دەڵێن
جوانترین شیعری داناوە.

**ڕامان:** بەم پێودانگە ئەگەرچاپی دووەم ئیزافەی هەبێ
بۆ سەر چاپی یەکەم ئاساییە؟

**ئەحمەد هەردی:** هەر ئەو پرۆژەیەیە لەمێشکی خۆمدا
چاپم کردووە.

**ڕامان:** ئەی ئەو چیرۆکەمان بۆ بێگێرەوە کە دەنگت
خۆشە و لە تیپی مۆسیقادا سروودت وتووە؟

**ئەحمەد هەردی:** ئەوکات قوتابی بووم، عەرووز وەزنە،
وەزنیش ئەگەر مرۆڤ گوێی نەبێ ناتوانێ ئەو وەزنانە
لەیەکتر جیا بکاتەوە، بڕوا دەکەی ناڵێم هەموو وەزنێکم
لەیەکتر جیا دەکردەوە، بەلام (١٠-١٢) وەزنی
بەناوبانگ هەیە کە من بەدەنگ هەموویانم جیادەکردەوە،
تۆ کتێبەکەی «الأیقاع في الشعر العربي» بخوێنەوە،
ڕۆژێکیان لەبەغدا بووم لەلای ئەم (موستەفا گولزاردیی)
لای خۆمان لەوێ کە ئوتێلی هەبوو، ئەوەی کورد بوو
دەچوویە ئوتێلەکەی ئەو، لەناو ئەو لیستانەی کە
هاتبوونە ئوتێلەکەی ئەم ناوی «مستەفا جەمالەدین»م
بینی کە خاوەنی کتێبەکە بوو، پێم وت ئەمە فلانە
کەسە؟ وتی بەڵێ ئەمە ئەو شاعیرەیە کە دیوانی هەیە و
ئێستا لێرەیە، وتم پیاوی چاک بە پێی بلێ با دوو سێ
پرسیاری عەرووزی لێ بکەم، بەڕاستیی کتێبەکەیم بە
چاکترین کتێبی ئەو سەردەمە دەزانی، ئێستا لێم بزر
بوو، دەبێ بۆم بکرنەوە، چوو و هاتەوە تەماشام کرد
مێزەر بەسەرێ بوو تەوقەم لەگەڵ کردو وتم من فلانە
کەسم و خەڵکی سلێمانیم و خەریکی عەرووزی شیعری
کوردیم، کتێبەکەی تۆ بەلای منەوە ئێستا چاکترین کتێبە
کە لەلامە، بەلام هەندێ پرسیارم هەیە، وتی فەرموو،
وتم یەک شتم دەوێ بیزانم، وتم جەنابت فارسی دەزانی؟
وتی نەخێر، وتم ئاخر شێخ کەریمی خەزوورم یەک دوو
کەس هاتوچۆیان دەکرد ئەوان لەگەڵ ئەم لە ئیعاشە بوون،
ئەوانیش لە ئیعاشە دەهاتنە لای یەکێکیان وتی
«مستەفا جەمالەدین یفهم فارسی کولش زین و یتکلم
بیە» وتم مادام نەجەفین فارسی دەزانن، هەر بۆیە ئەو
پرسیارەم لێ کرد، وتی بۆ دەپرسی، وتم لەبەر ئەوەی
کەسێ وای وت، بەلام ئەو قسانەی لەو کتێبەی تۆدایە
لەو ڕایانە دەچن کە پەرویزخانلەری لەوەزنی شیعری
فارسیدا نووسیوبەتی، وتی وەڵلا من فارسی نازانم،
ئینجا ئەو لە پێشەکی کتێبەکەدا هەمان قسەی من
دەکات و دەڵێ «من پێش ئەوەی عەرووز شارەزا بم
شیعری عەرووزیم هەر بەگوێی خۆم وتووە، فیعلەن هەر
وایشە، ئەحمەدی فەتاح بەگ شیعری عەرووزی هەیە
بڕواناکەم عەرووزی خوێندبێ.

**ڕامان:** ماوەیەک لێتەوە نزیک بووم نەمدەزانی دەنگت
خۆشە ئەگینا دەنگتم تۆمار دەکرد؟

**ئەحمەد هەردی:** لە تیپی سروودی قوتابخانە بووم، ئەو
سروودەی کە ئەو مامۆستایە دەیوت یەکسەر ئەو سروودەم
وەک خۆی دەوتەوە، **گەنجێ ئەگەر گوێی مۆسیقای نەبێ**
ئەو وەزنانە باش فێر نابێ، کە فێر نەبوو **دەبێ شیعری**
**سەربەست** بڵێ، ئەمە یەکێکە **لەو ڕەخنانەی کە لەو**
**گەنجانەی** دەگرم کە گوێی مۆسیقاییان نییە، **بۆیە ناتوانن**
**شیعری** عەرووزی بنووسن، چونکە ئەو **نیزامەی لە**
شیعری عەرووزدا هەیە لە شیعری تردا نییە.

**ڕامان:** باشە کێش و سەروا یان کێشی عەرووزی چ
خزمەتێکی شیعری کوردی کردووە، یان چ زیانێکی پێ
گەیاندووە؟

**ئەحمەد هەردی:** کورد کە کێش و سەروای وەرگرتووە
مەغزای خۆی هەیە.

**ڕامان:** نەبردی خەمێکی قووڵ و تەمی نائومێدی لە
تافی لاوی تۆ لە شیعرەکانتدا دیارە، هۆیەکەی چییە؟

**ئەحمەد هەردی:** بۆ ئەمە دەبێ ژیانی خۆم بگێڕمەوە.
ئەمە ڕەنگدانەوەی خوێندنەوەکان و تەبیعەتی خۆشمە،
مەگەر ئەم کوڕانە بۆم بنووسن (ئاماژە بۆ هەردوو

کوردەکەی ڕێبین و ئاسۆس دەکات).

**رامـان**: لە ژیانی شیعریت مەزنترین قوتابخانەی شیعری بە تێڕوانینی تۆ کە بەرچاو بێ و پێت گرنگ بێ کامەیە و ڕەمزەکانی ئەو ڕێچکەیە کامەن؟

**ئەحمەد هەردی**: بەلای منەوە چاکترین شیعر ئەوەیە بتوانێ خوێنەر بهەژێنێ، ئیتر بە چ قوتابخانەیەک دەیلێ بەلامەوە گرنگ نییە.

**رامـان**: لە شیعری کلاسیکی عەرەبی، تورکی، فارسی، تەئسیری کام شاعیری کلاسیک لەو سێ زمانە تەئسیری بەسەر شیعری کلاسیکی کوردییەوە هەیە؟

**ئەحمەد هەردی**: وابزانم فارسی.

**رامـان**: لە ژیانی شاعیریی خۆت هیچ هەوڵت نەداوە وەک ئەوەی باست کرد کە گۆران ویستوویەتی کاوەی ئاسنگەر بکاتە داستانی شیعری، خۆت هەوڵت نەداوە چامە بنووسیتەوە؟

**ئەحمەد هەردی**: مەگەر لەمەودوا، بیرم دێ جارێکیان وەللاهی و بیللاهی لە بەغدا بووم خەریک بوو ڕۆژنامەیەکی کوردی بەهۆی عەلی کەمال و ئەو کەسایەتییە کوردیانەی ئەوێ پێک بێنین، هەستم کرد کە ڕێزم دەگرن منیش وتم فرسەتە بۆچی هەوڵ نەدەم لەڕێی ئەمانەوە ڕۆژنامە دەربکەم و واز لە وەزیفە بێنم، لە ئیبراهیم ئەحمەدم پرسی، عەلائەدین سەجادی دەیوت ڕۆژنامە کەس نابات بەڕێوە و هاواری بوو دەیوت یارمەتیمان بدەن، وتی ئەوە لە سەرەتاوە وابوو، ئەگینا ئێستا چەند وەچەی خوێندەوار پێگەیشتوون و دەشیان کڕی، ئینجا وتی: تۆ دەتوانی پێی بەڕێوەبچی، هێشتا ژنم نەهێنابوو، وتی زۆر چاک دەتژبێنێ، هەوڵم دا کەس یارمەتی نەدام، یەک دوو هەوڵم بۆ ئەوەدا..

ڕۆژێکیان هاتوچۆی (دار المعلمين العالي)م دەکرد ئێستا سەریان سپییە هەندێکیان لە (حقوق) بوون، وەک «ئەکرەم نەجیب» و «عومەر عارف» و «کەمال جەلال» لە (دار المعلمين العالي) بوون، لەو کاتەدا چیرۆکێکم دەست پێکرد، زۆر ڕێک و پێک بوو، چیرۆکەکە خەریک بوو تەواو بکەم، ڕۆژێکیان هەمان چیرۆکم خوێندەوە کە من بەتەمابووم بینووسم و لە دڵمابوو، ئەو ژنەم دانیشتووە (ئیشارەت بۆ خێزانەکەی دەکات کە لەوبەرەوە دانیشتبوو) لەوێ کچێکم دی هەندێ وەسفم تێدا بینی، خەریک بوو ئەمم لەبیربچێ لەنێوان ئەم دووانەدا، زنجیرەی (أقرأ) دەردەچوو، هەموو مانگێ لە بازاردا دەمکڕی، تەماشا دەکەم هەمان چیرۆک، کچێکی ئینگلیزی نووسیوویەتی، خۆشەویستییەک لەنێوان دوو کەسدا بەهەمان ئەنجامیش، بۆیە نەمنووسی و وازم لێهێنا، چونکە ئەگەر بمنووسیایە لە سەداسەد دەیانوت لەوێ وەری گرتووە..

هەندێ کەس هەبوون پاڵەوانی ئەو ڕۆژە بوون ویستم ئەوە بکەمە چیرۆکێ، ئیتر زرووفی تایبەتیم بەسەردا هات.

**رامـان**: لەبارەی سروودی نیشتمانی، جەنابیشت هاوبەشیت هەیە و هەندێ سروودی سەرکەوتووت نووسیوە، چی لەم بارەیەوە دەڵێی؟

**ئەحمەد هەردی**: کە قوتابیی بووم (لاوی کورد)م لەسەر (موطني) دانا، ئینجا (ئازادی خوای کوردین ئێمە) لە خورماڵ دامنا..

**رامـان**: هەندێ دەڵێن ئەدەب تێکەڵی کاروباری سیاسەت بکرێت، هەندێکیش دەڵێن ئەو ئەدەبە تێکەڵ نەکرێ باشە، جەنابت بۆ ئەمەیان دەڵێی چی؟

**ئەحمەد هەردی**: ئایا چیرۆک پێویستە خزمەتی بزاڤی نیشتمانی بکات؟ ئەوەی بڵێ نابێ بیکات مەبەستیان ئەوەیە ئەدەبەکە لەبەر خاتری سیاسەتەکە بهێننە خوارەوە و ئەو وزە و هێزەی تێدا نەمێنێ، بەڵام ئایا پێویستە لە بزووتنەوەی نەتەوەی خۆمدا بەشداری بکەم، بەڵێ، کەواتە دەتوانێ ئەو نووسینەی دەینووسی خزمەتی ئەو بزووتنەوەیە بکات، بەڵام نابێ ئاستی هونەری بێنێتە خوارەوە، ئەمە لەسەر توانای ئەو کەسە وەستاوە.

**رامـان**: پێت وایە شیعر هەڵوێستە بەرانبەر ژیان و گەردوون؟

**ئەحمەد هەردی**: بەڵێ هەڵوێستە، ئەگەر باسی هەر شتێ بکات هەڵوێستە.

**رامـان**: ئەگەر بتەوێ شاکارێکی جیهانی بکەیتە کوردی، ئەو شاکارە کامەیە؟

**ئەحمەد هەردی**: ئەو پرسیارەم لە خۆم نەکردووە، یەکێکی وەک فیردەوسی کە مێژووی تێکەڵی شاکارەکەی کردووە بە کوردی بکرایە بە چیرۆکێک، بە ئەفسانە و بە بەلاغەتەوە بیکردایە زۆر چاک بوو.

**رامـان**: من لە کاک عەلی سامان ئاغام بیست کە لە سلێمانی بووین، گوتی ئێمە چەند کەسێک بووین لەناویاندا جەنابیشت، چووین بارزانیمان بینی یاداشتنامەیەکمان پێشکەش کرد، ئەو یاداشتنامەیە ناوەرۆکی چی بوو، گفتوگۆکەی نێوانتان چی بوو، ئەگەر لەبیرت مابێ؟

**ئەحمەد هەردی**: من بە ناوی خۆمەوە ئەو یاداشتنامەیەم نەناردووە بۆ لای بارزانی ڕەحمەتی، بە ناوی (کاژیک) ناردوومە، برادەرێکم ڕاسپارد و بردوویەتی و داویەتە دەستی و خوێندوویەتیەوە، بەڵام خۆم شەخسی نەچووم.

ئازاد دڵزار بەشی زۆری شیعرەکانی ئاست و بارێکی سیاسییان وەرگرتووە. بە بنیاد و ناوەرۆکەوە خزمەتی ئەم ئاست و بارە دەکەن. نەتەوە و نیشتیمان تەوەرو بابەتی سەرەکییەتی. بەردەوامی پێدەداو دەیهێنێتە ناو جەرگەی ژیان و رووداوی جۆراوجۆری گەرم. لەکاتێکدا بوونی نەتەوایەتیمان هەڕەشەی لەناوچوونی لێدەکرا بەرهەمەکانی رووبەڕووی دیکتاتورییەت دەجەنگان، وەک قەڵغانی جەوهەرداری بەرزبوونەوەی گیان و باوەڕی نەمەریی بەرگریان لە سەربەخۆییخوازی و مانەوەی سەروەریی کۆمەڵگای کورد دەکرد، بنیادێکی بابەتیانەشی هەیە و بەشێوازی واقیعی بەڕێوەدەچن. مولتەزیمن بە یەکێتی مانا؛ کەمتر لادانی زمان و رەگەزی کتوپڕییان تێدایە. وێنە بە روونی دەکێشێت. وەرگر پێویستی بەوە نابێت خەیاڵی خۆی وەک هاوبەشێک بەکاربهێنێت بۆ دۆزینەوەی کەشە تایبەتییەکانی. مەوداکان پڕکراون و یەکەوڕێ دەچێتە ناو ئاماژە و مانا ئاراستەکراوەکان.

بەرهەمهێنی پرسیار نییە، وەڵامدەرەوەی جووڵە دیاریکراوەکانە. وەک پێوەرێکی پشت ڕاست و گەرم بە دیاردەکان. بوون و دیدگای ئەدەبی خۆی لەسەر دامەزراندووە.

ماوەیەکی دوورودرێژە خەرۆشی نووسین دەیبزوێنێت، کەچی خۆی بەدوور گرتووە لە هەموو رووناکییەکی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن. ناوە ناوەش سەرنج و تێڕوانین دەربارەی هونەری گۆرانی و مۆسیقا دەنووسێت. ئەم کۆ شیعرانەشی چاپکردووە.

١- خونچەی سەهۆڵ- ١٩٧٥، بەغدا.
٢- ڕێچکەی خوێن- ١٩٩٤، ستۆکهۆڵم.
٣- حاجیلەکانی دەشتی هاموون - ٢٠٠٤، هەولێر.

ئەم هەڤپەیڤینە هەوڵێکە بۆ ئاشنابوون بە چێژ و پەیامی شاعیر کە شیعرەکانی لە ناوەرۆک و فۆرمی هزری پەروەردەی کردوون. خۆرووونکردنەوە و پانتاییەکیشە بۆ تێگەیشتن.



## ئازاد دڵزار:

# ئیلهام بەخشندەییەکی گرینگە، بەبێ ئیلهامیش شیعرێک بەرهەم نایەت گیانی لەبەردابێت و بژیت

**رامـــان:** چارەگە سەدەیەک زیاترە سەرگەرمی شیعر نووسینیت، ئەو تایبەتمەندییانەی لە شیعری کوردیدا داهێنانی تۆن چین؟

**ئازاد دڵزار:** لەچارەگە سەدەیەک زیاترە خەریکی شیعر نووسینم هەرچەندە ئەمە مەرجێک نییە بۆ بە شاعیربوون. شاعیر، یان ئەدیب بەگشتی بەر لە هەموو شتێ دەبێ بیسەلمێنێ کە توانای داهێنانی شتی تازەی هەیە و لەو ژێیانە بدا کە کەسانێک هەبن خۆیان و ئازارەکانیانی لەگەڵ ڕاژەنن. بەبێ ئەو سەلماندنە ئەگەر شاعیر هەموو ڕۆژێ جۆرە مۆدەیەکی تازەی شیعری بڵاوبکاتەوە شتێکی بۆ حساب ناکرێ و لەکاتی شەنوکەوکردنی شیعرو شاعیراندا دەکەوێتە بنی بێژینگەکەوە، ئەو سەلماندنەش ئەوکاتە دەبێ کە بەلانی کەمەوە بەرهەمەکانی لەلای خەڵکانی ئەدەب دۆستەوە وەربگیرێن.



زۆرن ئەوانەی لەسەر شێوەی خاچ، یان ڕاست و چەپ (×) شتی جاڵجاڵۆکەیی دەنووسن، یان لەگەڵ نووسینی هەر وشەیەک دە دوازدە نوختەو هێمای سەرسوورمان دادەنێن، یان لەگەڵ جەزبەی شتی بەناو شیعرەوە خۆیان تەنیا دەکەن، یان هەر دوو کەس لە چاپخانەیەکدا بەیانێک دەردەکەن و لە یادی ساڵوەگەڕیدا بەدوو قوڵی ئاهەنگ دەگێڕن. ئەگەر ئەمانە داهێنان و تایبەتمەندی بن، من لەولایەنەوە زۆر نەدارو دەست کورتم. ئەگەر مەبەستیش ئەو داهێنانانە بێ لە شیعری کوردیدا شاعیرانی وەک (قەدری جان و گۆران) و برادەرەکانی کردیان کە ئەم گۆڕانکارییەش تەنیا بەسەر شیعری کوردیدا نەهات، ئەگەر (گۆران) درەوشانەوەیەکی گەورەی شیعری نەبا، تەنیا بە گۆڕانکاری لە فۆرمی شیعردا نەدەبوو بەو (گۆران)ە. وەک برادەرە نوێبەخشەکانی لەقۆناغێکی سنووردارا بەجێ دەما. ئەمە جگە لەوەی ئەم گۆڕانکارییە ئەدەبییانە دەبێ ڕەوشێکی تایبەتی بیانهێنێتە کایەوە و کۆمەڵێک هۆکاری ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتی زەمینەی بۆ خۆش بکەن. خۆ هەموو ڕۆژێ شیعر تازە ناکرێتەوە.

وای بۆ دەچم تایبەتمەندی و داهێنانی شاعیری داهێنەر لە جۆری درەوشانەوەی شیعرەکانیدایە، ئەستێرەی (زوهرە) و ئەستێرەی (گەلاوێژ) هەردووکیان گەشن، بەڵام درەوشانەوەیان لێک جیاوازە، گەلاوێژ پتر دەجریوێنێ. درەوشانەوەی شیعری (هێمن) لەگەڵ درەوشانەوەی شیعری (هەژار)دا جیاوازە. داهێنان و تایبەتمەندی شیعری (نالی) لەجۆری مۆدیلەکەی نییە، بەڵکو لەمکومی بیناسازی و درەوشانەوەکەیدایە. هەر بەمجۆرەش شینەتیخ و خەنجەری بەجەوهەر لێک جیاوازن.

**رامـــان:** بۆچی شیعر دەنووسیت، ئایا شیعر دەتوانێت دوورییەکانی ژیان و بوون و دڵەڕاوکێی مردن بهێنێتە ناوخۆی و بەرانبەر مەرگ ... ڵی بپارێزێت؟

**ئازاد دڵزار:** خۆشم نازانم بۆ شیعر دەنووسم، هەندێ جار تووشی جۆرە کەم قەرارییەک دەبم تا ئەو شتەی لەناخمدا گینگڵم پێدەدا، دەری نەبڕم، ئۆقرە ناگرم و ناحەوێمەوە. مادام دەکرێ شیعر لە جۆلانەی خەیاڵدا سواربکرێ، دەتوانێ مەسەلەی بوون و ژیان و مردن هەمووی لەیەک چرکەدا بێنێتە ناودوە، مردن دڵەڕاوکێی ناوێ بەلای منەوە واقیعێکی ساکارو تاڵە هەرچەندە هەندێ کەس پێیان شیرینە کە پێم وانییە ڕاست بکەن، چونکە شیعریش پێوەندیدارە بەلایەنە گیانییەکەی مرۆڤەوە وەک ئایین و بیروڕای سیاسی ئەم واقیعە ساکارە لەناو کەشی تایبەتیدا بەزەحمەتتر نیشان دەدا، کۆمۆنیستەکان تەرمی (لینین و ستالین و دیمتروف)یان مۆمیاکردبوو، لەناو جامخانەیان دانابوون، مۆمیاکاری و ئەهرامەکانی میسر ئەگەر بەزەحمەتخستن و بەرەنگاربوونەوەی ئەم واقیعە ساکارە نەبێ، چییە؟ ئەگەر لە کارە ئەدەبییەکاندا سەیری مردنی ئاشق و پاڵەوانەکان بکەین وەک کارەساتی زۆر گەورە خراونەتە بەرچاو کە بەلای سروشتەوە مردنی (مەم و زین) و (ڕۆمیۆ و جولیێت) وەک مردنی مێروولەکان وایە.

**رامـــان:** ئایا شاعیر دەتوانێت خۆی لە دووروبەرو واقیع دابماڵێت و نیرڤانایەک بۆ خۆی دروست بکات. لەناویدا خەریکی داهێنان و پەروەردەکردنی ئەزموونی ئەدەبی خۆی بێت؟

**ئازاد دڵزار:** ناتوانێت خۆی لە دەوروبەری خۆی و واقیع ... دابڕێ، ئەگەر واقیع و ژینگەکەی خۆی

لەبەرهەمەکانی ڕەنگ نەدەنەوە واتا هیچی بەهیچ نەکردووە، واقیع و تەشقی تایبەتی شاعیر جۆرێ لە داهێنانەکانی دیاری دەکەن و لەهی میللەتان و تەنانەت کەسانی دیکەی هاوخوێنی خۆشی جیادەکەنەوە، بەڵام لەکاتی نووسیندا ئەگەر خەڵوەتێکی هەبێ باشترە.

ناوەندی ئەدەبی ئێمە تا ئێستا بەکرچ و کاڵ و نە کامڵ دێتە بەرچاو، یەکتر قەبووڵ نەکردن و گەلەکۆیی تێدا باوە. بۆیە، کەم تێکەڵاوبوون بەم ناوەندە ئەدەبییانە خۆدامالێن نییە لە دەوروبەر و واقیع، ڕەنگە خۆ ڕزگار کردن بێ لە هەندێ ژانەسەر، دەرکەوتووە بەبێ ئەو ناوەندە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییانەش ئەوەی بیەوێ، دەتوانێ کاری خۆی بکات.

## نوێبەخشی سەردەمی ئێمە لە وێستگەیەکی تازەوە سەریهەڵدا ئەویش بەیانی یازدەی ئادار خاڵی وەرچەرخان بوو. کە بابەتی تازەی هێنا ئاراوە.

**ڕامان:** نهێنی دەقی زیندوو لە چیدایە؟

**ئازاد دڵزار:** ئەگەر نهێنی کاری هونەری بەگشتی بزاندراباو دەستوورێکی هەبووایە و خەڵکی لێزان و شارەزا بیان توانیبا سنوورێکی دیاریکراوی بۆ بکێشن، هەر نووسەرێک، یان هونەرمەندێک هەوڵی دەدا بەگوێرەی ئەو دەستوورە هەموو بەرهەمەکانی شاکاربن، ئەوکاتە شاکاریش دەبووە شتێکی ئاسایی. زۆر شاعیر تێکڕای بەرهەمەکانی ئاستێکی باشیان هەیە، بەڵام بەیەکێک لە شیعرەکانی زیاتر دەناسرێ، خەنینەوە نائاساییەکەی (جیکۆندا) ئەو بەرهەمەی (دافنشی) نەمر کردووە، ئاوێتەبوونی باری دەروونی و سروشتی کوردستان و هەستی غەریبیی لە دەروشانەوەیەکی کەم وێنەدا چامە بەهارییەکەی (حاجی قادری کۆیی) خستۆتە ڕیزی چامە نەمرەکانی دنیاوە. پێم وایە شاعیر، یان هونەرمەند لەکاتی بەرهەمهێنانی شاکاردا جۆرە خرۆشانێکی پڕ لەکارەباتر هەستی دادەگرێ و لەکاتی بەتاڵبوونیدا دەروشانەوەیەکی گەورەتر بەرپا دەکات، ئەو ڕووناکییە لە هەموو سەردەمەکاندا تیشک دەهاوێ. وەک خۆر، کوژانەوەی بۆ نییە.

**ڕامان:** لەناو هونەرەکاندا کامیان پێویستییەکی کلتووری نەتەوایەتییە، ئایا لەم بارەدا شوێنی شیعر لەکوێدایە؟

**ئازاد دڵزار:** میللەتانی دنیا تێڕوانینیان بەرامبەر بە هونەر و جۆرەکانی جیاوازە، ئەفریقاییەکان بەشێکی زۆریان سەمایان پێ لە هەموو هونەرێک بەرزترە، ئاورووپاییەکان هونەری ئۆپێراو بالێ و سیمفۆنیایان پێخۆشە و ئێمە نیمانە، تەنانەت شانۆش لای ئێمە تازەیە، بەڵای منەوە گۆرانی کوردی کە ڕەگەزی شیعرو ئاوازی تێدا ئاوێتەیە لە هەموو هونەرەکانی دیکەی ئاشنا بەکورد پێویستییەکی کلتووری نەتەوایەتییە. خەڵکی زۆر هۆگری ئەم لیریکایانەن و کاردانەوەی ڕاستەوخۆیان لە بەرامبەریدا هەیە، دەمێکیشە زاندراوە کە ئەم گۆرانی و داستانانە بنەڕەتی شیعری کوردین و قۆناغە کۆنەکەیەتی کە شیعری نوێی کوردیش بەشیعرەکانی ئەم دواییەشەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو قۆناغە زۆر کۆنەو کلاسیک قۆناغێکی تازەیە.

**ڕامان:** شیعری نەوەی خۆت چۆن دێتە بەرزەینت و کێن ئەوانەی بەلاتەوە لێزیادبوونیان بۆ نەوەی **پێش خۆیان** کردووە؟

**ئازاد دڵزار:** پێم وانییە هەر دەساڵ بەقۆناغێک دابندرێ بۆ شیعر، بەڵام کە دەگوترێ قۆناغی ساڵانی حەفتاکان، بەڕاستی لە جێگەی خۆیدایە، ساڵی حەفتا لە ئەدەبی کوردیدا بە خاڵی وەرچەرخان دادەندرێ، هەر لەو ساڵەدا بوو بەیانی یازدەی ئادار دەرچوو کە یەکەم جاربوو دوژمنانی کورد دان بەبوونی نەتەوەی کورد دابنێن لەعیراقدا کە ئەمە کارێکی بەدەنگدانەوە و ڕووداوێکی گەورەبوو. هەر لە دەوروبەری ساڵی حەفتادا بوو ڕوانگەییەکان بەیانی ئەدەبیی خۆیان ئیمزاکرد و توانیان لە ڕووی ناوەڕۆک و فۆرمەوە بابەتی تازە بهێننە ئاراوە کە جگە لەلایەنی باشی ئەو جوولانەوەیە هەندێ نەخۆشیشی لەگەڵ خۆی هێنایە ناو ئەدەبیاتی کوردییەوە کە میکرۆبەکەی تا ئێستاش بنبڕ نەبووە.

جاران کەس بوێ نەبوو بەجلی ئاورووپایی، یان ئەملۆدەوە بێتە ناو ڕەشبەڵەکی کوردییەوە، کەچی بەم دواییە خەڵکی هەر بە پانتۆڵەوە هەڵدەپەڕن، هەندێ شریتی هەڵپەڕکێی هەندەرانمان بینی کەسانێکی نوێبەخش بەبێ شەرواڵ سەرچۆپی ڕەشبەڵەکیان گرتبوو. زۆر لەلاوەکانمان لەتاوان خۆیان بەدەربای (ئیجە) دادا، یان کابرایەک بەبێ شەدە، یان جامانە لەو دێهاتانە ئەگەر بچووبایە مەجلیسێکەوە، بەخێرهاتن نەدەکراو کەس جگەرەیەکی بۆ

هەڵنەدەدا و پێیان دەگوت سەرکۆت، ڕوانگەش دەرگای دیوانی شیعری کوردی بۆ ئەم سەرکۆتانە خستە سەر پشت. بەهەرحاڵ شاعیرانی نەوەی حەفتاکان توانیان لەگۆڕەپانەکەدا یاری باش بکەن و ئێستاش لەبیری خەڵکیدا ماون و با هەر ئەوانیش ئەوکەسانە دەستنیشان بکەن کە زیادبوونیان خستۆتە سەر بەرهەمی نەوەکانی پێشتر.

**ڕامان**: شیعری کوردی وەکو شیعری هەموو نەتەوەکان بەگەلێک وێستگەو قۆناغ تێپەڕیوە، ئایا هیچ لەو وێستگەو قۆناغانە بۆت بوونەتە سەرچاوەیەک و هەمیشە بگەڕێیتەوە سەری؟

**ئازاد دڵزار**: پێشتریش ئەم بابەتە هاتە گۆڕێ و باسی گۆرانی و داستانەکانی کوردی کران، دواتر کلاسیک وەک قۆناغێکی تازەتر، ڕۆمانسییەت لەناو شیعری کلاسیکیشدا خۆی نواندووە، لای (بابەتایەر) و (مەولەوی) و شیعرە بەهارییەکەی (حاجی قادری کۆیی) و (پیرەمێرد) ئاشکراترە، جگە لە شاعیرانی وەک (گۆران) و (هەردی) و (کامەران موکری) و (دیلان) و (دڵدار) و (دڵزار) وەک وێستگەیەکی تازەتر کە هەریەک لەمانە لەگەڵ ڕۆمانسییەتدا نوێیەخشیشیان هێناوەتە ناو شیعری کوردییەوە کە لەلای (گۆران) زۆر درەوشاوەیە. ریالیزمی سۆسیالیستی و ئەو کارانەی هەستی ناسیونالستی بەرجەستە دەکەن مەزلوومییەتی گەلی کورد لە ڕووی چینایەتی و نەتەوایەتییەوە دەردەخەن، بڵاوبوونەوەی بیری ئازادیخوازی و جووڵانەوەی نەتەوایەتی لەدوای شۆڕشی گەورەی فەرەنسەو شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە، بزووێنەری ئەو ڕێبازانە بوون لەهەموو دنیادا.

ڕێبازی شیعری نەتەوایەتی کوردی لە (ئەحمەدی خانی)یەوە بەشێوەیەکی ڕووناک دەرکەوت و بەهۆی (حاجی قادری کۆیی)یەوە بەتەواوی کوردستانی ڕۆشن کردەوە و تا ئێستاش هەرگەشە، ئەو شیعرانەی لەبابەتی سیاسی دەدوێن و تێکەڵ بە ڕۆمانسییەت کراون و کاری هونەرییان بۆ کراوە، بەرهەمی بەپێزیان لێدەرچووە وەک لەشیعری شاعیرانی قۆناغی (گۆران) و شاعیرانی حەفتاکاندا بەرجەستە بووە، لەڕاستیدا ئەو قۆناغانە لە ئەدەبیاتی کوردیدا هەر هەموویان ناتواندرێ فەرامۆش بکرێن، جا گەڕانەوە سەریان مەرج نییە بەتایبەتی، یان بە تەگبیر بێ.

**ڕامان**: لەو شیعرانەی بەرهەمت هێناون هەست بە پێوەندییەکی گیانی لەگەڵ نیشتیمان دەکرێت، ئایا شیعر بە پێوەندییەکی گیانی و ڕوانینی گەردوونی دەزانیت، یان نیشتیمان دووری لەپێوەندی گیانی و ڕوانینی گەردوونی بۆ شیعر چییە؟

**ئازاد دڵزار**: لەڕاستیدا پێوەندبوون بەنیشتیمانەوە، پێوەندێکی گیانییەو لە هەمان کاتیشدا پێوەندێکی خۆڕسکەو تەنانەت لای هەندێ لە گیانلەبەرانی دیکەش دەردەکەوێ، زۆرجار کۆترێک لەدووری سەدان کیلۆمەترەوە دەگەڕێتەوە ماڵی خاوەنەکەی پێشووی. پێم وایە ئەم هەستی نیشتیمان ویستییە لای هەموو کەسێک هەبێ، بێگومان کوردستان نیشتیمانی چل ملیۆن مرۆڤی چەوساوە و بەم پارچە پارچەیی و ژێر دەستییەوە لە



**دانیشتووەکان لە ڕاستەوە: ئازاد دڵزار، محەممەدی مەلا کەریم، محەممەد تەیموور، مستەفا ساڵح کەریم.**
**وەستاوەکان لە چەپەوە: ئەحمەد دڵزار، هێرۆ گۆران، ؟، د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، د. نافیع ئاکرەیی، جەلال دەباغ.**
**١٢/ ٩/ ١٩٧٨ - شەقلاوە**

هەستی شاعیرێکی سەردەمدا پانتاییەکی گەورەتری دەبێ لەوەی لە هەستێکی خۆڕسکدا هەیەتی. جگە لەوەی بەرهەمی ئەدەبی ڕەنگدانەوەی هەستی نووسەرەکەیەتی، ئەو نووسەرە هەر شتێکی خۆش بوێ مرۆڤ بێ، یان زێدو وڵات بێ لەبەرهەمەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە.

بەش بەحاڵی خۆم ئەوەندە حەز لە سەفەریش ناکەم و ئەوەندە لەماڵی خۆم دوورناکەومەوە زۆرجار بیرم لەوە کردۆتەوە کە خەریکە بەسەر دەچم، تا ئێستا زۆر شوێنی وڵاتەکەم نەگەڕاوم و [illegible] کوردستان نەبووم.

پەیوەستبوونی ڕاس[illegible]قینە بەنیشتیمانەوە، شاعیرێکی وەک (هەمزەتۆف)ی خودان گەل و نیشتیمانێکی بچکۆلانەی بەرەو ج[illegible]هانی بوون بردووە، وای کردووە

خەڵکی ئەم دنیایە لەچاوی ئەوەوە سەیری (داغستان)ەکەی بکەن.

**ڕامان:** ئەرکەکانی زمان لەشیعردا چین، پێوەندییە ئیستێتیکییەکانی زمان لەناو ڕستەدا چۆنە؟

**ئازاد دڵزار:** ئەرکی زمان لەشیعردا گەیشتنی مەبەستە بە کەمترین وشە، شیعر وەک پێشەنگایەک وایە زمان خۆی تێدا دەنوێنێ و پتەوترو جێگیرتر دەبێ. لەناو ڕستەی شیعریدا وشەکان وەک بەردی بیناسازی یەکتری دەبەستنەوە و ئیقاع و مۆسیقای ناوەوەش هەر لەوەوە پەیدا دەبن، ئەگەر تیپێکی سروودخوێنمان هەبێ، پێویستە لەکاتی ڕیزکردنیاندا بەگوێرەی بەرزی و نزمی بالآیان جێگایان لەناو ئەو ڕیزەدا بۆ دیاری بکرێ، ئەگەرنا دیمەنێکی ناڕێک نیشان دەدەن، ڕستەی شیعریش بە جۆرێک ڕێک دەخرێ کە هەر وشەیەک شوێنی خۆی بگرێ، بۆ نموونە گوتوویانە:

**«حەوتی بمرێ لەباوان، کلی نابرێ لەچاوان»**

ئەگەر هەمان کەرستە بێنین و ئاوای لێ بکەین:

**«لەباوان حەوتی بمرێ لەچاوان کلی نابرێ»**

سەیر دەکەین ڕیزکردنی وشەکان لەڕستەکانی نموونەی یەکەمدا، باشتر ڕیزکراون و ڕەوانترن.

**ڕامان:** ئایا شیعری تاراوگەی کوردی توانیویەتی سیماکانی خۆی دەستنیشان بکات. لەکاتێکدا مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە، هەر لەچامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم)ی نالی- و چامەی (گوتم بەبەختی خەوالوو)ی حاجی قادری کۆیی- تا دەگاتە شاعیرانی ئێستا؟

**ئازاد دڵزار:** بەم دواییە شتێک نابینم بەناوی شیعری تاراوگەی کوردی، نازانم کام تاراوگە؟ کەسانێک لەشوێنانی دیکەی ئەم دنیایە وەک مافێک نیشتمانێکی دیکەیان بۆخۆیان هەڵبژاردبێ و ژیانێکی چاکتریان دابین کردبێ و هەوڵیان دابێ لەو شارستانییەتەی دنیای ڕووناک بەشیان هەبێ کە بە ئەرک و ماندووبوون و قوربانی گەلانی دیکە هاتۆتە بەرهەم، بێ ئەوەی ئەوان خشتێکیان خستبێتە سەر ئەو بنیادەوە، هەر کاتێکیش بیانەوێ دەتوانن سەربدەنەوە و بگەڕێنەوە جا ئەگەر تاراوگە مانایەکی دیکەی هەبێ و خەڵک نەیانزانیبێ، من پێم وانییە شیعری تاراوگە لەم کەشوهەوایەدا دروست ببێ. ئەو تەشق و هەوایەی (نالی) و (حاجی قادری کۆیی) دوو چامە زیندووەکەی خۆیان تیانووسیوە، زۆر لەگەڵ تەشقی شاعیرانی ئێستای هەندەران جیاوازن و لەڕاستیدا دوو چامەکەی (نالی) و (حاجی قادری کۆیی) بەشیعری تاراوگە دەژمێردرێن، بەلآم شیعری شاعیرانی ئێستای هەندەران درێژە پێدەری ئەوان نین.

**مادام دەکرێت شیعر لەجۆلانەی خەیاڵدا سواربکرێت، دەتوانێت مەسەلەی بوون و ژیان و مردن هەمووی لەیەک چرکەدا بێنێتە ناوەوە**

**ڕامان:** نوێبەخشی نەوەی ئێوە بەکاریگەری ئەدەبی بێگانە پەیدابووە، یان سەرچاوەی لەنوێبەخشی (گۆران) و (ڕوانگە) و ئەدەبی خۆماڵییەوە وەرگرتووە. لەکاتێکدا نوێبەخشی ڕاستەقینە لەڕووی بابەت و شێوازی نووسین لەخۆبوونی دەلالەتەکانی زمانەوە سەرهەڵدەدات و دادەمەزرێت؟

**ئازاد دڵزار:** نوێبەخشی سەردەمی ئێمە لەوێستگەیەکی تازەوە سەری هەڵدا ئەویش بەیانی یازدەی ئادار خاڵی وەرچەرخان بوو. کە بابەتی تازەی هێنا ئاراوە، بەعسییەکان هەندێ کاری دیکەیشیان کرد بۆ ئەوەی وەک پێشکەوتنخواز خۆیان نیشان بدەن و توانیان فێڵ لەزۆربەی هێزە نیشتیمانییەکانی ناو عیراق بکەن، نەوتیان خۆماڵی کردو یاسای ژمارە (٩٠)ی چاککردنی کشتوکاڵیان دەرهێناو خۆیان کردە سوێندخۆری شۆڕەوی کە ئەو سەردەمە هەندێک پێیان وابوو خۆری ئازادی لەوێوە هەڵدێ، کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی (گەر ئەم وشەیە لەجێی خۆی بێ) ڕۆژ بەڕۆژ لەپاشەکشەدابوو کەسانی ملهووڕ بەبێ ماندووبوون و کاسبی بوونە خاوەن سامان و ئاغای تازە.

کاریگەری (گۆران)ی مەزن بەسەر زۆربەی شاعیرانی دوای خۆی نکۆڵی لێناکرێ، (گۆران) گەورەترین دیاردەی ڕۆشنبیری کوردییە لەسەدەی ڕابردوودا، دەرەوشانەوەیەکە ناکەوێتە بەر سێبەرەوە، (ڕوانگە)ش کاریگەری خۆی هەبوو هەرچەندە تێکەڵاویان نەبووم، بەلآم کەشوهەوایەکیان دروست کردبوو، زۆرکەس هاتنە ناو گۆڕەپانەوە و سوارو نەسوار کردیانە تەپ و تۆز. شیعری خۆماڵیش جارجار شتی وای تێدا بەرچاودەکەوێ کە بە خەیاڵی هیچ شاعیرێکی گەورەی ئەم سەردەمەدا

نەهاتووە.

ئەوەی لەزمان و دارشتنی شاعیرە دیارەکانی ساڵانی حەفتاکان وردبێتەوە، هەست دەکا لەرووی زمانەوە بێ دەسەڵات نەبوون، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرسوورمانە زۆربەی ئەوانەی پروپاگەندەی دوامۆدیلی نوێبەخشی دەکەن جەختێکی زۆریش لەسەر مەسەلەی زمان دەکەن و پێیان وایە زمانێکی تازەیان بۆ شیعری کوردی داهێناوە، بەڵام کە لە نووسینەکانیان دەڕوانی، دەردەکەوێ بەزمانێکی سەقەت و دوور لەجوانی و تەنکی نووسراون و مرۆڤ لە کاتی خوێندنەوەیاندا هەناسەی سوار دەبێ و پێی تەواو ناکرێن و تووشی ژانەسەر و دڵەسۆژە دەبێ.

**رامان:** دەڵێن رۆمان شیعری بەرەو لێژی بردووە و هەڕەشەیەکە بەسەریەوە، ئایا تۆ هەستت بەو مەترسییە کردووە. لەکاتێکدا تا ئێستا شیعر لەوڵاتی کوردستاندا جێگای تایبەتی خۆی هەیە؟

**ئازاد دڵزار:** هەستم بەو مەترسییە نەکردووە و ناشکەم، راستە رۆمان لە هەندێ جێگەدا بەتایبەتی لەوەسفی کەسایەتی و شوێنەکاندا لەزمانی شیعر نزیک دەبێتەوە، بەڵام هیچ کامێکیان شوێنی ئەوەی دیکەیان ناگرنەوە، ئەگەر رۆمان لەلای ئێمە تازەیە، خۆ لای میللەتانی دیکەی دنیا دەمێکە هەیە و چ جێگای شیعریشی لەلای ئەواندا نەگرتۆتەوە.

مادام شیعر هونەرە، مەترسی لەناوچوونی لەسەر نییە، کەینێ مۆسیقاو هونەرەکانی دیکە مەترسی لەناو چوونیان کەوتەسەر، ئەوکاتەش مەترسی لەناوچوونی شیعر دێتە ئاراوە، ئەگەر مەبەستیش لەو شیعرە بێ سەروبەرانەبن کە ناچنە خانەی هونەرەوە، بێگومان ناژین و کەسیش ئەزیەتباریان نابێ.

**رامان:** رۆژنامەوانی و کەناڵەکانی راگەیاندن و دەزگاکانی چاپ تا چەند توانیویانە داهێنانی خودی تاکەکەسی بەرێزتان بەناوەندی رۆشنبیری کوردی بگەیەنێت، رۆڵی رۆژنامەوانی و کەناڵەکانی راگەیاندن چی بووە لەناساندنی بەرهەمەکانت؟

**ئازاد دڵزار:** کەناڵەکانی راگەیاندن لەلای ئێمە هەردەم سەر بە لایەنەکان بوون، لە راستیدا بەسوپاسەوە بەرهەمیان لەچاپەمەنییەکانیاندا بۆ بڵاوکردومەتەوە بەچاپەمەنییەکانی جارانی رژێمیشەوەش بەتایبەتی لە (هاوکاری) و (بەیان) و (پاشکۆی عیراق) و (کاروان)دا، جگە لە (رێگای کوردستان) و (بیری نوێ) و (برایەتی) و (رامان)، بەڵام تا ئێستا بەرهەمێکی بەسەریەکەوەیان بۆ چاپ نەکردووم و لەقافی خۆیدا بە ئاسانی بەسەر ناوەکەمدا بازدەدەن، خۆشم وەک سروشتێکی تایبەتی ئەوەندە بەدوایاندا نەگەڕاوم و سەراسۆ نەکردوون کە پێم وایە هەر دەبێ واش بێ. رەنگبێ ئەوانیش تارادەیەک بەمافی خۆیانی بزانن کە فلانە نووسەر، یان هونەرمەند تا چەند ئاو لە ئاشی ئەوان دەکات، ئەگەر رووی زووڕناکەی نەختێ بەولادا کرد، ئەوا هەندێ لایەنی دیکە تیشکی لەسەر لادەبەن، هەرچەندە بەتواناو لێهاتووش بێ، پشتی تێدەکەن، خۆ ئەگەر هەندێ تەمغەو مۆری حازر بەدەستیش بەپشتی ملیەوە نەنێن، مانای ئەوەیە زۆرباش دەرچووە. جا شاعیرێکی بێلایەنی وەک من، دەبێ چ دەزگاو کەناڵێک خۆی لێ بەخودان بکات، بەڵام خۆ ئەوانیش دەزانن کە ئەدەبیش مێژوویەکی تایبەت بەخۆی هەیە.

**رامان:** رەخنەو لێکۆڵینەوە هێزی ئاشکراکردنی داهێنانە، ئەو داهێنانەی لەبواری کارەکانتدا بەجێت هێناون، تا چەند رەخنەو لێکۆڵینەوە بەناوەندی رۆشنبیری کوردی و خوێنەرانی ناساندوون؟

**ئازاد دڵزار:** کارێکی رەخنەیی ئەوتۆ بۆ شیعرەکانی من نەکراوە، ئەوەی بۆ شاعیرانی سەردەمی ئێمەش کراوە، شتێکی ئەوتۆ نین، زۆربەیان لەرووی ناسیاویەتی و لێک نزیکی بیروباوەڕو ڕکابەرکێی کەسانی دیکە و هەندێ جاریش شاعیرو نووسەرەکان بەنۆرە قوڵنجی یەکتریان داماڵیوە کە ئەمانە هیچیان ناچنە خانەی رەخنە و رەخنەکارییەوە.

هەندێ توانای رەخنەگری خەریکە بەم دواییە سەرهەڵدەدا، بەڵام کاری رەخنەگری پێویستی بە کەسایەتی بەهێز هەیە، رەخنەگرانی ئێمە بەزۆری کڵێشە رەخنەییەکانی ئاوروپای دوای جەنگی دووەمی جیهانیان دەهێناو نموونەی شیعری کوردییان لە جێگە دادەنا، کاتی خۆی لەسەر داوای کەسانی دیکە کۆ شیعری (خونچەی سەهۆڵ)م بۆ بەرێز (د. عیزەدین مستەفا رەسووڵ) نارد کە ئەوسا ناسیاویەتیشم لەنزیکەوە لەگەڵیدا نەبوو، بە سوپاسەوە خۆی لەگەڵدا ماندووکردبوو، هەموو شاعیرێک لەسەرەتادا چاوەڕێی ئەوەیە بەجۆرێکی رتووشکراو و گەشەوە پێشکێش بکرێ کە تائێستاش من هەروام دیوە، بەڵام زۆرم پێباش بوو، بەرێز دکتۆر وای نەکرد بوو، رێزم بۆ هەموو بۆچوونەکانی هەیە کە نیشانەی گرنگی پێدانێکی زۆری پێوە دیارە کە ئەمە بۆ هەموو شاعیرێکی سەرەتایی ناکرێ، بۆ ئەو رۆژگارەو بۆ من زۆر بوو، بەڵام یەک داوای قورسی لێکردبووم کە یەکسەر بێ ناو شیعرەکانم بناسرێتەوە، من پێم وا نییە تا نووسینی ئەم

دێرانەش دکتۆر و غەیری ئەویش شیعری شاعیرانی سەردەمی ئێمە یەکسەرو بێ ناو بناسنەوە. ئەگەر مەبەستیشی لەناسینەوە، وەک شیعری شاعیران (نالی) و (وەفایی) و (کوردی) و ئەوانی دیکەبێ کە شیعرەکانیان لەدووتوێی دیواندا جێگیرکراون و دەم بەدەم چەندین ساڵە دەگوترێنەوە، سەیر نییە ئەگەر خەڵکی وا هەبن هەر لە نیوەدێڕی یەکەمەوە بیانناسنەوە.

**ڕامان:** دەقەکانت لەکوێوە تێکەڵ بە کلتوور بوون و لەگەڵیدا گەیشتووی بە چ ئاسۆیەکی بەکاربردن، ئایا توانیوتە کلتووری یەقین بکەیت بەکلتووری گومان، کە گومان هۆو ئامانجێکی بنەڕەتییە بۆ داهێنان؟

**ئازاد دلزار:** ئەوەندەی بۆم کراوەو دەزانم کە زۆر لە چیرۆک و سەربردە و ئەفسانەی کوردی بەرەو نووسینیان بردووم و هەندێکیانم وەک هێما بەکارهێناون و بەردەوام هەوڵم داوە تابلۆی شیعرەکانم کوردستانی بن، هەستم کردووە لەم بوارەدا بەرهەمەکانم تێکەڵ بە کلتوور بووبن.

**ڕامان:** ئایا دوای نووسینی هیچ دەقێکت، هەستت کردووە هەموو ویستەکانت ڕژاندووەتە ناو ئەم شیعرەو گومانت لا پەیدابووبێت کە هیچت نەمابێت لەمەودا بیڵێیت، کەچی دوای ماوەیەکی کورت کەڵکەڵەو ئامادەبوونی نووسینی شیعرێکی دیکە دێتە ئاراوە و بینینت دەجۆشێت، ئەم حاڵەتەی پێشتر چۆن لێک دەدەیتەوە؟

**ئازاد دلزار:** زۆرجار دوای نووسینی شتێک هەستم بەحەوانەوە و جۆرە بەتاڵییەک کردووە، بەردەوام ئەم حاڵەتە بەلای خۆمەوە بەرهەمی باشی لێ کەوتۆتەوە بەپێچەوانەوە، زۆرجاری دیکەش ماوەیەک هەستم بەبێ ئۆقرەیی کردووە و بەرهەمێکی ئەوتۆم بەدەستەوە نەداوە، وام زانیوە ئیتر شتێکم نییە بیڵێم، بەڵام لەنادیارەوە بەبێ خۆ ئامادەکردن لەگەڵ کارێکی دیکەدا ئاوێتە بووم.

پێم وایە حاڵەتی یەکەم هەر ئەوەیە نووسەر ئەو پەنگخواردنەوەیەی کە زۆری لێدەکات، لەناخییەوە دێتە دەرێ و لەو وزەیە بەتاڵ دەبێ، دواتر بۆ جاری دووەم لەو تەزووە کارەبایە پڕ دەبێتەوە کە بە دەستووری فیزیکی لەوزەیەکی حەشاردراوەوە دەگۆڕێ بۆ چەند وزەیەکی دیکەی بزێو، وەک وشەو مۆسیقاو وێنەو ڕەگەزەکانی دیکەی شیعر.

**ڕامان:** ڕاستگۆیی لەشیعردا تا چەند شیعرییەت بەرهەم دەهێنێت، لەلایەکی دیکەوە گوتراوە ئەدەب درۆیەکی جوانە، ئایا لەنێوان ئەم ڕاستگۆیی و درۆیە جوانەدا پێوەندییەکان چۆن دروست دەبن و دەدۆزرێنەوە، ئایا چۆن خۆت لەیەکێکیان ڕزگاردەکەیت؟

**ئازاد دلزار:** ئەدەب لەگەڵ زانست لێک جیاوازن ئەگەر زانست عەقڵ تێر بکات، بەڵام دەروونی بێ تێرناکرێ کە بەسیستمێکی ئاڵۆزو جیا لە عەقڵ کاردەکات و زۆر لە پێداویستییە گیانییەکانی مرۆڤ دابین دەکات کە ئەدەب و هونەریش لێرەدا جێگەی خۆیان دەکەنەوە.

ئەگەر زانست سەلماندوویەتی مانگ شەش یەکی ئەم دنیایەی ئێمەیە و ئاو و بای تێدا نییە، ئەمە ڕاستە، ئەگەر ئەدیبێکیش بڵێ مانگ یەک دەریاچەی سەرەو ڕێژە لە مەی، هەستی من وا دەخوازێ مانگ ئەوەی دووەمیان بێ نەک هی یەکەم. ئەگەر شاعیرێکی میللی بڵێ **«بەو دەسرەی دەستت کفنم تەمامە»** بۆ ئەو سۆزو خۆشەویستییەی ئەو بۆ بەرامبەرەکەی درۆ نییە، ئەو کفن و مەرگەساتەی چەند جوان کردووە و لەدەست شۆخێکدا هەڵی دەتەکێنێ. ئەدی بۆ ئەو هەموو ئایین و ئایینزایانە بڵێین چی. کە ڕەگەزە سەرەکییەکەیان جۆرێکە لەئەدەب، ئەگەر ئەو ئەدەبیاتانەیان لێ لابەی، هیچیان بەسەر هیچەوە نامێنێ، نەک بەملیۆن، بەڵکو خەڵکی ئەم دنیایە باوەڕیان بە سەد دەرسەدی ڕاستی ئەوشتانە هەیە.

**ڕامان:** ئایا ئەدەبی کوردی بەگشتی و شیعر بەتایبەتی توانیویەتی کاریگەریی و گۆڕان لەژیانی کۆمەڵگا بەرپابکات، یان ئاست و ئاراستەی هەست و بیرکردنەوەی تاکی کورد بگۆڕێت، یان هەر ئەو دەربڕینانە لەناو کتێب و نووسراوەکاندا گیریان خواردووە و نەیتوانیوە بەکاریگەرییەوە بێتە ناو ژیان و ئاراستەیەک دروست بکات؟

**ئازاد دلزار:** پێم وایە توانیویەتی، ساڵانێکی زۆر کۆنم دێنەوە یاد نەخوێندەواری زۆر بەربڵاوبوو، کۆمەڵگەی ئێمە زۆر لەهی ئێستاکە لەدواتر بوو، ئەم هەستانەوەی ئەم دواییەمان دەگەڕێتەوە بۆ بڵاوبوونەوەی خوێندەواری کە ئەدەبیاتی کوردی پشکێکی گەورەی تێدا هەبوو، بەتایبەتی سروودو شیعرە نیشتیمانییەکانی کوردی خەڵکیان وریا کردەوە، جگە لەوەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی بوونە هەوێنی چەندان شۆڕش کە گۆڕانی بنەڕەتییان لەکۆمەڵگای کوردەواریدا هێنا کایەوە، بەتایبەتی شۆڕشە مەزنەکەی ئەیلوول، هەر لەسەرەتاوە شاعیرێکی وەک (حاجی قادری کۆیی) بۆی دیاری کردبووین کە (تۆپ و تفەنگ و هاوەن) پەیدابکەین و ئەگەر بۆ سیاسەت و تاکتیکیش بێ (تابیع بەدەوڵەتی) بین لەوەی دوایی جۆرە دوودڵییەکمان نواند و زۆر بە زەرەر بەسەرماندا شکایەوە، ئێستە خەریکە بارەکەمان ڕاست دەکەینەوە، خەریکە سیاسەت و دیبلۆماتکاریمان بەرەو پێشەوە ڕێ دەکات و گۆڕانی چاک و بەرچاو لەناو کۆمەڵگەکەماندا بەرپا دەبێت.

**ڕامان:** چۆن حەزت چووە نووسین، ئایا لە ڕێگای خوێندنەوەی سەرچاوەوە بوو، یان بەهۆی توندوتیژی و نیگەرانی و کێشە ئاڵۆزەکانی ژیان لەگەڵ شیعر

یەکتریتان ناسی و بووە بەشێکی گرینگ لە ژیانت؟

**ئازاد دڵزار:** تەمەنم شەش ساڵان بوو، لە سلێمانی لە ماڵێکی نهێنی و بەنهێنی دەژیاین، باوکم خەریکی کاری حزبایەتی بوو، نەیان دەهێشت لەماڵ دەربچم و تێکەڵاوی منداڵان بم، نەوەک بەهۆی منەوە بناسرێنەوەو ماڵەکەمان ئاشکرابێ، بەتەنیا زۆر بێزار دەبووم، باوکم لەکاتی دەست بەتاڵیدا شیعری کورتیلەی فێردەکردم کە لەماناکانیشیان نەدەگەیشتم، بەڵام حەزم لە مۆسیقاکانیان بوو بۆیە زوو ئەزبەرم دەکردن وەک:

**«لەناو باغی ژیان هەردەم گوڵێکی سوورە سەربەستی**
**لەناو گشت کۆمەڵی عالەم بلێسەی نوورە سەربەستی»**

لەمانای سەربەستی نەدەگەیشتم، بەڵام هەستم بە خرۆشێک دەکرد.

لە (کۆیە)ش باوکم «ئەحمەد دڵزار» و مامم «کەریم شارەزا» کتێب و گۆڤاری کوردییان زۆر بوو بەردەوام دەستم تێوەردەدان و هاموشۆی کتێبخانەی گشتی کۆیەشم دەکرد، هەر لە زووەوە هەستم بەدڵناسکی و جوانویستی دەکرد، وەک یەکێک لە دەرگا بداو بانگم بکات، نەمتوانی دوای ئەو دەنگە نەکەوم، هەر بەدوایدا ڕۆیشتم و هەر نەیگەیشتمێ.

**رامــان:** کاتێکی دیاریکراوت بۆ نووسین هەیە، یان ئیلهام کاریگەری وای هەیە کاتی نووسین دەستنیشان بکات و کاتی پەیدابوونی کتوپڕی خۆی بسەپێنێت؟

**ئازاد دڵزار:** کاتێکی دیاریکراوم بۆ شیعر نووسین نییە، بەزۆری ئەوەی کە دەمەوێ بیڵێم لە خەیاڵی خۆمدا چەند جار دەیڵێمەوە، کە شتێ تازەش دێتە سەر، دیسان لەگەڵ ئەوانی پێشتر هەموویان دەڵێمەوە ئەوجا دەیانخەمە سەر کاغەز، دوای مۆنتاژو هەندێ دەسکاری شێوەی کۆتایی وەردەگرێ. ئەگەر شتێکم لەخەیاڵدا بێ و نیەتی نووسینم هەبێ، حەز دەکەم بە تەنیا پیاسە بکەم.

ئیلهام بەخشندەییەکی گرنگە، بەبێ ئیلهامیش شیعرێک بەرهەم نایەت گیانی لەبەربێ و بژی، زۆرجار لەکاتی خوێندنەوەدا کتوپڕ ڕستەیەک، یان جۆرە دەربڕینێک کە دیمەنێکی تایبەتی بخاتە پێش چاو، ئیلهامی شیعرێکی بەمن داوە کە هیچ پێوەندی بەو نووسینەوە نەبووە کە خوێندوومەتەوە، گەلێ جاران گۆرانییەکی میللی، یان قسەو پەندو گفتاری پیاوێکی کۆنە ساڵی لادێی دڵی داخورپاندووم و سەرچاوەی شیعری تەقاندووم. شاعیری گەورە بەهۆی خوێندنەوەو خۆڕۆشنبیرکردنەوە پەیدانابێ، ئەگەر خودان ئیلهام نەبێ و ئامادەییەکی خۆڕسکی تێدا نەبێ.

**هەڤپەیڤینی: سە.ح ڕەنجدەر**

# دورجەکەی نالی

**عەبدوڵلا خدر مەولوود**
**(زانکۆی سەلاحەدین/ کۆلێژی پەروەردە)**

دیارە نووسین لەسەر شیعری شاعیرێک خوێندنەوەیەکی وردی گەرەکە، زۆر پێش کارکردنم لەم باسە، ئاگادارو ئاشنایەتیم لەگەڵ شیعرەکانی نالی هەبووە، ئەوە ماوەیەکە خوێندنەوەکە چڕو پڕتر بووە. ناوە ناوە تێبینی و ڕاو بۆچوونی تازەم لەلا دروست دەبوو، وام بە باش زانی ئەوەی پێوەندی بە لایەنی ئایینییەوە هەیە لێرە تۆماریان بکەم. ئەگەر باسەکەم دەوڵەمەند بکەن لە ئاواتەکانم نزیک دەبمەوە.

لە یەکەم دێڕی، یەکەم شیعری دیوانی نالی(*) ئەم دێڕە وا لێکدراوەتەوە:

**ئەی جیلوەدەری حوسن و جڵەوکێشی تەماشا**
**سەر ڕشتەیی دین بێ مەددەدی تۆنی یە حاشا   ل٤٨**

(ئەی ئەوکەسەی جوانیی و ورشە ئەبەخشێ و جڵەوی سەرنجی خەڵکیش ڕائەکێشی بۆ تەماشای ئەو جوانییە). بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە لێکۆڵەرەوەکان دەڵێن: (ئەی ئەو خوایەی جوانی خۆت لە کردارە سەرسام کەرەکانتدا دەر ئەخەیت و مێشک و بیریش ئەدەی بە ئادەمیزاد لێی ورد ببنەوە و بەوە جڵەوی سەرنجیان ڕائەکێشی بۆ بیرکردنەوە لە گەورەیی خۆت، نەک هەر کاروباری دنیا، بەڵکو سەرەتای ئایینیش، یاخود سەرەتای بینین هەرگیز بێ یارمەتی تۆ نابێ). دواتر دەڵێن: (لە «جڵەو کێشی تەماشا»یشدا ئیستعارەی مەکنییە هەیە، ئەوەتە (تەماشا) شوبهێنراوە بە ئەسپ و (جڵەو)یش بەڵگەیەتی، چونکە جڵەو لەو شتانەیە لەگەڵ ئەسپ دەگونجێن)«١».

ئەو غەزەلە حەفت دێڕە و ئەم وشانە سەرواکانی پێکهێناوە (تەماشا- حاشا، بەخشا، شەهنشا، معاشا، ڕشاشا، ماشا، ئینشا). وشەکانی (بەخشا، شەهنشا) نەبێت ئەوانی تر هەموویان عەرەبین، بەڕای ئێمە وشەی (تەماشا) لەو دێڕە بە واتا کوردییەکەی بەکارنەهاتووە، نالی زۆر شارەزاو وەستایانە ئەم جۆرە گەمەو یاریانە بە وشەو واتا دەکات. زۆر لەهاو واتا کوردییەکەی تەماشاش لەناو دێڕە شیعرەکانی بەکارهاتوون (سەیر، بنوارە، دین، دیتن، بینین... تاد). هەمان وشەی تەماشا وەکو وشەیەکی کوردی لای نالی بەکارهاتووە:

**وەرە سەر سەیری سەفاگاهی نەزەرگەی چاووم**
**کە عەجەب مەنزەرەیی سەیرو تەماشایێکە   ل٨٠**

ئەو بەکارهێنانە لە هەردوو وشەکانی (سەیر، دین) ڕەنگیان داوەتەوە، بەهۆی ئەو پێکهاتە واتایەی لەم وشانە کۆ بوونەتەوە، کە دوو واتا یا زیاتر بە دوو زمانی جیا لە یەک دەبەخشن. ئەم وشانەو ئەوانەی وەک ئەمانە هەمان دەور دەگێڕن هەریەکە و کۆمەڵە واتایەک دەبەخشن لە فەرهەنگی هەردوو زمانەکاندا. وەک سەیر: سەیران، گەڕان، تەماشاکردن، لە ڕێ ڕۆیشتن.

تەماشا وشەیەکی عەرەبییە و چاوگەو لە فرمانی (مشی، یمشی)یەوە هاتووە (یتماشی) و (تماشی)یش هەر لەوەوە هاتوون، کە ئەویش واتای پیاسەکردن، گەڕان و سووڕان بە پێ یا لێوردبوونەوە، ئەندێشە، عیبرەت دەگەیەنێ. حافزی شیرازی(٢) وشەی تەماشای بە سێ واتای جیا بەکارهێناوە:

١- گەشت و گوزار و گەڕان.

٢- دیتن.

٣- ورد بوونەوە و ئەندێشە و عیبرەت.

لە فەرهەنگەکان واتای تریشی هەیە لەوانە (سەرگەرمی و سەرقاڵی)«٣» حافزی شیرازی دەڵێ«٤»:

**دیدمش خرم و خندان قدح باده بەدست**
**واندر آن آینە صد گونە تماشا کرد**

واتە:

**دیم دڵشادو دەم بە پێکەنین، پیاڵەی مەی بەدەست**
**لەنێو ئەو پیاڵە مەی (ئاوێنە)ییەدا سەیری سەد جۆر جوانی دەکرد**

وشەی (دین)یش لەو دێڕە تەنیا دوو واتای بۆ نووسراوە، کەچی لە فەرهەنگەکانی زمانی (کوردی، عەرەبی، فارسی) واتایەکی گەلێ زۆری بەرامبەر نووسراون. شتێکی بەڵگە نەویستە کە وشەی فرە واتای شیعری، واتای دێڕەکان دەوڵەمەندو قووڵتر دەکەن، ئەو جۆرە بەکارهێنانەی وشە شیعرو شاعیری چاک و ڕەسەن لە هی تر جیا دەکاتەوە، وشە وەک کەرەسەیەکی شیعر بۆ هەردوولا سەنگی مەحەکە.

### موساوی وەک یەک و لوولن لە هەردوو لاوە زولفەینی نموونەی عەکسی حەرفی میم و نوون و واوە زولفەینی ل١٢٣

لێکۆڵەرانی نالی (دیوان) و نووسەرانی تریش ئەم دێڕە شیعرەیان وەرگرتووە و باشیشیان لێکداوەتەوە، بەڵام هیچ کام لەو نووسەرانە ئاگاداری ئەوە نەبوونە کە سۆفی (ئیبنیلعەرەبی) کتێبێکی هەیە بەناوی (المیم و الواو والنون)«٥»، ئێمە هیچ سەرد داوێکمان بەدەستەوە نییە کە ڕاستەوخۆ بمانگەیەنێتە ئەو سەرچاوەی بزانین نالی ئاگاداری نامە و کتێبەکانی ئیبنیلعەرەبی بووە، یا بەرهەم و نووسینەکانی خوێندۆتەوە، یا ئەو کاریگەریە چەندو چۆنە... تاد. بۆ ئەم بابەت و لایەنە بێ دەلیل و دەست بە تاڵین. ئەوەی تێبینی دەکرێ نالی لەو دێڕە شیعرەیدا هونەرێکی ڕەوانبێژی زۆر بە فراوانی بەکارهێناوە، کە سەر بە بابەتەکانی جوانکارییەکە (قلب)ی پێ دەڵێن واتە هەر وشە، دەستەواژە، یا ڕستەیەک لە پێشەوە چۆن دەخوێندرێتەوە، ئاواش بەبێ هیچ جیاوازییەک لە دواوەش بخوێندرێتەوە (وک یک و)، (لول)«٦». نالی هەر لەو دێڕە هونەرێکی تریشی بەکارهێناوە، کەس باسی ئەو هونەرەی نەکردووە، لەنیوە دێڕی دووەمی ئەو دێڕە وشەی وای هەڵبژاردووە بە پاش و پێش کردنی ئەوانیش کێشی شیعرەکە ناگۆڕێ، کێشی ئەو شیعرە هەزەجی هەشت هەنگاوی تەواوە، واتە: مفاعلین×٨، جێ گۆڕکێ بە هەر کام لەو تەفعیلانە بکەی نە کێش و نە واتاو نە سەروای ئەم دێڕە تێک ناچێت:

**ن/مـوو/نەی/عەک/سی/حەر/فی/می/م و/نوو/ن**
**و/وا/وە/زول/فەی/نی**
**ن/موو/نەی/عەک/سی/حەر/فی/نوو/ن و/می/م**
**و/وا/وە/زول/فەی/نی**
**ن/موو/نەی/عەک/سی/حەر/فی/وا/وو/می/م**
**و/نوو/نە/زول/فەی/نی**

بە هەر گۆڕانێکی تریش ئەو کێشە دیسان هەر وەکو خۆی دەمێنێتەوە. ئێمە لەو باوەڕەداین ئەگەر نالی ئاگاداری ئەو بەرهەمەی ئیبنیلعەرەبیش بووبێت ئەو هەروا بێ دەسکاری وەری نەگرتووەو دەست ڕەنگینی و لێهاتوویی خۆشی لەگەڵدا گرێ داوە، نالی لەوانە نەبووە بە سەدەقەو سواڵ، یا وەرگرتنی شتی ئامادە و حازر لەم و لەو خۆی پێ دروست بکا. بۆیە دەبینین نوونەکەی پێش خستووە (نوون و میم و واوە) وەک لە پەراوێزدا تۆمار کراوە(*)، ئێمەش ئەو ڕاو بۆچوونە پەسەند دەکەین کە دەبێ نوونەکە لە پێش بێت هەر بۆ ئەوەی ڕێزبەندی پیتەکان لەگەڵ دەنگەکانی (نمو)ی وشەی نموونە یەک بگرنەوە«٧»، ئێمە ئەو عەکس و وەک یەک و لوولەی ئەو دێڕە شیعرە زیاتر بۆ ئەو یارییە قەشەنگ و ڕەزا سووکە دەگەڕێنینەوە کە بەکێشەکە کراوە.

**(نالی) نیەتی سیحری بەیان، حیکمەتی شیعرە**
**ئەمما هەیەتی قووەتی دڵ قوودرەتی ئینشا ل٤٨**

نالی زۆر وەستایانە و ئوستادانە سێ پاش و پێشی بەم فەرموودە پیرۆزە کردووە:

١- جێ گۆڕکێی بە هەردوولای فەرموودەکە کردووە (ان من الشعر لحکمة، وان من البیان لسحرا)ی کردۆتە (سیحری بەیان، حیکمەتی شیعر).

٢- (ان من الشعر لحکمة) کراوە بە (حیکمەتی شیعر).

٣- (وان من البیان لسحرا) بووەتە (سیحری بەیان).

دواتر ئەو پرسیارە بەجێیەش دەوروژێنێ: ئایا بەهێزی دڵ و هەبوونی توانا بۆ داهێنان و دروست کردن و داڕشتنی شتی تازەو دانسقە، دووەکەی سەرەوە لە (سیحری بەیان) و (حیکمەتی شیعر) بەدەست دێت!؟ نالی لەو دێڕە باس لە هێز دەکا، هێزەکەش هێزی بازوو، لەش و بیرو، بینین و... ئەوانی تر نییە، ئەو باس لە هێزی دڵ دەکا، دڵیش شوێن و سەرچاوەی بیرو باوەڕو ئیمانە.

لە نالی (دیوان) وا هاتووە، کە ئەم دێڕە دوو ئیقتیباسی تێدایە:

١- بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر (د) کە نیشان درا.

٢- بۆ ئەو ئایەتی کە دەفەرموێ: (اانتم انشأتموها، ام نحن المنشئون).

ئێمەش دەڵێین، ئیقتباس هونەرێکی ڕەوانبێژییە و دەچێتە ناو بابەتی هونەری سێیەم کە ئەویش جوانکارییە. ئیقتیباس: (تێهەڵکێش کردنی هەندێ لە قورئان و فەرموودەکانە لە گوتندا...)«٨» لە لایەکی تر زانایانی ڕەوانبێژی دەڵێن بۆ شاعیر هەیە (گۆڕانکارییەکی کەم لە وەرگیراوەکە بکا، جا لەبەر پێویستی کێش، یا هەر پێویستییەکی تر بێت)«٩» ئایا بەو هەموو گۆڕانکاری و پاش و پێش کردنانەی نالی بەو فەرموودەیەی کردووە، ئەو هونەرە لەو دێڕە هیچ سێبەرو پاشماوەیەکی ماوە!؟ بۆ خاڵی دووەمیش دیارە هیچ ئیقتیباسێک وەک ئەو پێناسە و زانیارییەی ئاماژەمان بۆ کرد، دروست نابێت و نییە. ئەم دێڕە ئەگەر ئیقتیباسیشی تێدا نەبێت، نالی بای ئەوەندەی دەست ڕەنگینی و وردەکاری تێدا خەرج کردووە کە حسێبی شادێڕێکی بۆ بکرێ. لەو شوێنە تۆمارکردنی ئەو تێبینییە بە پێویست زانرا: لە نالی (دیوان) و لێکدانەوەی دێڕەکان یەکجار زۆر ناوی ئیقتیباس هاتووە، ئێمەش دەڵێین: لە هەموو ئەو جێگایانەی باسی ئیقتیباس کراوە و ئەو مەرجانەی سەرەوەیان تێدانەبێت، دیارە ئیقتیباس نین. ئێمە ئەو دەقە پەسەند دەکەین کە (نییەتی و هەیەتی) تێیدا تۆمار کراوە لەو دێڕە (نییەتی) بە واتای نییەت و نیاز زۆر زۆر دوورترە لە واتای نیتی یا نییەتی، نالی (نییەتی) بە واتای یەکەم بەکارهێناوە، بەڵام ئاشکرا دیارە کە سیغە و شێوازی تایبەتی خۆی پێداوە:

**بێ نییەتی تەقبیلی دەمت عاتیلە ڕۆژووم**
**بێ حەزرەتی میحرابی برۆت عاتیلە نوێژم ل٧٦**

هاتنی وشەی (عاتیل)ە لە هەردوو نیوە دێڕەکان بە هەڵەی نووسەری دەستنووس دەچێ، وەک لە نالی (دیوان) هاتووە یەکێکیان (باتیل) با زۆر شاعیرانەتر دەبوو.

**دونیای چلۆن دەوێ کە بەقەد هیمەتی نەکرد**
**ئەم خیلعەتە کە ئەتلەسی نۆ چەرخی ئەخزەرە**
**(ئەستەرە) ل١٤٩**

لێکۆڵەرانی نالی (دیوان)، لە لێکدانەوەی وشەکان دەڵێن: (ئەستەر: مەعنایان بۆ ساغ نەکرایەوە. لەوانەیە صیغەی موبالەغەی (ستر) بێ واتە ئەوەی پتر داپۆشێ)، (ئێمە «ئەستەرە»مان دانا چونکە «ئەخضەرە» جارێکی تریش وتراوە)«١٠» لەگەڵ ئەوەشدا دێڕەکەیان لێکداوەتەوە، لەو کتێبەی کە بۆ پێداچوونەوە و ڕاست کردنەوەی ئەو دیوانە نووسراوە، لە مەڕ لێکدانەوەی ئەو وشەیە دەڵێ: (شەرحەکە لە وشەی «ئەستەر»دا ماوە. ئەگەر سەیرێکی دیوانەکەی گیو کرابایە لەوێ ئیشکالەکە دەڕەوییەوە، تومەز (نۆ چەرخی ئەخضەرە) یە، دیارە نوسخە نووس (اخضری)ی نووسیوەو قەوسی (ض)ەکەی سواوە و نوختەکەی ئەو و (خـ) بوونەتە دوو.. کڵاوی (خ)ە کەش بەرسووان یان ڕەش بوونەوە کەوتووە.. نازانم بۆچی بایەخیان پێ نەداوە و نەیانخستۆتە پاڵ نوسخەکانی دیکە)«١١».

پێشەکی لێکۆڵەرەکان ئاگاداری چاپەکەی گیون و بە ئیختیارکردنی ئەستەر بۆ (زەربی) ئەو دێڕە شیعرە بەرامبەر بە (ئەخزەر)، کارێکی ڕاست و دروستیان نواندووە و نیشانیان پێکاوە. ئەوان ئەمە بۆ (چونکە «ئەخضەرە» جارێکی تریش وتراوە) دەگەڕێننەوە، خۆ وشەکانی (ئەنودرە)، (سەرە)ش دووبارە بوونەتەوە. دووبارە بوونەوەی وشەیەک بۆ سەروا لای نالی ئێمە بۆ سێ ئەگەری دەگەڕێنینەوە:

١- هەردوو وشەکان ڕەگەزدۆزی تەواو پێک دەهێنن.

٢- نووسەری دەستنووسەکان پاش و پێش و گەمە بە دێڕە شیعرەکان بکەن و لە نەزانینەوە لێکیان نزیک بکەنەوە.

٣- خەوش و عەیبێکە شاعیر تووشی دەبێ و لە زانستی سەروادا پێی دەوترێت (الایطاء)«١٢».

لێرە بۆ سەروای ئەو شوێنە ئێمە نالی زۆر بە گەورەتر دەزانین لەوەی تووشی عەیب و خەوشی لەو بابەتانەبێت. لێکۆڵەرەکان جارێکیش (ئەستەرە) یان نووسیوەو لایان وابووە کە پیت و دەنگی (ە) تەواوکەرو ڕەسەنە، کەچی خۆی لە (ئەستەر+ە) پێکهاتووە. بۆ دۆزینەوەی واتای تەواوی ئەو وشەیەش تەماشای فەرهەنگەکانی ئینگلیزی و فەڕەنسی و فارسی و عەرەبی و کوردی کراوە«١٣».

فەرهەنگی کوردستان دەڵێ: (بە دیالێکتی گۆران ئەستەر بەواتای (بەری کەوا، ئەستار) هاتووە«١٤».
وشەی ئەستەر لە «ئەسترلومیقا»ی گریکییەوە وەرگیراوە کە واتای ئەستێرە ناسی دەگەیەنێ فەرهەنگەکان کۆکن لەسەر ئەوەی واتای (هەسار، ئەستێرە،، یا ئەستێرەناسییە، ئەستەرو ئەستارو ئەستێرەو.... تاد).
هەموویان لەو سەرچاوە کۆنە هاتوون، ئەو گۆڕانکارییەی هەیە لەناو بنەماڵەکانی یەک زمان شتێکی زۆر سادەو ئاساییە (ئەسترلاب)یش هەر لەوەوە هاتووە و چەندەها واتای تریشی بۆ نووسراوە.

**قاروونە فەلەک موستەحەقی گرتن و خەسفە**
**زیوو زەڕی شەمس و قەمەرە، درهەمی کەوکەب   ل٥٧**

لە نالی (دیوان) و کتێبی دەستەودامانی نالی باس لەو دێڕە کراوە. لێکۆڵەرەکان ئەو دێڕەیان باش لێکداوەتەوە، تەنیا ئەوەندە هەیە ئەنجامەکەیان بەدەست نەهێناوە. نالی دەڵێ: قاروون زێڕو زیوو درهەمی ئەوەندە زۆر بوو نەدەهاتنە ژمار ئەو دەوڵەمەندییەی بووە هۆی ئەوەی لووت بەرزو مەغروور بێت، زۆر تێپەڕاندو بە سەرکێشی سنوورەکانی بەزاند بەرامبەر بە بیرو باوەڕە ڕاست و دروستەکانی خەزرەتی موسا، بۆیە خوای گەورە خۆی و هەموو سەروەت و سامانی نغرۆ کرد (ئێستاش لەناو کوردەواری خۆمان وا باوە کە ئەو زرینگاندنەوەی جار نا جار لە گوێمان پەیدا دەبێ دەڵێن ئەوە زێڕو سەروەتەکانی قاروونن و هەر لە دابەزین و ڕووچووندان و پێک دەکەون و دەزرینگێنەوە). دواتر دەڵێ: فەلەکیش ڕۆژو مانگ و ئەستێرەی هەیە، دەیەوێ لاسایی و چاو لە قاروون بکاو لە خۆی دەربچێ، بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدا ڕکەبەری و مونافەسەی جوانی خۆشەویستەکەمان بک. بۆیە نافی خۆیەتی ئەوەی بەسەر قاروون هاتووە، بەسەر فەلەکیش دابێت.

**سەحرا بەتەجەللا دەکەنە وادی یی ئەیمەن**
**قامەت شەجەرو مەزهەری ئەنواری ئیلاهن   ل٨٤**

بۆ لێکدانەوەی ئەم دێڕە، لێکۆڵەرەکان زۆربەی زۆری گۆتەکانیان بەرەو لای چیرۆکەکانی حەزرەتی مووسا ئاراستە کردووە، هەر لەبەر هەبوونی وشەکانی: تەجەللا، وادیی ئەیمەن، شەجەر کە دەوری سەرەکییان هەیە لە چیرۆکەکاندا.

ئەم دێڕە هەروەکو دە دێڕەکەی تر باس لە سەربازو چەکدار دەکا، لە خۆ نیشاندانێکدان کە بۆنەو ئاهەنگێک دەگێڕنەوە هەر لە یەکەم دێڕەوە دیارە نالی باس لە چی دەکا:

**ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاسسەیی شاهن**
**ئاشووبی دڵی مەملەکەت و قەلبی سوپاهن   ل٨٤**

سەحرا: واتە بیابان و چۆلەوانی، وشکانی و بێ ئاوو ئەوەدانی، ترس و سامناکی. تەجەللا: دەرکەوتن. وادیی ئەیمەن: بەشێوی یا دۆڵی لای ڕاست هاتووە، لەو دێڕە بە شوێنی پیرۆز یا شوێنێک پڕبێت لە هێمنایی و ئاسوودەیی. نالی لەو دێڕە دەڵێ: ئەو سەربازو چەکدارانە ئەگەر لە شوێنێکی بە ترس و سامناکیش دەرکەوتن سێبەری خۆشی و ئاشتی وەک چەتر هەموو لایەنەکانی ژیان دادەگرێ، ئەوەتە بالایان وەکو داری ڕاست و سەربڵند وان کە ئەوەش ئیشارەیەکی تێدایە بۆ شینایی و ئاوەدانی، وەک لێکۆڵەرەکان دەڵێن ئەم دێڕە سەرلەبەری ئیقتیباسە لە ئایەتی (فلما اتیها نودي من شاطيء الواد الايمن في البقعة المباركة من الشجرة، ان يا موسى اني انا الله رب العالمين). ئێمەش دەڵێین نالی ویستوویەتی دوو ڕووداو بە هەندێ لە وشەکانی قورئانی پیرۆز لێک گرێ بدا، ڕووداوی یەکەم زۆر کۆن و بەناوبانگە، ئەو دەیەوێ بە ڕووداوەکە کە لای زۆربەی زۆری خەڵک زانراوە، ڕووداوی دووەمی پێ ببەستێتەوە کە هەر ئەویشی مەبەست بووە.

**ئەشخاسی خاسسە (تشخص ابصارهم) هەموو**
**(وانەفسی!) یانە هەر یەکە بۆ خۆی موحەییەرە**
**ل١٥٢**

لەو دێڕە ئەشخاسی خاسسە، بە پیاوانی تایبەتی

لێکدراوەتەوە.«١٥». نالی دەیەوێ بڵێ: لەو ڕۆژەی کە کەس بەکەس نییە پێغەمبەرەکان هەریەکەو بەکارو شتێک خەریکن و خەڵکانێک دەچنە لایان بۆشەفاعەت کردن لای باری تەعالا، دیارە ئەوانیش ناتوانن و عوزریان هەیە، واتە ئەوان هەر (نەفسی، نەفسی)یانە. کەچی پێغەمبەری ئێمە (د) ئەوەی بیگاتێ شەفاعەتی بۆ دەکاو ڕزگار دەبێ، گۆتەو دروشمی ئەو لەوکاتە پڕ مەترسی و ئاستەنگە (ئوممەتی، ئوممەتی)یە.

**لەم خاکی دەری ڕەحمەتی بێ زەحمەتە (نالی)**
**فیردەوسە مەئالی**
**حاشاکە لەمەی دا ببمە سائیلی مەحرووم**
**هەرچەند لە عوسا تم ل١٦٩**

لە نالی (دیوان) ل٢٧٠ دەڵێین: (لە کۆکردنەوەی (ڕەحمەت) و (زەحمەت)دا جیناسی (موضاریع هەیە).

لە کتێب و سەرچاوەکانی ڕەوانبێژی بەم جۆرە ڕەگەزدۆزییانە دەڵێن (تصحیف) واتە: (هەردوو وشەکان بەخاڵ جیاوازییان هەبێ)«١٦». لێکۆڵەرەکان ناوی ئەو ڕەگەزدۆزییەیان نەهێناوە.

**دڵ سیەهـ سەنگ نەبێ مایلی خاکی وەتەنە**
**خاڵی لەعلی حەبەشە ساکینی بوردی یەمەنە ل١٠٣**

لە نالی (دیوان) ل٥٢٤، لێکۆڵەرەکان زۆر درێژەیان بە لێکدانەوەی ئەم دێڕە داوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە ڕایەکی هێمن موکریانیشیان تۆمار کردووە. لەبەر ئەوەی ناتوانین هەموو ئەو نووسینانە لێرە پێش چاو بخەین لەبەر درێژە دادرێ، بۆیە هەر بابەتەو بە جیا شتێکیان لەسەر دەنووسین. بۆ وشەی (خاڵی لەعلی ڕەش) دەڵێن: ئەوەتە خاڵیش (خاڵی یار) کە وەک لەعلی حەبەشە ڕەشە بۆ وشەی (لەعلی حەبەشە) زۆر کتێب و سەرچاوە و فەرهەنگ تەماشا کراوە، هیچ هێماو ئیشارەتێکمان بەدەست نەکەوت. لە فەرهەنگەکان بە تێروتەسەلی باس لە لەعل کراوە، کە زۆر دژ بەو لێکدانەوەن. لەعل بێ لە واتا فەرهەنگییەکەی بۆ زۆر واتای تریش خواستراوە، ئەوەتا حافزی شیرازی بۆ ئەو واتایانەی خواستووەو لە دێرە شیعرەکانی بەکاری هێناون:

**یەکەم:** بەواتای بەردی بە قیمەت و گرانبەها.
**دووەم:** خواستراو بۆ شەراب.
**سێیەم:** خواستراو بۆ لێو.
**چوارەم:** خواستراو بۆ فرمێسک.
خواستراو بۆ لێو:«١٧»

**خدارا ای رقیب امشب زمانی دیده برهم نه**
**که من بالعل خاموشش نهانی صد سخن دارم**

واتە: بۆ خاتری خودا، ئەی ڕەقیب، دەمێ، یان ماوەیەک چاوەکانت بنوقێنە، واتە ساتێ بنوو، کە من لەگەڵ یاردا کاتێ کە بێدەنگە و وتەیەک لە دەم و لێوە ئاڵەکانی دەرناچێ سەد قسەم هەیە کە بە پەنهانی بۆی بکەم.

ئەگەر بەوردی سەیری ئەم دێڕەی نالی بکەین، ئاشکرا دیارە ئەویش وشەی لەعلی خواستووە و لە جیاتی لێوی بەکارهێناوە. بەوپێیە واتاکەی بەو شێوەیە دەبێت (خاڵێکی ڕەش لەسەر لێو) خۆی بنوێنێ. بۆ وشەی (ساکین)یش دەڵێن (نیشتەجێ بووە). ئێمەش لەو باوەڕەداین نالی ئەو وشەیەی بەواتای سابیت و نەجووڵاو و بێدەنگ بەکارهێناوە، نەک نیشتەجێ بوون. بۆ ئەو ڕایەی کە دەڵێ: (حجر الاسود) سیاسەنگە ئەوە زۆر لێک دوورە، (حجر الاسود) واتە بەردی ڕەش، سەنگی سیا، نالی دێری شیعری هەیە کت و مت وای بەکارهێناوە:

**بەو ڕەحمەتی عامەکە دەکا سەنگی سیەهـ زەڕ**
**لەم قەلبە وەکو بەردە ڕەشی ڕەششی ڕەشاشا ل٤٨**

لەو دێڕە هەست بەجۆرە پەیوەندییەک دەکرێ کە لەنێوان هەردوو نیوە دێڕەکان هەیە، وەک لەفف و نەشر خۆیان نیشان دەدەن:

دڵ لەگەڵ خاڵی بە هەر دوو واتای (خاڵی ڕەش، بەتاڵ).

**سەنگ بەرامبەر بە لەعل.**
**سیەهـ بەرامبەر بە حەبەش.**
**مایل بەرامبەر بە ساکین**
**خاک و بوردە بەرامبەر وەتەن و یەمەن.**

لە نالی (دیوان) بوردەی یەمەنیان لێکداوەتەوە، بەڵام لە فەرهەنگەکان (بوردە) و (بورد) کۆمەڵە واتایەکیان بەرامبەر نووسراوە کە زۆریان بۆ لێکدانەوەی تر دەست دەدەن.«١٨» بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان دانە پاڵی بوردەیی یەمەن بۆ بوردەکەی پێغەمبەر گۆتەیەکە و زۆر لێک دوورن. زۆر دێڕە شیعری نالی هەیە هێشتا سیحرو تەلسمیان بەتاڵ نەکراون. لەوەی بەچاکی بۆی بچین و پاش لێکدانەوەیان تێیان بگەین، ئەو دێڕەش یەکێکە لەو دێڕانە:

**یەک ڕەنگم و بێ ڕەنگم و ڕەنگین بە هەموو ڕەنگ**
**بەم ڕەنگە دەبێ ڕەنگ ڕەژی عیشقی حەقیقی ل١٢١**

لە نالی (دیوان) ل٦٥٥، لێکۆڵەرەکـان درێژەیان بۆ لێکدانەوەی ئەم دێرە داوەو هەرچەندە بۆ ئەم لێکدانەوەش ڕای ئەم و ئەویش وەرگیراوە. ئەوەی تێبینی دەکرێ هیچ حسێبێکیان بۆ ئەو هەموو بەکارهێنانەی وشەی ڕەنگ نەکردووە.لە کتێبی دەستەو دامانی نالی، ل٢٨٧،«١٣» دێری بۆ نووسراوە. چەند واتایەکی تری وشەی ڕەنگی نووسیوە، دووانیان نەبێت ئەوانی تر زۆر دوورن. بە قەناعەتی ئێمە نالی ئەو هەموو ڕەنگانەی هەر بەواتا کوردییەکەی بەکار نەهێناوە، لە فەرهەنگەکانی زمانی فارسی بەوردی واتای ئەم وشەیان تۆمار کردووە، ئەوەتە فەرهەنگی (برهان قاطع) بۆ وشەی ڕەنگ (٣٣) واتای بەرامبەر کردووە و بۆ هەندێکیان نموونەی گەورە شاعیرانی فارسیشی هێناوەتەوە.

یەک ڕەنگم: دوو ڕوو نیم، وەکو خۆمم ناگۆڕێم، گرتنی تاکە ڕێبازێک.

بێ ڕەنگم: خاوەنی هیچ ڕەنگێک نەبێت، ناتەواوی باری تەندروستی، بێ فروفێڵ و تەڵەکەبازی، بێبەش و نەسیب، بێ ڕەنج و مـحنەت، بێ ماڵ و زێرو شتومەک...تاد.

ڕەنگین: ئاڵ و واڵا، ڕەنگی زۆر پێکەوە، ڕەنگاو ڕەنگ. جۆراوجۆر.

ڕەنگ: واتا گەلێکی زۆر.

بەم ڕەنگە: بەم شێوەیە، واتای تریش.

ڕەنگ ڕەژی: لە نالی (دیوان) نووسراوە (ڕژی). ڕەنگی ڕێژ، ئەگەر ڕەژی لە سەرەتاوە (رزی) فارسی بووبێت کە ئەویش لە هەردوو وشەی فەرهەنگی (رزیدن)، (رزین) زۆر نزیکە، بەڵکو بەشێکە لەوان، دەبینین هەردوو واتاکانیان بۆ ئەو دێرە لە شوێنی خۆیەتی، ڕەزیدەن بەواتای ڕەنگ کردن هاتووە، ڕەزینیش بەواتای: مکوم، تەواو، سەنگین، ڕاست و دروست.....تاد.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

(*) نالی (دیوان)، مودەڕیس، ل٧٥.
(١) سەرچاوەی پێشوو.
(٢) حافظ (دیوان)، حافظ نامە، بهاءالدین خرمشاهی، پخش اول، چاپ دهم، شرکت انتشارات علمی و فرهنگی، ١٣٧٨، ص٥٢٨.
(٣) محمد خلف برهان، برهان قاطع.
(٤) حافظ (دیوان)، ص٥٦٤.
(٥) محي الدين ابي عبدالله بن العربي، رسائل ابن العربي، الطبعة الاولى، دار احياء التراث العربي، لبنان،؟،؟. (نامەی هەشتەم).
(٦) مەسعود محەمەد، دەستەو دامانی نالی، چاپی یەکەم، کتێبی هەرزان، سوید، ١٩٩٨، ل٢٩٩.
(*) نالی (دیوان)، مودەڕیس، ل٦٧٥.
(٧) مەسعود محەمەد، دەستەودامانی نالی، ل٢٩٩.
(٨) الخطيب القزويني، الايضاح في علوم البلاغة، الجزء الثاني، مكتبة المثنى، بغداد،؟، ص٤١٦.
(٩) سەرچاوەی پێشوو، ص٤١٩.
(١٠) نالی (دیوان)، مودەڕیس، ل٤٢٥.
(١١) مەسعود محەمەد، دەستەودامانی نالی، ل١٨٦.
(١٢) الايطاء (دووبارەکردنەوەی سەروایە بە هەمان شێوە و بچم و مانا لە شیعردا عبدالعزيز عتيق (د)، علم العروض والقافية، دارالنهضة العربية، ١٩٧٤، ص١٦٦.
(١٣) أ- منير البعلبكي، المورد، الطبعة الحادية عشرة، دارالعلم، للملايين، بيروت، ١٩٧٧.
ب- جبور عبدالنور(د)، سهيل ادريس(د)، المنهل، الطبعة الخامسة، دارالعلم للملايين، بيروت، ١٩٧٩.
ج- حسين خلف برهان، برهان قاطع.
د- رينهارت دوزي، تكملة المعاجم العربية، ترجمة: د. محمد سليم النعيمي، الجزء الاول، دارالحرية للطباعة، بغداد، ١٩٧٨.
(١٤) گیوی موکریانی، کوردستان، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ١٩٩٩.
(١٥) نالی (دیوان)، مودەڕیس، ل٤٤٢.
(١٦) اسامة بن منقذ، البديع في نقد الشعر، تحقيق د. احمد بدوي- د. عامر عبدالمجيد، القاهرة، ١٩٦٠، ص١٧.
(١٧) حافظ (دیوان)، ص٢٨٨، ٩٤٥.
(١٨) رينهارت دوزي، تكملة المعاجم العربية، الجزء الاول.

**تێبینی: بەشی یەکەم و دووەمی ئەم بابەتە لە ژمارە (٦٤-٧٦)ی گۆڤاری ڕامان بڵاوکراوەتەوە.**

**«ڕامان»**

# ئافرەت بەر لە سەدەیەک لە ئاوێنە و کامێرای شیعری مەولەوی تاوەگۆزی-دا

عەبدولڕەحمان تاوەگۆزی
(سلێمانی)

مەولەوی ئەو شاعیرە بەرزە خۆش تەرزەیە کە حەکیمانە لە گۆڕەپانی سوارچاکیدا ئەسپی بیر تیژی خۆشوێژی خۆی تاووتین داوە، ئەو مرۆڤەیە تا هەنووکەش بەهای شیعری ئەو زێڕییە و (عەیار)ی بەرزی خۆی لە دەست نەداوە، کەم گۆڤارو ڕۆژنامەیەک دەبینی میوانداری نەکردبێ و باخچەی چیمەن و گولزاری خۆی بە ئاوی شیعری سازگاری ئەو ئاوپڕژێن نەکردبێ. دوور نەڕۆم و بێمە سەر مەبەست (پایەی) ئافرەتە لای مەولەوی کە چۆن دەنگ و ڕەنگی ئاوێزان کردووە و لە دیدو بۆچوونی ئەودا کە سەدو چەند ساڵێک لەمەوبەر ئافرەت پایەیەکی پتەو بووە لەنێو باڵەخانەی شیعری ئەودا. کێ بووە بتوانێ لەو چەرخەدا بەو شێوەیە لە ئافرەت بڕوانێت و تای تەرازووی مرۆڤایەتی هەردوو ڕەگەز ئاوا هاوسەنگ کات، ئەو لە ئاوێنەی شیعری خۆیدا لەبیر و بۆچوون و خەیاڵی ئەودا ئافرەت پانتاییەکی گەورەو گرانی داگیر کردووە و بە وردبوونەوەو زیاتر گەڕان بە شابازاڕی پڕ لە عەتری و گوڵاوی شیعری ئەودا زیاتر و زۆرتر دەتوانین پەی بەو ڕاستییە ببەین و نیشانە بپێکین، چونکە ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ئەوەتا لەسەر شیعرەکانی دەکرێت و لەم چەند ساڵەی دواییەدا پەروانەی پێنووسی نووسەران و ئەدیبان بە دەوری مۆمی شیعری ئەودا هەر خول دەخوات و ئەویندارانە گوڵی پەیڤی ناسک ئارایی ئەو ڕادەمووسن و شیلەی گوڵە شیعری شیلانە و شنۆ و شەوبۆی ڕەنگاڵەی ئەو دەمژێ.

مەولەوی بەکامێرایەکەوە هاتەڕوو وێنەی ئافرەتی نەخشین نەخشاندو بە وێنەو تابلۆی نەختەوە ئافرەتی خستە نێو بازنەی شاشەکەوە تا ڕاستترو ڕوونتر لە هەر کەس پەیکەری پایەداری بەدیاربخات، تا بەسەیرکردن و نیگاو تێڕوانینی قووڵ بزاندرێ ئافرەت چی نرخ و بایەخێکی کۆمەڵە. هەر مەولەوییە بتوانێ بەر لە سەدیەک و چەند ساڵێک شیوەنێ سازکات ئەگەر لە پەنای شیعرە شیوەنییەکانیدا بۆ (عەنبەر) گوێ قوڵاخ کەیت و بێ سرووە گوێگریت، دەبیستی چۆن زریکەو هەنیسک و فرمێسک و ناڵە و فوغان و شین و شەپۆڕو گریەو زاری ئەوی بێزار کردووە، بێ شەرم و شۆ لەوەی کە پیاوە بگری بۆ ژن، بێ لەوەی گوێ بداتە تانەو توانج کە نەنگی بێت فرمێسک بەخوڕ بۆ ژنەکەی کە لەو سەردەمەداو ئێستاشی لەگەڵدا بێت دەبێتە جێی تەشەرو گازاندەی خزم و کەس و هاوڕێ و بێگانە. خوای مەزن مرۆڤی بە باشترین و جوانترین شێوە بەدیهێناوە لە هەر دروستکراوێکی تر، هەر بۆیە کام گوڵ جوانە زۆرجار لێی دەکەینەوە و بەسەر گیاو سەوزاییدا ڕادەبووڕین، بەڵام ئەستەمە ئازار بە مرۆڤێک بگەیەنین مەگەر مرۆڤ بگاتە ڕادەی دڕندەیی، جا وەرە لەم ڕوانگەوە بڕوانە کامێراکەی مەولەوی چۆن ئەو هاوکێشەیەی شیکارو نیشان داوە، بەدەر لە شاعیرانی تر کە ڕووی یارو دۆستیان بەگوڵ

چواندووه، کـەچی مـەولەوی لە سـۆنگەی بەها و ڕێزی مرۆڤەوە پێچەوانەی شاعیرانی تر ئەمەی کردووە، مەگەر هەر ئەو بێت و بڵێت:

**گوڵ چوون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان**
**وە فراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان**

کەواتە دەربخـستووە گوڵ چەندە جوان و نازەنین بێت هێشتا لە ڕووی ئازیزەکەی ئەو دەچێت، کە ئەمـەش بە هەند وەرگرتنی ئەو خەسـڵەتە جوانەیە کە (جـوانی و شـۆخی ئافـرەت)ی چەند بەرز ڕاگـرتووە. هەن لەو کەسـانەی کە بەکۆچی ڕۆڵەکـانیـان (کچ بێ یا کـوڕ یا کـەس و برادەرێکی) کـۆلیلی گـێـراوەو کـەف و کـوڵی خستۆتە چوارچێوەی شیوەنی شیعرییەوە، بەڵام بەدەگمەن بۆ ژن وەکـو هاوسـەرێکی ژیان وەکـو نیـوەی کـۆمـەڵ و دایکی نیـوەکـەی تر ئەمـە کـرابێت «ئەوەتا شـاعـیـرێکی عـەرەب شـەرم دەکـات بچێـتـە سـەر گـۆڕی ژنەکـەی یا خـۆشـەویسـتـەکـەی نەبادا بکەوێتـە بەر پلوکـە بەردی ڕەخنەی ئەم و ئەو و دەڵێ:

*** لو لا الحياء لهاجني استعبار**
**ولرزت قبرك و الحبيب يزار(*) »**

کەچی مەولەوی گۆڕەکەی عەنبەر بە فرمێسک دەشوات و بۆ تێڕوانین و بەرز ڕاگرتنی ئافرەت لای مـەولەوی ئەوا سـەرێک لە دیوەخـانی شـیـعـری مـەولەوی دەدەین و بەوەرگـرتنی چەند دێڕە شـیـعـرێک ئەو بوارو لایەنەی مەولەوی لێک دەدەینەوە:

**مەولەوی و عەنبەر خاتوونی خێزانی**

دیارە مەولەوی بەر لە هێنانی عەنبەر، سەردانی ماڵی باوکی کـردووە و بەو بیـانووەوە (ئاو و دۆیەکی) داوا کـردووە بەنیـەتی بینینی (عـەنبـەر) ئەویش لە کـاتی پێدانیـدا دەڵێ (فـەرمـوو خـاڵۆ) مـەولەویش بێ شـەرم دەڵێ:

**خاڵۆ خاڵۆتەن، کەم واچە خاڵۆ**
**خاڵۆ دەم وەبان خاڵانت ماڵۆ**
**شەرت بۆ من جەداخ خاڵۆ خاڵۆی تۆ**
**وێم کەروو وەکوڕ چواردە ساڵەی نۆ**

ئەمـــەش زیرەکی و وتوو وریایی مـــەولەوی بەدیار دەخات، کە هەر ڕەمەکییانە بڕیاری هێنانی ژنی نەداوە، بەڵکو بەو مـەبەسـتـەی دەبێـتـە هاوبەشی ژیانی چووەتە دیدەنیـان بەمەبەستی ڕەفتارو گوفتارو ڕوخساری ئەو



ئافرەتەی سبەی دەبێتە دایکی منداڵەکانی، دواتر عەنبەر وەکو خێزان و ژنی مەولەوی ڕەگی خۆشەویستی خۆی لە ناخی مـەولەویدا هەرێز ئاسـا توندگـیـر کـردو چووە نێـو هێلانەی چاوەکانی و لە شەقامەکانی دڵیدا دەگەڕا، (ژن و مـــێـــرد)یان بەجـــۆرێکی وا تەبابووە لە ڕوانگەی(لاواندنەکـانیـیەوە) کەم وێنەی هەیە. هەر بۆیە لە کاتی هەر کۆسپ و کۆستێکیدا لە کاتی هەچ ناخۆشی و ناشادییەکـیدا بەو جۆرە نەکەوتۆتە بەر تیـری غـەم و برین. گەلێک کارەسات و ڕووداو لە ژیانیدا ڕووی داوە، بەڵام هیـچیـان بەقەدەر (کاریگەری مردنی خێزانەکەی) کـاریگەر نەبوون کـە شـیـعـرەکـانی لووتکەن و ئەسـرینی بەخوڕ لە چاوگەی چاوەکانییەوە بەسەر ڕیشیدا قەتارەی دەبەست. مەولەوی هیـچی نەهێشـتۆتەوە هەرچی هەبووە لە توانایدا بۆ عـــەنبـــەری کـــرد بە تایبـــەت لە بوارە شـیـعـرییـەکـەدا کە ئەمـە ئەگـەر گـریانێکی تەنهـایی و گۆشـەگیری و لە گـوندێکدا بێت تارادەیەک دەبوو، بەڵام ئەم کردییە هەڵای شیعرو بە هەموو کونج و کەلەبەرێکدا بڵاوی کـردەوە- بوێرییـەکـە لێـرەدا دەردەکـەوێ- کـە چۆن بەشوورەیی نەزانیـوە و تیغی مردنی ژنەکەی جەرگی بڕیوە بۆ سـەدەیەک و چەند سـاڵێ لەمـەوبەر ئەمـەی کـردووە، ئەوەتا دەڵێ:

*** بینایی وە ڕاست دڵەی پڕ دەردم**
**ئای چەند سەرسەخت بیم لوای نەمردم (ل٤١)**

خـۆی بەسـەرسـەخت دەزانێ کـە عـەنبـەر ڕۆشت و ئەم ماوەتەوە لەدوای مردنی ئەو، لە شیعری تردا دەڵێت:

**نەی چی‌ا وەبێ بەزم یاران جانی**
**کام سەفامەندەن پەی زیندەگانی (ل٤٦)**

لەم دێڕە شیـعـردا، ڕووی دەمی دەکـاتە کاکی شمشاڵ ژەن و پێی دەڵێ: بەبێ سـەفـاو سـەیر لەگـەڵ یارانا

(مەبەست عەنبەر) ژیان چی خۆشەییەکی هەیە.
لە شوێنێکی تردا مەولەوی دەڵێت:

**ئەدای پەشێوی حاڵات جەستەم**
**دوورەن جەتەحریر خامەی شکستەم**
**بەڵام (مەعدووم) هەرس دیدەش جۆش وەردەن**
**ناعیلاج خامەش وەدەسگیر کەردەن**
**پەلە پەل پێکان پەل وەخامەدا**
**یەک فەرد رەقەم کەرد وەرووی نامەدا**
**ئیسە دیدەی دڵ دێوانەکەی وێت**
**نە بێخ ئاودا مەگێلۆ پەرێت (٥٦)**

واتە: (باسی حاڵەتی پەشێوی جەستەم بەم قەڵەمە شکاوەم نانووسرێ، پێویستی بەوەیە خۆم بێمە لات بۆت باس بکەم، بەڵام من فرمێسکی چاوم لێشاوی کردووە و کوێر بووم، لەبەر ئەوە پێم ناکرێ بێم بۆ لات، واناچار پەنام بردۆتە بەر قەڵەم جا چەندی پێ بکرێ بۆتی بنووسێ... ئێستا چاوی دڵە بۆت شێت بووەکەم لەبنی زەریای فرمێسکا بەدواتا دەگەرێ).

مەولەوی لەم گرنگیدانەدا بەخێزانەکەی و بە هەند وەرگرتنی هەر بەوەوە نەوەستاوە، بەڵکو ئێمە هەر کەمەکێ باس و خواسیمان کردووە، ئەگینا شیعرەکانی درێژتر و زۆرترن، ئەوەتا لە شیعرێکی تردا بە (رۆژی دەهەمی مانگی موحەررەمی) دەچوێنێ کە یادی کوشتنی حەزرەتی حوسەینە و دەڵێ:

**شوورای عاشوورا دیسان بەزمش بەست**
**(موحەرەم) ئاما (مەحرەم)شی نەدەست**
**ئەو خەریک نەچۆڵ شار عەدەم دا**
**من نە (کەربەلا)ی سارای ماتەم دا**
**ئەو (یەزید) مەرگ وە ئەسیر بەردە**
**من زادەی (زیاد) خەم یەقیر کەردە**
**بازارەن، وادەی مامەڵەن، ساقی**
**هەی بگرەفانی، وەی بەدەر باقی**
**رۆ، (حسەین) ئاسا فەردا کە رێبۆ**
**داخۆم سەرجەکۆ، لاشەم جەکۆ بۆ (ل ٣٢٠)**

واتە: (وا دیسان قەرەباڵغی سنگ کوتانی رۆژی عاشورا پەیدا بووەوەو مانگی موحەرەم هات، من مەحرەمەکەی خۆم لە دەست چووە کە خێزانەکەمە. ئەو مەرگ بەدیل بردوویەتی کە وەک یەزید وایە، منیش خەم گیری پێ خواردووم کە وەک عوبەیدوڵڵای کوڕی زیادە. خوایە ئەم جیهانە وەک بازاڕ وایە جێگای مامەڵە کردنە، شتی فەوتاومان لێ وەرگرە کە ژیانی ئەم دنیایەیە و لە بەرامبەر یا شتی نەبڕاوەمان بدەرێ کە ژیانی هەمیشەیی بەهەشتە، هەی رۆ سبەینێ کە رۆژ بووەوە ئاخۆ منیش وەک حەزرەتی حوسەین سەرم بکەوێتە کوێ و لاشەم بکەوێتە کوێ..) ئیشارەیە بۆ کارەساتەکەی حەزرەتی حوسێن. مەولەوی جارێکی بلندی دا لە بلندگۆی شیعری خۆیەوە بێ سڵکردن و سڵەمینەوە، ئافرەت لە شیعرەکانیدا کاڵای گرانبەهای بۆ بەبالادا کراوەو مۆرکی رەسەنێتی پێ خەڵات کردووە. ئایا ئەمە نرخ دانان نییە بۆ ئافرەت؟ ئایا ئەوە ناگەیەنێ رۆشنبیری و سەلیقەی مەولەوی چەندە بالابووە بەرامبەر بە ئافرەت و ژن لە زۆر شوێنی تردا بۆ ئافرەت شیوەنی کردووە، یا بە شیعر گفتوگۆی لەگەڵ کردوون، یا وەسف و رێزی ئەوانی لە ئاوێنەی شیعری خۆیدا نیشان داوەو بە ئەمەکەوە پلەو پایەی بۆ داناون و ئەوەی لێک نەداوەتەوە بەخراپ بشکێتەوە بەسەریدا بەو تێکەڵی و هاتنە ئاخاوتن لەگەڵ رەگەزی بەرامبەردا کە ئەو رۆژگارو ئێستای سەدەی مۆدێرن و مەدەنییەتیشی هەر بڤەیە و زەنگی ترسناکی بۆ لێ دەدرێت. ئەوەتا مەولەوی لە بارەی خوازبێنی خوشکەکانی (ئەحمەد پرسیی) هاورێ و خۆشەویستی (لەیلاو بەهێجێ) و (پەریزاد خان)ی بەگزادەی جاف و (نازدارێکی تری جاف) و (ئامینە خان) و (ئەمنەخانی کچی قادر بەگی جاف)داو زۆرێکی تر، کە بە وردی بگەرێی لە دیوانەکەیدا دیارە.

### مەولەوی و کچەکەی خۆی و (بولبول)ی شاعیر

بولبول شاعیرێکی هەمان سەردەم و کاتی مەولەوی بووە کە حەزی کردووە خوازبێنی کچەکەی مەولەوی بکات، بەڵام حەزەکەی دەرنەبڕیوە تا کچەکەی مەولەوی شووی کردووە. جا هاتووە قەسیدەیەکی پڕ لە شەڕ و نزای خراپی بۆ مەولەوی نووسیوە و بۆی ناردووە، گرنگی لەوەدایە مەولەوی بە زمانێکی نەرم و ناسک وەڵامی بولبول دەداتەوە و هەناسەی ساردی بۆ هەڵدەکێشی و نەهاتووە بەبەزمی عەشایەری بیکا بە هەڵاو قین و نارەحەتی و هیچ گرژو مۆنییەک پیشان نادات، بەڵکو بەزمانێکی شارستانییەتی کە لەم سەردەمەوە نزیکە لە رووی سەربەستی و مافی ئافرەت بەو جۆرە دواوە بە (بولبول) دەڵێ کوا تۆ جارێک ئەمەت درکاندبێ، تا دەڵێ:

**چێشەن پەشێویم: ماتەمی دڵەن**
**یا کزەی نامای نامەی بولبولەن**

واته: (هی چییه وا پەشێوم؟ هەر خۆم خەفەتبارم، یا کزەی هەناسەی ساردی بولبولە لە نامەکەیەوە سەری داوە؟). چەندە جوان بۆی دەکرووزێتەوە، ئەوەتا دیسان دەڵێت:

**بەڵام تۆ قەزاو بێ تەدبیری وێت**
**کەردەن پێت ئانا، هەرچی کەردەن پێت (ل١٧٢)**
**کەی تۆ خەیاڵێت وەدەروون ئاوەرد**
**هانات کەرد ئەو من، من بێ مەیلیم کەرد.**

واته: (بەڵام تۆ یەکەم قەزاو قەدەری خواو دووەم بێ سەروبەری خۆت ئەوەیان پێ کردی کە پێیان کردی، کەی تۆ خەیاڵێکی وات بەدڵدا هات و دەسەودامێنێ من بوویت و من بەگوێم نەکردی، تا لالانەوەو هاوارو نالەی شەوت کار بکات لە حزووری خوادا، یا هەناسەی ساردی تەک نزای بەیانیانت ئەنجامێکی ببێ).

شیعرەکە درێژەو نالوێ هەمووی بهێنینەوە، ئەوەی بولبولیش بە پێویستمان نەزانی کە بینووسینەوە و لە دیوانەکەدایە کە دوو شیعرە هەر ئەوەندە بەسە کە چۆن لێزانانە و حەکیمانە دڵدانەوەی بولبول دەداتەوە لە رووی ئافرەتێکەوە کە (کچی خۆیەتی) ئەو هەر لە خۆڕا بێ خوازبێنی بەشیعرو گازاندە یەخەی مەولەوی گرتووە کەواتە مەولەوی ئەو شاعیرە بەرزەیە راستە کە دەڵێن: (مەولەوی سەدەیەک پێش سەدەکەی خۆی کەوتووە). مەولەوی بەبیرێکی بەرزو کامێرایەکی رەنگینەوە وێنە و تابلۆی ئافرەتی نرخاندووە بەدەر لە باری بە زۆر بەشوودان و دەرنەبڕینی رەنگ و دەنگی لە کاتی چارەنووسیدا و باسکردنی کە ئێستاش لەزۆر شوێن هەر پیادە دەکرێ، مەولەوی وەکو داناو زاناو کەسێکی سۆفی و موسڵمانی تێگەیشتووی سەردەمی خۆی ئەو کۆت و بەندەی شکاند بوو کە مەحاڵ بوو کەسێکی وا هەبێ بتوانێ لەو بارەوە متەقی لێ بێت. ئەو کەسێک بوو ئافرەتی هێنایە ناو کۆشکی بلوورین و باڵەخانەی شیعری خۆی و بەهای وەکو ئافرەت، وەکو رەگەزێکی پێویستی ژیان، وەک دایک، وەک تەواوکەری کۆمەڵگە و پێشکەوتن دنیایەکی پڕ لە دڵسۆزی کالای بۆ بالای دووری و وێنەی کەم وێنەیی دەرخست.

*** میهرەجانی سلێمانی.**

**سەرچاوە**: دیوانی مەولەوی- مەلا عەبدولکەریمی مودەریس.



# (گۆران)
# سیروانی پەرناس لە شیعری کوردیدا

**فەرهاد پیربال**
**(زانکۆی سەلاحەدین - کۆلێژی پەروەردە)**

عەبدوڵڵا گۆران (١٩٠٤- ١٩٦٢) لەچاو شاعیرانی دیکەی پێشەنگ، لە هەموویان زیاتر لەسەری نووسراوە. لێرەدا بێ ئەوەی لاپەڕەی زیاد بە شتی لابەلا ڕەش بکەینەوە، خوێندنەوەیەکی کرۆنۆلۆژی بۆ نوێگەرییەکانی ناوبراو پێشکەش دەکەین؛ بۆ یەکەمین جاریش لە بواری تۆژینەوەی ڕەخنەیی کوردیدا - ئەوە دەسەلمێنین و ڕوون دەکەینەوە کە **گۆران شاعیرێکی پەرناس بووە و یەکەمین شاعیری کورد بووە ڕێبازی پەرناسی لە شیعری کوردیدا داهێناوە.**

گۆران لە بەستێنی تازەکردنەوەی شیعری کوردیدا بەراستی پێشەنگی یەکەمە؛ دەستاوەردە نوێگەرییەکانی، ئەمانەن:

- دیدێکی تازە، ڕووانینێکی هاوچەرخ، جیهانبینییەکی ئەمڕۆیی لەنێو بەرهەمەکانی خۆیدا دەربڕیوە کە پێشتر لای هیچ شاعیرێکی کلاسیک نەبوو.
- وێڕای ئەم ڕووانینە مۆدێرنە، چەند ڕێبازێکی نوێی ئەدەبی دەگەڵ بەرهەمەکانی و دەنێو بەرهەمەکانیدا پەیدا دەبن: ڕێبازی پەرناس، ڕێبازی ڕۆمانسیزم، ڕێبازی ڕیالیزم، ڕیالیزمی سروشتی و ڕەخنەگرانە و سۆشیالیستی و شۆڕشگێری.

بەم شێوەیە، ناوبراو یەکەمین شاعیری کوردە - تا ئێستاش - کە زیاتر لە دوو ڕێبازی ئەدەبی تاقی کردبێتەوە و بەم هەموو ئەزموونە ئێستاتیکییە جۆراوجۆرانە تێپەڕبووبێ.

- گۆران یەکێکە لە یەکەمین ئەو شاعیرانەی کە بۆ یەکەم جار لە مێژووی شیعری کوردیدا ڕاستەوخۆ سوودی لە کولتووری ڕۆژئاوا وەرگرتبێت؛ تێم و ژانر و بابەت و چەمک و تەکنیکەکانی شیعری ئەورووپایی هێنابێتە ناو فەرهەنگی شیعری کوردییەوە: شیعری درامی، نۆپەرێت، چیرۆکەشیعر، گەشتنامە، شیعری منداڵان، سروود.
- وێنەی شیعریی نوێ، زمانێکی شیعریی تازە، هەروەها وەبەرکردنەوەی گیانێکی تازە بە زمانی نەتەوەیی نووسیندا.
- بۆ یەکەمین جار بەکارهێنانی نیشانەکانی خاڵبەندی وەک تەکنیکێکی نوێی دەربڕین.
- گۆران کەوتە باسی جیهانی تاکەکەس و ئازادییەکانی، لەو ڕێگەی تاکەکەسەوە هاتە ناو کێشە گشتییەکانەوە. بەپێچەوانەشەوە.
- گۆران بابەت و کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتی و سیاسی و مرۆڤایەتییەکانی خستە بەر شیتەڵکردنەوەی ڕووانینی خۆی. ئەمەش هەر کارێکی تازە بوو.
- تێکشکاندنی سیستەمی کۆنی قافیە و بەکارهێنانی کێشی پەنجە (خۆماڵی) لەجیاتی سیستەمی کۆنی سەروا و کێشی عەرووزی عەرەبی.
- گۆران بەرەو سەرچاوە نیشتیمانی و کەلەپوورە نەتەوەییە ڕەسەنەکان دەگەڕێتەوە و باوەش بە سامانە شیعرییە فۆلکلۆرییەکانی خۆماندا دەکا. لەم ڕووەوە، وەک ئەنوەر قادر جاف ئاماژەی بۆ دەکا، باش توانیویەتی سوود لە کێش و دونیا و بابەتەکانی شیعری مەولەوی و شاعیرانی دیکەی گۆران وەربگرێت و دەکاریان بهێنێ: (لای گۆران ئەم تەئسیرە شەقڵێکی ئاسایی هونەری و ڕەوتی پرۆسێسی داهێنانی گرتۆتە خۆی).
- گۆران خاڵێکی سەنتراڵی لەناو شیعردا دروست کرد

کە هەموو کۆیلە و دێڕەکان بەدەوری ئەم خاڵە سەنتراڵەدا بسووڕێنەوە؛ هەموو دێڕ و کۆیلەکان بەدەوری یەک بابەتدا بخولێنەوە. یەکیەتی بابەتی هێنایە ئارا کە لە شیعری کلاسیکدا نەبوو.

- گۆران بەپێچەوانەی هەموو شاعیرانی کلاسیک، گەنجینەیەک بۆچوون و تەنزیرات و یاداشتی خۆی لەبارەی چەمکی شیعر و داهێنانەوە بۆمان جێهێشتووە. ئەم کارە تەنانەت شاعیرانی هاونەسلی خۆیشی بەدەگمەن کردوویانە. بۆ نموونە لەبارەی ریالیزمەوە دەڵێ:

ڕۆژهەڵاتییەکان چاویان بڕیوەتە ئاسمان، لەبەر ئەمەیە کە لە سەرەتای ژیانیان چۆن بوون هەروەها ماونەتەوە و لە جێی خۆیانا چەقیون، پێشکەوتنیان بۆ نییە؛ بەڵام ڕۆژئاواییەکان چونکە دەزانن هۆی ژیانیان لەسەر ئەرزە هیچ بەتەنگ ئاسمانەوە نین، چاویان بڕیوەتە دەوروپشتی خۆیان.

هەروەها لەبارەی ڕۆڵی ئەدەب دەڵێ:

تۆ شیعر و ئەدەبێکی بەرز و پێگەیشتوو لە کوردستانا بێنە بەرهەم، لەپاش سەردەمێکی زۆر کەم، نیشتیمانێکی پڕ لە ئاسایش وگەلێکی بەهێزی یەکگرتوو، شارستانیەتێکی پڕ لە زانست و کارسازی، بەکورتی بەهەشتێکی بەختیاری لە من داوا کە!

## کرۆنۆلۆژیای داهێنانی گۆران

### ۱۹۲۱

- گۆران لە ژمارە ٦١ی پێشکەوتندا لە ساڵی، واتە لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا، یەکەمین بەرهەمی خۆی، پەخشانێکی جوانی بلاوکردۆتەوە: ئەسەفی ماضی و ئەندێشەی ئیستیقبالم.

### ۱۹۲٦

- دەرکەوتنی ڕۆژنامەی ژیان لە سلێمانی کە لە ساڵی ١٩٢٦ بەملاوە تا ١٩٣٨ گۆران شیعری خۆی تێدا بلاودەکاتەوە.

### (۱۹۲۷- ۱۹۲۸)

- دوو پارچە شیعری گۆران لە ژیان.

### ۱۹۲۹

- ڕەشید نەجیب لە ١٩٢٩ نازناوی (گۆران) دەبەخشێتە عەبدوللا بەگی شاعیری نوێخواز.

- بزاڤی شیعری نوێی تورکی دەمێکە دەستی پێ کردووە: «گۆڤاری سەروەتی فنوون» (خولی دووەم: ۱۹۰۹- ۱۹۲۳) (خولی یەکەم: ۱۸۹٦- ۱۹۰۱) کە بۆتە هۆی دروستکردنی شەپۆلی «فەجری ئاتی» لە ئەدەبی تورکیدا و لە هەمان کاتیشدا کاریگەریتی خۆی بەسەر کوردستاندا نواندووە. گۆران، لەبارەی کاریگەریتی ئەم قوتابخانە تورکییە بەسەر خۆی و شاعیرانی کوردی ساڵانی (۲۰-۱۹۳۰)دا، دەڵێ:

شێخ نووری و ڕەشید نەجیب و من، بە ئەدەبی تورکی موتەئەسیر بووین و پێکەوە ئەمماننووسی. ئەدەبی تورکی، قوتابخانەی شیعری تازەی تیا پەیدا بوو کە پێیان ئەوترا ئودەبای فەجری ئاتی، لەوانە تۆفیق فیکرەت و جەلال ساهیر بوون. وە ئەدیبێکی تری تورک کە عەبدولحەق حامید ئەگەرچی لەم کۆمەڵە نەبوو، بەڵام دیسان هەر پێی موتەئەسیر بووین..».

### ۱۹۳۰

- گۆران پارچەشیعرێک لە (ژیان) بلاودەکاتەوە. وردە وردە داهێنانی گۆران و کاریگەریتییەکەی بەسەر شاعیرانی نوێخوازی کورد دەست پێدەکات. گۆران لەم بارەوە دەڵێ:

«پاش ئەم ماوەیە کە سەرمەستی ئەدەبی تورکی و فارسی بووین، بەرە بەرە ئەدەبی تازەی عەرەب و ئەدەبی ئینگلیزی هاتنە کایەوە و بلاوبوونەوە.

لە سەرەتاوە بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدووای **نظریەی هونەر بۆ هونەر** ئەرۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە وەکو هینەکانی جۆن کیتس و ئۆسکار وایلد..».

### ۱۹۳۱

- لە ژمارە (۲۹۰)ی ژیان شیعری (شەوێکی بەهار) بلاودەکاتەوە.

### ۳۰ی ئەیلوولی ۱۹۳۲

- گۆڤاری هاوار لە دیمەشق لە ژمارە ۹دا «ئاواتی دووری» یەکەی گۆران بلاودەکاتەوە.

### (۲۳ی تشرینی یەکەمی ۱۹۳۲)

لە ژمارە ۱۰ ی هاوار «ئیلهامی هاوار»ی گۆران، هەروەها لە ژمارە ۱۲دا «ئەی گەلاوێژ» ئنجا لە ژمارە ۲۳دا «بۆ خانمێک» بلاودەکاتەوە.

- لە هەمان ساڵدا شیعری شەهید دەنووسێ.

### ۱۹۳۳

- بلاوبوونەوەی (یادگاری لاوان) لە بەغدا کە تێیدا چەندین شیعری نوێ (لەناو ئەواندا شیعرێکی گۆران) لەگەڵ بابەتێک بە ناونیشانی (بۆ شاعیرە لاوەکانمان)

بلاوکراوەتەوە و بە مانیفێستێک دەچێ بۆ شیعری نوێ؛ ڕەفیق حیلمی بۆچوونەکانی ئەم نووسینە بە بناغەی شیعری نوێ دادەنێت.

**١٩٣٤**

کاریگەریتی ڕێبازی پەرناس و شیعری ئینگلیزی بەسەر گۆران بەردەوامە. شیعرە پەرناسییەکانی خۆی بلاودەکاتەوە، لەوانە: شیعری (بۆ بلبل) ی گۆران لە شیعرێکی شیللی وەرگیراوە. هەروەها شیعری گوڵی خوێناوی (کە لە ١٩٣٤ لە بەغدا لە دیاریی لاوان، ل ٦٥ بلاوکراوەتەوە) لە چیرۆکێکی ئۆسکار وایلد بە ناونیشانی (بولبول و گوڵ) وەرگیراوە.

**١٩٣٥**

- گۆران ڕێبازی ڕیالیزم دەناسێت و دەست پێدەکات بەرهەمە ریالیستەکان دەخوێنێتەوە. سەرەتای کاریگەرێتی ڕیالیزم بەسەر گۆران وردە وردە دەردەکەوێ. گۆران دەڵێ:

«پاش ئەم ماوەیە تەییاری سیاسی و کۆمەلایەتی کەوتە ناومانەوە وە من بە تەئسیری ئەم دوو ئەدەبەوە (ئینگلیزی و عەرەبی) کەوتمە هەوای واقیعیەتەوە..»؛ «لە ١٩٣٥ بەملاوە دوای هاتنە ناوەوەی جوولانەوەی پێشکەوتوویی (تقدمي) و کۆمەلایەتی پاڵی پێوە ناین کە لە ئەدەبی عەرەبی و ئینگلیزیشدا بەدوای نموونەی ئەدەبێکی (تقدمي) بگەڕێین. بەم هۆیەوە لە ١٩٣٥ بەملاوە ئەم ڕێگەیەم گرت (ڕیالیزم) وەکو لە هەڵبەستی دیاری خوای شەڕ دەردەکەوێ کە لە گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی ١٩٤٣دا بلاوکرایەوە و چەند ساڵێک بەر لەو مێژووە دامنابوو.

**١٩٣٩**

- بلاوبوونەوەی گۆڤاری گەلاوێژ (١٩٣٩-١٩٤٩) کە ڕۆڵێکی دیار دەگێڕێ لە تازەکردنەوەی شیعریدا و گۆران شیعرە ڕیالیستەکانی خۆی تێدا بلاودەکاتەوە.

- گۆران شیعری (دەروێش عەبدوللا) دەنووسێ.

**١٩٤٣**

- گۆران: بلاوکردنەوەی یەکەمین شیعری ڕیالیستانەی خۆی (دیاری خوای شەڕ) لە گۆڤاری گەلاوێژ کە چەند ساڵێک بەر لەو مێژووە دایانابوو.

**(٢٥- ٦- ١٩٥٠)**

- گۆران لە بەغدا (بەهەشت و یادگار) و (فرمێسک و هونەر) بلاودەکاتەوە کە زۆربەی شیعرەکانی بریتین لە ئەزموونی پەرناس و ڕۆمانسیزمی ساڵانی ١٩٣٠. بۆ خۆی لە پێشەکییەکەدا دەڵێ:

«دیوانەکەم سەرانسەر لەگەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە.. ئەو جۆرە ئوسلووبەیان تێدا کراوە بە سەرمەشق کە مامۆستا م. نووری و هاوڕێکانی لە ئەدیبە تازەکانی تورکی عوسمانییان وەرگرتووە و لە سەردەمی ١٩٢٠- ١٩٣٠ شیعری کوردی ناوچەی سلێمانییان پێ تازە کردەوە.

**١٩٥١**

یەکەمین شیعری خۆی لەبارەی پیشاندانی هاوخەباتی نێونەتەوەیی، لەوانەیە یەکەمین شیعری لەم جۆرەش بێت لە مێژووی شیعری کوردیدا، بە ناونیشانی (لاوکی سوور بۆ کۆریای ئازاد) دەنووسێت.

**١٩٥٢**

- شیعرێکی پەخشانی ئازادی بە ناوی چەقەڵ لە ژین بلاوکردۆتەوە.

**(٢٠-١٠- ١٩٥٢)**

بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەی ژین، لە ژمارە (١١٢٤)ی بەملاوە دەکەوێتە دەست گۆران تا دەرچوونی ژمارە (١٢١٣). هەر لەو سەردەمەدا گۆران بۆ یەکەمین جار لە مێژووی شیعر و تۆژینەوەی شیعری کوردیدا سوریالیزم بە خوێنەری کورد دەناسێنێ:

«سوریالیزم ئەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەدەب لە تازەکردنەوەیەکی بەردەوامدا بێت، هەر وشە و ڕستە و دەربڕینێک هەڵمەتێک بێت بۆ دۆزینەوەی ڕاستی.

**(دیسەمبەری ١٩٥٢)**

- گۆران لە ژین، ژ ١١٢٧دا داوا دەکات کە شیعر بەیەکجاری ئازاد بکرێت و لە وەزن و قافیە بەیەکجاری ڕزگار بکرێت: «ئەگەر پێویستی وەزن و قافیە لەکایەدا نەبووایە، نیاز و مەبەستی دڵ زۆر بەئاسانتر و ڕەوانتر ئەدرکا».

- گۆران شیعرێکی پەخشانی ئازاد لە ڕۆژنامەی ژین بە ناونیشانی چەقەڵ بلاودەکاتەوە.

**١٩٥٣**

سوودوەرگرتنی گۆران لە شیعری ئینگلیزی بەردەوامە؛ شیعری (گیان) کە لە گۆڤاری پەیام ژمارە (١٩٧) بلاوکراوەتەوە، لە شیعرێکی ئاننا باربۆلد -BAR BOULD بە ناونیشانی (ژیان) وەرگیراوە.

**١٩٥٤**

- گۆران: پەیامی کورد، سلێمانی.

**(١٩٥٥- ١٩٥٨)**

- گۆران لە ١٩٥٦ شیعری (شۆڕشگێڕ) لە گۆڤاری شەفەق.

- سوارەی ئێلخانی زادە و کامەران موکری و ئەحمەد هەردی و دیلان و ع.ح. ب و چەندین شاعیری دیکە کەوتوونەتە ژێر کاریگەریتی گۆران، لاسایی شێوازی ئەو دەکەنەوە و شیعر (یان دیوانەکانیان ) بلاودەکەنەوە.

- کاریگەریتی (بدر شاکر السیاب و عبدالوهاب البیاتي) بەسەر گۆران-دا و هاوڕێیەتی نێوانیان.

بەپێی ئەم لیستەیەی خوارەوە دەردەکەوێت کە گۆران لە ماوەی سالانی ١٩٢٠- ١٩٣٢ لە هەموو شاعیرە نوێخوازەکانی سەردەمی خۆی کەمتر شیعری بلاوکردۆتەوە. کەواتە لە ١٩٣٢ بەملاوەیە کە بلاوبوونەوەی شیعری گۆران و کاریگەریتی ڕاستەقینە و نوێخوازێتی گۆران دەست پێدەکات:

ئەسیری: ٤١ شیعر

شێخ نووری شێخ سالح: ٢٧ شیعر (زۆربەی لە پێشکەوتن و ژیان)

عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری: ٢١ (لەگەڵ دیوانێکی دیکەی)

مستەفا شەوقی قازی زادە: ١١ شیعر

عەلی کەمال باپیر: ١٧ شیعر

پیرەمێرد: ١٦ (هەمووی لە ژیان)

بێکەس: ١٥ شیعر (زۆربەی لە پێشکەوتن و ژیان)

بەختیار زێوەر: ١٠ شیعر

مامەند کەرکووکی: ٩ شیعر (هەمووی لەزاری کرمانجی)

حەمدی: ٩ شیعر

ئەحمەد فەوزی: ٨

سەعید فەوزی: ٧ شیعر

ئەحمەد موختار جاف: ٧

زێوەر: ٦

گۆران: ٤ (هەمووی لە ژیان)

ڕەشید نەجیب: ٣

## گۆران و ڕێبازی پەرناس

بێ ئەوەی بکەوینە ناو تۆژینەوەی ئەدەبی بەراوردکارییەوە Litterature Comparee، هەوڵ دەدەین بسەلمێنین کە گۆران لە سالانی ١٩٣٠دا شاعیرێکی پەرناس بووە و سەرنجێکی ڕاگوزارییانە لەبارەی کاریگەربوونی گۆران بە قوتابخانەی پەرناسی فەرەنسی دەخەینە ڕوو. ئەم کاریگەربوونەیشی بە پەرناس لە قۆناغی سەرەتایدا بووە، واتە دوای دەرچوونی لەژێر کاریگەریتی کلاسیزم. پەرناس بوونی گۆران لەڕێگەی خوێندنەوەی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بووە:

### پەرناس چییە؟

لە سالانی ١٨٦٦ و ١٨٦٩ و ١٨٧٦ لە لایەن چەند شاعیرێکی گەنجی فەرەنسییەوە لەوانە: لۆکۆنت دو لیل، سوولی پروودهۆم، ستێڤان مالارمێ، پۆل ڤێرلێن، لیۆن دیەرکس، فرانسوا کۆپێ، ڤیلیێ دو لیل ئادام، سیلڤێسترا، دی هێرێدیا... سێ دیوانەشیعری هاوبەش، بە زنجیرە و یەک لەدوای یەکتر، بە ناونیشانی پەرناسی هاوچەرخ Parnasse Contemporain بلاوکرانەوە و " قوتابخانەی پەرناسییان" ڕاگەیاند. بەشی دووەمی کتێبە هاوبەشەکەیان بە سەرپەرشتی لۆکۆنت دو لیل (١٨١٨- ١٨٩٤) بوو. پاشان هەر لە سالی ١٨٦٦ دا یەکەم دیوانە شیعری پۆل ڤێرلێن (١٨٤٤- ١٨٩٦) بلاوکرایەوە. ئەم بەرهەمە هاوبەشە شیعرییانە، بوونە دەسپێکی ڕێبازێکی نوێ لە ئەدەبیات ر هونەردا بە ناوی پەرناس Parnasse .

پەرناسەکان، لەژێر گوشاری ئێستاتیکای «هونەر بۆ هونەر» لە نووسینەکانی خۆیاندا پەیرەوی بینینی بۆدلێر و بیری جوانیناسی مالارمێیان دەکرد. تیۆری " هونەر بۆ هونەر" سەرچاوەی یەکەمی ئەو نووسەر و شاعیرە گەنجانە بوو؛ دەیانویست لە بورجی عاجی خۆیان و لە گۆشەگیریدا، لە ڕیتمی ژیان دوور بکەونەوە و بەناو ڕۆحی خۆیاندا سەفەر بکەن.

یەکێک لە پرەنسیپەکانی پەرناس ئەوە بوو کە هونەر و ئەدەبیات پێویستە سەرچاوەکانی خۆی لە فەلسەفەی کۆنی یۆنانی و ئێستاتیکای گریکەکانەوە هەڵبهێنجێنێ. پێیان وابوو کە شێوازی نموونەیی، جوانی، ڕەسەنایەتی.. تەنیا لای یۆنانییەکان هەیە. یەکێک لە پرەنسیپەکانی دیکەی پەرناس ئەوە بوو کە هونەر پێویستە بەتەواوەتی سەربەخۆ بێت، نابێ بکەوێتە ژێر فەرمایشتی ئەخلاق و سیاسەت و نەریتەکانی کۆمەڵەوە. نابێت خەڵک چاوەڕێی ئەوە لە هونەر بکات کە هونەر بکرێتە ئامرازێک بۆ جێبەجێکردنی ئامانجە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەخلاقی و ئایدیۆلۆژییەکان وەک ڕیالیستەکان داوایان دەکرد.

هونەر بە بۆچوونی پەرناسەکان خۆی لە خۆیدا ئامانجێکە نەک ئامرازێک. هونەر ئەگەر سوودێکی هەبێت تەنیا ئەوەیە کە جوانە. ئەم جوانییە ئیتر بەسە! هەر بۆیەش پەرناسەکان بایەخێکی زۆریان بە ڕازاندنەوە و جوانکردنی بەرهەمەکە دەدا. لەم بارەیەوە، نووسەری پەرناس، تیۆفیل گۆتیێ (١٨١١- ١٨٧٢) دەیگوت: «هەموو کاتێک هەر شتێک بەسوود بوو، ئیتر ناتوانێ

جوان بێ».

هەروەها لەبارەی هەمان مەبەست، لە پێشەکی (ئەلبێزتۆس)دا لە ساڵی ١٨٣٢، دەڵێ:

« بەشێوەیەکی گشتی، هەر کاتێک شتێک گەیشتە ئەوەی سوود بگەیەنێت، ئیتر لە جوانی خۆی دەکەوێت.. دەکەوێتە ژیانی پۆزەتیڤ و ڕۆتینەوە».

عەبدوڵلا گۆران، کە تا ڕادەیەکی زۆر لەژێر کاریگەرێتی پرەنسیپەکانی پەرناسدا بووە، هەمان بینینی پەرناسەکانی لە شیعرەکانی خۆیدا دەربڕیوە.

ڕووانینی پەرناسانەی گۆران هەر یەکسەر لە هەڵبژاردنی ناونیشانی شیعرەکانیەوە دەردەکەوێ. ناونیشانی شیعرەکانی ساڵانی ١٩٣٠ی گۆران هەموویان پێوەندییان بە جوانییەوە هەیە: ئافرەت و جوانی، ڕەوتێکی جوان، بۆ جوانی سەرەڕێ، جوانی لە لادێ...

وەک دەشبینین، خۆی لە پێشەکی دیوانەکەی ساڵی ١٩٥٠دا دەڵێ: «دیوانەکەم سەرانسەر لەگەڵ بابەتەکانی جوانی و دڵداری خەریکە..».

جگە لە شیعرەکانی، کە لێوانلێون لە دەربڕینی جوانی و ناوەرۆکی پەرناسانە بۆ جوانی، گۆران لە شیعرێکیدا خۆی ناوی لە خۆی ناوە «شێتی شیعر، شێتی جوانی». لە وتارەکانیشیدا بایەخێکی زۆری داوەتە جوانی و چەمکی جوانی. لە وتاری «کەڵکی ئەدەب» ژین: ژ ١١٢٦ و ١١٢٧ لەبارەی جوانیپەرستی و پەرناسەوە دەڵێ:

پیاوێک بێنە پێش چاو: ئەو جوانییانەی لە زەوی و ئاسمان هەیە، لە ڕەنگ و دەنگ و بۆ هەست بە هیچ کامیان نەکا. ئەو جوانییەی لە کردەوەی شیرینا هەیە.. هەمووی لا هیچ بێ. تکا ئەکەم ئەم پیاوە کلۆڵە ئەبێ نرخی ژیانی چی بێ؟

پەرناس بوونی گۆران لەبواری ڕەتکردنەوەی «فەلسەفە بەسوودەکەی» سانت سیمۆن دا زۆر بەجوانی دەردەکەوێ. بە پێی بینینی شاعیرانەی گۆران (کە فەلسەفەیەکی پەرناسە) هەمیشە ئەو کەرەستە و بابەتانە جوانن کە لە ژیاندا ئاوریان لێ نادرێتەوە و لای مرۆڤ فەرامۆش کراون:

**گیانی من بۆ چڵێ وەنەوشە پەرۆشە**
**کە لەژێر سێبەری تووترکا خامۆشە**

یان:

**مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو**
**زەردە لەترسی قاسپەقاسپی کەو**

سانت سیمۆن دەیگوت کە دەبێ تەنیا شتی بەسوود و بابەتی بەسوود و کەرەستەی بەسوود لە ئەدەبیات و هونەردا جوان پیشان بدرێن؛ بەڵام گۆران و پەرناسەکان بەپێچەوانەی ئەم فەلسەفەیەی سانت سیمۆن کە پێی دەگوترا (الفلسفة النفعية) کەرەستە و بابەت و شتی بێ سوود و فەرامۆشکراویان بە جوان پیشان دەدا؛ چونکە پێیان وابوو کە **جوانی هیچ سوودێکی نییە** و تەنیا سوودێک لە جوانی و هونەردا هەبێت ئەوەیە **کە جوانە؛** تەواو!

بە لای گۆرانەوە، وەک پەرناسەکانیش پێیان وابوو: دەریایەکی بێ سنوور، بام بەهۆی ماسی و زێڕەکانی و سامانە سروشتییەکانی - بۆئەوەی بکرێتە بەندەر - چەند بەسوودیش بێت، بەڵام هەمیشە «کانییەکی بچکۆلانە» لەچاو ئەو دەریایە، شاعیرانەتر و جوانترە.

ئەم پرەنسیپە پەرناسییە بەتەواوەتی لەلای گۆران ڕەنگی داوەتەوە و زۆر وردبینانە بەکارهاتووە. عەبدوڵلا گۆران، دژی هونەری بەسوود بووە، دژی جوانیی بەسوود بووە. تەنانەت گەلێک جاران گۆران کۆپلەشیعرێکی پەرناسەکانی، دەقاودەق ڕاگواستۆتەوە بۆ ناو شیعرێکی خۆی. بۆ نموونە لەم کۆپلەیەی گۆران ورد بەرەوە:

**کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو**
**لە بنیا بلەرزێ مرواریی زیخ و چەو**
**لەلای من جوانترە لە دەریای بێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەر تیشکی خۆر...**

ئەم کۆپلەیەی گۆران بەراورد بکە بەم کۆپلەیەی شاعیری پەرناسی فەرەنسی، هنری دو ڕینییێ، کە لە شیعری (بەختەوەری)دا هەیە و گۆران لێی وەرگرتووە:

**نە گوێ لە هاواری لافاو ڕابگرە نە لە بانگی زێ؛**
**با لە ئەڵماس جوانتر بێ لەلات زیخ و چەوی ڕێ.**
**لە چواریانەکان سڵ بکەوە و لە دەنگدانەوەکان ڕامێنە...**

هەڵبەتا گۆران فەرەنسی نەزانیوە بەڵام لەوانەیە ئەم شیعرەی ئەم شاعیرە فەرەنسییەی بە ئینگلیزی خوێندبێتەوە. ئەگەر نەشیخوێندبێتەوە، گرنگ: لە وێنەیەکدی پەرناسیا و لە بۆچوونێکی پەرناسیدا هەردووکیان یەکیان گرتۆتەوە لەوەی کە کانییەک لە دەریایەک جوانترە! ئەمەش فەلسەفەی پەرناسە!

ئەمە جگە لەوەی کە بنەمای بیرێکی دیکەی پەرناس «جوانی تەنیا لەپێناو جوانی!» لە لای گۆران زۆر بەفراوانی هەستی پێدەکرێ:

**سەرنجێ من دەیدەم لەو بەژن و باڵایە**
**لە سینەی پاکەوە بۆ جوانی تەنیایە**

ئەم بینینە لای گۆران لە هەمان بنەمای فەلسەفی

پەرناسەکانەوە «هونەر لەپێناو هونەر» وەرگیراوە: لای پەرناسەکانیش جوانی خۆی لە خۆیدا ئامانجە، نەک بکرێتە ئامراز بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیکە.

لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە، گۆران لە یاداشتێکی خۆیدا بەئاشکرا دان بەمەدا دەنێت و گەواهی دەدات کە پەیڕەوی پەرناسی (هونەر لەپێناو هونەر)ی کردووە:
«لە سەرەتاوە بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدوای (**نظریەی هونەر بۆ هونەر**) ئەڕۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە وەکو هێنەکانی جۆن کیتس و ئۆسکار وایلد. .»

هەروەها شیعری گوڵی خوێناوی (کە لە ١٩٣٤ لە بەغدا لە دیاریی لاوان، ل ٦٥ بڵاوکراوەتەوە و دووەم جاریش لە ژین ژمارە ٥٥٧ ساڵی ١٩٣٩ بڵاوکراوەتەوە) لە چیرۆکێکی شاعیری پەرناسی ئینگلیز ئۆسکار وایلد بە ناونیشانی (بولبول و گوڵ) وەرگیراوە.
ئەم چیرۆکەی ئۆسکار وایلد، ئاشکرایە، فەلسەفەی پەرناس بەوپەڕی وردبینی و فراوانییەوە دەردەبڕێ. گۆران نموونەیەکی پەرناسی جوانی هەڵبژاردووە بۆ بەهرە لێ وەرگرتنی. ئەم بەهرەوەرگرتنەی لە ئۆسکار وایلد و شاعیرانی دیکەی پەرناس بەڵگەیەکی دیکەی پەرناس بوونی ناوبراوە.
پەرناسەکان پێیان وابوو کە «جوانی» ڕزگارکەر و مەئوا و ئامانجە، تاقە سەرچاوەی بەختەوەرییە. گۆران ئەم پرەنسیپ و ڕوانینەیشی هەر لێیان وەرگرتووە و لە بەرهەمەکانیدا دەکاری هێنارە:

**حەیاتی جوانی،**
**جەمالی بزووتن و، گیانی..**
**ضیای سروور ئەڕژێنێتە ژینی ئینسانی**

یان سوود لە تەکنیکی پەرناسەکان وەردەگرێت: چەمکی ڕەهای «جوانی» لەناو جەستەی ئافرەتدا بەرجەستە دەکات (جوانی لە بەژنێکی بەرزا) و پیشان دەدات کە تەنیا جوانی (جوانی و بەس) دەتوانێ بەختەوەری ببەخشێتە مرۆڤ و دنیا:

**فیدات بم ئەی ژنی جوان،**
**ئەی جەمالی سنعەتکار**
**بەڵێ! دەلیلی سەعادەت ئەخەیتە پێش ئەنزار.**

شایانی باسە، ڕەفیق حلمی لە هەر دوو بەرگەکەی خۆیدا لەبارەی شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، هەروەها عەلائەدین سجادی و کاکەی فەلاح و د. عزەدین مستەفا رەسووڵ و د. کەمال میراودەلی و سەرجەم ئەو توێژەر و ڕەخنەگرانەی دیکەیش کە باسی گۆران و بەرهەمەکانی ئەویان کردووە، تا ئەمڕۆش، خەیاڵیان بۆ ئەوە نەچووبوو کە گۆران شاعیرێکی پەرناس بووە. بەکورتییەکەی: ئەمە یەکەمین وتار و ئاماژەیە بەم مەسەلەیە و لە داهاتوودا فراوانتر لێی دەکۆڵینەوە.

**سەرچاوە:**

**عەبدولڕەزاق بیمار: دانیشتنێک لەگەڵ گۆران، گ، بەیان، ژمارە ٢، بەغدا: شوباتی ١٩٧٠، ل ٣.**
**گۆران، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، ئاراس، هەولێر: ٢٠٠٢**
**ئەنوەر قادر محەممەد: لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، دەزگای سەردەم، سلێمانی: ٢٠٠١، ل ٢٦٩**
**کەمال میراودەلی: وتارێک لەبارەی گۆران، گ. نووسەری کورد، ژمارە (٩) ئابی ١٩٧٣، ل ٨١**
**ئومێد ئاشنا: ڕەشید نەجیب، ئاراس، هەولێر: ٢٠٠١، ل ١٦**
**عومەر مەعرووف بە...نجی: گۆران و ئەدەبی ئینگلیزی، گۆڤاری ڕۆژی ک... ژمارە (٤٢) ساڵی ١٩٧٧ و ژمارە (٥٠)، بەغدا: ١٩٧٨.**
**عومەر مەعرووف بەرزنجی: گۆران و ئەدەبی ئینگلیزی، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٤٢) ساڵی ١٩٧٧ و ژما... ...غدا: ١٩٧٨.**
**ڕەفیق حیلمی: شعر و ادبیات، ب ١ و٢، بەغدا**
**د. عزەدین مستەفا ڕەسووڵ: ئەدەبی نوێی کوردی.**
**وتاری «کەڵکی ئەدەب» ژین: ژ ١١٢٦ و ١١٢٧**
**سەرجەم دیوان و نامیلکە و کتێب و گۆڤار و بڵاوکراوەکانی لێرەدا ناویان هاتووە.**

**تێبینی:**
لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەم وتارەمەوە، ڕادەگەیەنم کە ئەم وتارەم و هەموو وتار و توێژینەوە و کتێبێکی دیکەشم - کۆن یان ئەوانەی لە داهاتوودا بڵاویان دەکەمەوە - **ڕازی نابم و بە هیچ شێوەیەک ڕێگە نادەم** کە لەلایەن مامۆستایانی زانکۆ و قوتابیانی ماجستێر و دکتۆرا (بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن ئەکادیمییەکان و زانکۆییەکان) سوودی لێ وەربگیرێت: نابێ تەنانەت ئاماژەیشی پێ بدرێت! چونکە من باوەڕم وایە کە ئەکادیمی و دکتۆر و پرۆفیسۆر و سەرجەم زانکۆ و زانکۆییەکان هەموو تەلاری زانست و سامانەکانی خۆیان لەسەر پەردووی زبڵخانە و قەشمەریاتەکانی خەڵکی ڕووتەڵەی وەک من بنیاد ناوە.
لەمڕۆ بەملاوە، هەر یەکێک لەو زانکۆیی و ئەکادیمییانە ئەگەر بەپێچەوانەوە ڕەفتار بکەن، خۆیان تووشی سزا و لێپێچانەوەی یاسایی دەکەن.

# (فەرهەنگی خەم)
# فەرهەنگی باوەڕ و خەبات

**کەمال غەمبار**

## پێشباس

ڕەنگە گەڕانەوە چەند جارێک بۆ نووسین لەسەر شاعیرێک، ئەوەندە بەپێزو بەهێزو بەنموود نەبێ، بەقەد ئەوەی کە جاری یەکەم لەسەری نووسراوە، هەر چەندە کەمن تا ئێستا بەچەند نووسینێک ئاوڕم لەم شاعیرە داوەتەوە، بەپێی توانا و تێگەیشتنی خۆم ڕووناکیم خستۆتە سەر شیعرەکانی. هەر جارێک بەشێوەیەک هەڵسەنگاندوون و تاڕادەیەک مافم بە لێهاتوویی و بواری ئەفراندنی داوە، بەڵام جیهانی شیعریی شاعیر ئەوەندە فراوان و بەربڵاوە، دەکرێ، هەر جارەی لایەنێکی لێ شەن و کەوبکرێ، لەم ڕوانگەیەوە حەز دەکەم لەو شیعرانە بدوێم کە ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕو خەباتی شاعیرن. ئەم جارەیان «فەرهەنگی خەم» بکەم بە «فەرهەنگی باوەڕو خەبات».

## حەسیب قەرەداخی و سیاسەت

«سەرەتای تێکەڵبوونی شاعیر، بە دنیای پڕ جەنجاڵی سیاسەت لەڕاپەڕینەکەی (١٩٤٨)ەوە دەست پێ دەکات، سەرەتا لە پارتی دیموکراتی کوردستاندا دەست بە تێکۆشان دەکات، تا جیابوونەوەی هەمزە عەبدوڵلا.

دواتر ڕیزەکانی حزبی شیوعی عێراقی بۆ تێکۆشانی چینایەتی و نەتەوەیی و نیشتمانی هەڵبژاردووە. ئەو دوو ئەزموونەی شاعیر لە ژیانی حزبایەتیدا، هەریەکەیان لەکات و سەردەمی خۆیدا ڕەوت و شێوازی شیعر نووسینیان تاڕادەیەکی زۆر بۆ دیاری کردووە»(١) واتە لەتەمەنی (١٩) ساڵییەوە تێکەڵ بە سیاسەت بووە، بەر لەو تەمەنەش هەرزوو هۆشیاریی سیاسی، لەئەنجامی هەستکردنی بە ئێش و ئازاری گەلی کورد، لەدڵ و دەروونیدا چەکەرەی کردووە و گەیشتۆتە ئەو قەناعەتە، بە خەباتێکی ڕێکوپێک و بە بڕوایەکی چەکپۆش نەبێ گیروگرفتەکانی کۆمەڵ چارەسەرناکرێن و گەل ئازاد و بەختەوەر نابێ، بۆیە ڕێگەی سیاسەتی گرتۆتە بەر و «سیاسەتیش لای ئەرستۆ زانستی بەختەوەریی کۆمەڵایەتییە، هەروەها ڕەوشت زانستی بەختەوەری تاکەکەسییە و وەزیفەی دەوڵەت ئەوەیە کە گەورەترین چەردەی بەختیاری بۆ زۆرترین ژمارەی هاووڵاتییان بێنێتەدی» (٢).

لەم ڕوانگەیەوە شاعیر چۆتە کۆڕی خەبات و ژیانی خۆی بۆ گەل تەرخان کردووە، بە کردەوە سەلماندوویەتی کە خاوەن هەڵوێست بووە، شیعریشی کردۆتە چەکێکی تری تێکۆشان، کە ئەو سەردەمەی ئەو تێیدا خەباتی نهێنی دەکرد، شیعر کاریگەرترین چەک بوو دژی داگیرکەرانی


حەسیب قەرەداغی

کوردستان. لەم تێکۆشانەشدا خۆی تەنیا نەبوو، پشت ئەستوور بوو بەو کاروانەی لەگەڵیا کەوتبووە ڕێ، لەو ڕێگەیەدا ئامادە بوو قوربانی بدات و بەجۆرە خۆشی و بەختەوەرییەکی بێ سنووری لەقەڵەم دەداو، بەکارێکی پیرۆزی دەزانێ:

**بەرەو بەیان ڕێ ڕەچاوکە**<br>
**بەرەو بەیان ڕێ ڕەوایە**<br>
**سەفەری وا موبارەکەو ڕۆژێکی ڕوونی لەدوایە**<br>
**قەڵای مەردان هەزارانی وەکو تۆ بوون**<br>
**چینی دیواریان بۆ هەڵساند**<br>
**نەخشەی هەبوونیان بۆ سەپاند**

**برای ڕێبوار، خاوەن بڕیار**
**بڕیاری چاک ببەیتە سەر**
**چەند پیرۆزە لەو قەڵایە تۆیش چینێکی بخەیتە سەر**
**ئێجگار خۆشە**
**مرۆڤ باخی تێکۆشانی بۆ بێتە بەر**
**لەناو دەریای شینی ڕەنجا گەوهەری خۆی بۆ بێتە دەر. (٣)**

شاعیر، سیاسەت وەک ئارەزوویێکی کاتی سەیر ناکات، بەڵکو بەلای ئەوەوە، سیاسەت ڕەوشت و پابەندبوونە بەهێڵێکی هەڵکشان بەرەو لووتکە، بەردەوامبوونە لەسەر ئەو هەنگاوانەی بە مەڵبەندی دەگەیەنن، نەک خۆ دابڕین لەکاروانی خەبات لەنیوەی ڕێگەدا:

**ئێجگار خۆشە**
**کە هەنگاوت بەرەو ئامانج هەڵهێناوە**
**بۆ پیشوازیت خەڵکی هەبن دارنەدەنە بەر هەنگاوت**
**کەمتەرخەمی تۆیەڵ نەکەن.**
**بیهاوەن بۆ سەرو چاوت**
**کە پەیکی خێر مژدەی خۆشی گەیشتنی کاروانی دا**
**بانگی بەیان خەبەر بدا**
**بووکی ئاوات لە گوڵزاری وا وەرزێکا**
**چەپکە گوڵی هەمەڕەنگە**
**لەبەر مووڕو لەسەر بدا (٤)**

کە شاعیر دەبینێ ئەوانەی لەگەڵ کاروانەکەی خەباتدابوون، ڕێگەکەیان چۆڵ کرد، هاوبیرەکانی لە ڕیزەکاندا ترازان، شیعرەکانی دەبنە گەڕیدەو لەدەرگاکان دەدەن، بەڵام ئەفسووس کەس دەرگا ناکاتەوە، ئەویش باری سەرشانی ئەوەندە گران و سەختە، لە ئەرکی (کاوە)یەکی قارەمان دەکات، کە ببێتە پێشەنگ و میللەتە ستەمدیدەکەی دەرباز کات:

**ئای گەڕیدەی شیعرەکانم لەشاراندا لەدەرگای دا**
**کەسێک نەبوو لا دەرگایەک بکاتەوە**
**کەسم نەدی بڵێ ئەمەش بەندەی خوایە**
**خەمی (کاوە)ی لە کۆڵدایە. (٥)**

کە شاعیر، سیاسەت بەکارێکی ڕەوشتکاری لەقەڵەم دەدات، بەپاکی و بێگەردی چۆتە ناو گۆڕەپانەکە، بەڵام بەداخەوە کە مرۆڤ لەسەر ئەو پاکی و بەرائەتەی خۆی تووشی کەسانێ دەبێ، کە قسەو بەڵێن و کردەوەیان نێوانی ئاسمان و ڕێسمانە، خۆی بە ساویلکە و نەفام دێتە بەرچاو، چونکە حەقیقەتی ئەوکەسانەی نەدەزانی کە پێیان هەڵخەڵەتاو بەرەو خەبات بەکێشیان کرد و بەرلەوەی جەوهەرو نەژادیان دەربکەوێ، بەقسەی زل و دروشمی بریقەدار تا پەتەکە ئامادەباشی خۆیان دەردەبڕی، ئەوان لەئەنجامی ئەزموونەکاندا حەقیقەتیان ڕوون بۆوە، کە هی ئەوە نەبوون مایەی پشت پێبەستن بن، بەراوردی لەنێوان بیروباوەڕ و ئایدیالۆژیای ئەوکەسانەو ڕەنگدانەوەی لەسەر زەمینەی واقیعدا کردووە:

**برینەکەم! ئەی هاوسەری دەیان ساڵم**
**دانپیانانە من هێشتا کە ئەو منداڵەم**
**وام دەزانی پیاو، کوتەکە،**
**حەق، شەتەکە،**
**وام دەزانی ڕاست دەکات، ئەوەی دەڵێت: تاپەتەکە!**
**کاتێ تەماشای دۆزم کرد؛**
**کاتێ تەماشای دۆخم کرد؛**
**سۆسیالی تێلا چوو بەگژما.**
**ناسیۆنالی دیموکراسی دایگرتەوە!**
**مێژووم لێ بوو بە سەگی هار**
**لەم ناوە دووری خستمەوە.**
**دزان، جرتیان تێ دەگرتێن..**
**جرتێک بۆ من، دوو جرت بۆ تۆ!**
**سەد بۆ کوردایەتی، درۆ. (٦)**

شاعیر کە وەک ئازادیخوازێک، هەست بەو ئازادییە دەکات کە مافی خۆیەتی تەعبیر لەکەسایەتی خۆی بکات، بە عەقڵێکی کراوەی مەعریفی مێژوو دەخوێنێتەوە، خوێندنەوەیەکی ناوەوە، چونکە ڕەهەندی دەرەوە شتێک بوو، ڕەهەندی ناوەوەش شتێکی تر، ئەویش دەیتوانی لەهێڵی سیاسی ڕەوشتکاری بترازێ، لەگەڵ واقیعە تفت و تاڵەکەدا خۆی بگونجێنێ، بیروباوەڕی نەتەوەیی و نیشتمانی و مرۆڤایەتی بەلاوە بنێ، قەتماغەی برینەکان هەڵنەداتەوە، بەڵام شاعیری ڕەسەنی خاوەن هزر کە بەپاکی ڕێگەی خەباتی گرتبووە بەر دەیزانی وەک مەسیح فەرموویەتی: «چ سوودی بۆ مرۆڤ هەیە ئەگەر گشت جیهانی دەسکەوێ، خۆی بدۆڕێنێ» ، کە شاعیریش هەست بەکەسایەتی و شاعیرییەتی خۆی بکات، کە پاراستنی شکۆمەندی و سەربەرزی هەموو شتێکە، خەباتکردن لەپێناو گەلی کوردو کوردستان خولیاو جەوهەری ئەو کەسایەتییە سەربەخۆیە بێ، هەرگیز قوربانی بەخۆی و ئەفراندن و خولقاندن ناداو لەدەرەوەی مێژوودا ناوەستێ، چونکە

«ئەگەر «تاکییەکەی» لەدەست دا، مەبەستم هوشیارییە خودییەکەی،یان کەسایەتییەکەیەتی، لەگەڵ غەیری خۆی لەیەک بارستدا تێکەڵ بوو، جیاوازی تێدا نەبێ، وەک ئەوەی لە مێگەلی مەڕدایە، لە هەمان ساتدا ئادەمییەتی خۆی لەدەست دەدات و خولقاندن و داهێنانی تێدا دەکوژرێ، ئەفراندن نامێنێ، بەڵکو (داهێنەر) ئەگەر هەبێ- لە حەسیب قەرەداخی هەیە- دەبێتە لادەرەوە (خولقێنەر)ی ناوازەو دەرەوەی کۆمەڵ» (٨)

هەرچەندە کە شیعری سیاسی هەندێک پێیان وایە لەڕووی هونەرییەوە بەپێی ئەوەی کەرەستەی کەمە، لە ئاستێکی نزمدایە، بەلام شاعیر ئەگەر سەرەتای شیعرەکانیشی مۆرکی راپۆرتی و گوتاریان پێوە دیاربێ، بەلام لەئاکامدا وەک شاعیرێکی داهێنەر تەنانەت لەم بوارەشدا ڕەسەنایەتی خۆی سەلماند و شیعرو هونەری بەیەکەوە بەستەوەو لەیەک بۆتەدا هەردووکی تواندەوەو کردنی بەیەک جەستەو یەک گیان، لەم ڕووەوە ئەدۆنیس دەڵێ: «من زەمەنێکە هەوڵم لەگەڵ شاعیرە ئایدیالیستەکان داوەو زۆرم لێکردوون شیعرییەت و هونەریەتییان بگاتە ئاستێکی بەرز بەجۆرێ فیکرەکانیان لەناو هەستیاری و شیعرییەتیاندا بتوێنەوە، نەک ئەوەی زمانی شیعری هەر تەنیا ئامرازێ بێ بۆ گواستنەوەی کۆمەڵێ بیروباوەڕی وشک، چونکە توانەوەی فیکر لەناو هەستیاریی شیعریدا، شیعر دەبێ بە وتاردان و پڕۆپاگندە وەک لەوەی ببێ بە شیعر» (٩).

هەر لە سۆنگەی شانازیی شاعیر بە شاعیرییەتی خۆیەوە، بوێرانە دێتە گۆ، بالای شیعری خۆی لەهی شیعری (ڕەسوڵ هەمزاتۆڤ) بەکەمتر نازانێ، بۆیە ڕووی تێدەکات:

**من چیاییم چیایی**
**ناچمەوە ناو ئاوایی**
**منیش وەک ئەو عالەمە وا بایی دەبم لەخۆم**
**ئەی داغستانی شیعرم منیش کالای بالای تۆم**
**لە داغستانی دەروون هەرکە ئێوارە دابێت**
**سەگی شەو پێم دەوەڕێ و منیش ئەم شیعرە دەڵێم**
**سەگ وەڕ بێ و شیعر بڵێم**
**مەڵێن لەخۆی باییە**
**بەخوا زۆر ئازاییە(١٠)**

شاعیر هەرگیز بڕاقی هزری لەبزووتنەوەی واقیعدا جیاناکاتەوە بۆیە شیعر دەکاتە تۆو گەردکیەتی لە کێڵگەیەکی بەپیتدا بیرووێنێ، چونکە فیکر هەرگیز واقیع ناگۆڕێ، ئەگەر بەواقیع نەبەسترێتەوەو زۆر لەو ئایدیۆلۆژیانە پووچەڵ بوونەوە کە نەیانتوانی پێگەیەک لەسەر زەمینەی واقیعدا بڕەخسێنن، واتە فیکر ڕەنگدانەوەی واقیعەو لەهەمان کاتیشدا بۆ گۆڕینی واقیع و دروستکردنەوەی واقیعێکی تر تەرخان دەکرێ.

جارێکی تر ڕوو دەکاتە داغستانەکەی گەمزاتۆف و بانگی دەکات:

**هۆ دایکی داغستانم، ئەم نازەی من مەشکێنە**
**ئەم شیعرەی من مەدڕێنە**
**لەناو کێڵگەی پوختەدا تۆوێکی پاک بڕوێنە**
**مەمکی پڕ لە شیری خۆت با دوگمەی سینەوازکا**
**بیکە بە ئالای ژیان**
**بەدروشمی ئاگر و بەفرو باران و چیا**
**دایک شیر با بەساواو باوک خەنجەری باتێ**
**هەر شیری مەمکی دایە**
**بەرامەی خاکی تیایە**
**باسی شیرو خەنجەریش ئێمە دەیکەین بە بەستە**
**شیری دایکە کوردەکان لەسەر چاوەوە خەستە(١١)**

شاعیر ئەوەندە دژی ستەمکارە، وەک جانەوەرێکی ئادەمی دێتە بەرچاو کە هیچ حیسابێک نە بۆ تاک نە بۆ کۆمەڵ دەکات، شوێنەوارێکیان بۆ دانانێ و «زۆرداری مرۆڤ دەکاتە کوێلە، ئەگەر خەڵک بوونە کوێلە، یان ئاژەڵ نرخی خۆیان لەدەست دەدەن، نەدەستپاکی، نە ڕاستگۆیی و نە بوێری لە ئارادا دەبێ، بەڵکو درۆو دووڕوویی و ماستاوکردن و ڕووپا مالی و ، ملکەچی و گەیشتنە مەبەستەکان لە نزمترین ڕێگەوە دێنە کایەوە» (١٢).

لەم ڕووەوە شاعیر نەک تەنانەت وەک مرۆڤ کە نایەوێت ببێتە کۆتەڵی زۆردار، بەڵکو گا بەردێک بەوەلامدێنێ، گیانی مرۆڤی هوشیارو ئازادیخوازی پێدەبەخشێ. بەزمانی ئەوەوە دەڵێ و دەیکاتە ماسک بۆ کەسایەتی هەموو مرۆڤێکی شەرەفمەندو ئازاو دلێری دژی ستەمکاری:

**گا بەردێکی لارێ گرتوو، پارایەوە**
**خەبەر وایە ئالێرەوە دەمگوێزنەوە بۆ ناو پارکێ!**
**دەمکەن بە پەیکەری سوڵتان**
**مەخابنە پیاوی چابە، پیکێ بێنە**
**دامگرەوە تا ورد دەبم، دەبمە کوچک و کوڵتوو دانە،**
**یا بمتاشە وەک پێپلکە بۆ بەردەرگای**
**قوتابخانە!(١٣)**

هەروەک لەپێشەوە ئاماژەم بۆکرد، خۆی بەشاعیرێکی

ڕەسەن و خاوەن موڵکی خۆی دەزانێ، کە مرۆڤیش بوو بەخاوەنی خۆی هەست بە ئازادیی کەسایەتی تایبەت بەخۆی دەکات، لەدیدی خۆیەوە دەڕوانێتە واقیع، ملکەچی ڕاوبۆچوون و ویست و ئارەزوو و حەزی ئەم و ئەو نابێ، مەسەلەکان بەپێوەری عەقڵی مەعریفی خۆی لێک دەداتەوە. بەگیانێکی بەرز، وەک مرۆڤێکی خاوەن شەرەف و سەربڵند مامەڵە لەگەڵ ڕووداوەکان دەکات، هەر ئەو سەربەرزییەشە وای لێکردووە کە نەچێتە قاڵبێکی دارێژراو، ئەگەر ئەو قاڵبەش خاسییەتی گشتگیری بەخۆ گرتبێ، مادامەکی پێوەرەکان گۆڕدراون و سەرەو لێژ کراون، ئەو وەک مەسیحێک دەیەوێت کە (سەرنجی خەڵکەکە بۆ جیهانێکی نوێ پەلکێش کات کە لەناوخۆیدا هەڵیگرتووە، کە بایەخدانە بەگیانی ڕۆحی، ئەو جیهانەی کە وێنەی مەملەکەتی ئاسمانە «مەملەکەتی خوا» و بۆ ئەوەی بگاتە ئەم مەملەکەتە دەبێ ئەو بتانە بشکێنێ کە حەزو ئارەزووەکانی سەر زەمین دروستی کردوون)(١٤).

شاعیر ئەو بتە دەشکێنێ کە خەڵکی کاسەلێس دروستیان کردووە، کردوویانەتە خوای سەرزەمین، ئەم یاخیبوونەی شاعیر لەم کۆپلە شیعرەدا ڕەنگی داوەتەوە:

**بۆچی دەبێ هەرچی بکەم مەرج بێ خەڵکی بڵێن باشە**
**خەڵکی ئاگای لەمن نییە سەرم ماشەو ژێرم ئاشە**
**کە تەشتی نان بوو بەچڵکی دەستی کەسێک**
**ئای ئای مرۆڤ دەبن بەسەگ**
**ڕیشی درێژ دەتاشرێت و سمێڵ دەکرێ بەبۆیەدا**
**ئای دەم هەڵبەست، ئای دەست هەڵبەست**
**دەبنە فرمایش و ئایەت**
**ئای کە بتیش دەکرێت بەخوا!(١٥)**

ئەو هەست و نەستەی شاعیر کە لەمێشک و دەروونییدا پەنگیان خواردۆتەوە، نرخ و بەها ڕاستەقینەکان لینگەو قووچ کراون، ناچارە پەردە لەڕووە دزێوە دەمامککراوەکان هەڵداتەوە، هەر دەبێ بانگی حەق و ڕاستی بدات، هەرگیز ناتوانێ فێڵ لەدەروونی خۆی بکات، ڕاستییە شاردراوەکان لەڕوخساریدا ڕەنگیان داوەتەوە، هەر بۆیە ماندوو و شەکەتە، ئەو لەکەسانی تر زیاتر هەست بەو بارە نالەبارو نامۆیە دەکات و ناشتوانێ بێدەنگ بێ، کە «مرۆڤ بە نرخترین سەرمایەی جیهان» بێ، وەک پێڵاو لەپێ بکرێ، کتێب و ڕۆمان و شیعر کە زادەی مێشک و بیری مرۆڤن، دەبێ لەو ڕۆژگارەی کە خوڕ بەدەستی ئەنقەست ڕوو ڕەش دەکرێ، مێژوو دەبێتە ئاودەستخانە و شیعر بەمیزەڵان، چ ئومێدێک بەژیان بمێنێ، بەڵام هەر چۆنێک بێت ئامادە نییە بێتە ڕیزی مرۆڤی سەگی کاروانناس:

**سەگی ئەمڕۆ کاروان ناسە**
**مرۆڤەسەگ دەست و دەمی تەورداسە**
**من دەروونم ئاوێنەیە بۆ ڕوخسارم، بۆیە ماندووم**
**گەردن لەکڵپەی ناکامی سەفەر دەسووم**
**دەستم لەڕوو ڕەشی ڕۆژدا نەبووە و نییە**
**خەڵکی لەشیعرو لە شاعیر گلە و بناشتەکەی چییە؟!**
**مێژوو بوو بە ئاودەستخانەو هەرچی هەڵسێ گووی تێدەکا**
**شیعریش کرا بەمیزەڵدان هەرچی هەڵسێ فووی تێدەکا**
**نرخیش بووە بەپێڵاوێ**
**ئەوی پارەو پوولی هەبێ لە پێی دەکا**
**جرت بۆ کتێب، جرت بۆ ڕۆمان**
**جرت بۆ ئەوان، جرت بۆ خۆمان**
**ڕێگە هەمووی پێدز کێیە و جرت و فرتە**
**ئاواز هەمووی بای گەدەیە و ماوەی کورتە.**

هەرچەندە شاعیر لەو باوەڕە دایە کە ئەو واقیعەی بەرچاوە، واقیعێکی شێوێنراوە، تێکوپێکدانی شتێکی کاتییە، بەڵام ئەو دەیەوێت ئەو مێژووەی پیس کراوە، جارێکی تر بەو ئازارو ئەشکەنجەیە بنووسرێتەوە کە لە فەرهەنگی خەمی ئەودا تۆمار کراون، بۆیە دەبێ خەمخۆری ڕاستەقینەی دارشتنەوەی مێژوو بێ، مێژووی خەمی مرۆڤێکی بەوەفا کە خاکی پیرۆزی کوردستان بیبیلەی چاوەکانییەتی، گەلی کوردیش باوانییەتی، ئەو جۆرە مرۆڤانەش مێژوو دروست دەکەن، نەک زورناژەن و تەپڵ لێدەری کاسەلێس:

**شیعرەکانم بارگە و بنەن**
**تۆماری چیرۆکی خەمن**
**بەداخەوە هەتا ئێستەش**
**نەیانزانی زۆرن کەمن؟**
**ئەو پڕ بەم کوردستانە**
**هاوار دەکەم من ڕووبارم**
**هەر ئەوساتەی دەڵێن خۆمم**
**خۆشم نیم و بەهرەدارم**
**هەر خەم دێت و خەیاڵ دێنێ**
**هەر خەیاڵەو خەم فڕ دەکا**
**هەر ئازارو ئەشکەنجەیە**
**پێکی ژیانم پڕ دەکا**
**مرۆڤ ئەگەر خەمی نەبوو**
**شاعیر ئەگەر ژانی نەبوو**

**واته ئیتر ئەم مێژووە،**
**هەر پۆیە بوو تانی نەبوو(١٦)**

## سەنگەر نەگۆڕینی شاعیر لەپابەندبوونێکی تایبەتەوە بەرەو پابەندبوونێکی گشتی

سەرەتا ئاماژەمان بۆ بەتێکەڵاوبوونی شاعیر بەدنیای سیاسەت کرد، کە پابەندی هێڵی حزبایەتی بووە و لەو ڕێگەیەوە، بیروباوەڕی کوردایەتی و چینایەتی و مرۆڤخوازی چۆتە مێشکی و بەکامی دڵ تێکۆشاوە و لەو پێناوەدا ئەشکەنجە و ئازاری بینیوە. کە لەژیانی حزبایەتیشدا دوورکەوتۆتەوە، زیاتر پابەندبووە، بەدۆزێکی مەڵبەندی، کە دۆزی ڕەوای گەلە ستەمدیدەکەی بووە، وەکو مرۆڤێکی نەتەوەخوازی نیشتمانپەروەر لەسەنگەرە فراوانەکەدا زیاتر خۆی دۆزیوەتەوە، بەر لە ڕاپەڕینی بەهاری ساڵی (١٩٩١) زۆربەی زۆری نووسەرو هونەرمەندان، دۆزە نەتەوەییەکە لایان زیاتر پاڵنەری بنەڕەتی بووە بۆ خۆڕاگرتن و خۆ نەدۆڕانیان، هەر ئەو هەستە نەتەوەییە بووە کە گیانی شۆڕشگێری بەجۆش هێناون و چۆکیان لەئاست زەبرو زەنگ و هۆکارەکانی فریودان و ویژدان فرۆشتن دانەداوە و شاعیر یەکێک بووە، لەو شاعیرە نەبەزانەی کە بە پاکی کەسایەتی خۆی پاراستووە، هەرگیز نەبۆتە زوڕناژەن و، تەپڵ لێدەری دەرباری سوڵتان، چونکە وەک وتراوە: «ئەو شاعیرەی لەبەر دەرگای سوڵتان دەوەستێ، شاعیرێکی دزە»، بەپێچەوانەوە، شیعرەکانی کردۆتە چەکی کاریگەری خەبات و شانازیشی بەو چەکەوە کردووە وەک «شێخ ڕەزای تاڵەبانی» دەڵێ:

**تۆ هەتە تیغی دەبان و من هەمە تیغی زبان**
**فەرقی ئەم دوو تیغە هەروەک ئاسمان و ڕێسمان!(١٧)**

جا ئەگەر تیغی زۆرداری دەسەڵاتدار داپلۆسین و ئەشکەنجەدان بێ، یان شێوازی تر بێ بۆ لەخشتە بردن و بێ دەنگکردنی شاعیر، یان کڕینی ئەو کەسایەتییە ئازادیخوازە سەربەخۆیە بێ.

کە شاعیر بولبولی ئاوازی پەیڤی ڕەوانی کوردی بێ، وشەکانی ببنە گەردەلوولی بێ ئامان و ڕێگەی خەباتی چارەنووسی گەلی کوردی بندەست بگرێتە بەر، ئەو ڕێگەیەی بە پابەندبوونێکی ڕاستەقینەی دەزانێ و میللەتەکەی بەرەو ئازادی و سەرفرازی دەبات، شیعر لەلای ئەو ڕەهەندێکی تر وەردەگرێ و بەختەوەرییەکی دیکەی پێ دەبەخشێ، کراسێکی تری لەبەر دەکات، کە کراسی شۆڕش و خەم و خەونی هەژارانە:

**کە زمانم کەوتە مەلەو**
**دەستم بوو بە هاوڕێی خامەو**
**هەنگاویشم هەڵهاتەوە..**
**بەسەر سنووری ئاوایی ساردو سڕا،**
**چووم لەدورگەی بەختانم دا**
**شیعر بوو هات بە دەنگمەوە**
**وتم کاکە ڕێبوارێکم پرسم هەیە**
**ڕەجاڵێکم ترسم هەیە**
**کراسێکی کردە بەرم ئاودامان بوو**
**تانی شۆڕش..**
**پۆیشی خەم و خەونی هەموو هەژاران بوو.(١٨)**

کە شیعرە سیاسییەکانی شاعیر دەخوێنینەوە بە عەقڵی ئەمڕۆ دەیخوێنینەوە، هەرچەندە دەبێ هەر شیعرە لەچوارچێوەی مێژووی خۆیدا بیخوێنینەوە، بەڵام ئەو شاعیرەی کە سنووری سەردەمی خۆی دەبڕێ و تەعبیر لە ئاینده دەکات بەو جیهانبینییە گەشەی خۆی، شیعرەکانی مۆرکی نەمرییان پێوە دەبینرێ. ئەو بەدیدی خۆی شیعری نووسیوە، گوێی نەداوەتە ئەوانەی چۆنی هەڵدەسەنگێنن، بەڵام لەهەمان کاتدا، بەرووی ئەوانەی ستەمیان لێکردووە و مافی ڕەوای خۆیان نەداوەتێ تەقیوەتەوە کەلەمەو دوا زیاتر لێی دەدوێین:

**چاوی کوردی ستەمدیدەم، ئەشکی تۆڵەم**
**تیا دەکوڵێ**
**گرنگ نییە ڕەخنەسازێ چی دەنووسێ و هەرچیش بڵێ**
**بۆ لاسەرەی ئەویندارا ن**
**بەهاری نوێ دەبە گوڵێ.(١٩)**

شاعیر دڵی خۆشە بەو ئەرکەی خستۆیەتییە سەرشانی خۆی، کە گەرەکیەتی دۆزەخ بکاتە بەهەشت، وەک وتم هەرگیز ئامادەنەبووە ببێتە شاعیری دەرباری دیکتاتۆر، بۆ پلە و سامان پێیدا هەر بڵێ، بەڵام بەکامی دڵەوە ببێتە شاعیری دەرباری خەم و هیوای مەزنی کوردستان، خەونە سەوزەکانی ڕابەرانی ڕێگەی ئازادی، کە لەو ڕێگە شکۆدارەدا سەریان نایەوە، بەدیدەنی خاکێکی سەربەخۆ شادنەبوونەوە و لەتاراوگەدا گیانیان بەخاک سپارد:

**بۆ بولبولی نەغمەی کوردی پەیف و لاوک و حەیرانم**
**ئەگەر کرام بەرەشەبا، گەردەلوولی بێ ئامانم**
**دۆزەخ دەنێمە سەر شانم**
**منی شاعیر لەژێ کانی تاری دەستی گەرووی پاکی**
**کێوەکاندا تۆنێکی نوێم**

**لەتەک ڕێبواری ماندوودا**
**ڕێبواری ڕێی خەم و هیوا، سای سەهەنم**
**هەنگاو دەنێم هۆ ڕێبواری ڕێگەی خەم**
**خەم و هیوای مەزن**
**قەت شاعیری دەربارنەبووم**
**لەدەربارتا بۆ شاعیری دەربار دەشێم**

**مردن هەیە.. دوای ناشتنم، گیانم چەپکێ گوڵی سوورە**
**وەلیای ژیلەی بن تەنوورە**
**بەدەن لە پرچی دار بەڕووی کەلی (زەردە) و**
**مەودای تێڕوانینم دوورە.**
**بۆنم دەگاتە گۆمی (وان) شەپۆلم ڕووی لەباشوورە**
**دڵم خۆشە هەموو شەوێ خەو دەبینم**
**(حــاجی) لەکــۆیە حــەج دەکــاو (نالی) هەر لە شارەزوورە(٢٠).**

## شاعیرییەتی حەسیب قەرەداخی

شاعیـر دەیزانی چۆن مـامـەڵە لەگەڵ پەیڤدا بکات «سـوور بوو لەسـەر ئەوەی شـوێنەوارێک لەدەروونی خوێنەردا بخولقێنێ لەجیاتی لە یەکگەیشتنی ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا، مامەڵەی لەگەڵ وشەکان بە ڕێگەیەکی تایبەت دەکرد کە پێداگرتن بوو لەسەر بەهای هەڵچوون و سروشتی پەیڤ»(٢١)، هەرچەندە کە خۆی شاعیرێکی نوێخواز بوو، بەڵام ڕەوت و کێشی شیعری لەدەست نەدابوو، جاروبار ناوەڕۆکی نوێی لەبۆتەی فۆرمێکی کۆن دادەڕشت، وەک شاعیرێکی نیو کلاسیک. ئەو کێش و ئیقاعەی کە شاعیر پەیڕەوی دەکردن تەعبیریان لەکەسایەتی شاعیر دەکرد، کە «وەرگر- گوێگرو خوێنەریان لە دەروونەوە دەبزواند، کە لەدڵ و دەروونێکی بەجۆش هەڵقوڵیبوون، وێڕای ئەوەی دەسەڵاتێکی تەواوی لەسەر پەیڤەکاندا هەبوو، کە زەخیرەیەکی دەوڵەمەند لە هەگبەکەیدا هەبوو، هەر ئەو دەوڵەمەندییەی وشە نەیکردبووە ئەو شاعیرە لێهاتووە، بەڵکو دڵسۆزی و خوێن گەرمی و چۆنیەتی بەکارهێنانیان ڕەنگدانەوەی ئەو باڵابوونە شیعرییەی بوون، لەگەڵ ئەو ئەزموونە درێژەی کە تێیدا ژیا، باکگراوندێکی مەعریفی ڕۆشنبیری کە زیاتر زەمینەی لەباریان بۆ ڕەخساند.

کە شاعیر ئەو باڵا بەرزە شیعرییەی لەخۆیدا بەدی دەکرد وەک شاعیرێکی بوێری شۆڕشگێڕ لەناو هەڵبەست و دەرەوەیدا و «شیعری شۆڕشگێڕ وەک تێدەگەم هەڵوێستە لەژیان و ململانێدا و پێوەندی نێوان هەردوو چەمک، پێوەندی نامۆیی نییە.. ناکرێ شۆڕشگێڕ لەناو قەسیدەدا شۆڕشگێڕ بێ و لەشەقامدا کۆنەپەرست بێ، هەروەها ناکرێ شاعیری شۆڕشگێڕ لەشەقامدا شۆڕشگێڕ بێ و لەناو قەسیدەدا کۆنەپەرست بێ، ئەگەر توانیمان ئەو گونجانەی نێوان هەردوو چەمک بەپێوەندییەکی قووڵتر لە هاوسەریەتی و ئۆرگانیتر پێک بێنین، ئەوا بە سانایی دەری دەخەین کە ئەو شیعرە شۆڕشگێڕەی خوازیارینە، پێویستە لەناوخۆیدا شۆڕش و ڕوانینە کەلەپوورو غەیری تر لەشێوەکانی پێوەندییەکان لەناو قەسیدەدا هەڵگرێ»(٢٢)

ئەم بۆچوونەی شاعیری ناسراوی فەلەستینی (مەحموود دەروێش)، (حەسیب قەرەداخی) چ لە ناو شیعرداو، چ لە دەرەوەیدا، بەدێرە شیعرێکی خۆی دەیسەلمێنێ، وەک حەقیقەتێکی بەرچاو، کە توانیویەتی بەکردەوە هەڵوێستی مەردانەی لەژیان و ململانێدا هەبێ و خۆی نەدۆڕێنێ، لەهەمان کاتیشدا بەها هونەرییەکانی شیعری ڕەسەن بپارێزێ، بوێرانە و ڕاشکاوانە پڕ بەدەم هاوار بکات:

**هەتا دەمرم من هەر دەڵێم «جێ خەرمان نیم خۆم خەرمانم»**
**نە چوومەتە سەرشانی کەس وەلێ هاتوونە سەرشانم!(٢٣)**

شاعیر نوێخوازییەکەی لە کولتووری ڕەسەنی کوردەواری هەڵێنجاوە. زیرەکانە ئاوڕی لێداوەتەوە، ئەوەی ڕابردووی نەبێ، ئێستای نابێ، ئەوەی ئێستای نەبێ ئایندەشی نابێ وەک ئەدۆنیس دەڵێ: «ئەمە مانای ئەوەیە کە داهێنانی شیعری بەداهێنانی مێژوویی نەبێ تەواو نابێ، گۆڕانەکە مرۆڤخوازییەکی سەرانسەرییە نەک هونەری و چیتر»(٢٤). کە شاعیر پەنا دەباتە بەر کولتوور، بەتایبەتی کولتووری سۆفیگەری ئەمە نیشانەی نزمی ئاستی ڕۆشنبیرییەکەی نییە بەقەد ئەوەی نیشانەی قوڵبوونەوە و هوشمەندی و دەرک پێکردنە، کە ئەو جۆرە مامەڵەکردنە زادەی بیروباوەڕی و وزەی شیعری پتەوتر و فراوانتر دەکات. بەتایبەتی شیعری سۆفیگەری کە «فراوانی عەقڵ و واڵاکردنی چوارچێوەی هەستیاری لە ڕێگەی شیعرەوە نەبێ پێکنایەن»(٢٥). لەم ڕوانگەیەوە (فەرهەنگی خەم)، بەتایبەتی خەمی خودی شاعیرو خەمی گەل و نیشتمان بوونەتە بەردی بناغەی شیعرەکانی، ئەو پێوەندییە توندوتۆڵەی نێوان هەردوو جەمسەر بینای شیعرەکانیان هەڵچنیوە «وشەش ئەو بیرۆکە دەردەخات کە کۆنترۆڵی شاعیری کردووە، لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان بۆ ئەوەی لەناو گیانی

نووسەردا، بەدوای ئەو پەیڤانە بگەڕێین کە لەکارەکانی، بەرهەمەکانیدا زۆر بەکاردێن»(٢٦)، ئەمە وتەیەکی (بۆدلێر)ە بۆ نموونە هێنامانەوە، کە بەڕاستی تەعبیر لە رۆحی شاعیر «حەسیب قەرەداخی» دەکات، کە (خەم) بۆتە فەرهەنگێکی بەرفراوان، بەجۆرێ ڕەگ و ریشەی لەدەروونیدا قووڵ چووە، تارادەیێ، لە (فەرهەنگی خەم)دا (٣٥٠) جار دووپات کراوەتەوە(٢٧).

## بوێری شاعیرو شانازیکردن بەشاعیرییەتی خۆی

ئەگەر بەخێرایی بگەڕێینەوە، سەر دوای ساڵی یەکەمی ئاداری (١٩٧٠) کت و مت بۆ (٢١)ی ئاداری (١٩٧١) کە لەیەکەمین (میهرەجانی شیعری کوردی)دا شیعری (هەوەڵ مەزات)ی تێدا خوێندەوە، ئەوکاتە شەپۆلی (ڕوانگە) تاو و تەوژمی خۆی هەبوو، شاعیریش سەر بەو ڕێبازە نەبوو، لێشیان نزیک نەبوو، لەبواری داهێنان و ئەفراندن و نشاردا سەر دەفتەری نوێخوازان بوو، من وەک شایەت عەیانێک کە لەمیهرەجانەکەدا بووم، بەچاوی خۆم بینیم چۆن دڕی بەخەڵکەکە داو لەدەرەوەی هۆڵەکە لە «کەرکووک» بە دەنگێکی ڕەسەنی جیاکراوە، خەڵکەکەی هەژاند، تەقینەوەیەک بوو لە ژیانی شیعری شاعیر، جۆرە گواستنەوەیەکی تایبەت بوو لەبواری شیعری کوردیدا، کە ئەو حەلە باڵی مۆرکی ڕاپۆرتی و خیتابی و شێوازی ڕووکەشی بەسەریا کێشرا بوو، (هەوەڵ مەزات) بەدەنگی دلێری شاعیر، هاواری نارەزایی و بەگژداچوونی بازرگانی بوو بە وشەی پاکی کوردی، هێشتاش ئەو هۆنراوەیە تین و تاو و کاریگەریەتی خۆی هەرماوە، خاسییەتی ڕەها بەخۆوە دەگرێ، سنووری کات و شوێن دەبڕێ، هۆنراوەکە ڕیتمەکەی گورج و گۆڵەو، کێشی پەنجەی (٤) برگە بەچوار برگەیەو بەکێشی عەرووزی عەرەبیش دەریای «هەزەج»ە:

**هەوەڵ مەزات**
**ئەوا ئاوی ئەژنۆم داهات**
**حەرفم بەسەد گازو قاوە**
**بادراوە**
**ئەو دامێنەی هەڵوەشاوە**
**لەڕێگادا داخراوە**
**وا پێ خوستە، وا سواوە**
**دوێنێ کەسکی پەشێمانیم پیا هانیوە**
**تا ئێستاش کەس نەی بانیوە**
**خەتام نییە حەرفم ڕەقە**
**جێی ڕاوەستانم وا لەقە!**

**هەوەڵ مەزات، هەوەڵ مەزات**
**خواوەندی وەرزی بەهات**
**تا بۆ (گوێرەکە)ی (سامری)ی**
**دەستەونەزەر نەوەستاوم**
**هەتا لێلایی ئاخ و داخ**
**نەیەتەنیوە بەری چاوم**
**بێن بم گەنێ.. هەوەڵ مەزات**
**هەتا هەر کوێ دەنگم دەگات**
**هەوەڵ مەزات**

لەکۆتایی هۆنراوەکەیدا کە زیاتر ڕاستییەکە خەست دەکاتەوە و پەردە لەسەرڕووی دەمامککراوەکان هەڵدەداتەوە:

**پاز بەند و (زەند) و (ئاوێستا)م**
**بۆ مەزاتە**
**خەڵکینە بروام پێ بکەن**
**ماوەی مەزات بۆ یەک ساتە (٢٨)**

هەڵبەت ئەم هۆنراوەیە ڕەنگدانەوەی هەستی ناوە خۆی و سکاڵای دەروونی شاعیر بوو لە ئاست ئەو ئاژاوەی کە وشەی ڕەسەن لەبازاڕی ئاژاوەدا مەزات دەکرا، دەربڕینی هەستێکی لەم جۆرە نیشانەی بوێری و ڕاشکاوی شاعیرە، دڵسۆزبیە بۆ هونەرێکی ڕەسەن، دەربڕینی ئەزموونی شاعیرە، ئارەزووی دەربڕینی ئەزموون بەوپەڕی وردی لای شاعیرە نوێخوازەکان پێگەی یەکەم داگیر دەکات، ئەوان پەی بە پێداویستەکانی ئەوە دەبەن، ئەوان لە خەمساردی و سەرکێشی تا بڵێی دوورن، کارامەیی باڵاو وردەکاری نموونەی باڵایانە، شاعیرێکی بە جەرگی وەک ئەلبرتی دەڵێ: «هەرچەندە ئاژاوەی ژیان قووڵ بێ، پێویستی زیاتر دەبێ بە ڕاستگۆیی بە پەیڤی هەڵبژاردە بەخۆپارێزییەکی زۆر (٢٩)، شاعیرییەتی «حەسیب قەرەداخی» ئەوەندە سەردەکات کە وەک حەللاج بیربکاتەوە، لەناو بووندا بتوێتەوە و ببێ بە بوون و بوونیش ببێ بە ئەو، ئەمەش باڵاترین خوازیارییەکانی سووفییەکانە، کە مرۆڤ و جیهان دەبن بەیەک، منەکییەکە (الأنیة) کە نێوان (منەکە) و (تۆ)، جیا دەکاتەوە لەئارادا نامێنێ:

**نەیانزانی زامەکانم پێش ئەوانیش**
**ویستیان دڵم بکەنەوە**
**لەدەرباری پاشای هیوای کەللەی زلما**
**باری خەمم بخەنەوە**
**وە لێ هەیهات... نە پسپۆرو نەزام و خەم**

**کەی دەگەنە نا ئەو پایەی من بناسن؟**
**من تەواوم.. شوێن و کاتم لانەماوە**
**من تەواوم.. تاجی شیعرم لەسەرناوە**
**ئێستا وجوود هەمووی منەو**
**منیش هەموو ئەو وجوودەم نۆش کردووە**
**بەرەو کازیوەی خولوودیش**
**ڕچەم بۆ خۆر خۆش کردووە.(٣٠)**

ئەم گەیشتنە ڕۆحییە بالایەی شاعیر حاڵەتێکی هەستیاری ئاوێتەییە، ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوانەن کە جەوهەری شیعرو شاعیر ناناسن، کە لەرێگەی بالابوونی پلەو پایەی شاعیرییەتی بەرەو نەمری هەنگاو دەنێ، گەیشتن بە حەقیقەتی ڕەها ڕچەشکاندنە بەرەو خۆر. ئەم خوازیارییەی بەرەو ڕەها، بەرەو ئاسمانی کۆتایی، بەرەو خۆر کە ڕەمزی حەقیقەتە، لەئەنجامی کاردانەوەی بەگژداچووەکانی ئەو سەردەمە جەنجاڵەیە کە شاعیر دژیان وەستاوەو ڕەتیان دەکاتەوە، بەشێوە میتافیزیکییەکەی نا، بەڵکو بەهەستێکی هاوچەرخانە، بەرێگەیەکی ئاسایی نا، بەڵکو بەو ڕێگەیەی کە شاعیر خۆی تێیدا دۆزیوەتەوە، کە شوێن و کات لای ئەو بوونیان نەماوە، واتە ئەو ڕێگەیەی بە هەست و نەستی شاعیرانە و تێڕوانینێکی گەشبینانە بەدی کردووە و لەو سنوورەی بۆی کێشراوە دەردەچێ و ڕوو دەکاتە پانتاییێکی بێ کۆتایی، کە پانتایی نزیککردنەوەی دوورە، کە ئەوانەی تێی ناگەن و نایناسن، بەو پایە ناگەن.

ئەو حاڵەتە شعوورییەی شاعیر تەنیا لەسنووری خودی خۆی ناوەستێ کە شانازی بە گەورەیی شیعرو دەسەڵاتی مەعریفی دەکات، بەڵکو ڕووبەڕووی ئەوانەش دەبێتەوە، کە زۆر هەوڵیان دا لەنرخ و بەهای کەسایەتی (گۆران)ی نەمرو پێگەی شاعیرییەتی لەسەر نەخشەی شیعری کوردیدا کەم بکەنەوە، «گۆران» جارێکی تر گیانی دێتەوە بەرو بەڕووی ئەو هێرشە نارەوایە وەک پیرەمەگروون دەوەستێ و وایان لێدەکات تەنیا مایەپووچی و شەرمەزارییان بۆ بمێنێتەوە:

**گۆران وەکو پیرە مەگروون ڕاوەستابوو**
**پەیامێکی لە هەستابوو**
**«بەڵێ دیارە لەناو قەومی بەسیتا قەدری سنعەت کار**
**وەکو عەکسی قەمەر وایە لەناو حەوزێکی لێخن دا»**
**حەوزی لێخن پڕکەنەوە**
**ئەم هێرشە نارەوایەش کرکەنەوە**
**دەبێ هەموو جامبازەکان شەرمەزاربن**
**دەبێ هەموو شایەتەکان**
**بێ نق و جق..**
**سەری لا کۆڵان چۆڵ بکەن**
**چاوی وشە لالەکانیان**
**لەبەر پێدا پڕ خۆڵ بکەن**
**لالەزارە پەژموورەکان ئاویش بدرێن هەر دەکەون**
**هەزار دەهۆڵیان بۆ لێدەن...**
**پارشێو ناکەن هەر دەخەون!(٣١)**

## تێکەڵکردنی شیعرو سەنگەر

هەروەک لە پێشەوە ئاماژەم بۆ کرد، شاعیر، هزری نەتەوەیی و نیشتمانی نەکرد بە مەسەلەیەکی کاتی، بەڵکو شیعر وەکو فیکر بوو بە چەکی کاریگەرو هەڵوێستنواندن بوو بەسەنگەری ڕاستەقینە، واتە بەستنەوەی فیکر بەواقیعی بەرچاو، دڵسۆزیش بۆ هەردووتەوەر، ئەفراندنی شیعری خوڵقاند، تا ئاوەتا وەک بڵێی شاعیر لەگەڵماندایە، خۆی بەکوردە عاشق لەقەڵەم دەدات، شیعرو سەنگەر دەبن بەیەک ڕۆح، لەیەک جەستەدا:

**ئازیزەکەم.. دڵی خۆم کرد بەسەنگەرو**
**بەرامبەر دوژمنی تۆ ڕاوەستاوم**
**دەستم لەسەر چەخماخەیە**
**چاوم لەو بەژن و باخەیە**
**هەموو بەستەو شیعرەکانم**
**چەکی تێژن**
**هەموو پەڕەی چامەکانم**
**باوەشی گەرم و ئامێزن**
**ئەگەر بەردێ بگرنە تۆ دنیا دەدەمە بەر جنێو**
**پشکۆیەکت بۆ بهاوێن**
**بیرو هەست و خەون و خەمم**
**دەدەنە کێو.**
**من شاعیرم دەنگم هەیە**
**لەناو دێری گری عیشقا پەیتا پەیتا زەنگم هەیە(٣٢)**

شیعر لای شاعیر وەک شەراب دەڕسکێ، بەرەژانی شاعیرێکە کە دوای ئەشک و ئاهو موعاناتێکی زۆر لەدایک دەبێ، وردێنەو پەیڤی ڕووکەش و سەرپێی نییە، هەژانی مێشک و دەروونە، گوشینی فیکرو ئەندێشەیە، وەک ئەو خۆشاوەی لەکوپەی خەمی شاعیردا دەبێ بەشەراب:

**ئەی ئەو کەسانەی لەلاتان سەیرم**
**دڵتۆێ ئەشک و ئاهێکتان نییە؟**
**گەر شیعر نەبێ و نەکرێ بەشەراب**

## تێم ناگەیێنن ئەی ژیان چییه؟! (۳۳)

وێڕای گەورەیی شاعیریەتی حەسیب قەرەداخی، هەندێ لەوانەی کەسێبەری خۆیان بەباڵای ڕاستەقینە تێدەگەیشتن، دانیان بەو وزە شیعرییە تەقیوەی شاعیر نەدەنا، لەمەش زیاتر هەموو ئەو شاعیرانەی کە لە ئاستی ئەودا نەبوون، لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەیان لەسەر دەنووسرا، مافی ئەویش دەکرا بەژێر لێوەوە، منیش بەرامبەر ئەو ڕەوشە شێوێنراوە، بەپێی تواناو زانیاری خۆم، شتێکم نووسی و جۆرە سکاڵایەکیشم دەربڕی، وەک جۆرە نارەزاییەک و مافپێدان بە شاعیریەتی ئەو شاعیرە لێهاتووەمان، کە هەتا دەهات بەقەد ئەوەی تەمەنی بەرەو پیری هەڵدەکشا، بەڵام شیعرەکانی وەک هەمیشە بەهار پاراوترو گەشتر و نوێتر خۆیان دەنواند، ئەوەبوو لە (۲٦)ی ئابی (۱۹۸٥)دا شیعرێکم بەناوی «شیعر پیر نابێ» نووسی کە پێشکەشبوو بە شاعیری داهێنەر «حەسیب قەرەداخی» دەبوایە لەگۆڤاری (کاروان)دا بلاوببوایەوە، بەڵام هەرچەندە لەیەک لە ژمارەکانی گۆڤارەکەدا ئاگادار کرابوومەوە کە چاوەڕوانی بلاوکردنەوەی بم، کەچی بەداخەوە بەڵێنەکە تەنیا قسەی ڕووت بوو، وا بۆیەکەمین جار لەم نووسینەمدا چاو دەکاتەوە:

**هەرزەکارێ**
**لە ڕووی شاعیری بەتەمەن**
**وەستاو وتی:**
**لەسەر شانۆ وەرە خوارێ**
**تۆ ئێستا پەڵە هەورێکی هاوینی**
**چۆن،تۆ بارانت لێ دەبارێ**
**ئێوە وەچەی پەنجاکانن**
**ئەمڕۆ لەکۆڕی**
**شیعری نوێ دا**
**هەرچەند هەنگاوتان گورج بێ**
**هێشتا هەر لەدوای کاروانن**
**هۆنراوەتان**
**تێن و گوڕیان تیانەماوە**
**بەڤیتامین ناکرێن چارێ**
*** * ***
**شاعیری پیر هاتە وەڵام:**
**کاکی شاعیری هەرزەکار**
**تۆ لاو لاوەی قەدت لەدار ئاڵاندووە**
**گەڵای ناسکی پاییزیت**
**کزەبایەک دەیوەرێنێ**
**من دار بەڕووم ڕەگوڕیشەی قووڵی تینووم**
**ڕۆژ بەڕۆژ پتر ڕوو دەچن**
**ڕەشەبا هەر چەند بەتین بێ**
**ناتوانێ داری شاخپەرست لەبن بێنێ**
**هەرچەند کەمن لەچاو تۆدا**
**بەتەمەنم**
**شیعرم هەمیشە بەهارە**
**لەسەر نەخشەی شیعری نوێ**
**جێ پەنجەکەی من دیارە**
**با پیریش بم**
**بەڵام شیعرم چۆن پیر دەبێ**
**بۆچی من کوێرەکانیمە**
**هەر بەهاران بژێیمەوە؟!**
**من شەرابی ڕسکاوی دەیان ساڵەمە**
**کاتێ سەری کوپەڵەکەم هەڵدەنەوە**
**بەتامو بۆیەکی نوێ**
**خۆی دەنوێنێ**
*** * ***
**ئەی شاعیری هەرزەکاری**
**شیعر هەرزە**
**چۆن دەتەوێ**
**لەسەر شانۆ بێمە خوارێ**
**کە هێشتا دەنگی زوڵاڵم**
**لەگەڵ گشت نرکەو هاوارێ**
**داهێنان و نوێکردنەوە**
**دەڕژێنێتە ناو دەریاچەی**
**شیعر، بەخوڕ**
**وەک ڕووبارێ**

### پاشباس

هەرچەندە کە من چەند جارێک لەبارەی شاعیری «حەسیب قەرەداخی»یەوە نووسینم بلاوکردۆتەوە، بەڵام لە «فەرهەنگی خەم»ی شاعیردا دەبێ بڵێین خەرمان بەرەکەت، شیعرەکانی زۆر لایەن بەخۆوە دەگرن، بۆیە ئەمجارەیان لایەنی «باوەڕو خەبات»م کردە سەرناوی باسەکەم، لە پابەندبوونی سیاسی حزبییەوە بەرەو کەناری پابەندبوونە گشتییەکە ئاوڕێکم لەشیعرەکانی دایەوە و ڕووناکیم خستە سەر تێکەڵکردنی هزری شاعیر بەواقیع و خەباتی نەپچڕاوەی بۆ گۆڕینی ئەو واقیعە تفت و تاڵەی کە تێیدا ژیا، تا دڵە پڕ شیعرەکەی لەلێدان کەوت، سەنگەری شەرمەندی چۆڵ نەکرد، لەپاڵ

شیکردنەوەی چەند نموونەیەک لەشیعرەکانی لە شاعیریەتی شاعیر دواوم و لایەنە هونەری و داهێنانەکەییم فەرامۆش نەکردووە، لەهەمان کاتدا پەنجەم خستۆتە سەر بوێری و شانازیکردن بەو پلەو پایەی کە شاعیر باوەری بەخۆی هەبووە کە ئەو گەورەیی شیعرییە بەخۆی رەوا ببینێ و شیعری «هەودڵ مەزات» بەتەقینەوەی ئەو ئەفراندنە لە قەڵەم بدەم کە لە یەکەمین فیستیڤاڵی شیعری کوردی «لەکەرکووک» خوێندییەوە، هەر لەوکاتەوە شاعیر زیاتر هەنگاوی بەرەو خۆ نوێکردنەوە و ئەفراندن نا، لە راستیدا نەمویست لەترسی درێژی لەسەر فیکرو فەلسەفەی سۆفیگەری لە «فەرهەنگی خەم»دا ئەوەندە بوەستم، چونکە ئەم بابەتە لایەنێکی گرنگی ترە لەجیهانی شاعیر، کە بە شێوە ئایدیالییەکەی سۆفیگەری مامەڵەی لەگەڵ بۆچوونی هزرمەندانی تەسەوف نەکردووە، بەڵکو بەتێروانین و جیهانبینیی خۆی سەیری واقیعی کردووە، بەرۆحیەتێکی هاوچەرخانە تەوزیفی شیعرەکانی بۆ مەبەستێکی نەتەوەیی و نیشتمانی کردووە، ئەم نووسینە ئاوردانەوەیەکە لە شیعرو هەڵوێستی شاعیر، کە بەداخەوە تا ئێستا ئەگەر پلەو پایەی هۆنراوەکانی و هەڵوێستی سەربەرزانەی لەمەیدانی خەبات و قوربانیداندا، لەگەڵ هەندێ شاعیری تر بەراورد بکەین، زۆر چاک هەست دەکەین، وەک پێویست مافی خۆی نەدراوەتێ.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**

١- بەسەرکردنەوەیەکی خێرای وێستگەکانی ژیانی حەسیب قەرەداخی نەمر، بەهات قەرەداخی- فەرهەنگی خەم (٤) چاپەمەنی و ئۆفسێتی داناز- سلێمانی ١٩٩٨.

٢- الطاغیة: تألیف أ. د. امام عبدالفتاح امام- مکتبة مدبولي- القاهرة، ل١٦٢.

٣- فەرهەنگی خەم (٣).

٤- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٢.

٥- فەرهەنگی خەم ٢، ل١٤١.

٦- فەرهەنگی خەم (٤)، ل١١-١٢.

٧- انجیل لوقا اصحاح ٩: ٣٦.

٨- الطاغیة، ل٤٢.

٩- گفتوگۆ لەگەڵ ئەدۆنیس- منداڵی، شیعر، تاراوگە وەرگێرانی نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم (١٣٩)، سلێمانی ٢٠٠١، ل٤٧-٤٨.

١٠- فەرهەنگی خەم (٣)، ل١٩-٢٢.

١١- الطاغیة، ل١١٣.

١٢- فەرهەنگی خەم (٤)، ل٨٢.

١٣- الطاغیة. بابەتی (السید المسیح)، ل١٩٥.

١٤- فەرهەنگی خەم (٣)، ل٢٧.

١٥- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٨.

١٦- فەرهەنگی خەم (٤)، ل٣٢.

١٧- مێژووی ئەدەبی کوردی- عەلائەدین سجادی، چاپی دووەم، بەغدا ١٩٧٢، ل٣٧٩.

١٨- فەرهەنگ[illegible]، ل١٤٧.

١٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢.

٢٠- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٢-١٣٣.

٢١- التج[illegible]ة الخلاقة- تألیف البروفسور. س. م. بور[illegible] [illegible]ـلافة حجاوی- دارالشؤون الثقافیة العامة- أفاق عربیة، الطبعة الثانیة، بغداد، ١٩٨٦.

٢٢- مجلة الأقلام، العدد (١٢) السنة السابعة، ١٩٧٢، محمود درویش یتحدث عن الشعر الثوري والثورة في الشعر.

٢٣- فەرهەنگی خەم (٣)، ل١٣٣.

٢٤- مقدمة في الشعر الصوفي- طراد الکبیسي.

٢٥- أ. أ. ریتشاردز، الشعر بین الواقع و الابداع- صبیح ناجي القصاب- دارالرشید للنشر- بغداد، ١٩٧٩، ل١١٣.

٢٦- ثورة الشعر الحدیث- د. عبدالغفار مکاوي، ل٧٠.

٢٧- دیاردەی غەم لەشیعری حەسیب قەرەداخیدا. تانیا ئەسعەد محەمەد ساڵح، نامەی ماجستێر- زانکۆی سەلاحەددین، ٢٠٠١.

٢٨- فەرهەنگی خەم، ل٧٠-٧٣، بەرگی یەکەم.

٢٩- التجربة الخلاقة.

٣٠، ٣١، ٣٢، ٣٣- فەرهەنگی خەم: بروانە (بەرگی یەکەم و دووەم)ی سەرجەم شیعرەکانی حەسیب قەرەداخی دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس- زنجیرەی رۆشنبیری، ٢٠٠٢.

# نوێکاری شیعر و جوانیی لە دیوانی «بنەوشەکان»دا

کەریم شارەزا

## پێشەکی

دیوانی بنەوشەکان یەکێکە لەدیوانە خنجیلانە ڕازاوەکانی شاعیری نوێکاری کورد (عەبدولڕەزاق بیمار)، بریتییە لە (٢١) هۆنراوەی ناسک و جوانی چنراو لە تانوپۆی وشەی پتەو و ناوەرۆکی ئاودراو بە سۆزی ناسک و هەست و ئەندێشەی قووڵ. لەخوێندنەوەی بابەتەکانی ئەو هۆنراوە سەرکەوتووانەیدا بۆمان دەردەکەوێ کە شاعیرێکی بەهرەداری ڕووناکبیرە و شاگردێکی زیرەکی قوتابخانە شیعرییە نوێکەی شاعیری مەزن (گۆران)ە. لەگەڵ شاعیری نوێکاری بەدەسەڵاتی هاوچەرخی (جەلالی میرزا کەریم) چەند بەردێکی تازەو پتەویان خستۆتە سەر دیواری تەلاری قایمی ئەو قوتابخانە نوێیەی شیعری کوردی.

دیوانی بنەوشەکان بەزۆری ئەو هۆنراوانەی شاعیری گرتۆتە خۆ کە لەشەستەکانی سەدەی ڕابوردوودا بە وشەی جوان و ناوەرۆکی پتەو و تازەی ئەدەبی ڕیالیزمی نوێ داڕێژراون، بالێرەدا بکەوینە دەستنیشانکردنی چەند تەلە بنەوشەیەکی جوان و ئاودار و بۆنخۆشی وێنە شیعریە بریقەدارەکانی و جارێ بەرلەوەی چەپکێک لەبنەوشەکانی بچنین بابزانین وێنەی شیعری چییەو چۆن دەخولقێ.

## وێنەی شیعریی و چۆنیەتی خولقانی و جۆرەکانی

وێنەی شیعریی لەسادەترین پێناسەیدا، وێنەیەکی ڕوونبێژییەو لە ڕێگەی وەسف و لێکچوواندن و ئاوەڵواتا (خوازە و میتافۆرە)«١»وە لەباری بێئاگایی لەبنیادی هۆنراوەی شاعیری داهێنەردا دروست دەبێ، بەمەرجێ سۆزو شەپۆلی هەستی هەڵچوو و ئەندێشەی بەر بڵاوی شاعیر دەورێکی کاریگەر لەخولقاندنی ئەو وێنانەدا ببینن، شاعیریش خۆی بکاتە هاوتای ئەوشتانەی کە لە هەست و هۆشی خۆیەوە دەرکیان پێ دەکات.«٢»

کەواتە چەندە وەسف و لێکچوواندن و ئاوەڵواتا وێنەی شیعریی دەخولقێنن، ئەوەندەش هەست و سۆز و ئەندێشەی شاعیری بەهرەدار دەور لە خولقاندنی ئەو وێنەیەدا دەبینن.

وێنەی شیعریی لە هەموو هۆنراوەیەکدا دەوری جوانکاریی و ڕوونکردنەوە لەبنیادی هۆنراوەدا دەگێڕێ، چونکە ئەو وێنانەی ناو هۆنراوەی شاعیری داهێنەر، وەک زنجیرە ئاوێنەیەک وان کە لە گۆشەکانی بنیاتی ئەو هۆنراوەیەدا دادەنرێت تا بەڕوون و ڕەوانی ناوەڕۆک و چەمکی بەپێزی بابەتەکە بنوێنن و ئەو وێنانەش ئەگەر جوان و سیحراوی بن، ئەوە تەنیا بابەتە شیعرییەکە دەرنابڕن، بەڵکو ڕوخساری ڕازاوەیشی پێ دەبەخشن و وا دەکەن گیانی داهێنان لە شیعرەکەدا بکەوێتە باریکی بەرجەستەی هەست پێکراوی بینراو«٣».

وێنەی شیعریی بەپێی چەسپان و جووڵانەوەی چەمک و ناوەرۆکی شیعرەکەی خۆی لەدوو جۆردا دەنوێنێ: جۆری چەسپاو و جۆری جووڵاو. لەبارەی زنجیرەی خولقانیشیەوە دوو جۆرە: وێنەی سادە و وێنەی ئاوێتە کە خۆی لەتابلۆیەکی شیعریدا دەنوێنێ و هەر وێنەیەکیش بەهۆی هەستێکی مرۆڤەوە وەردەگیرێ. ئەگەر لە ڕەنگ و ڕووناکی و تاریکی دووا ئەوە بەهەستی بینین وەردەگیرێ و ئەگەر لەدەوری دەنگ و ئاواز سوورایەوە ئەوە بەهەستی بیستن وەردەگیرێ، ئەگەر لەبۆن و بەرامەش دوا ئەوا بەهەستی بۆنکردن وەردەگیرێ و ئەگەر لەبارەی تاڵی و شیرینی و ترشی و تفتی و تیژیشەوە دوا ئەوا بەهەستی چەشتن وەردەگیرێ و خۆ ئەگەر لەبارەی نەرمی و ڕەقی و توندیی و شلیەوە دوا ئەوا بەهەستی دەستلێدان باشتر هەستی پێدەکرێت.

## چەند تەلە بنەوشەیەک وەک وێنەی شیعریی لەدیوانی بنەوشەکاندا

دوای ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی خولقانی وێنەی شیعریی و جۆرەکانی و چۆنیەتی وەرگرتنیان، دەکەوینە دەستنیشانکردنی چەند نموونەیەک لەوێنەی تەلە بنەوشەکانی باغچەی هۆنراوەکانی شاعیری نوێکار، تا لەنزیکەوە شارەزایی لەچۆنیەتی خولقانی ئەو وێنە شیعرییانەی ناو هۆنراوەکانی شاعیرو جۆرەکانی پەیدا بکەن.

شاعیر لەهۆنراوەیەکیدا لەژێر ناوی (بۆ ئافرەتان) لە ڕێگەی وەسف و لێکچواندن و میتافۆڕەوە، چەند وێنەیەکی یەک لەدوای یەکی شیعریی بۆ خولقاندووین، هەروەک لەبەشی سێیەمی هۆنراوە پڕ سۆزەکەیدا بە ئافرەتان دەڵێ:

**ئەی گوڵزاری گوڵ لەوێنەی**
**ئەستێرەی گەش**
**ئەی دڵی گەرم، ئەی چاوەکەی**
**پڕ هەنگوینی خۆشەویستی و**
**لاوانەوە ناسک، بێ خەش ل:١١-١٢**

لەو کاتەی کە شاعیر لەدوو نیوە دێڕەکەی سەرەتای ئەم بەشەدا ئافرەتان بە گوڵزاری جۆرە گوڵێک دادەنێ کە وەک ئەستێرەی گەشە و لە ڕێگەی وەسف و هونەری لێکچوواندنێکی جوانەوە وێنەیەکی شیعریمان لەجۆری چەسپاو بۆ دەکێشێ کە لە ڕێگەی هەستی بینینەوە وەردەگیرێ.

دوای ئەمەش لە سێ نیوە دێڕەکەی دیکەدا وێنەی دووەمی بەدوا دادەهێنێ کە لەدڵی گەرم و چاوی پڕ هەنگوینی خۆشەویستی و لاوانەوەی ناسک و بێ خەوشداخۆی دەنوێنێ. ئەم وێنە ناسکەش لەجۆری چەسپاودو لە ڕێگەی هەستی بینینەوە وەردەگیرێ و ئەگەر وێنەکێشێکی هونەرمەند ناوەرۆکی ئەم دوو وێنەگەش و گۆڵە بەزەیت و فلچە بکێشێ، بێگومان تابلۆیەکی هونەریی نایابیان لێ دەخولقێنێ.

شاعیر لە هۆنراوەی (بۆ ماریلین)دا هەندێ وێنەی جوانی شیعریمان بۆ دەخولقێنێ و لەسەرەتادا بەمجۆرە وەسفی شووشەی گوڵاو و پیاڵەی بەللوور و ملوانکەی لەشێوەی ئەستێرەی وردی تێکەڵ بە قژی خاو، کە هەموویان کەلوپەلی ئەو کیژۆڵەیەن کە بە لەشێکی ڕووتی ڕەنگ یاقووتی چۆتە ناو ئاوی ڕووبارێک و نەگەڕاوەتەوە، بەم وەسفە وردو جوانەی کەلوپەل و لەشی سووری یاقووتی وێنەیەکی ناوێتەیی شیعریمان لە ڕێگەی وەسف و لێکچوواندنەوە بۆ دەخولقێنێ کە لەجۆری چەسپاو و لەڕێگەی هەستی بینین و هەستی بۆنکردنەوە وەردەگیرێ و بابزانین چی گوتووە:

**شووشەی گوڵاو**
**ملوانکەی ئەستێرەی وردی**
**تێکەڵ بە هەوری قژی خاو**
**کەل و پەلی کیژۆڵەکەن**
**وەکو یاقووت**
**بەلەشی ڕووت**
**چووە ناو ئاو**
**نەهاتەوە ل:١٤**


عەبدولڕەزاق بیمار

دوا بەدوای ئەم دوو وێنەیە، شاعیر لەباری بێ ئاگاییدا چەند وێنەیەکی دیکەمان بۆ دەخولقێنێ:

**هۆ کیژۆڵە.. هۆ ماریلین**
**سەردەمەکەت**
**ئامێرێکی سەوزو سوورە**
**چەرخی بەداوی ئاوریشم و**
**کەوانەی شەبەنگ پێچراوە**
**وەستاکەی: ئەو ملەستوورە**
**کەلبەی گڕی پف دراوە ل:١٥**

شاعیر لە ڕێگەی لێچوواندنی سەردەمی ماریلین بە

ئامـێری سەوزو سـوورو لەرێگەی پێکەوەنانی خـوازە و میـتافـۆڕە لەپێچانی چەرخ بەداوی ئاوریشم و کـەوانەی شـەبەنگ و وەسفکردنی وەستاکەی واتە ئەو چەوسێنەرە مل ئەستوورەی خۆی مەبەستیەتی بە یەکێکی کەڵبەگرێ پفدراو، سێ وێنەی شـیـعـریی یەک لەدوای یەکـمـان بۆ دەخـوڵقێنێ و هەر سێ وێنەکەش لەجۆری چەسپاون و بە هەستی بینین وەردەگیرێن.

شـاعــیــر لە هۆنراوەیەکی دیکەدا بەناوی (ئیش) چەپکێک وێنەی جـوان و ناسکـمـان لەوەسف و هونەری لێکچـوواندن و خـوازە بـۆ دەخـوڵقـێـنێ و لە ئەندێشـەی مرۆڤێکی وێڵ بەدوای ئیش و کاردا کە دەیەوێ لەرێگەی ئەو کارو ئەرکەی بەرەو باغی هیواو ئاواتی خۆی بچێ کە بـاغـی نـان و پـارە پـەیـداکـــــــردنە بـۆ دابـیـنـکـردنـی پێویستیەکانی ژیانی منداڵ و هاوسەرەکەی:

**دەڕۆم بەرەو باخی هیوا**
**لە هەوراز و لەنشێوا**
**دەڕۆم و چاو دەبڕمە دوور**
**باخی هیوای پڕ گوڵی سوور**
**باخی نان و پارەو پۆشاک**
**پارەی شیر بۆ منداڵەکەم**
**جل و بەرگی ژنە دڵ پڕ خەیاڵەکەم ل:١٩**

بەهێزی بەهرەی شاعیریی خۆی، تابلۆیەکی شعریمان لە رێگەی وەسف و لێکچوواندن و میتافۆرەوە بۆ دەکێشێ و ئەوەمـان بۆ سـاغ دەکـاتەوە کـە وێنەکـانی هەرچەندە بەوشـەی سـادەکـێـشـراون، بەڵام بە هەست و سـۆزێکی ناسک و بە ئەندێشەیەکی قووڵ ئاودراون.

شاعیر چونکە خەریکی جووڵە و رۆیشتنە لە گەشتی ئەندێشەی بەربلاوی و دیمەنەکانی باری هەوڵ و کۆششی دەگـۆرین، بۆیە ئەو زنجـیـرە وێنە شـیـعـرییـەی کـردۆتە تابلۆیەک و وێنەکـــانی دەجـــووڵێن و لەبارێکی وەســتـــاودانین، بەڵکو وێنەی جــوولاون و لە رێگەی هەســتـەکـانی بینین و چەشـتنەوە وەردەگـیـرێن، چونکە دیمەنی باخ و رەز و شوێنی هەورازو لێژ و گـوڵی سوور و پارە و پۆشـاک بە چاو دەبینرێن و خۆراکی وەکو (نان و شیر)یش بە هەستی چەشتن دەرکی پێدەکرێ.

لەم هۆنراوەیەیدا هەر لە رێگەی وەسف و لێکچوواندن و خواز و میتافۆرەوە وێنەی شیعریمان بۆ دروست ناکات، بەڵکو دنیای روونبێژی و واقیع جێدێڵێ و دەچێتە ناو دنیـایەکی فـراوانتـر کـە ئەویش دنیـای (ئەفسـانە)یە و چەند وێنەیەکی جوانمان لە کەرەستەی ئەفسـانەیی وەک (فرشـتـەی رەش) بۆ دەکـێـشـێ کـە ئەو رەمـزەش نموونەی خـراپەکـارییـە و لە دژی ئادەمـیـزادە، با بزانین چۆن ئەم تاقـیکردنەوە نوێیەی لەسەر حیـسـابی ئەفسـانەی کۆن بۆ خولقاندووین:

**رێگا دەبڕم**
**چاو لە ئاسمانی دوور دەبڕم**
**(فرشتەی رەش) عەبای باڵی**
**بەسەرپردەکەدا داوە**
**کەسی لێ ناپەڕێتەوە ل:٢٠**

شاعیر ئەفسانەی (فرشتەی رەش)ی داستانی کۆنی کوردی بەکارهێناوە بۆ پتەوکردنی ناوەرۆکی هۆنراوەکەی و خولقاندنی وێنەیەکی جوان و پتەوی شیعریی. ئەوەمان بۆ دەردەبڕێ کە چۆن ئەو رەمزەی شەڕو خراپەکاریی باڵی بەســەر پردی رێگەی ئیـشـوکـاری ئەو مـرۆڤـە هەژارە بێکارەدا داوە و رێی لە هەموو رێبوارێک گرتووە بچن بۆ ئیش و دابینکردنی بژێوی ژیانیـان، بەڵام ئەو مـرۆڤـە ورەبەرزە، لە هەردشەو سـامناکی ئەو رەمزە شەڕانییـە ناترسێ و ئەژنۆی شکـستیی دا نادا و چمکێکی عەبای باڵی ئەو فرشتە شەڕانییە هەڵدەداتەوە و دەبینێ ئاسۆ نەگـیـراوە، هەرچەندە دوورە، بەڵام ئەو ئاسـۆیەی ژیان گەش و سوورە و جێگای هیواو ئاواتی مرۆڤەو لەخۆری رووناکەوەش پەری خێرخوازی دۆستی مرۆڤی دڵ پڕ لە هیـوا، باسکی سپی رۆژێکی نوێی راکـێـشاوە و کـۆتری ئاشتی هەڵدەفرێنێ و تیشکی رووناکی بۆ ئاسمانی رەش بەدیاری دێنێ و بەمـجـۆرە تاقـیکردنەوە ئەدەبیـیـەکـەی ئەنجامداوە و زنجیرە وێنە شیعرییەکانی خولقاندووە:

**چمکێکی هەڵدەدرێتەوە**
**- نا تەواوە**
**- کێ دەڵێ ئاسۆ گیراوە**
**ئاسۆ دوورە**
**بەڵام سوورە**
**لەخۆرەوە پەریی دۆستم**
**باسکی سپی راکێشاوە**
**پۆل پۆل کۆتر هەڵەفرێنێ**
**تیشک بۆ ئاسمانی رەش دێنێ ل:٢٠**

زنجیرەیەک وێنەی شیعریی لەجۆری جولاوی شیعریی بۆ خـولقـاندووین و هەمـووشـیـان بەهەسـتی بینین وەردەگیرێن. شاعـیر لە ئاوێتەکردنی واقیع بەخەیاڵ و ئەفسـانەوە بەچاکی سـەرکەوتووە وەک (رۆلان بارت)ی

رەخنەگری هاوچەرخی فەرەنسایی گوتەنی: (شیعر بریتییە لەدارشتنەوەی ئەفسانەی کۆن، یان خولقاندنی ئەفسانەی نوێ).

شاعیری نوێکار لەبەشی سێیەمی هۆنراوەکەیدا بە وردی هەموو ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی ئەو مرۆڤە کلۆڵە دەخاتە ڕوو کە داوای کاری کردووە لە دەسەڵات و بروانامە و هەموو بەڵگەنامەیەکی پێویستی دامەزراندنی لەدۆسییەکدا پێشکێش کردووە، کەچی کار بەدەستی پشت مێزی فەرمانگە کارەکەی ناسازێنێ، ئەویش هەر لەچاوەڕوانیدا دەبێت، بەڵام دڵنیابە لەوەی کە ڕۆژێک دادێ ئەو ڕەنجە چەوسێنەرانە ئارامگایان پێ لەق دەبێ. ئەوساکە هەست دەکەن ئەو کەسانەی کە داوای ئیش و کار دەکەن کێن. کە هەموویان ڕۆشنبیر و هەژاری گەلن، ئەو گەلەی کە چاوەڕوانی هەڵاتنی ڕۆژێکی گەشە و ئەم شاعیرە هونەرمەندە زنجیرەیەک وێنەی شیعریی ئاوێتەمان لەم دەربڕینانەی خوارەوە بۆ دەخولقێنێ:

**باوەڕنامە و ڕەوشتی چاک**
**تکا کاریی پیرانی پاک**
**هەمووی لەناو مقەوایەک**
**دەنێرمە ئەودیو دەرگای باغ**
**(باغی هیوام)**
**بەڵکو وەزیرو دەستوپێی**
**بە دڵنەرمی دەڕوانن لێی**
**بەپەنجەی ناز، چاوی ئارام**
**گەشە دەکا ڕووی سکاڵام   ل:٢١**

شاعیر لە هەنگاوێکی دیکەی ئەو بەشەی هۆنراوەکەیدا زنجیرە وێنەیەکی شیعریی لەڕێگەی وەسف و خواستن و میتافۆرەوە دادەڕێژێ کە هەندێکیان چەسپاو و هەندێکیشیان جووڵاون و هەمووشیان لەڕێگەی هەستەکانی بینین و بیستنەوە وەردەگیرێن. بەم کارەیشی تابلۆیەکی گەورەی ڕەنگاو ڕەنگی بۆ کێشاوین:

**گەورەی دوا مێز**
**گەورەی بەڕێز**
**چاوەڕوانی تا بەیانی**
**دوایی نەهات**
**... ... ...**
**کەی ئەو ساتە بێ بڕوانی**
**کێین و کێنین**
**دەستوپێ نین**
**ڕەوشەنبیرو هەژارانی**
**گەلین: گەلی چاوەڕوانی**
**هەڵهاتنی ڕۆژێکی گەش**
**ڕۆڵەی ماتی دەس لەکۆشش   ل:٢٢**

(دوکانەکەی مام حوسێن) لەهۆنراوە ناسک و نایابەکانی شاعیری نوێکارمانە، مادامکی وێنەی شیعریی تابلۆیەکی بەوشەکێشراوە و تابلۆش هۆنراوەیەکە بەهێڵ و ڕەنگ دارێژراوە. هەردووکیشیان زادەی هەست و سۆزو ئەندێشەی شاعیری بەهرەدارو هونەرمەندی داهێنەرن، کەواتە بۆمان هەیە بڵێین لەبەر جوانی وەسفکردنەکەی شاعیر بۆ ئەو دوکانەی مام حوسێن و ئەدگارەکانی و وەسفە وردەکەی خودی مام حوسێن و کەلوپەل و بەروبوومە جوان و ڕازاوەکانی ناو دوکانەکەی هەر لە ماست و سەرتوێژو پونگ و گوڵ تا دەگاتە گەلامێو و شەکرەباوی بەهاران. ئەم دیمەنانە وێنەی جوان و سروشتێن بە بیستن و بینینیان وا لەمرۆڤ دەکەن بە جوانترین تابلۆی دابنێن:

**بێ با بچین بۆ میوانی**
**بەهار شێوەی ناودوکانی**
**مام حوسێنی چاوگەشی پیر**
**ڕوو دڵنیا و ساکارو ژیر**
**دەڕوانێتە دوکانەکەی**
**یان هێلانە پڕ ئارامی ژیانەکەی**
**بێ دەفتەرو قاسە و**
**بارو بارخانەکەی   ل: ٢٣**

لە هەنگاوێکی دیکەی هۆنراوەکەیدا شاعیر بە وردی وەسفی ئەو بەروبوومانە دەکات کە لە دوکانەکەی مام حوسێن دەفرۆشرێن و زنجیرە وێنەیەکی دیکەی شیعریمان بۆ دەکێشێ و کەرەستەی هونەرەکەیشی هەست و سۆزی خۆبەتی و ئاوێتەی دەکات بە وەسفی دیمەنە سادەو ساکارەکانی ئەو دوکانە:

**گەلامێوی نۆبەرەی دار**
**سەبەتەی پڕ لە گوڵەباخ**
**شەکرە باوی و هەموو شتێ**
**زادەی بەهار**
**دەستو دیاری بەفراو و شاخ**
**دڵی من و دڵی خاڵۆ و ناو دوکانی**
**نەخشاندووە، بەساکاری و میهرەبانی**
**حەز دەکا کۆ هەر بەدیاری**

بەر هەر بەری کردگار بێ   ل:٢٤

شاعیر ئەم زنجیرە وێنە شیعرییە چەسپاوەی بۆ دارشتووین و هەموویان بەهەستی بینین وەردەگیرێن و تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگ پێکەوە دەنێن و لە بەشی سێیەمی هۆنراوەکەیدا وەسفی کڕین و فرۆشتنی گوڵ و ماست و گەلامێو دەکات:

**دڵی نەرمم ڕوویەرووی ژیان**
**کە بۆ خەڵکی پێدەکەنێ**
**هەروەکو ئەو کیژۆڵەیەی**
**ڕۆژانەکەی**
**لەناو دەست مام حوسێن دەنێ**
**دەسکێک گوڵی لێ وەردەگرێ**
**کوریژگەیەک ڕوبعە ماستێک**
**بۆ بەرچایی و پیرەژنێ**
**چەنگێ گەلامێو دەکرێ   ل:٢٤ - ٢٥**

دوا بەدوای ئەم وەسفە وردو جوانەی کڕین و فرۆشتنی بەروبوومەکانی ناو دوکانەکە، شاعیری گەشبینمان بۆ بەدیهاتنی ژیانێکی ئاسوودەی پڕ لە شادی دەڕوانێ کە ئارامی و داد بۆ هەموو کەسێک بێت:

**خۆزگەم ژیان هەر سەرچاوەی**
**شادی ئەبوو**
**هەر ئارام و دادی ئەبوو**
**بۆ ئەم خەڵکە هەموو.. هەموو   ل:٢٥**

(برسیەتی و جوانی) هۆنراوەیەکی نایابی شاعیری نوێکارمانە لە شێوەی چیرۆکە شیعر لە ساڵی (١٩٦٢)دا دایناوە لەکارەساتی کچە شۆخێکی (جوانی) ناوەوە دەدوێ کە برسیەتی و هەژاریی چۆن ئەو نازدارەیان لەهێز خستووە. شاعیر لەسەرەتای هۆنراوەکەیدا وەسفی جوانیی ئەو پەریزادە شۆخ و شەنگە دەکات کە لەجوانیدا بێ هاوتایە:

**(جوانی) کچێک بوو زۆر نازدار**
**کە بهاتایە لەنجەو لار**
**چ شازادەو پەریزادە**
**چ پەپوولەی باخی بەهار**
**چ شەماڵی بەفری کۆسار**
**ڕێیان نە ئەکەوتە شوێنی**
**جادوویی باڵا و لەنجەو لار   ل:٢٦**

ئەگەر بەسەرتاپای هۆنراوەکەدا بچینە خوارەوە دەبینین شریتێکی دوورو درێژی وێنەی شیعرین و شاعیر لە ڕێگەی وەسفی جوانی ئەو کچە شۆخە. لە ڕێگەی خوازە و لێکچوواندنەوە خوڵقاندوونی، بەتایبەتی کە بەسۆزو ئەندێشەی قووڵی پێکیەوە ناون و کارێکی هونەریی جوانی ئەنجامداوە.

لە بەشێکی دیکەی هۆنراوە ناسکەکەیدا شاعیر پتر لەسەر وەسفی پێکەنین و سەرتاپای لەش و لاری ناسکی دەروات و زنجیرە وێنەیەکی دیکەمان بۆ دەخوڵقێنێ کە لەجۆری چەسپاون و بە هەستی بینین و بۆنکردنەوە وەردەگیرێن:

**(جوانی) پێکەنینی گوڵ بوو**
**سەرتاپا لەشی ناسکی**
**جۆش و گەرم و گوڕی دڵ بوو**
**شەنگەبی بسک و شابسکی**
**ورشەدار و شەنگ و شل بوو**
**گوڵاو بوو... ڕووناکی و تاو بوو**
**کچێک بوو (جوانی)ی ناو بوو   ل:٢٧**

ئەمجۆرە کچە جوانانە لەسەردەمی پێشوودا ئاغە و شازادەکان بەجوانیان مەست دەبوون و دەیان بردنە بارەگای خۆیان و دەبوونە هاوسەری ئەو جۆرە کەسە خواپێداوانە. ئەو شۆخە نازدارانەش لەو ژینگەیەدا بەکامەرانی دەژیان، کەچی ئەمڕۆکە لەسەدەی بیستەم و بیست و یەکەمدا ئەو جۆرە شۆخانە کاسەو کەوڵی پیرەژنان دەکەنە بەرگ و پێتاو و بەسەر خەرمانانندا دەگەڕێن بۆ خەرمانلۆغە و بە دڵشکاوی و دەست بەتاڵی دەگەڕێنەوە:

**لێرە ئەمڕۆ لەسەردەمێ**
**کە سەدەی بیستەمە ناوی**
**کاسەو کەوڵی پیرەژنانی**
**کردۆتە بەرگ و پێتاوی**
**لەخەرمانان، لەکێڵگەکان**
**لەلای جووتیارە بەندەکان**
**هاتۆتەوە بەتوزاوی**
**هاتۆتەوە چی پێ بڵێم**
**بەمل... یا بەدڵ شکاوی   ل:٢٨**

بەم زنجیرە وێنە شیعرییە کە بەهەستی بینین وەردەگیرێن، چیرۆکی ئەو کچە شۆخەمان بۆ دادەڕێژێ کە

لەسەدەی بیستەمدا لە کڵۆڵی دا دەتلێتەوە و زۆر جاریش کچی جوان و لاوی چەلەنگ لەچنگ هەژاری و برسیەتی لەناو دەچن و شاعیریش هونەرمەندانە تراژیدیای کارەساتەکەی (جوانی)ی شۆخ و شەنگ و نازداری دارشتووە.

شاعیر لەهۆنراوەیەکی دیکەیدا بەناوی (ساوی) وێنەی جوولاومان لە دیاردە سروشتییەکانی ولاتەکەی بۆ دەکێشێ و سەرنج بۆ ئەو دیمەنە جوانانەی نیشتمانەکەی هەر لە مێرگی گیای تەڕو شەونمی زیوین و سەماکردنی گیا بۆ ڕووناکی و بۆ سروەی (با) ڕادەکێشێ:

**سەیری مێرگی گیای تەڕ کە**
**زیوی شەونم تەنیویەتی**
**بۆچی گیا دێتە سەما**
**بۆ ڕووناکی و بۆ شنەی با**
**یا ئەو مەلەی دنیایەتی**
**چلە دارێک**
**پڕ بە گەروو هەڵئەکوڵێنی**
**شەپۆل شەپۆل ئاوازی خۆش ل:٣١**

لە تەنینی گیای تەڕ بە شەونمی زیوین، میتافۆرەیەک دروست دەکات و دەیکاتە وێنەیەکی ناسکی شیعریی کە لەجۆری چەسپاوە و بە هەستی بینین وەردەگیرێ. لەسەماکردنی گیا بۆ ڕووناکی و شنەی (با)ش بەهەمان هونەری میتافۆرە وێنەیەکی جوولامان بۆ دەخولقێنێ. ئەمەشیان بەهەستی بینین وەردەگیرێ و لە هەنگاوی هۆنراوەکەشدا لە هەڵکولینی ئاوازی خۆش لە گەرووی مەل وێنەیەکی دیکەی شیعریمان لەجۆری جوولاو بۆ دادەڕێژێ، ئەمجارەیان بەهەستی بیستن ئەو ئاوازە خۆشە وەردەگیرێ. بەم وێنە ناسکانە سەرەتایەکی سەرکەوتوو بۆ هۆنراوەکەی دادەمەزرێنێ.

لە بەشێکی دیکەی هۆنراوەکەیدا دایەلۆژێک لەگەڵ خۆیدا دەخولقێنێ و یەکەمجار دەپرسێ (کێن ئەوانەی بەستە ئەڵێن و ئاشقی کێن) ئینجا هەر خۆی وەڵامی پرسەکەی خۆی دەداتەوە و دەڵێ: ئەو بەستە بێژانە ئەو دارو درەختانەن گۆرانی دەڵێن. وەکو ددروێشان کەم کەمە خۆیان دەهەژێن و ئاوی خوڕە بەدەم و بەردەکانی ناو ڕووبارن کە بوونەتە بەردەبازی ڕێبواران:

**- کێن ئەوانەی بەستە ئەڵێن**
**دلداران کێن**
**- ئەو دارانەن لەبەرزەوە**
**بە لق و پۆپی سەوزەوە**
**وەک دەروێشان ڕائەمێنن**
**کەم کەم خۆیان ئەهەژێنن**
**کڕنووش ئەبەن بۆ ئاوی چەم**
**ئاوی چەمی خوڕە بەدەم**
**ئەو بەردانەی ناو ڕووبارن**
**کە بەردەبازی ڕێبوارن ل:٣١**

شاعیر لەبەستە گوتنی دارە بەرزەکان میتافۆرە دەخولقێنێ و لەخۆهەژاندنی لق و پۆپی سەوزی ئەو دارانە لەچەشنی دەروێشان لێکچوواندن و میتافۆرەی پێکەو ناوە و بەم چەشنە وێنەیەکی شیعریی لەجۆری جوولاوی خولقاندووە. بەهەستی بینین وەردەگیرێ و لە کڕنووشبردنی دارەکانیش بۆ ئاوی چەمی خوڕە بەدەم وێنەیەکی دیکەی جوولاومان بۆ دەخولقێنێ. بەهەستەکانی بینین و بیستن وەردەگیرێن.

لە هەنگاوێکی دیکەی هۆنراوەکەیدا لەگەڵ خۆی دەڵێ، چونکە دانەری هۆنراوەی تاڵە و داوا لە خۆی دەکات نەناڵێنێ و با مەلی خەیاڵی بۆ ئاسمانی پاکی ساماڵ بەرەڵلا بکات:

**ئەی دانەری هۆنراوەی تاڵ**
**مەناڵێنە**
**بەرەڵلاکە مەلی خەیاڵ**
**بۆ ئاسمانی پاکی ساماڵ ل:٣٢**

لەدەربڕینی (هۆنراوەی تاڵ) وێنەیەکی شیعری لەجۆری چەسپاو خولقاندووە و بەهەستی چەشتن وەردەگیرێ، چونکە هۆنراوەی بە (تاڵ) وەسف کردووە و لە دەربڕینی (بەرەڵلاکردنی مەلی خەیاڵ)یش شاعیر هونەری میتافۆرەی پێکەوە ناوە، کردوویەتی بەوێنەیەکی جوولاوی شیعری و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

(ئەسپی والی) لەهۆنراوە نایابەکانی شاعیرە، بریتییە لە چیرۆکە شیعرێکی کۆمیدی و دوو تابلۆی جیاواز و دژ بەیەک لەخۆ دەگرێ و شاعیرمان بەهرەدارەو (شاعیری بەهرەداریش بەهێزی شاعیریەتی خۆی دەتوانێ وێنەی شیعری لە هەموو شتێک دروست بکات)«٤». تابلۆی یەکەم چەندان دیمەنی چڕوپڕ لەخۆ دەگرێ و بەڕوونی وێنەی ئەو هەموو حەشاماتە دەکێشێ کە لەڕێوڕەسمی تۆپینی (ئەسپی والی)دا ئامادە بوون و لەبەردەم ئەو زاتە زەبر بەدەستە خۆیان بە دڵسۆزو غەمبار دەزانن و کامەی پیاوی پیرۆز و گەورەیە جێگای لەبەردەم تەویلەکەی ئەسپی والییە و دەبەوێ لەو دەرفەتە دانەبڕێ:

**کێ پیرۆز و زۆر گەورەیە**
**شوێنی بەردەم (تەویلە)یە**
**بەختیارە و خۆی هەڵئەدا**
**تا دانەبڕێ لەدەرفەتا   ل:٦١**

لەکاتی هێنانەدەری لاشەی تۆپیوی ئەسپەکە لەبەر ئەو ریاکارانە باڵ و بڕو قاچ و قولی بەدەست کەسی تر نەدەکەوت:

**هێنایانە دەرێ لاشەی**
**جوانە مەرگ: ئەسپی والی**
**دەس نە ئەکەوت، سنگی، یاڵی**
**ملی، قاچ و قول و باڵی   ل:٦٢**

بەم وەسفە وردە تەنزئامێزە تابلۆی یەکەمی چیرۆکە شیعرەکەی دەکێشێ. لە تابلۆی دووەمیشی دا کە بەپێچەوانەی تابلۆی یەکەمە کاتی (والی خۆی دەمرێ) کەس لەرێورەسمی بەرێکردنی تەرمەکەی ئامادە نابێ و بۆ جێگایەکی نەدیو دەبردرێ. ئەم دیمەنە کۆمیدییە لەدێرە شیعرێکدا دەردەبرێ:

**بەڵام والی بۆ خۆی کە مرد**
**کەس نەیزانی بۆ کوێیان برد   ل:٦٢**

ئەم دوو دیمەنە کۆمیدیانە لەگەڵێک دەورو سەردەم دووبارە دەبنەوە و هەڵپەرست و ماستاو ساردکەرەوە دەوری خۆیان دەبینن لەو کردارە نابەجێیە و مەبەستی شاعیرش لەدارشتنی ئەم دوو تابلۆ شیعرییە ریسواکردنی دیاردەی هەڵپەرستی و ماستاوچییەتییە و خستوویەتییە قاڵبی شیعریی و بەچاکی لەتاقیکردنەوە ئەدەبییەکەیدا سەرکەوتووە.

### ئەنجام

(عەبدولرەزاق بیمار) شاعیرێکی بەهرەداری خامە رەنگینە و لە دارشتنی شیعری لیرکی و شیعری شانۆیی دەست رۆیشتووە. لەکاتی دارشتنی شیعرەکانیدا بەسۆزی هەڵچووی و هەستی ناسکی و ئەندێشەی قووڵی لەباری بێئاگاییدا جوانترین وێنەی شیعریی خولقاندووە. لە (دیوانی بنەوشەکان)دا جوانتر ئەو وێنانە خۆیان نواندووە و هەموویانی لەرێگەی وەسفی وردی دیمەنەکان و لە لێکچواندن و پێکەوەنانی (خوازە و میتافۆرەوە) دروستبوون و هەر بە ئەوەندەش نەوەستاوە، چووە پەنای بردۆتە بەر ئەفسانە و ئەفسانەی (پەری رەش)ی بەکارهێناوە کە ئیشوکاری خراپەکاری و شەڕە و رێگرە لە مرۆڤی خەباتگێڕ لەپێناو پەیداکردنی نان و ژیانێکی وا کە هەژاران لەچەوساندنەوە رەها بکات و بیان گەیەنێتە ژیانێکی ئازادو ئاسوودە.

شاعیر لەم کارە هونەریانەی و لەشێوەی دارشتنی شیعرەکانی لەسەرکێش و ئیقاعی خۆماڵی کوردی و ناوەرۆکی پتەوی نوێ، شاگردێکی زیرەکی قوتابخانە نوێیەکەی شیعری هاوچەرخی کوردییە کە (گۆران و شێخ نووری شێخ ساڵح) بەردی بناغەی تەلارەکەیان دامەزراند و چەند چینێکی پتەویان لێ بەرزکردەوە (دڵدارو دڵزار و هەردی و ع. ح. ب و دیلان و کاکەی فەللاح و کامەران و حەسیب قەرەداخی) بوونە سوارچاکی ئەو قوتابخانەیە و دوای ئەوانەش (جەلالی میرزا کەریم و عەبدولرەزاق بیمار) بوونە شاعیری بەدەستەڵات و نوێکاری ئەو قوتابخانە شیعرییە و رێگەیان بۆ دەستەی (روانگە) خۆشکرد تا دەوری خۆیان لەتازەکردنەوەی شیعری کوردی لە رووی روخسار و ناوەرۆکەوە ببینن.

**سەرچاوە و پەراوێز:**

**١- ناوەڵواتا: بەمانای (المجاز) دێت (خواستن)یش دەگرێتە خۆ (خوازە)ش هەر بەمانای مەجاز دێت.**

*** میتافۆرە: وشەیەکی ئینگلیزییە بەمانای (خواستن) دێت.**

**٢- د. کامیل حەسەن عەزیز بەسیر- زانستی ناوەڵواتا- بەغدا (١٩٨١)، ل١٠٧.**

**٣- سیسیل. دی. لویس- الصورة الشعریة- ترجمة: د. احمد الجنابي و آخرون- بغداد (١٩٨٢، ص٩٠.**

**٤- الصورة الشعریة، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.**

*** عەبدولرەزاق بیمار- دیوانی بنەوشەکان- بەغدا (١٩٨١).**

# ستایشەکانی نەزەند بەگیخانی

هاشم سەراج

شوعاعی ڕووت لە گەردندا دیارە دڵ دەسووتێنێ
بنازم بەم تەجەللایە، چ خورشید و بلوورێکە!
«نالی»

«ستایش» کتێبێکی نوێی خاتوو «نەزەندبەگیخانی»یە بەقەبارەیەکی مامناوەندی و شێوەی لاکێشەیی هەژدە تێکستی شیعری گرتۆتەخۆ و لە بڵاوکراوەی ساڵی «٢٠٠٤»ی دەزگای چاپ و بڵاوکراوەی «ئاراس»ە.

ئەگەر بەهێمنی و دڵارامی گوێ بۆ گوتن و دەربڕینەکانی چرپە و نیگەرانیەکانی زمان هەڵخەین هەست دەکەین تێکستگەلی «ستایش» تا دێ پەرژین و ئاستەنگە سوننەتییەکانی چەمک و مانا دەبەزێنێ و دنیای ئاڵۆسکاوی شیعریش هێدی هێدی نوقم و ئاوێتەی جۆرێک لەکەشوهەواو تەراتیل و سرووتەکانی عیشق و تراژیدیاو جوانی و ئیرۆتیک دەبێ و ئەمەیش بەهۆی هەڵدانی چەندین ڕستە و دەستەواژەی تژی بە ئیقاع و سیمبۆل و دەلالە و وێنەی دانسقەی شیعری کە شەپۆلێک چێژ و لەززەت و خەفەتباری بەگیانی عیشقئامێزی خوێنەر دەبەخشێ. ستایش لەڕێگەی فەزاو کەناڵەکانی «دوو» تێکستەوە جۆرێک لەهاوسۆزی و هاوسێتی و ئاشنایەتی و دەقئاوێزانی لەگەڵ خەسڵەتەکانی بوێری و چەمکە مەینەتئامێزەکانی «فروغ فەرِوخزاد». دێنێتە کایەوە کە کردەی بەرپاکردنی جۆرێک دیالۆگی خەفەت و حەسرەتئامێزە تێکەڵ بەدڵ و دەروونی پارساو دلۆڤانی دایک دەبێ، یان هەڵڕشتنی کوانوویەک پشکۆی غەمگینییە لەدوعا و نزاو نەوازو سەڵەوات و لالانەوەی گیانی ڕووەو ڕووگەی عیشق و دڵاوایی عالەمی باڵا و لەپێناو پاراستنی ڕۆحی پەروێزو ئازیزان لە چاوی بەد و تیری ناگەهانی قەدەرو هێزی خەتەرناکی شەڕانگێزی.. هاوکات تیشکگەلی (میهری باڵا) لە مۆنادە پەرش و بڵاوەکانی گەڵای دارو درەخت و چەمەن و گوڵە حاجیلەو بەیبوون و دڵۆپەکانی باران و باوبۆران و خۆڵ و بەردو تێکڕای توخمەکانی سرووشتدا دەدۆزێتەوە کەچی دواین جار سەرپاکی هیواو مورادو مرازەکانی خودو وجود بەتارماییەکانی نائومێدی گەمارۆدەدرێن و



کەینونەی سەرمەستی «ستایش» بەتەقس و رەقس و سەمای شێتانەی غەجەری و هەستی دیۆنیزۆسیانە گوزارشت لە مۆرکی پووچێتی گەردوون و شەکەتی بوون دەکات.

**جگەرەیەک داگیرسێنە**
**چرایەک هەڵکە**
**وەرە با پێکەوە گۆرانی بڵێین**
**ئەی هاوڕێم**
**وەرە با پێکەوە سەما بکەین**
**بۆ هێورکردنەوەی دڵی حاجیلەکان**
**بۆ لاواندنەوەی دوعا تەنهاکانی دایکم**
**دایکم هەموو بەیانییەک دوعا دەکا**
**لەجیاتی دوو ڕکات شەش ڕکات نوێژ دەکات**
**وەرە سەیرکە چۆن فوو بەدەوری خۆیدا دەکات و**
**لەفڕین دەپارێتەوە.**
**ئاواتەکانی دایکم وەک مرواری سپین**
**لەژێر سێبەری ئیماندا دەبرسکێنەوە**
**ل۹-۱۰**

بەهەمان شێوە لەتێکستی «حیکایەتەکانی نەنکم»دا کردەی دەقئاناوێزانی ڕوون و ئاشکرایە. هەر دڵێی تێکەڵبوونی بەهرەکانی گیانە بە عیشق و شەیدایی و ڕۆح و جوانی و شیعرەوە ئاوێزانی دنیای پڕ محنەت و تراژیدیای «فروغ» دەبێ و بەرێگەی هەڵدانی ڕستەی شیعری و سیاقی جیاواز جیاوازو فەراهەمکردنی فەزای مەجازییەوە گوزارشت لە پێناسەکانی ژیان و چرکەساتەکانی حەسرەت و خەفە و جودایی و غوربەت و ئولفەتەکانی نێومالّ و لەززەتی پێوەندییەکانی خۆشی و هۆگری خانەوادە دەکات. کە کڵپەی هالاّوەکانی نوستالژیایە و بە پشکۆکانی عیشق و غوربەت و ئولفەت و مەفتەن ئاگر لە گیانی پەرێشانی کەینونەی سەرمەستی شیعر بەردەدا.

**ژیان دەشێ دانیشتنێکی وەنەوشەیی**
**خوشک و برا بێت**
**لەناو ژووری سپیی وشەو**
**بەر ئاگردانی حیکمەتەکانی نەنکم**
**ئینجا ئەو دەبوت**
**ژیان دەشێ چاوەڕوانییەکی شین بێت**
**بۆ دیداری عەشقێ یا بۆ لێکدابڕان**
**چاوەڕوانیی لە دایکبوونی رۆئیایەک**
**یا تێکەڵبوون بەغوبار**
**ل۱۰۰**

ئیتر پەیتا پەیتا کەشوهەوای ستایش دەگۆڕدرێ بۆ پانتاییەک لە کەرنەڤالّ و کۆمەڵێک تەقس و سرووت و تەراتیل و سروودی ئیرۆسی و لەززەت و خۆشنودییەکانی چەمکی ژیان دەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ و هێدی هێدی هێزو وزەی عیشوەگەری [لیبیدۆ] هەوڵ و کۆششی کردەی تێکشکاندنی لۆگۆسی وشەو هەڵدانی ڕستە سەرمەستەکانی مەجاز دەدا و هێزی جیلوەگەری شیعر خەریکە ترادیسۆنی خود دەتەقێنێتەوە و بەرێگەی گەمەی نەشئەبازی جەستەی وشە گوزارشت لەهزرە تایبەت تایبەتەکان دەکات. هزرێک لێوانلێوە لە پاتوسەکانی شیعر و لەدورج و ماسکەکانی زماندا دەکەوێتە سەماو لەنجەی غەجەری و «تومۆس»ی زیندەگی بەنەشئەدێنێ. ئەمە پرۆسەی هەڵدانی ڕستەو دەستەواژەی تەڕییە لە خەسڵەتەکانی ئیرۆس و حەشیش و ئەڤین دژی وێرانەیی و خاپوورگەی «ئاناتۆس». یان دۆزینەوەی ڕەونەقی حالەتە ڕەوحانیەکانە لە فەزاو گەوهەری شتگەل و سروشت و ڕۆح و ڕوخسار و جەستەی خەڵقندە نازپەروەرو جیلوەگەرەکاندا. ئەو بوونەوەرانەی بەئاتەشە پیرۆزەکانی جوانی دەدرەخشێن و مۆناد و ئاقیق و ئاخڵەی نووری یەزدانی ڕووەو دەیجووری بوهلی نائومێدییەکانی گەردوون پەخش دەکەن. لێرەوە کردەی دەسگیرکردنی چرکەساتە بێ مەیلەکانی نووسین و مەرگ و فەناو تراژیدیا و عیشق و جوانی هێندە بەخەمساردی ڕوو لە نهێنییەکانی قەدەر دەکاو دەزانێ شیعرو بەهرەو مرۆڤ نەخچیری هێزێکی نادیارو ناوادەن و مرۆڤ لەچاوەڕوانی هێرشێکی ناگەهانی زەمانی دایە و ئیتر «ستایش» بەوپەڕی جورئەتەوە هەوڵی نووسینی وەهمە جوانەکانی شیعرو جەستەو ئیرۆتیک بەرپادەکات، بەلاّم کام نووسین، چۆن نووسینێک- نووسین، یان کردەی نووسین لەکوێوە سەرچاوە دەگرێ.

ئەگەر بەوردی گەوهەری ئەم ڕستە شێرپەنجەییەی «شارل بۆدلێر» ڕاڤە بکەین. کە دەڵێ: [هەموو جۆرە ئەدەبیاتێک لەگوناهەوە سەرچاوە دەگرێ] ئیتر چلۆن هێندە بەسادەو سانایی لەنێو ماسکەکانی دەق و فۆرم و شێوە و بونیادی قووڵی ڕستەو کردە شاراوەکانی زمان و

بونیادی گشتی تێکستدا بەدوای چەمک و ماناو دەلالە و گومڕایی نووسین و مەبەستە لەنێو چووەکانا وێڵ و سەرگەردان دەبین، یان چلۆن لەمانای لەیادکردنەکانی-بوون- و دۆزینەوەی -دەنگەکان- ئەو دەنگە ڕاڕاو نازپەروەرو پەنهانانەی کە جار جارە بە پارێزەوە خۆ لە فەزای لەززەتداری دەقدا دەردەخەن و لەمیان ئاستە جیاجیاکانەوە دەلالەی مانا دواخراوەکان ڕووەو نیگەرانییەکانی ڕۆحی خوێنەر هەڵدەدەن.

«ستایش » لە تێکستی «پاسیۆن»دا هەوڵدەدا خەسڵەتی لەنێوچووی لەززەت و خۆشنوودی و هۆگرییەکانی مرۆڤایەتی بگەڕێنێتەوە. ئەو خەسڵەتانەی کە لەگەڵ هێرش و غەزووی ئایدیولۆژیای جیاجیا و جێگیربوونی ترادیسۆنەکان ژێر و زەبەر کران. بۆیە لە تەقسێکی لەززەتاویدا و بەوپەڕی بوێری ئاڵای شەکاوەی [دیۆنیزۆس] بەرزدەکاتەوەو لەفەزای سرووتێکی عیشق و جوانی و جەزبە ئامێزی شەوانەی کەنارو شەپۆلەکانی دەریادا گەمەی تێکئالانی جەستە کریستاڵییەکان ئەنجام دەدا ئەمەش بەهیچ شێوەیەکی موژدەی ئافەریدەکردنی-وشە- و نوتفە و خوێنپارەی پیرۆز ناگەیەنێ، بەڵکو ئەنجامدانی کردەی یارییەکی مەزدارو لەززەتمەندی جەستەیە و هێدی هێدی بەرەو نوورەکانی نەشئە هەڵدەکشێ و جەستەیەک کە هەزارەها ساڵەو بە ڕێگای ڕێساو جەبەڕووتەکانی سوننەت و میرات و ترادیسۆن و زەبروزەنگی پاتریارکییەوە دەچەوسێتەوە، یان ئەنجامدانی کردەی ئازادو شەیدایی نووسینە لەپێناو بە ئیستێتیک و ئیرۆتیک کردنی بوارە جیاجیاکانی پانتایی زیندەگی لێرەدا هەست دەکرێ فەزای شیعر بە ئیقاعێکی خەفەتبارەوە ڕەحیقی هێزێکی نەرم و نیانی فێمینیزمی لێ دەچۆڕێ ئەو هێزەی کە نەشئەکانی جەستەو ئیرۆتیک لەنێراو و فروستادەی ڕۆحی مەلەکووت و فیردەوسەکانی لاهووت وەرناگرێ، بەڵکو لەسەر زەمین و لەنێو فەزای گەمە کاریزماییەکانی لەززەت و سێکسدا ڕۆح و جەستە تا ئاستەکانی ئۆرگازم و مەحەبەت تێکدەئاڵێن. ئیتر دارژانی گیانی سەرمەستی شیعر بەم خەسڵەتی ئازادی و بوێرییە و بەم ئاگری وزینە و عیشق و نەشئەو جوانییە بەشێوەیەکی جیاواز گوزارشت لەسەر بهوردی «پاکیزە مەریەم» دەکاو مۆرالێکی تایبەت و شوناسێکی جیاواز لە جیهانی تێکست دەبەخشێ و لەشی بنێس و لەنجەداری پاکیزەش دەبێتە تێکستێکی نازپەروەری شیعری پڕ لە فەزیلەتی پرشنگەجوانەکانی خۆری زیندەگی و میهرو حەسرەت و قەدەری ئیلاهی و ڕووگەی دەرەوشاوەی مەلەک.

**دوێنێ شەو**
**شیعر**
**میناکۆرێکی زراف**
**لەکەناری لم**
**بەڕووتی ڕاکشابوو**
**منیش سپیتر لەمەوجی ڕۆشنایی**
**لەسەر ڕوویا خۆم هەڵخست**
**دواتر مەلائیکەتێ بەلامدا تێپەڕی و فەرمووی**
**سەڵەواتت لێ بێ**
**ئەی ئەو کەسەی کە پڕیت لەفەزیلەت»«١»**
**ل٢١**

(١) ئەم ڕستەیە لە تەورات وەرگیراوە کاتێ حەزرەتی جبرایل دەچێتە حزووری حەزرەتی مریەم بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵی لەدایکبوونی مەسیح. بەم شێوەیە لە ستایشدا «لیبیدۆ» خۆی دەدوێت و بەهیچ شێوەیەک کەسێک نوێنەرایەتی ناکاو... هەوڵدەدا شەکەتییەکانی ڕۆح و ئاگرەکانی عیشق و ڕۆنەقەکانی جوانی و مۆسیقاکانی غەریزە و شەپۆلە شێتێتیەکانی زەین و نائاگایی بنووسێتەوە و مۆرکی جیاوازی خۆی بسەپێنێ، یان لە دیدو گۆشەنیگای «فرانسوا لیوتار»، یان مۆراڵی پۆست مۆدێرنیزم. کە مۆراڵی لیبیدۆیە و مۆراڵی جیاوازی و گەڕاندنەوەی بەهاکانە بۆ تاکەکەس و ئازادکردنی فێمینستێکەو لە دەرەوەی مەرزی پاتریارکییەوە زمانێک بەرهەم دێنێ و بەها تازەکان بە گەوهەری ژیان دەبەخشێ و زمانێک پڕیەتی لەتوخمەکانی «لیبیس»ی وشەو شیعریش تۆریستێکەو بەردەوام هەوڵدەدا بە نەشئەکانی دیۆنیزۆسی سێنتەرزمی عەقڵگەرایی تێک بشکێنێ و بۆیە هەست دەکەین «ستایش» بەتایبەتی دەقی «پاسیۆن» خاوەندی گوتارێکی شیعری شێوە نیهلستی و میتافۆری و باخوسی و ئەپیکۆرییە، یان «لیبیدۆ» «دیۆنیزۆس» Dionysos یێکی نوێ و بێباکە و داهێنەری بەهای تازەو ڕەوشتە نوێکانە و تا دێ سەڵتەنەتی هۆش پووچدەکاتەوە و بەچەمکی -نیچە- نەشئەباز و تراژیدیە و کۆمەڵێک پێوەندی ئیرۆتیکی لەگەڵ ژیان دروست دەکات. ئەمەیش پرۆژەی بە ئیرۆتیک و ئیستێتیک کردنی ژیانە، یان بەڕپاکردنی یارییەکانی

ڕۆح و جەستە و هەست و ئارەزووەکانە کە لەنێو سیاق و بونیادی زماندا ئەنجام دەدرێن، چونکە «تاک» هەوڵدەدا فۆرمی خۆی دروست بکات، یان گوێ بۆ بەسۆزترین و خەفەتبارترین دەنگێکی «ئۆرفیۆس»ی هەڵخا کە لەنێو دەقێکی کراوەدا سترانێکی ئاتوونی بۆ هیچی بوون و گەردوون دەچڕێ. سترانێک بەکۆراڵی تاکێتی و مۆسیقاکانی غەریزەوە. بانگەشەی (مەرگی گێڕانەوە زەبەلاحەکان» دەکات ئەم چەند بڕگە شیعرانەیش بۆ چێژو ڕاڤەکانی خوێنەر جێدەهێڵم:

**دڵۆپێ سێبەر ڕژایە بەرپێم**
**فەزا دابەش بوو**
**شوێن بوو بەدوو کەرتەوە**
**سنوور ڕووا**
**من لەیەک کات لێرەم و لەودیو**
**بەڵام هەردەم لەگەڵ تۆم**
**ل٢٥**

**سپێدەیەک، نیوەڕۆیەک، یا پاش عەسرانێک**
**بەبێدەنگی دەکەوین**
**وەک نووستو و چاولێک دەنێین**
**وەک مردوو هەناسە دەدەین**
**ل٢٧**

**لە چڕلایی دەستەکانت**
**بێپایان ڕاکشاوم**
**هێشوویەک جوانی**
**لەناو کۆشی ژیان**
**ل٢٦**

**پێکەوە یا بەجیا**
**یەکتری دەنووسینەوە**
**ئەوی دی کە ڕابردوو بوو**
**ئەوی تر کە هەرگیز لەداهاتوودا نابێت**
**ل٢٦**

**لەپشت سەری تیشک دانیشتم**
**ئاه چەند گەرمە نزیکبوون**
**چەند نزیکە پێکەوە بوون**
**لەناو باوەشی وشە و**

**ئاوێزانی دڵنیایی**
**ل٣٢**

**هێی هێی هێی هێ**
**سەرگوزەشتەی من**
**دەشێ سەرگوزەشتەی تۆش بێ**
**سەرگوزەشتەی من**
**سەرگوزەشتەی گوڵێک بوو**
**لەسووچێکی سەر ئەم زەمینە**
**دەشنایەوە، پێ دەکەنی**
**لەگەڵ جوانیدا هاو دەم بوو**
**ل٣٩**

**من پانتاییەکم**
**لەپێکەنین**
**لەگریان**
**لەهەناسە**
**من پێ دەکەنم**
**من دەگریم**
**من سەما دەکەم**
**من گەورەترم لە گەورەبوون**
**نەمرترم لەمردن من دەژیم**
**ل٨١**

**پۆلێ منالی کەسک و سوور**
**تەنکە بەردی نەرم دەگرنە ڕووخساری لواغ**
**بازنە ئاوییەکان**
**لۆچی تەماشای**
**پیرێژنە سەر ڕووتاوەکانی نێوارەکانی ئەم ناوەن**
**کە لەناو بۆشایی ڕۆژەکان دادەنیشن و**
**خەون بە سپێدەکانی تەمەنەوە دەبینن**
**لواغ توو لە ڕێیەکی نارنجییەو**
**بەهێواشی دەکشێ بەرەو دۆڵێکی خۆڵەمێشی**
**سەرخۆشەکان**
**گەردێکی وەنەوشەیین لەسەر گۆنای ساڵەکان**
**قوتووە بیرە بەتاڵەکان لەکەمەری لواغدا پشتێنی**
**زێڕینی تەنهایین**
**ل٩٤**

# کێشێن شعرا کوردی دناڤبەرا بەحرێن فەراهیدی و هەسپێن جگەرخوینی دا

ئەحمەد قەرەنی

دیرۆکا شعرا کوردی ل سەدسالیا دەهێ دەستپێکرییە، کو ب چارین و دوو بەیتێن بابەتاهیری هەمەدانی (٩٣٧- ١٠١١ز) هاتینە تۆمارکرن(١). هەرچەند بەرهەمێن ئەڤی شاعیری ب دروستی نەهاتینە ساغقەکرن و، گەلەک گۆمان ل سەر چەوانیا پەیڤ و دارشتنا شعرێن وی هەنەو، گێنگەشەکا گەرم دناڤبەرا ڕێزکرنا بەرهەمێن دناڤبەرا ئەدەبیاتێن فارسی و کوردیدا هەر مایە، لێ لجەم تەڤایا نڤیسکار و لیکۆلەرێن کورد ئەڤ کێشەیە یەکلایەنە بوویە و دناڤ هەموو پەرتووکێن مێژوویا ئەدەبێ کوردیدا ئەڤی شاعری ب پێشەنگ دادنێن نەمازە ئەوێن لایەنی زانستی ئەکادیمی لبەرچاڤ دگرن.(٢) چارینێن بابە تاهیری ژی لسەر عەرووزێ هاتینە دانین، (٣) و بەحرا هەزەجا شەشی بکارهێنایە کو هنەک ئەڤێ ب مەرجەکێ سەرەکی دزانن و، هنەک ژی هەر نیڤە دێرەکێ وەسا دادنێن کو دڤیا لسەر کێشا (لاحول ولا قوة إلا بالله) بیت.(٤)

ئەگەر ئەڤ چەندە د چارینێن بابە تاهیریدا دروست بیت، لێ بەلێ مەرج نییە هەموو چارین د ئەدەبێ کوردیدا تەنها لسەر ئەڤێ کێشێ بن. (٥)

هەرچەندە زۆربەی چارینێن بابا تاهیری لسەر کێشا هەزەجا شەشی گۆشەییا سراوەن (الهزج المسدس المحذوف = مفاعیلن مفاعیلن فعولن).(٦)

یان ژی (هەزەجی شەشی مەقسوور= مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل)(٧) ئەڤەو کێشا هەزەجا سالم گەلەکا ل کارە د(چارین)ێن شعرا کوردیدا کو دبیتە: (مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن) دەربارەی کێشا شعرێن چارین، چونکە بەحرا هەزەجا سالما دروست دبیتە: (مفاعیلن، مفاعیلن، مفاعیلن، مفاعیلن) (٨). ئەگەر بزڤرینەڤە سەرکێشێن دوو بەیتێن بابەتاهیری وەکو ستران و سروود دهێنە بەرچاڤ، گەلەک ژ زانایان کو دیراسا ئەڤی جۆرێ شعرێ دکەن بناڤ دبەن ب شعر (مللی) یان (گەلی)، ئەڤەژی ژبەر هندێ بوویە بەرامبەر بابەتاهیر هاتیە گوتن، چونکە ل وی سەردەمی ئەڤ شعرە لسەر زارێ هەموو خەلکێ دەڤەرێ بوون، کێشا وان ژی کێشا شعرا مللی بوویە. (٩) ئەڤەژی نیزیک دبیتە ڤە ژ ئەوێ بۆچوونێ کو شعرا خۆمالی هەبوویە لێ ب ڕێکا ئەدەبێ فارسی کێشێن شعرا عەرەبی هاتینە بکارئینان کو عەرەبان ژی نەدویرە ئەڤ زانستە ژ بەرهەمێن گریک و ڕۆمانان وەرگرتبیت پشتی کو هاتینە وەرگێران بۆ سەر زمانێ عەرەبی لسەردەمێ دەولەتا عەباسیان.

لدویڤ بابەتاهیرێ هەمەدانی دیوانا مەلایێ جزیری لبەردەستێن مەدایەو، ئەو ژی ب تەمامی شعرێن خۆ لسەر عەرووزێن عەرەبی ڤەهاندینەو، ب ڕەنگەکێ شارەزایانە زۆربەی بەحرێن عەرووزا شعرا عەرەبی




بکارئینانینە، چونکە گەلەک جاران خوّ پێدڤی زەحاف و عیللەیان نەکریە، ژبەر کو زمانێ کوردی یان فارسی ژی هەردەم پێدڤی ئەڤان حالەتانە تاکو ئەو تەرتیفا فەراهیدی دانای دگەل ئەڤان زمانان ژی بگونجیت، لەوما ژی دێ بینین کو جزیری گەلەک جاران بەحرێن تەواو بکارئینانینە، وەکو:

١- کێشا هەزەج، کو د ئەڤێ شعرێدا دبێژیت: (١٠)

**ب نارێ فیرقەتێ سوهتم**
**ژ فەرقی سەرحەتی پێدا**
**خەدەنگا غەفلەتێ نوهتیم**
**ژ بەرقا لامیعا تێدا**

هەتا دگەهتە..

**مەلا بێ قامەتا یەکتا**
**قیامەت من ب جەهڤان دی**
**فراقێ رووسیا بێ تە**
**ژمن جانێ شیرین جیدا**

مفاعیلن مفاعیلن
مفاعیلن مفاعیلن
ب ---/ ب ---
ب ---/ ب ---

٢- کێشا رەجەز: جزیری د قەسیدەیەکا (٢٤)مالکیدا دبێژیت: (١١)

**خەلقێ ل من کەن شیرەتێ**
**ئەو دلبەرا زەرین کەمەر**
**من دی دحالێ غەفلەتێ**
**هات دەر ژ بورجێ وەک قەمەر**

هەتا دگەهتە..

**زاهیر دبێژم پەندگیر**
**دا دل نەدی زولفا حەریر**
**شوبهی (مەلێ) دمینی ئەسیر**
**گوه دیرە قەولی موعتەبەر**

مستفعلن مستفعلن
مستفعلن مستفعلن
-- ب -/-- ب -
-- ب -/-- ب -

ئەڤە و جزیری دیوانەکا تەواو هەیە کو سەروایا شعرێن وی هەموو پیتێن زمانی ڤەدگرن و گەلەک کێشێن عەرووزێ بکارئینانینە و گەلەک جاران ژی پشت ب زیحاف و عیللەیێن تۆشی شعرێ دبن بەستینە، چونکە دگەل رەوانیا سەلیقەیێن شعرا جزیری ژی، لێ کێشێن عەرووزا عەرەبی دگەل زمانێ کوردی **ناگونجێت، هەتا ئەو رادەیێ کو هنەک ژ شارەزاو زانایێن کوردان دگەل ئەوێ بۆچوونێ نینە کو کێشێن عەرووزا شعرا عەرەبی بۆ شعرا کوردی بکێربهێت ژبەرکو زۆر لەنگی و ب خورتی** پێکڤە ئینان و خستنە سەر وژێبرن بسەردا دهێن، لەوما ژی دکتور عزەدین مستەفا رەسوول دبێژیت کو بۆچوونا دویماهیێ ئەوەیە کو عەرووزا عەرەبی هەر دکوردیدا نییە. (١٢)

بەلێ دەمێ جزیری شعرا خۆیا (رابی) لسەر کێشا رەجەزا هەشتیێ تەواو دڤەهینیت گەلەک ئەوان گۆمانان لادەدەت مینا ئەڤێ شعرێ: (١٣)

**من دی سەحەر شاهی مەجەر**
**لەبسی دبەر مەخموور بوو**
**ئەو دیم زەری سورموشتەری**
**یارەب پەری یاحوور بوو**
**حووری وەشە شیرین مەشە**
**کاکول رەشە خال حەبەشە**
**خالین دقەر مسکا تەتەر**
**نازک بەشەر کافوور بوو**

هەتا دگەهتە...

**وێ کاکولێ چینێن دلێ**
**قەلبێ مەلێ داڤ داندلێ**

**داڤا دلان نیڤ سونبولان**

**سەر سوورگولان مەنقوور بوو**

مستفعلن مستفعلن

مستفعلن مستفعلن

-- ب -/-- ب -

-- ب -/-- ب -

لدویف مەلایێ جزیری، ئەحمەدێ خانی هاتیە (١٦٥٠- ١٧٠٧) و دنووبهارا

خۆدا کو فەرهەنگەکە ب شعر هاتیە دانان، داکو زارۆکێن کوردان فێری عەرەبی بکەت و دهەمان وەختدا هەر پارچەیەک ژ فەرهەنگێ لسەر کێشەکا عەرووزێ دانایەو هەلبەت ئەو کێش دساناهی و بارتر بووینە لەوما بۆ دانانا فەرهەنگێ هەلبژارتینە، داکو زوی فێربن، ئەو ژی ئەڤەنە: (١٤)

١- کێشا هەزەجا مەکفووفا مەحزووف.

**حەتا تو دەور و دەرسان نەکی تکرار و مەسرووف**

**د دنیایێ تونابی نەمەشهوور و نە مەعرووف**

**مفاعیلن فعولن مفاعیلن فعولن**

**چ خۆشی وەزنە ببیتن هزج مکفوف و محذوف**

نووبهار: ٣١

٢- کێشا رەجەزا مەتوی یا مەخبون:

**پەردە کو رابێن ژبەر عارضێ دلستانە خۆش**

**دل ژ غەمان کو بێتە دەر بلبلێ گولستانە خۆش**

**مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن**

**بەحرا (رجز) کو (خبن) و (طی) گەر ببیتن رەوانە خۆش**

نووبهار: ٣٤

٣- کێشا رەمەلا مەحزووف:

**عارفێ کو ب قەنجی مەعرووف بت**

**دێ حەلیم و سابرو مەوقووف بت**

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلات**

**وەزن ئەڤە حینا (رمل) محذوف بت**

نووبهار: ٣٩

٤- کێشا رەجەزا تەواوا هەشتی، ئەڤ کێشەیە گەلەکا زۆرە دناڤ شعر کلاسیکیا کوردیداو، نیشانا دەستپلی وزیرەکیا شاعری دیاردکەت:

**گەر دێ تە مەقسوودەک هەبی لازم دڤێ لێ یی ب لەز**

**خاسما تە مەعبوودەک هەبی دائیم د ئەمرێ وی بەز**

مستفعلن مستفعلن

مستفعلن مستفعلن

-- ب -/-- ب -

-- ب -/-- ب -

**سالم (مثمن) هەر ئەڤە ئەی طالبێ بەحرا رەجەز**

٥- کێشا رەجەزا مورەفەل:

**هەرچی علمی ب جەهل کر موبەدەل**

**سفرێ خو وی ب زێر موکەلەل**

**مستفعلاتن مستفعلاتن**

**بەحرا (رجز) بوو چ خۆش (مرفل)**

نووبهار: ٤٧

٦- کێشا موزاریعا ئەحزەب:

**ئێ کو تەکبر دائم کریە ژبو خو مەرکەب**

**ئەول تو بێ بکەین پاشی بکێرە مەرکەب**

**مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن**

**خۆش وەزنە بێ هەلالە گەر بیت (مضارع أحزب).**

نووبهار: ٤٩

٧- کێشا رەمەلا مەقسوورا هەشتی:

**شێخ وصوفی کەرامەت و هەم خوەندن و عەمەل**

**خلوەتە حوجرە طەریڤا تە شریعەت بێ خەلەل**

**فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلات**

**خۆش تو ڤێ بەحرێ بخوونە لەورا خۆش چۆنە رەمەل**

نووبهار: ٥٣

٨- کێشا بەسیتا مەتوی:

**گەر تە دڤێتن تو ببی میر وسەر و موعتەبەر**

**کذب و خلافێ مەبێژ گەر تەبکن کەرب کەر**

**مفتعلن فاعلن مفتعلن فاعلن**

**مەطویە بەحرا بەسیط لێ بکە جارەک نەظەر**

نووبهار: ٦٠

٩- کێشا هەزەجا ئەحزەبا هەشتی:

**هەرچی ژ دنیایێ بەرداشتە دامن بوو**

**بێ شوبهەت دنیڤ عامێ ئەفراشتە گەردەن بوو**

**مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن**

**وەزنا هەزەجا (أحزب) ئەڤ رەنگە (مثمن)**

نووبهار: ٦٧

١٠- کێشا رەجەزا مەتوی یا هەشتی:

**گەر تە دڤێتن کو بەرابەر نەبێن کەس ب تەرا**

**علمی بخوون هەم عەمەلی تویکە صنعەت ژخورا**

**مفتعلن مفتعلن مفتعلن مفتعلن**

**ئەڤ رەجەزا مەطویە دا قەنج بزانی تو برا**

نووبهار: ٧٠

١١- کێشا سەریعا مەتوی:

**هەرچی کەسێ علمەکی قەنج خوەندیە**

**دەولەتە گەر وی ب ئەصل زانیە**
**مفتعلن مفتعلن فاعلن**
**بەحرا سەریعە چیە خۆش مطویە**

نووبهار: ٧٤

١٢- کێشا هەزەجا سالما هەشتێ
**د فەصلا نووبهارێدا دگەل دلبەر بچن گەشتێ**
**ژ ئەو خۆشتر عومر نابت ل من ئەڤ حال قەوی خۆش تێ**
**مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن**
**(هزج سالم مثمن) بت ل طەبعان خۆش مونەقەش تێ**

نووبهار: ٧٩

١٣- کێشا موتەقاریا مەقسوور:
**(معلم) بلا دل وەکی بەر بتن**
**دڤێتن کو شاگرد دلبەر بتن**
**فعولن فعولن فعولن فعول**
**تەقارب خۆشە گەر (مقصر)بتن**

نووبهار: ٨٤

من نەڤـیـا دەسـتـکاریێ ددەقـێن شـعـرێن نووبهـاراتویژاندیدا بکەم، چونکە وەخت و کـار و دەرفەتەکا درێژ پێدڤیان، لێ ئەو کارێ بفەر دزانین لڤێرە بەحس بکەین ئەوە کو:

١- ئەحـمـەدێ خـانی ژی وەکـو مـەلایێ جـزیری ب دروسـتی چوویە دناڤ زانسـتـا عـەرووزا عـەرەبیـدا، هەرچەندە هیچ ئاماژەیەک لدەڤ وی نەهاتیـە کـرن کـو چەوا و بۆچی کێشا عەرووزێ بکارهینایە و چوکێشێن دی بکار نەهینـاینە ئەگـەر هاتوو ل وی سـەردەمی هەبووبن.

٢- خانی وەکو جزیری ژی زانینا کێشێن عەرووزێ بکارەکێ فەر زانیە کو شاعر بزانیت و، دەبیت مەرجەک ژی بیت بۆ تەمامکرنا خویندنێ.

٣- خـانی ژ (١٦) کـێـشێن عـەرووزی (٧) کـێش هەلبژارتینە، لێ پشتی بکارهینانا زەحاف و عیللەیان هەمــوو تـێکرا دبنە (١٣) کـێـش، ئەڤێ ژی هەڤسەنگیـیەک هەیە دناڤبەرا هەژمارا پەیڤێن هاتینە راڤەکرن دقەوارا نووبهارێدا دگەل ئەوان

سـێزدە کـێـشێن دناڤـدا هاتین کـو خـێرخـوازێن وی سەردەمی دەبێت فێرببانە، هەرچەند (هزج، رەجەز) پتر لکاربووینە.

هۆسا دیاردبیت کـو ئەڤ کـێـشێن عـەرووزێ دباو و لکاربووینەو، ئەگەر هەلبـژارتنا کـێشـەکا شـعـر ژی بۆ شاعرەکی تشتەکی ب زەحمەت بایە، دا شعرەکا پێش خۆ

کەتە پێوەر و لسەر سەلیقا وێ شعرەکێ ڤەهوینیت(١٥)

ئەڤ رێبـازە دناڤ شعـرا کـوردیدا بەردەوام بوویە هەتا سەرەتایا سـەد سـالیـا بیـسـتێ. ژبلی هنەک شعـرێن ب دیالێکتا گوران هاتینە دانین و پشت ب کێشێن خۆمالی بەستییە کو دگەل زمانێ کوردی پتر دگونجێت بەلکو ژ سەخلەتێن رەسەنێن وی ژی بووینە.

دگەل نویکرنا بیرو هزرو کارو خەباتان، فوکر د نویکرنا کێشێن شعرێ ژی هاتە کرن لێ ئەوان شاعـران بۆ جارا یەکێ پتر کێشێن عەرووزێ و خۆمالی تێکەل دکرن و دویڤدا رێچکەکە پتر هاتە ڤەوژارتن و هەتا گەهشتە ئەوی رادەیەی کو ب دروستی جهێ خۆ گرت و کێشێن عـەرووزێ ئانکو وەکـو دبێژنی کـلاسیـک کـەت و مـات مانەڤە.

بۆ نموونە شاعرەکێ نوێخوازێ وەکو (عەبدوللا گۆرانی) سـەرەتا ژیانا خـۆیا شـعـرێ ب کـێـشـێن عـەرووزێ دەستپێکرییە و هەتا ماوەیەکێ زۆر لسەر چوویە،(١٦) هەرچەندە هنەک جاران هەردوو تێکەل کـرینەو، پاشـان هێدی هێدی لبن کاریگەرییا شعـرا فارسی و عـەرەبی دەرچوویە.

لڤێرەدا، دێ شێین بێژین کو هەر شاعرەکێ نوێخوازێ کورد ل سەد سالیا بیستێدا ئەزموونەکا خۆیا تایبەت هەبوویە کو چەوا ل تەوقا کێشێن عەرووزێ خۆ رزگار کـرییـە و زڤـرییـەڤـە بۆ بکارهینانا شـعـرا پەنجـەیی (خـۆمـالی) و یەک ژ ئەوان ئانکۆ پێـشـەنگ بوو (عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری) بوویە(١٧).

شێخ نووری شێخ سالح یەکێک لەو شاعرانە بوویە کو هەر ل سالێن (١٩٢٦-١٩٢٧)دا زنجیـرە گـوتارەک د رۆژنامـا (ژیان)دا بە لاڤکربوو و، هەر د یەکەم گـوتاردا هەردوو کێشێن پەنجەیی و عەرووزی بەراورد دکەت و، ب درێژی شـرۆڤـەدکـەت(١٨) هەروەسا پیـرەمێـردی و قـەدری جـانی(١٩) ژی رۆلێ خـۆ هەبوو د نویکرنەڤـا کێشێن خۆمالی د شعرا کوردیدا.

من نە ڤـێـت ناڤێ هەمـوو شـاعـرێن نوێخـوازێن پێشەنگ، لڤێرە، رێزبکەم چونکی دێ گەلەک درێژ بیت، لێ بەلێ تشـتـی گـرنگ ئەوە کـو ئاماژێ ب گـوتارەکـا بەهەشتی (جگەرخوینی) بکەم کو ل هەژمارا (٢٢)یێ یا کـۆڤـارا (هاوار)دا، ئەوا ل (١-تیـرمـە- ١٩٣٣)یێ ل شـامێ دەرچوویە و ل رووپەلێ (١)یێ دا بابەتەک ب ناڤێ (هەسپێن خوەشخوانێن کوردی) بەلاڤ کرییـە و تێدا سیستـەمێکی رێکوپێک بۆ رێکخستنا کێشێن خۆمالیێن شعرا کوردی داتییە(١٩). ئەم بفەر دزانین

لێرەدا دووبارە بەلاڤکەینەڤە ژبۆ راکێشانا سەرنجا تویژەر و نڤیسکارو خوینەرێن ئیرۆ بۆ رۆلێ جگەرخوێنی د ئەڤێ قادیدا، چونکە گەلەک هزر دکەن کو دناڤەرۆکا شعرا خۆدا نوبخواز بوویە، لێ شعرێن وی هەر لسەر کێشێن عـــەرووزی هاتینە دانین، لەومـــا دێ رێچکا ئەوی ئەفراندی دانینەڤە پێش چاڤێن خەمخۆر و خوێندەڤانان:

## هەسپێن خوەشخوانێن کوردی.
## ب ناڤێ یەزدانی پاک ئێ دلۆڤان و میهرەبان

تو بزان ژ رێڤە هەسپێن خوەشخوانێن کوردی چارن. ئی (چەلەنگ) و ئێ (لاغـــەر) و ئێ (ســـڤک) و ئی (رەوان).

هەسپێ چەلەنگ دو گاڤان داڤێژە. هەر گاڤەکێ پێنج مۆڤک تێدا هەنە.

ئێ لاغەر دو گاڤان داڤێژە. هەر گاڤەکێ شەش مۆڤک تێدا هەنە.

ئێ سڤک دو گاڤان داڤێژە. هەر گاڤەکێ هەفت مۆڤک تێدا هەنە.

ئێ رەوان دو گاڤان داڤێژە. هەر گاڤەکێ هەشت مۆڤک تێدا هەنە.

ئەز هێڤی ژ هەڤال و هۆگران دکم ئەگەر کێمانی یەک د هەسـپـێـن من دا دیتن ب‌رە راست بکن و دەرباس بن چکو هەسپێ چێ ب کەتنەکێ فهێت نابێ.

ئەرێ ئەزێ چەندکان ژوەرە ژ هەڤ کت کتی بکم کو وە ناسکرن. پاشێ هوونێ ژ من بهتر و چێتر ببەزینن.

### هەسپێ چەلەنگ

گاڤا پێشی: ئەز و دەلالێ
گاڤا پاشی: چوونە قرشکا

مۆڤک: ٥ ئەز- و- دە- لا- لێ.
مۆڤک: ٥ چوو- نە- قر-ش- کا.

**مالێ مە ل مسرێ کۆنێ مە ل عبرێ**
**ما- لێ- مەل- مس- رێ**
**کۆ- نێ- مەل- عب- رێ**

**شەپل زێرینێ شەپل مەلانێ**
**شە- پل- زێ- ری- نێ**
**شە- پل- مە- لا- نێ**

**کەچکێ تە بدنە میرێ جەزیرێ**
**کەچ- کێ- تە- بد- نە**
**می- رێ- جە- زی- رێ**

ئەرێ ســوارۆ چڤــاس هەســپــێـن وەکی ڤــان تە دیتن تو کــاری بێــژی ئەڤ هەســپێ چەلەنگە. دو گــاڤــانە و پــێنج مۆڤکە. وەکی نهــا ڤان چەند هەسـپـێـن کو ب شـوون ڤە تێن.

**دەستار گەریا ل دۆرا بازێرۆ**
**لۆلۆپسمامۆ لازم ب لازم**
**دە هوورک هوورک دەڤیا**

### هەسپێ لاغەر

هەسـپێ لاغـ[illegible] داڤێـژ[illegible]. هەر گـاڤـەکێ شـەش مۆڤک تێ دە هەبە. ئەزی ژ تەرە چەندکان کت کتی بکم. ئێدی ژ من چێتر و بهتر کاربی ببەزینی.

[illegible] بشارۆ نەمایۆ
گاڤا پاشی: دۆرا گوند گەرِیایۆ

مۆڤک: ٦ ب- شا- رۆ- نە- ما- یۆ
مۆڤک: ٦ دۆ- را- گوند- گەرِ- یا- یۆ

**کنم درێژ نابم کنم کنم لێ لێ**
**ک- نم- د- رێژ- نا- بم**
**ک- نم- ک- نم- لێ- لێ**

**کال کالێ قەرچەکێ کال مێرێ کەچەکێ**
**کال- کا- لێ- قەر- چە- کێ**
**کال- مێ- رێ- کە- چە- کێ**

**عەبایێ عەبایێ گۆرێ مە رادایێ**
**عە- با- یێ- عە- با- یێ**
**گۆ- رێ- مە- را- دا- یێ**

**لەسفاندا لەسفاندا گەزەک لە روخاندا (سۆرانی)**
**لەس- فان- دا- لەس- فان-دا**
**گە- زەک- لە- رو- خان-دا**

ئەرێ سوارۆ تە چقاس هەسپێ شەش مۆڤک دیتن تو کاری ل وان سوار بی و بێژی ئەڤ هەسپێ لاغەرە.

## هەسپێ سڤک

ئەو هەردو هەسپێن کو چوون دناڤ کوردمانجان دە کێمن و هندک مرۆڤ کارن وان ببەزینن. بەلێ ئەڤ هەردوییێن کو تێن دناڤ کورمانجان دە پرن و هەر کەس کارە وان ببەزینی. هەسپێ سڤک دو گاڤان داڤێژە. هەر گاڤەکێ هەفت مۆڤک تێدا هەنە. ئەزێ ژوەرە چەندەکان ژ هەڤ کتکتی بکم. ئێدی هوون کارن ژمن چێتر و بێهتر باژۆن و ببەزینن.

گاڤا پێشی: زەکۆ زەکۆ زەینەبێ
گاڤا پاشی: هات کاروانێ حەلەبێ

مۆڤک: ٧ زە- کۆ- زە- کۆ- زەی- نە- بێ
مۆڤک: ٧ هات- کار- وا- نێ- حە- لە- بێ

**هێ هاتن هاتن هاتن * کۆچەر ژ زۆزانان هاتن**
**هێ- ها- تن- ها- تن- ها-تن**
**کۆ- چەرژ- زۆ- زا- نان- ها- تن**

**دە یار دە یار ڤودرەتێ * تۆپا خوەدێ لێ کەتێ**
**دە- یار- دە- یار- ڤود- رە- تێ**
**تۆ- پا- خوە- دێ- لێ- کە- تێ**

**لێ تێرگەزێ کۆچەرێ * تەرەس باڤێ کۆچەرێ**
**لێ- تێر- گە- زێ- کۆ- چە- رێ**
**تە- رەس- با- ڤێ- کۆ- چە- رێ**

**خومخومێ تۆریبانێ * کەڤۆکا سەرێ بانێ**
**خوم- خو- مێ- تۆ- ری- با- نێ**
**کە- ڤۆ- کا- سە- رێ- با- نێ**

**فەرحۆ باڤێ عەزێرە * چوو ژ تالانێ بەرژێرە**
**فەر- حۆ- با- ڤێ- عە- زێ- رە**
**چووژ- تا- لا- نێ- بەر- ژێ- رە**

**ئاخ و ئەمان چەچانێ * کەچا ئەحمەد کەیانێ**
**ئا- خو- ئە- مان- چە- چا- نێ**
**کە- چا- ئەح- مەد- کە- یا- نێ**

دڤردا ئەز نکارم هەسپێن سڤک تەڤان گرێدم. ئەگەر فەلەکا مالخەراب و سیتەمکار بەرێ چەرخا خوە ل من نەدێ ئەزێ ژ وەرە دوور و درێژ خوەشخوانێن کوردی تەڤان کۆم بکم و ژ وەرە بەلاڤ بکم ئاخ ئاخ سوارۆ کورمانج دبێژن تو چ بێژی ل بەژنا سوارێ من تێ.

## هەسپێ رەوان

هەسپێ رەوان پرێ جاران پالڤان و خوەشخوان کو دبێژن. هەسپەکێ شێرینە، سەرنەرمە، رەوانە وەکی ئاڤا گران دبەزێ دە، بالا خوە بدێ سوارۆ دەلالۆ. هەسپێ رەوان دو گاڤان داڤێژە، هەر گاڤەکێ هەشت مۆڤک تێ دە هەنە. ئەزێ چەندکان دیسا کتکتی بکم. هوونێ ئێدی کارن بێ سەرگێژی و دلئیشی تەڤان باژۆن و ببەزینن.

گاڤا پێشی: بەژنا زراڤ شڤا زێرۆ
گاڤا پاشی: پۆز ب قولێ خەزێم تێ رۆ

مۆڤک: ٨ بەژ- نا- ز- راڤ- ش- ڤا- زێ- رۆ
مۆڤک: ٨ پۆز- ب- قو- لێ- خە- زێم- تێ- رۆ

**مەچە گۆتێ تو غەیبیدی * ئاڤا گۆلا ل مە جەمدی**
**مە- چە- گۆ- تێ- تۆ- غە- یبد- دی**
**ئا- ڤا- گو- لا- لە- جە- م- دی**

**سەلاما من سەناخوانی * سەحەر گەهـ گەهـ هەر ڤەشان بت**
**سە- لا- ما- من- سە- نا- خوا-نی**
**سە- حەر- گەهـ- گەهـ- هەر- ڤە- شان- بت**

**وێ ل سەر بانی چەک د شووشتن * زەندو بازن تەڤ هلمشتن**
**وێ- ل- سەر- با- نی- چەک- د شووش- تن**
**زەن- دو- با- زن- تەڤ- هل- مش- تن**

**ئاگر ب کوردستانێ کەت * لەورا دکت هەوارە دل**
**ئا- گر- ب- کور- دس- تا- نێ- کەت**
**لەو- را- د- کت- هە- وا- رە- دل**

**هەی مامستا خەلکێ پەردێ * شوور دە کێشا لەدوو گەردێ**

**هەی- ما- مس- تا- خەل- کێ- پەر- دێ**
**شوور- دە- کێ- شا- لە- دوو- گەر- دێ**

**هەر لەنجە خانم لەنجەیە * لەنجت یەنۆکێ پەنجەیە**
**هەر- لەن- جە- خا- نم- لەن- جە- یە**
**لەن- جت- یە- نۆ- کێ- پەن- جە- یە**

ژبۆنا ئیرۆ ئەڤ چەند. ژخوە ئەڤ لێ لێ یە، هەکە خویندەڤانێن هاوارێ پێ بەندەوار بوون، لۆ لۆ ل پێ یە.
هەروەکو خانیێ رەحمەتی گۆتیە:
**چ بکم کۆ قەوی کەسادە بازار**
**نینن ژ قوماشی را خەریدار**

* * *

ئەڤا ل سلال مە بەحسکری دیرۆکا چەوانیا پەیرەوکرنا کێشێن شعرا کوردی یە، کو هەر ژ سەدسالیا دەهێ دەستپێ دکەت و هەتا سەد سالیا بیستێ، کو پشتی کورد تێکەلی شارستانیەتا عەرەبیا ئیسلامی بووی و زانستێن ئایینی و زمانێ عەرەبی ب گرنگی وەرگرتی، تشتێن خۆمالی پشت گوه هاڤێتن یان ژی ب حالەتەکێ فەرمی نەدزانی. ژبەر هندێ کێشێن شعرا خۆمالی تەنها دناڤ خەلکێ ئاساییدا ماڤە و بۆ ستران و بەیتان بکاردهینا. لێ ددەمێ شعرا هەلبژاردە دناڤ حوجرێن خویندن و دیوان و کۆچکێن میر و حاکماندا دهاتە گۆتن ددبیت ئەو کێشە هاتبانە بکارهینان کو وەکو کێشا شعرا فارسی و عەرەبی بیت، کو ئەو ژی زارڤەکرنەکا شارەزاییانەبوو ژبۆ شعرا گریکی و رۆمانی کو بایەخێ ب کێش و ریتما ناڤدا و موسیقا وی ددەت، ب رێکا رێز بەندکرنا برگەیێن کورت و درێژ. لێ پشتی جەنگێ جیهانیێ یەکێ و هۆشیاربوونا مللەتێ کورد د خەوا نەهشبوونا خۆیا مێژوویی جغز و نێرکا رەسەناتیا وی سەرژنوی شینبووڤە و دەربارەی کێشێن شعرێ ژی گەلەک شاعران هزر ژێکر وەکو پیرەمێرد و شێخ نووری شێخ سالح و گۆران و قەدری جان و عوسمان سەبری، لێ کەسێ وەکو جگەر خوینی ب رێکوپێکی بهەڤ نەئێخست و د ئەڤان چار قالبێن ئاسان و خۆش و سەلیقەداردا کۆم کرنەڤە.

**ژێدەر و پەراوێز:**

١- عەزیز گەردی، کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسیدا، چاپی یەکەم، هەولێر ١٩٩٩ ل٩٥.
٢- دکتۆر مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠١ ل١٨٤.
٣- عەبدولڕەزاق بیمار، کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی، چاپی یەکەم، بەغداد ١٩٩٢ ل١٧.
٤- عەلائەدین سوجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، بەغدا ١٩٦٧ ل١٧١.
٥- بنێرە ژێدەری (١) ل٢٦٨.
٦- بنێرە ژێدەرێ (٢) ل١٩٠ یان ژی ژێدەرێ (٣) ل٧٠.
٧- بنێرە ژێدەری (١)، ل٢٦٩.
٨- جبور عبدالنور، المعجم الادبي، الطبعة الأولى، بيروت ١٩٧٩، ص٢٦٨.
٩- عەلائەدین سوجادی، دەقەکانی ئەدەبی کوردی، لەچاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨، ل٤٨-٤٩.
١٠- احمد بن الملا محمد الزفنگي، العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزري، الجزء الأول، الطبعة الثانية، مطبعة الصباح ١٩٨٧، ص٣٥-٥٥.
١١- بنێرە ژێدەرێ (١)ێ ل١٥٤. هەروەسا ژێدەرێ (١٠)ێ ل٢٤٤-٢٥٠.
١٢- بنێرە ژێدەرێ (٣) کە لە (د. عزەدین مستەفا رەسوول، شیعری کوردی و ژیانی شاعیرانی، ل١١٩) وەرگیراوە.
١٣- بنێرە ژێدەرێ (١٠)ێ، ل٥٩٨-٦٠٧.
١٤- سادق بەهائەدین ئامێدی- نووبهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدی خانی، چاپا یەکێ، بەغدا ١٩٧٩.
١٥- د چاڤپێکەتنەکێدا دگەل بەهەشتی (مەلا تاهایێ مایی) کو دیوانەکا شعرێ دانایە و باپیرێ وی ژی شاعر بوویە و ئەو بخۆ ژی دۆستەکێ نێزیکێ ئەحمەدێ نالبەند بوویە و دیوانا وی ساغکریەڤە. ئەوی هۆسا بۆ من گۆت کو ئەوان پتر لسەر سەلیقا شعرێن شاعرێن مەزنێن بەری خۆ شعر دانانە.
١٦- حسين علي شانوف، شعر الشاعر الكردي المعاصر عبدالله گوران، ترجمة: شكور مصطفى، مطبعة دارالجاحظ- بغداد ١٩٧٥، ص١٧٠.
١٧- د. فەرهاد پیرباڵ، عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری، دهۆک ٢٠٠٢.
١٨- رۆژنامەی ژیان ژمارە (٢٩) سلێمانی ١٩٢٦.
١٩- د. عزەدین مستەفا رەسوول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، هەولێر ١٩٨٩، ل١٧٤.
٢٠- کۆڤارا (هاوار) جلد(١) وشانێن کۆمبەندا کاوا بۆ چاندا کوردی، هەولێر ٢٠٠١، ل٤٦٢.

# دوو زستانەگەشت

**فەرهاد شاکەلی**
**(سوێد)**

## پێشەکییەکی کورت (نە پێویست بوو من بینووسم و نە پێویستیشە تۆ بیخوێنیتەوە)

ئەمە پەرچدانەوەی دوو هاوینەگەشتەکەی مامۆستا گۆران نییە. ئەگەر باسەکە بخەینە چوارچێوەی لۆگیکەوە، زۆر لە یەکیشەوە دوور نین. بە رووالەت هاوین دژی زستانە و سپی دژی رەش. بەلام ئەمە هەموو جارێک راست دەرناچێت. مامۆستا لە هاوینی گەرمی کوردستاندا گەشتی بۆ فێنکستانی هەورامان و قەراخ کردووە، منیش لە سەهۆلستانی سوێد هەلاتووم و خۆم گەیاندووەتە گەرمیانی فرانسا و یۆنان. ئەنجامەکان زۆر لە یەکدی دەچن.

فەلسەفەکەی من زۆر ساکار و ئاسانە. نالێم ژیان بە فشە بگرە، بەلام هێندەیش خۆتی پێوە ماندوو مەکە کە دەرفەتت بۆ ژیان خۆی نەمێنێت. لێکدانەوەی ئەمە دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی بە لای تۆوە کامە توێکلە و کامە کاکل. خەلکی دیکە حەزیان لە زۆر شتی دیکەیە. منیش حەزم لە زۆر شتە، بەلام دوویان (شاز)ی هەموو حەز و ئامانج و ئارەزووەکانمن: سەفەر و کتێب.

هەموو جارێ کە دەگەرێمەوە بۆ کوردستان دایکم سەر دەکاتە سەرم:

ـ باوکەکەم، کورەکەم! تۆ ئەوە بیستوچەند ساڵە لەو ولاتە دەژییت. بۆ هیچت دیارنییە؟ دە تۆیش وەک ئەو عالەمە بۆ خۆت لێرە خانوویەک بکرە. بیدەرە کرێ. ئەگەر رۆژێکیش خوا کردی و گەرایتەوە بۆ خۆت تێدا دانیشە.

ـ دایە گیان، خانووم بۆ چییە؟ هەر کاتێکیش هاتمەوە منیش وەک ئەو عالەمە. [ پێ دەچێت (ئەو عالەمە)ی ئەو و (ئەو عالەمە)ی من یەک شت نەبن].

ـ ئەوەتا کورەکەی (حاجی فلان) هەمووی چوار ساڵە هاتۆتە ئەوێ، ئێستا خانوویەکی کڕیوە یەژی قەسر مەلیکە، خوا پێی رەوا ببینێت.

ـ ئەی ئەو هەیەتی و دەتوانێ بکرێ، من بە چی بیکرم؟

ـ خۆ تۆیش هەتە. بەلام تۆ گشتی ئەدەیتە سەفەر و کتێب. هەر کتێب و هەر کتێب. ئەمە چی بوو، نەبڕایەوە؟ کەی ئیشەلا لە کتێب تێر ئەخۆی؟ نازانم لەم شیعر و کتێبە چیت دەست کەوتووە؟ دە تۆیش بۆ خۆت فێر بە بژییت.

ـ ئاخر دایە گیان، ئەگەر واز لە سەفەر بهێنم و واز لە شیعر و کتێب بهێنم ، ئیتر ژیان چییە؟

بینیت؟ وا دەرنەچوو. وام دەزانی فەلسەفەکەی من ساکار و ئاسانە. دایکم لە فەلسەفەی قووڵ و ئالۆزکاوی (ئەو عالەمە) دەگات، کەچی نایەوێت لە فەلسەفەکەی من بگات.

ئەم دوو زستانەگەشتەی لێرەدا پێشکەشیان دەکەم کورتەیەکی ئەو رۆژنامچەیەن کە لە کاتی سەفەرەکەدا یا دواتر نووسیومن. لەم تێکستەدا هەموو ئەو بەشانەی باسی کەسوکار و خەلکی تایبەتە دەرهاوێژراون و تەنیا ئەوەندەم لێ هێشتوونەوە کە گێرانەوەکە پێویستی پێ بوو. زانیاریی گشتی لەبارەی ئەو ولاتانەوە کە سەرم داون، دەکرێ لە هەر ئەنسیکلۆپیدیایەک یا سایتێکی رەسمیی دەولەتەکان خۆیان پەیدا بکرێن. ئەوەی من لێرەدا مەبەستم بوو پێشکەشی بکەم وێنەیەکی ئارایشتنەکراوی ژیانی مرۆڤێکی کورد، نووسەرێکی کوردە لە ئەورووپا

### گەشتی یەکەم:
### پاریس، ٢٣ - ٣٠ی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣

بۆ دەوروبەری ئەم سەری ساڵە نە خەیالی سەفەرم هەبوو، نە بیریشم لێ کردبووەوە. ئێمە زیاتر هاوینان

دەچین بۆ سەفەری دوورودرێژ. ئەگەر بکرایە، بێگومان، سەفەری مانگی دوانزە ناخۆش نییە. خۆشییەکەی لە دوو رووەوەیە؛ یەکەمیان دوورکەوتنەوەیە لە سەرما و سۆڵەی سوێد، کە ئیتر چلەی زستانە و بەفر دنیا دادەپۆشێت و دار و بەرد دەیبەستێت. سوێدییەکان زۆریان بە لاوە گرنگە کە جەژنی کریسمەس و سەری ساڵیان سپی بێت، واتە بەفر بارییێت. ئەگەر ساڵێک جەژنێکی بێ بەفر بکەن زۆریان پێ ناخۆشە. هۆی دووەمیش ئەوەیە لە وەڕزی و وشکیی شەوی سەری ساڵ رزگار ببیت. ئەم شەوی سەری ساڵە بۆ سوێدییەکان گرنگە و جەژن دەگێرن، ئەگەرچی جەژنگێرانیشیان لە هی کەس ناچێت، چونکە کەمجار وا رێک دەکەوێ کە هەموو ئەندامانی خێزان پێکەوە بن، بەتایبەت ئەو کچ و کورانەیان کە لە تەمەنی هەرزەکاریدان. هەر یەکە لەگەڵ (دەنک) و برادەری خۆیدا شەوەکە دەباتە سەر. بە هەر حاڵ ئێمە وەک کورد و موسڵمان زۆر بایەخ بەم جەژنی سەری ساڵە نادەین. جاران کە تازە هاتبووینە سوێد، ئێمەیش چەند ماڵێک کۆ دەبووینەوە و شێوە جەژنێکمان دەگێڕا. بەڵام ئەوە دە دوانزدە ساڵێکە ئەوەیشمان واز لێ هێناوە. من خۆم هەر زۆریش لە مەراسیمی وەها بێزارم و پێم خۆشە ئەو شەوەی سەری ساڵیش وەک هەر شەوێکی دیکە بێت، بەڵام لە وڵاتێکی وەکو سوێددا ئەمە ناکرێ. جارێ هێشتا یەک مانگی تەواوی بمێنێ بۆ سەری ساڵ، ئیدی بازاڕ و دووکان و شار و کۆگاکان بە هەزار چاو دەڕوانن خەڵک و کڕیار و هانیان دەدەن شت بکڕن و دیاری ئامادە بکەن بۆ دۆست و خۆشەویست و خزم و ئاشناکانیان. ئەوجا شەوی سەری ساڵیش، سەعات دوانزدە کە ساڵ دەگۆڕێ (دیارە بە کاتی سوێد) دەبێتە تەقوهۆڕ و هەراومەزات و شایلۆغانێک کە ناچاریت بچیتە دەرەوە، یا بچیتە بالکۆنێ بۆ تەماشاکردن. هەر ئەو سوێدییانەی کە پێیان وایە بە فڕێدانی بنەجگەرەیەک، یا توێکڵە مۆزێک، تۆ ژینگەی وڵات پیس دەکەیت، ئەو شەوە ملیۆنان کەرەسەی ئاگربازی و فیشەکەشێتە دەتەقێنن و نەک هەر زەوی و زەریا، بەڵکە ئاسمان و هەوای وڵاتەکەیش پیس دەکەن. بەڵام سەرمایەداری ئەمەیان ناو دەنێ خۆشی و جەژن و پێی وایە ئەمە فەرهەنگێکە و دەبێ بپارێزریت و پەرەی پێ بدرێت.

هێشتا حەفتەی یەکەمی مانگی دوانزە بوو، زەریای کچم لە (مالمۆ)وە تەلەفۆنی دەکرد و یەک دوو جار دای بە گوێی من و دایکیدا کە با بۆ سەری ساڵ سەفەرێ رێک بخەین. زەریایش و هەموو ئەفرادی ماڵیش دەزانن من لە هەموو کەسێ زیاتر حەزم لە گەشتوگوزار و سەردانی وڵاتانە، ئەگەر گیرفان لێ بگەڕێ. هەموو جارێک کە زەریا باسەکەی دەهێنایە پێشەوە، پێم دەگوت بەڵێنی هیچ نادەم، بەڵام هەوڵ دەدەم، بەتایبەتی ئەگەر سەفەرێکی هەرزانمان چنگ بکەوێ، ئەوە چاکە. من دەمزانی زەریا زیاتر حەزی لە سەفەری وڵاتی گەرم و سەر ئاوە، بۆ مەلەکردن. رەنگە لەوەیش زیاتر حەزی لە سەفەری سپانیا بێت، چونکە ساڵی پاری لەوێ بردە سەر بۆ خوێندن و زمانەکە دەزانێ. من زۆر گوێم بەوە نەدا، بەڵام مەسەلەی سەفەریشم زۆر بە جددی وەرنەگرت. هەر وا جاروبارێ تەماشایەکی رۆژنامەم دەکرد، بەڵکە شتێکی باش و هەرزانم دەست بکەوێ.

رۆژێکیان ئاگادارییەکی رایانئەیەر (Ryanair)م بەرچاو کەوت. ئەم شەریکەتە بەوە بەناوبانگن کە سەفەرەکانیان زۆر هەرزانە، بەڵام هەندێ وردە زەحمەت و ناخۆشییان هەیە. بۆ نموونە فڕگەکانیان زۆر لە شارەکانەوە دوورن، دەبێ هەمیشە بە قەتار و بە پاس بۆی بچیت، یا ئەوەی کاتەکانیان شەوی درەنگ یا بەیانیی زووە. بێجگە لەوەی کە لە ماوەی سەفەرەکەدا خواردن و خواردنەوە نادەنە رێبوارەکان و دەبێ خۆت خواردن بکڕی. ئەمانە. راستت دەوێ، هیچیان زەحمەت و سەختیی راستەقینە نین. هۆیەکی دیکەی ئەوەی سەفەرەکانیان هەرزانن ئەوەیە، ئەم شەریکەیە کارمەند و بارەگا و هەیتوهووتی نییە. تەنانەت بلیتەکەیش هەر لە رێگەی ئینتەرنێتەوە دەکڕیت و پارەکەی دەدەیت و لە فڕگە وەریدەگریت. بەمەیش خەرجی و مەسرەفێکی زۆریان لە کۆڵ بۆتەوە. لەوەیش سەیرتر دەڵێن، فڕۆکەوانەکانیان ئەو خوێندکارانەن کە خەریکی فێربوونی فڕۆکەوانین و هێشتا خوێندنیان تەواو نەکردووە. بە هەرزانتر لای ئەمان کار دەکەن. بە هەر حاڵ تا ئێستا نەمبیستووە فڕۆکەیەکی ئەمان کەوتبێتە خوارەوە.

بە کورتییەکەی شەوێ بۆی دانیشتین و بە هۆی ئینتەرنێتەوە بلیتەکانمان داوا کرد و زۆریش هەرزان بوو؛ بۆ چوون و هاتنەوەی هەر پێنجمان، وا بزانم هەمووی کردی سێهەزار، سێهەزار و شتێ کرۆن. هەرزان ئەمما هەرزان، تۆڵەکەی بەهاری پێ ناگات.

رۆژی ٢٣ی مانگ لە فڕگەی سکاڤستاوە سوار بووین بۆ فڕۆکەخانەیەک کە نزیکەی سەعاتونیوێک لە خوار پاریسەوەیە. فڕۆکەکە درەنگ دەرچوو. هێشتا نەگەیشتبووینە سەر فرانسا، فڕۆکەوانەکە پێی راگەیاندین کە فڕۆکەکەمان گرفتێکی هەیە و بەداخەوە ناتوانین بچین بۆ پاریس و دەبێ پێشتر لە لەندەن بنیشینەوە. ئەگەر کرا فڕۆکەکە چاک بکرێتەوە و بەردەوام بین، دەنا فڕۆکە دەگۆڕین. بەو ئێوارەیە فڕۆکە خۆی و ئێمەیشی گەیاندە لەندەن و لە فڕگەی ستانستێت

نیشتــەوە. کـاریان ڕاست بێت، هەر زوو فـڕۆکـەیەکی دیکەیان بۆ ئامادە کردین و دیسان کەوتینەوە ئاسمان.

ئەگـەرچی بەرنامـەیەکی زۆر ڕێکوپێکمـان دانەنابوو، بەڵام سێ چوار ڕۆژێ لەسـەر یەکە هەر دەچووینە دەرێ و چەند شـوێنێکی توریستـی و فـەرهەنگیـمـان بە سـەر کردەوە. من و زەریا پێشتر قولەی ئایفلمان بینیبوو. وا بزانم خۆم یەکەم جار هاوینی ١٩٧٨ بوو چوومە پاریس و چاوم بە ئایفل و مـوزەی لۆڤـر کـەوت. چەند جـاری دیکەیش چووبوومە پاریس. وا بزانم هاوینی ١٩٩٢یش بوو لەگـەڵ زەریا سـەری پاریسـمان دا. ئەو جارەیش، لە بیرمە، بە هۆی ئەوەوە زۆر جێگە گەڕاین: قولەی ئایفل، موزەی لۆڤر، یاریگەی دیزنی لاند و ناوەندی فەرهەنگیی پۆمپیدۆ. هەر ئەو جارە لە پاریسەوە بە قەتار چووین بۆ برۆکسێل. ئەو ساڵە لە پێشبڕکێیەکی ئەدەبیدا شیعرێکم خەڵاتی بەر کـەوتبـوو. بەو بۆنەیەوە ئاهەنگێکـیان ساز دابوو. چووم بۆ ئامادەبوونی ئەو ئاهەنگە، ئەم جارەیش سـەری قـولەی ئایفلـمـان دا، چونکە (زریان) و (یار) نەیانبینیبوو.

لە بیرم نییە لەگەڵ (زینەت) بینیبوومان یا نە؟ دەزانم مـــانگی دووی ســـاڵی ١٩٨٦ چووبووینە لەندەن، لەوێیشەوە بۆ ماوەی سێ چوار ڕۆژێش سەری پاریسمان دابوو، بەڵام کوێ گەڕاین و کوێ نەگەڕاین، ئێستا چاکم لە بیـر نەمـاوە. ئەوەندە دەزانم سـەرێکی مـاڵی خـانمی (جۆیس بلۆ)مان دا. زەریا ئەو کاتە نزیکەی سێ ساڵان بوو. لە ماڵی خانمی بلۆ کەوتبووە ناو پێڵاوەکان لە پێی دەکـردن و تاقی دەکـردنەوە. جـۆیس زۆر بە پەرۆشـەوە باسی دۆکـتۆر ئەوڕەحمانی قاسملووی دەکرد. من تا ئەو کـاتە دۆکـتـۆر قـاسـملووم هەر لە دوورەوە دەناسی، ئەگـەرچی لە یەک دوو سەمـینـاریدا ئامـادە بووبووم. وا بزانم هەر ئەو سـاڵە بوو، یا سـاڵێ دواتر چاومـان بە یەکـدی کـەوت و مـاوەیەکی باش پێکەوە دانیشـتین. جۆیس وتی کـتێبێکی ڕووسیم پێشانی قاسملو داوە لەسـەر کـورد نووسـرابوو، زۆر پەلەی بوو بزانێت لەبارەی خۆیەوە چی تێدا وتراوە. هەر بە قسـەکـانیدا وام هەست کـرد جـۆیس قـاسـملووی زۆر خـۆش دەوێت. من لەگـەڵ جـۆیسـدا بە ئینگلیـزی قسـەم دەکـرد. ئەو ئەگـەرچی کـوردناسـیـشـە، بەڵام هێندە کـوردی نازانێت کـە دەمەتەقێـیـەکی باشی پێ بکات. لە باسی قـاسـملوودا وشـەیەکی بە کـار هێنا، وای پێشـان دەدا کـە نەک هەر وەک هاوڕێـیـەک خـۆشی دەوێت، بەڵکە ئەولاوەتریش. هەر لەو سـەردانەدا چەند شـەوێک مـیـوانی مـاڵی کـاک ئیسمـاعیل (ئیرەج خانی کەشکوولی قەشقایی) بووین. ئیرەج خان یەکێکە (یەکێک بوو) لە خانە گـەورەکـانی هۆزی قـەشقـایی لە ئێـران. یەکێکیش بوو لە ڕێبـەرانی

کۆمیتـەی شـۆڕشگێڕی حیزبی توودەی ئێران لە دەرەوەی وڵات. ئەمانە لە حیزبی توودەکەی سەر بە سۆڤیەت جیا بووبوونەوە و مـاویست بوون. ئیـرەج خـان لە ناوەڕاسـتی شەستەکاندا سەری کوردستـانی عیـراقی دابوو، هەر لەبەر ئەوەیش بوو لەناو مـاویسـتـە کـوردەکـاندا بە کـاک ئیسمـاعیل دەناسرا. دیارە کوردییەکی باشیشی دەزانی. من کاک ئیسمـاعیلم لە کۆتایی حەفتاکاندا لە شام و بەیرووت ناسی. لە ئەڵمـانیـایش، لە شـاری هامـبـورگ، دوو سێ جار چاومـان بە یەک کەوت. هەر ئەو دەمـەیش بوو کـە لە سـیـاسـەت دوور کـەوتمەوە و ئیـدی چاوم پێ نەکـــەوتـەوە. من چووم بـۆ ســوێد و ئەویش دوای سـەرکـەوتنی شـۆڕشی ئیـسـلامی گـەڕایەوە بـۆ ئێـران و زۆریش بە دڵگەرمی پشتگیریـیان دەکرد. بەڵام هەر زوو ئەوانیش کەوتنە بەر شاڵاوی لێدانی چەپەکـان و جارێکی دیکەیش لە ئەورووپاوە سـەری دەرهێنابوو. ئەم جـارە لە پاریس دەژیا و پەنابەری سیاسی بوو. کاک ئیسمـاعیل لە سـەردەمی چالاکی سـیـاسـیـدا چاوی بە سـەرۆک ماوزەدۆنگ (ی چین) و ئەنوەر خۆجەی (ی ئالبانیا)یش کـەوتبـوو. ئەو سـەردانەی من دوای حـەوت سـاڵ هەر وەفایەک بوو بۆ ئەو دۆستایەتییە کۆنەمان.

بە هەر حـاڵ ئەم جـارە، یەکـەم ڕۆژ چووینە تەمـاشـای قولەی ئایفل. لە بەختی ناباشی ئێمەدا ڕۆژەکـە هەور و تەم بوو. لەو بەرزاییـەوە تەمـاشـای شـاری پاریسـمـان دەکرد، بە ئاسـتـەم شـتـمـان دەبینی. ڕۆژانی دیکە سـەری ناوەندی فەرهەنگیی پۆمپیدۆ، کڵێسا سپییەکەی سەر گردەکە (ناویم لە بیر نییە) و ئەنسـتـیـتـوتی جیـهانی عەرەبمان دا.

ڕۆژێک چووین بۆ سـەردانی کـتـێـبـفـرۆشـیـیـە عـەرەبییـەکـان. لە کـتـێـبـفرۆشی، وا بزانم، ئیبن سینا ڕۆمانە تازەکەی سەلیم بەرەکات (دلشاد، فراسخ الخلود المهـجـورة)م کـڕی، هەروەها دیوانی تازەی مـەحـمـوود دەرویش (لا تعـتـذر عما فعلت). لەوێدا شیـعـرێکی بۆ کورد نووسیبوو، پێشکەشی کردبوو بە سەلیم بەرەکات. خاوەنی کتێبفرشییەکە دیاربوو سەلیمی دەناسی. وتی هیچ دەیبینی؟ گوتم جاروبار. هەندێ باسی کوردمان کرد. وا بزانم هەر لەوێ بوو کـتـێـبـێکی چاکم لەسـەر تیـۆریی (وحدة الوجود)ی ئیبن عـەرەبی دەست کـەوت. کـتـێـبی دیکـەیش لەسـەر تەسـەوف زۆر بوون، بەڵام بە ڕاسـتی گـران بوون، یا من وام هەست دەکـرد زۆر گـرانن. سـەری دوو کـتـێبفرۆشی دیکەیشمان دا. دیارە کـتـێبی چاک و خـۆش یەکـجـار زۆر بوون، بەڵام من بە زۆری بۆ کـتـێـبی تەسـەوف دەگـەڕام. لەوەیش بتـرازێ ئەو کـاتە زۆرەمـان نەبوو بە کاوەخۆ بکەومە ناو کتێبەکان و یەک بە یەکیان تەماشا بکەم.

له دوا کتێبفرۆشی، خاوەنەکەی گوتی لێ بوو ئێمە لەناو خۆماندا بە زمانێک کە ئەو تێی ناگات، قسە دەکەین و لەگەڵ ئەویش بە عەرەبی، یەکسەر وتی برایان ئێوە خەڵکی کوردستانی عێراقن؟ وتمان چاکی بۆ چوویت، هەوین. هەندێ باسی کورد و عێراقمان کرد. کابرا لوبنانی بوو، کوڵێ قسەی جوانی کرد. وتی من پێم وایە کورد بەو هەموو ملیۆنەوە دەبێ دەوڵەتی خۆیان هەبێت. ئەوجا عەرەب ئەو هەموو نەوتەی هەیە، با نەوتی کەرکووک بۆ کورد بێت. پێشنیازی ئەوەم بۆ کرد کتێبی (الانسان الکامل)ی عەبدولکەریمی جیلی چاپ بکاتەوە، وتی باشە، بۆچی نا؟ ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆن و فاکسی دامێ، بەو هیوایەی زیاتر قسەی لەسەر بکەین. هەروەها وتم دوو سێ کتێبم کراون بە عەرەبی و حەز دەکەم چاپیان بکەم. وتی دەتوانین لەسەر ئەوانیش قسە بکەین.

له نهۆمێکی ئەنستیتوتی جیهانی عەرەبدا بەشێکی کتێبفرۆشی لێیە و کتێبی چاکیان هەیە. لەوێ کتێبی نووسەرێکی جاپانیم کڕی: نۆبۆئاکی نۆتۆهارا: عەرەب، لە ڕوانگەیەکی جاپانییەوە (العرب، وجهه نظر یابانیه). ئەم کتێبەم پێشتر دەناسی چونکە ڕانانم لەسەری خوێندبووەوە، زۆر بەرزی نرخاندبوو. بێجگە لەوەیش بە لامەوە خۆش بوو کە زانیم نووسەرە جاپانییەکە هەر خۆی کتێبەکەی بە زمانی عەرەبی نووسیبوو، نەک ئەوەی بڵێی تەرجەمەی عەرەبی کرابێت. هێشتا لە پاریس بووم، دەستم کرد بە خوێندنەوەی. هەر زوو تێگەیشتم کە بە ڕاستی کتێبێکی چاکە. نۆتۆهارا خۆی دیارە عەرەبناسێکی ناسراو و گەورەیە. کە کتێبەکەی دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت کابرا بە ڕاستی عەرەبی خۆش دەوێ و خزمەتێکی زۆری کردوون. دەیان ڕۆمان و شیعری کردۆتە جاپانی و دەیان لێکۆڵینەوەی لەسەر فەرهەنگ و ئەدەب و مێژووی عەرەب نووسیوە. کەچی لەم کتێبەیدا ڕەخنەی زۆر توند، بەڵام ڕەوا و ڕاست، لە فەرهەنگ و سیاسەتی عەرەب دەگرێت. تۆ کە دەیخوێنیتەوە هەست دەکەیت ئەمە ڕەخنەی دۆستێکە کە دەیەوێ دەستت بگرێ و لەو بارە خراپەی تێی کەوتووی دەرت بهێنێ، نەک ڕەخنەی کەسێک لە دڵێکی پیس و پڕ لە ڕق و کینەوە تیری ژاراویت تێ بگرێ، وەک زۆربەی ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپایی کە باسی ڕۆژهەڵات و ئیسلام و کورد و عەرەب و ئێرانی دەکەن. ئەم عەرەبناسە، بەڵام عەرەبدۆستیشە؛ ئیسلامناسە، بەڵام دژی ئیسلام نییە. ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپایی زانستەکەیان، ئیسلامناسی، کوردناسی، عەرەبناسی، ئێرانناسی، بۆ دژایەتیکردنی ئەوانە، واتە ڕێک بۆ دوژمنایەتی ئیسلام و کورد و عەرەب و ئێرانی، بە کار دەبەن، بۆ پیلانگێڕان، بۆ ناوزڕاندن و ڕەشکردن و تەفروتووناکردن و داڕزاندن. نۆتۆهارا لە کاتێکدا ڕەخنەی زۆر توندیان لێ دەگرێ، بەڵام هەرگیز بە نیازی بریندارکردن، یا بە ئامانجی بە نزم پێشاندانی عەرەب و فەرهەنگ و دینەکەیان نانووسێ.

ئەم کتێبە بۆ من، سەرباری ئەو لایەنانەی باسم کردن، دوو لایەنی دیکەیشی هەن کە سەرنجڕاکێش و گرنگن: یەکەم، نووسەر نەک هەر عەرەبناسێکی ئەکادیمیک و تیۆریزانە، بەڵکە زۆر شارەزا و ئاشنای وڵاتانی عەرەبی و فەرهەنگ و سیاسەتیانە. زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان گەڕاوە و بە مانگان و بە ساڵان تێیاندا ژیاوە و خەڵکێکی یەکجار زۆر و جیاواز دەناسێ. ئەو نەک تەنیا ئەکادیمیسیانە عەرەبەکان، بەڵکە بەشێکی زۆری نووسەران و شاعیران و نیگارکێشانیش دەناسێت، بەڵام، لەوەیش گرنگتر، تەنانەت کۆمەڵێ سەرۆکخێڵ و کۆچەر و بەدووی بیابانەکانیش دەناسێت و لەناویاندا ژیاوە. کەواتە کابرا لە خۆیەوە قسە ناکات و ڕەمڵ لێ نادات، بەڵکە خاوەنی ئەزموونێکی قووڵ و فراوان و پانوپۆڕە. لەوەیش بترازێ، ئەو نەک هەر شارەزای زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی عەرەبییە، بەڵکە زمانە عەرەبییەکەی تا ئەو ڕادەیە ڕەوانە کە کتێبێکی پێ دەنووسێت و کتێبەکەیش بۆ عەرەب خۆیان دەنووسێت. ڕاستە لە هەندێ ڕستە و وشە و دەربڕیندا تۆ هەست دەکەیت لەنگییەک هەیە، بەڵام ئەمە لە نرخی کارەکەی داناشکێنێ. عەرەبەکان خۆیشیان کە دەنووسن دەیان و سەدان هەڵەی ڕێنووس و ڕێزمان لە نووسینەکانیاندا بە دی دەکەیت. لەمەیشدا نۆتۆهارا زۆر لە ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپایی جیاوازە. من خۆم بەشێکی زۆری کوردناسانی ڕۆژاوا دەناسم، بەڵام کەسێکیان تێدا نییە بتوانێ بە ڕێکوپێکی بە کوردی قسە بکات، چ جای بگاتە ئەوەی بە کوردی بنووسێت.

لایەنی گرنگی دووەمی کتێبەکە، بۆ من، ئەوەیە کە ئەو خەوش و ناتەواوی و لەنگی و کەچی و کوورییەی کە نووسەر لە ژیان و فەرهەنگ و سیاسەتی عەرەبدا دەیانبینێ، هەر هەموویان لای ئێمەی کورد، بە زیادیشەوە هەن. واتە ئەگەر عەرەب جارێک دواکەوتوو بن، ئەوا ئێمە دوو جار و پتریش دواکەوتووین. من کە ڕەخنەکانی نۆتۆهارام دەخوێندەوە، ڕێک وام دەزانی باسی کۆمەڵگەی کورد و فەرهەنگی کورد دەکات. لەوەیە ئێمە خۆمان لەبەر هەستی نیشتمانپەروەری، یا نەتەوەپەرستی، هەرچییەکی ناو دەنێی، عەیب و خەوش و لایەنە ناشیرین و دزێوەکانی خۆمان نەبینین، یا ڕەنگە ئەگەر بشیانبینین، ئەمانەوێ ڕاستگۆیانە پێیان لێ

بنێین. بریا کەسێکی دیکە، کەسێکی وەک نۆتۆهارا، بهاتایە و رێک و رەوان کلی بەر چاوەکانمانی ئاشکرا بکردایە. بەداخەوە بێگانەکانی ئێمە یا ناسیۆنالیست و شۆڤێنیست و تەنانەت رەگەزپەرستانی دەوروپشتمانن، کە هەڵوێستێکی زۆر دوژمنانە و نەیارانەیان هەیە، یا کوردناسەکانی رۆژاوان کە هەموو زانست و شارەزایی و ئاشنایەتییەکەیان هۆیەکە بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتی ئیمپەریالیستان و پارچەپارچەکردنی کورد. لە بەختی رەشی ئێمەدا کوردناسێکی جاپانی یا برازیلیمان بۆ پەیدا نەبوو، ببێتە دۆستمان و ئەگەریش رەخنەی گرت لێمان بۆ هارین و بۆ وردوخاشکردنمان نەبێت، بەڵکە بۆ دەستگرتن و فێرکردنمان، بۆ ئەوە بێت بە راستی خۆمان بناسین.

گەڕانەوەکەمان ئێوارەیەکی درەنگی ٣٠ی مانگ بوو. هەتا گەیشتینە وەستگەی پاسەکان کە بۆ فڕۆکەخانەکە دەچوون شەڵاڵی عارەق بووین. کاریان راست بێت پاسێکیان لەبەر ئێمە هێڵابووەوە و چاوەڕێی دەکردین. فڕۆکەکەمان درەنگێ دەرچوو. دوای نیوەشەو گەیشتینە سکاڤستای سوێد. نزیکەی سەعات دووی دوای نیوەشەو گەیشتینەوە ماڵ. سبەینێکەی دوایین رۆژی ساڵی ٢٠٠٣ بوو. من هەر تەنیا دوو رۆژم بە دەستەوە بوو، چونکە دووەم رۆژی مانگ و ساڵی تازە دەبوو بچم بۆ یۆنان.

## گەشتی دووەم:

### ئەسینا (ئەتێن)، ٢-١-٢٠٠٤ تا ٣٠-١-٢٠٠٤

ئەمە سێیەمین جارم بوو دەچووم بۆ یۆنان. بێجگە لەو دوو جارەی پێشوو، زۆر جاریش کە سەفەری وڵاتی دیکەم کردووە، یا بەسەر یۆناندا فڕیوم، یا لە فڕگەی ئەسینا فڕۆکە نیشتۆتەوە بۆ یەک دوو سەعاتێ.

یەکەم جار هاوینی ١٩٩٣ بوو، بە هۆی یەکێتی نووسەرانی سوێدەوە ستیپێندیۆم (بورس)ێکی یەکمانگیم پێ درابوو، بۆ ئەوەی لە ماڵی سوێدی لە شاری کاڤاللا Kavalla بیبەمە سەر. ئەو جارە لە سوێدەوە بە فڕۆکە چوومە شاری تێسالۆنیکی، لەوێشەوە بە پاس گەیشتمە کاڤاللا. شارێکی بچکۆلە و جوان و دڵگیر. لەو مانگەی وەرمگرتبوو، توانیم بیست و پێنج رۆژ لەوێ بمێنمەوە. ئەو ماوەیەی لەوێ بووم خەریکی نووسینی لێکۆڵینەوەیەک بووم لەسەر قەسیدەی کوردی، کە هەر یەکسەر دوای گەڕانەوەم لە کاڤاللا، چووم بۆ لەندەن بۆ بەشداری لە کۆنفرەنسی قەسیدەدا، کە ناوەندی لێکۆڵینەوەی رۆژهەڵاتی و ئەفریقایی رێکی خستبوو، لێکۆڵینەوەکەم لەو کۆنفرەنسەدا پێشکەش کرد و دواتر هەموو لێکۆڵینەوەکان لە کتێبێکی دووبەرگی گەورەدا چاپ کران. لە کاڤاللا، ئەگەرچی کاتەکەی یەکجار خۆش بوو بۆ گەڕان و رابواردن و سەر کەناری ئاو چوون، بەڵام بەراستی من هیچ تامێکم لێ نەدیت. لە لایێکەوە خەریکی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و ئەکادیمی بووم، کە دەبوو زۆرتر لە ژوورەوە دانیشم و کار بکەم. بەڵام لە لایێکی دیکەیشەوە هەموو بیر و مێشک و خەیاڵم لای برا و خوشکێکم بوو کە لە تورکیا بوون و وایان نیاز بوو لەوێوە دەرچن بۆ سوێد. کارەکەیان کەوتبووە دەست قاچاخچی و بێنەو بەرەیەکی زۆریان بە سەر هاتبوو. ئەنجامەکەیش، بەداخەوە، ئەوە بوو کە دوای یەک ساڵ چاوەڕوانی و دەستی دەستی پێ کردن، ناردنیانەوە بۆ کوردستان. وا دیارە ئەمەیش هەر دەکەوێتە بەر تیۆریی (لە پیاوان دەقەومێ).

ئەو ماوەیەی لە کاڤاللا بووم شێوەژیانێکی زۆر رۆتینی و تا رادەیەکیش وشک و برینگم دەبردە سەر. بەیانیان درەنگ لە خەو هەڵدەستام. دوای بەرچایی خواردن دەچوومە ژووری کارکردنەکە، چونکە کۆمپیوتەری لێ بوو، دەستم دەکردە نووسین. هەندێ جار دەچوومە کتێبخانەکە و گوێم لە مۆسیقا دەگرت. هەندێ کاسێتی کوردیم لەگەڵ خۆم بردبوو، بەڵام بە زۆری گوێم لە کاسێتێکی تازەی کاک ناسری رەزازی دەگرت و لە کاسێتەکەیشدا گوێم لە گۆرانی (نیاز) دەگرت، کە بەراستی شاکارێکە بۆ خۆی. ئێستایش دوای ئەو هەموو ساڵە هەر حەز دەکەم گوێی لێ بگرم. بەشێکی جوانی گۆرانییەکە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شیعرە جوانەی مامۆستا گۆران، کە رەزازی بە ئاوازێکی جوان خەمڵاندوویەتی. راستییەکەی من چیرۆکێکی دیکەیشم لەگەڵ ئەم گۆرانییەدا هەیە. وا بزانم پاییزی ١٩٩١ بوو، یا بەهاری ١٩٩٢، لە ئینگلستانەوە بە سەردان هاتبوومەوە بۆ سوێد. ئەو ساڵە لە لەندەن دەژیام و لە زانستگەی لەندەن خەریکی کاری لێکۆڵینەوە بووم. ئێوارانێک کاک ناسر تەلەفۆنی کرد وتی ئەگەر لە ماڵیت دێم سەرێکت لێ دەدەم. کە هات، بە ماشێنەکەی ئەو چووین بۆ پیاسە بۆ دەوروبەری شارۆچکەکانی ژووری ستۆکهۆڵم. جا لە رێگا کاسێتێکی دانابوو گوێمان لێ دەگرت. ئەوسدەم هێشتا (سی دی) وەک ئێستا تەشەنەی نەکردبوو. لەپڕ گوێم لە گۆرانی (نیاز) بوو. هەر بە جارێک ئەبڵەق بووم. وتی ئەمە ئاوازێکی کۆنی شاری سنەیە و ئێستا خەریکم دەیکەمە گۆرانی. دوای ماوەیەک ئەم گۆرانییەی لێ دەرچوو کە ئێستا هەیە.

هەندێ رۆژ، بەتایبەت ئێواران، دەچووم بۆ ناو شار، بەڵام شار زۆر بچووک بوو. هەندێ شوورا و کۆشکی کۆنی لێ بوو. یەک دوو جارێ چوومە تەماشای. شتێکی سەرنجڕاکێش ئەو جۆگە، یا لوولە، ئاوە دەستکردە بوو کە

بەسەر پردێکدا لە لایەکی شارەکەوە بردبوویان بۆ لایەکی دیکەی شارەکە. ئێوارەیەکیش لە ناوشار گرۆیەکی هونەری کۆمەڵێ گۆرانی و مۆسیقا و هەڵپەرکێی جوانی میللییان پێشکەش کرد. خەڵکێکی زۆریان لێ کۆ بووبوودوە، منیش تەماشام کردن.

دوو سێ ڕۆژێک پێش گەڕانەوەم، خانمێکی سوێدی هات کە ناسناوەکەی وەک ناسناوی مامۆستاکەم بوو. ئەم خانمەیش نووسەر بوو، دوای تەواوبوونی مانگەکەی من، ئەو دەهاتە جێی من وەک نووسەری وەرگری بورس. بەڵام دیار بوو ویستبووی ماوەیەکی زیاتر لە یۆنان بێت، چەند ڕۆژێک زووتر هاتبوو. دیارە ئەم ڕۆژە زیادانە لەسەر حیسابی خۆی لەوێ دەژیا. کە یەکمان ناسی زانیم کە ئەمە ژنی پێشووی مامۆستایە. دوو سێ جار لەگەڵ ئەم خانمە چووینە دەرێ. جارێک بۆ دورگەیەک کە بە بەلەم سەعاتێ کەمتر لە کاڤالاوە دوور بوو. ڕۆژێکیش چووین بۆ هەندێ شار و لادێی سەرووتر. ئەو ناوچانە خەڵکەکەی تێکەڵ بوون، هەم مەسیحی و هەم موسڵمان. لە هەندێ گونددا زۆربەی خەڵکەکە موسڵمان بوون و لە لایەن خەڵکی ناوچەکەوە بە تورکیش دەزانران. لە دێیەک ویستم خۆم هەڵێنم و جوانی و چاکی مزگەوت پیشانی ئەو خانمە بدەم، بەڵام بەداخەوە شەرمەزار بووم، چونکە دەرگای مزگەوت داخرابوو. کەچی کاتێ لەوێوە چووین بۆ کڵێسایەک، نەک هەر دانەخرابوو، زۆریش جوان و فێنک و خۆش بوو، ئاوی ساردیشی لێ بوو بۆ خواردنەوە.

کە لە ماڵەوە دەبووم بە زۆری خەریکی خوێندنەوە دەبووم، بەتایبەتی شەوان هەتا درەنگێ دادەنیشتم. هەر ئەو ماوەیەی من لەوێ بووم کۆمەڵێ گەنجی نۆروێژی هاتبوون، خەریکی لێکۆڵینەوەی ئارکیۆلۆگی بوون. ئەمانە ڕۆژانە دەچوونە دەرەوە و کە ئێوارە دەهاتنەوە کۆمەڵێ بەرد و چەویان لەگەڵ خۆیان دەهێنایەوە و بە هەموویان تێی دەورووکان. ئەوجا بەردەکانیان دەکردنە کۆمەڵی ورد ورد و دەیانخستنە ناو کیسە و پریاسکەی نایلۆنەوە و هەندێ حەرف و ژمارەیان لەسەر دەنووسین. هەندێ ئێوارە کە دەهاتنەوە هێندە برسی و ماندوو دەبوون کە تاقەتی ئەوەیان نەبوو خواردنێ بۆ خۆیان لێ بنێن. یەک دوو جارێ من لە چێشتەکانی خۆم بەشم دان. هەروەها کچ و کوڕێکی نیگارکێشی لێ بوو، سوێدی بوون. ئەمانە لەو ماڵە یەکتریان ناسیبوو، بەڵام هەر زوو دڵدارییەکی سوێدییانەیان دامەزراند کە وەک سیغەی شیعەکان دەهاتە پێش چاوم. ئەمجا پیرەمێردێکیش هات، نووسەر و ڕۆژنامەگەر بوو؛ سەرنووسەری گۆڤاری کۆمەڵی بڵاوکردنەوەی زانیاریی سێکسی بوو. سەرپەرشتکاری (ماڵی سوێدی) کابرایەک بوو، سالانێک لە یۆنان ژیابوو. وا پێ نەدەچوو کە هیچ پێوەندییەکی بە فەرهەنگ و خوێنەوارییەوە هەبێ. جاروبار لەگەڵ ئەم چوار پێنجە ئێواران دادەنیشتین و هەندێ قسە و باسمان دادەمەزراند، بەڵام ئەمە هەمووی وا بزانم دوو یا سێ جارێ ڕووی دا.

سەفەری دووەمی یۆنانم وا بزانم هاوینی ١٩٩٧ بوو. ئەو جارە هەموومان پێکەوە بۆ هاوینەگەشتێ چووین بۆ دورگەی (کریت). ئێستا لە بیرم نییە چۆن بوو ئەوێمان هەڵبژارد، بەڵام دەزانم منداڵەکان پێیان خۆش بوو. ئەو سەفەرەمان بۆ دوو حەوتوو بوو. هەر لە سوێدەوە ماڵێکی کەنار زەریامان ڕێک خست کە بیرۆی بلێتفرۆشییەکە خۆیان لەگەڵ بلێتەکەدا دەیاندا بە کرێ. هێشتا سەفەرمان نەکردبوو، کاک خەبات عارف پێی وتم کە ئەوانیش هەر لەو ماوەیەدا. چەند ڕۆژێ زووتر یا درەنگتر، لەوێ دەبن. ئەمەم پێ خۆش بوو، چونکە هەبوونی هەندێ دۆست و ئاشنا خۆش بوو، بۆ خۆیشمان و بۆ منداڵەکانیشمان. ئێمە بەم جۆرە سەفەرانە ڕاهاتووین. بەشێکی زۆری کاتی مرۆڤ لەو کەنار ئاوە بەسەر دەچێت، بە مەلەکردن و خۆدانە هەتاو. کە لەوێیش نابیت، یا دەچیتەوە ماڵ بۆ خواردن لێنان، یا بۆ ناوشار بۆ کڕینی شتومەک و تەماشاکردنی کۆگا و دوکان و خەڵک و ناوجادە.

ئەو دوو حەفتەیەی (کریت)مان هەر بەو شێوەیە بردە سەر. شتێکی گرنگ و سەرنجڕاکێش نەبوو. ئەو خانووەی تێیدا دەژیاین لە شێوەی هۆتێلێکی بچکۆلەدا ڕێک خرابوو. نزیکەی ٨ - ٩ ژوورێکی هەبوو، یەکجار لە ئاوەکەوە نزیک بوو. هەر هەمووی ٤٠-٥٠ مەتر لێیەوە دوور بوو. ڕێگەی نێوان ماڵەکە و زەریا بەشێکی خۆڵ و قوڕ بوو. لەوە بە دوا چەوڕێژ کرابوو. ئێمە دوو ژوورمان هەبوو. یەکێکمان کردبوو بە ژووری کۆبوونەوە و دانیشتن، ئەوی دیکەیش بۆ لێنانی خواردن. بەڵام شەوان لە هەردوو ژوورەکە دەخەوتین؛ منداڵەکان لەولا و ئێمەیش لە ئەمی دیکە. کێشەیەکی ناخۆش ئەوە بوو، لەبەر ئەوەی ژوورەکان بە تەنیشت یەکەوە بوون و هەر یەکەیان دەرگای سەربەخۆی خۆی هەبوو، هەمیشە لەنێوان ئەم دوو ژوورەدا لە هاتوچۆدا بووین. دەرگاکانیش چونکە با هەبوو، زوو زوو پێوە دەدران و ئەو پێوەدرانەیش زۆر بەهێز بوو، وات دەزانی دەرگاکە دەشکێ. لەوەیش خراپتر کە دەرگا پێوە بدرایە، بە کلیل نەبووایە نەدەکرایەوە. لە بەدبەختی ئێمەیش ژنەی خاوەن هۆتێل، هەتا بڵێی توورە و گرژ و مۆن و شەڕانی بوو. لە بچووکترین نارێکی هەڵدەچوو. دەبوو دەنگی دەرگا نەبەت، نابێ منداڵ زۆر فرتەفرت بکەن، بە پێی قوڕاوی نەچنە ژوورەوە و دەیان قانوونی سەیر و سەمەرە کە بۆ توریستێک بیەوێ خۆشی بگوزەرێنێ و هەست بە ئازادی و بەرەڵایی بکات، نەک

هەر ئاسان نەبوو، بەڵکە زۆریش ئاستەم و ناخۆش بوو. ڕۆژێکیان وا بزانم منداڵەکان کلیلیان لە ژوورەوە بە جێ هێلابوو، دەرگاکەیش داخرابوو، نەدەکرایەوە. ئەمە گرفتێکی گەورەی دروست کرد. لە ژوورەکەی تر من لەسەر جێگەکەم پاڵ کەوتبووم، پیرەژن هات ئەو گرفتە چارەسەر بکات. من زۆر توورە بووم. داوای کلیلی کرد، منیش بە جۆرێ بۆم فڕێ دا، ئەگەر بەری بکەوتایە، ڕەنگە ئازاری پێ بگەیاندایە. ئیتر لەو ڕۆژەوە پیرەژن فزەی بڕا و لەگەڵ ئێمە نەیدەوێرا شاتەشات بکات.

ماڵی کاک خەبات لە هۆتێلێک بوون لە سەرووی ناوچەکەی ئێمەوە. جێگەکەیان لە ئاوەکەوە دوور بوو، بەڵام باش بوو لەناو هۆتێلەکەیاندا هەستێلێکی مەلەوانی هەبوو، منداڵەکانیان دەیانتوانی مەلەی تێدا بکەن. ئەوان یەک دوو جارێ هاتن بۆ لای ئێمە و ئێمەیش پێم وایە جارێ، دوو جار سەرمان لێ دان. ڕۆژێکیان پێکەوە چووین بۆ شار (لەبیرم نەماوە، نازانم خانیا بوو یا شتێکی دیکە) بۆ کڕینی شت. من ٧-٨ کیلۆ حەڵوای ڕاشیم کڕی. کە لە دوکانەکە دەهاتمە دەرێ، کاک خەبات بە کامێرای ڤیدیۆ وێنەی گرتووم بە کیسە حەڵواوە.

ڕۆژانە کە دەچووینە قەراغ ئاوەکە، دەیان دەسگێڕ و وردەفرۆش و خەڵکی دیکە دەهاتن و دەچوون. یەکێ لەو شتانەی سەرنجی ئێمە (بەتایبەت منداڵان)ی ڕاکێشابوو یارییەک بوو لەناو ئاوەکەدا دەکرا. ڕاستییەکەی یاری نەبوو، بەڵکە جۆرێ سەرچڵی و وەرزشی سەخت بوو. لە تەختە بنکەیەکیان دروست کردبوو چوار پێنج مەترێ بەرز، یەک یا دوو کەس دەچوونە سەری و لەوێ دەچوونە ناو شتێکەوە لە دەرپێ دەچوو، واتە قاچت تێوە دەکرد و سەرەوەی بە کۆمەڵێ پەتی سەخت و بتەو بەسترابوو بە چادرێکی گەورەوە کە لە شێوەی کۆلارەیەکی گەورە دروست کرابوو. لە خواریشەوە، لەناو ئاوەکەوە کابرایەک بە بەلەمێکەوە ڕاوەستابوو کە کۆلارە گەورەکەی پێوە بەسترابوو. کە بەلەمەکە دەکەوتە گەڕ و زۆر خێرا دەچوو، کۆلارەکە دەچوو بە ئاسماندا و ئەو یەک یا دوو کەسە وەک ئەوەی لەو ئاسمانە لەسەر کورسییەک دانیشتبن، وا بوو. دوای دە دەقیقە سووڕانەوە بە ئاسماندا بەسەر ناوچەکەدا، کابرا بەلەمەکەی خاو دەکردەوە و لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا ڕایدەگرت و کۆلارەکەیش، کە ئیدی بای بەهێز لە ژێرەوە هەڵینەدەگرت، لەناو ئاوەکەدا دەنیشتەوە. ڕۆژێکیان من و زریان هەر بۆ تەماشا چووینە سەر بنکەکە. نازانم چۆن بوو لەوێ هات بە سەرماندا بڕیارمان دا سوار بین. من بەڕاستی زۆر دەترسام بەڵام لەبەر زریان حەزم نەدەکرد بڵێم با واز لەم یارییە بێنین. هەر جۆرێ بوو، سوار بووین و چووین بە ئاسماندا. کە لەو ئاسمانە تەماشای ئەملا و ئەولای خۆمانم دەکرد هەر چۆڵایی و هەر بۆشایی بوو، ئێمەیش بە دوو سێ پەت بەسترابووین بە کۆلارەکەوە، خواریشمان زەریایەکی سەوزی مەیلەو ڕەشی قووڵ بوو، کوڕم دەویست ترسی نەچێتە دڵەوە. منێکی گەرمیانی پەروەردەی ئەو دەشتی شاکەلە، ئێستا بچیت بە ئاسماندا و خواریشت زەریای ناوەڕاست (مێدیتێرانە) بێت، دە وەرە زارەترەک مەبە. ڕۆح لە جێیەکی سەختدایە و دەرناچێ. لە دابەزینیشدا لەو ناو ئاوە قووڵە، دیسان ترسێکی گەورە بوو، بەڵام هەرچۆنێک بوو ئەو جارە ڕزگارم بوو.

گرفتەکە ئەوە بوو کە دەمزانی ئێستا ئیتر زەریای کچیشم داوای ئەمەم لێ دەکات و دەبێ لەگەڵ ئەویش ئەم سەفەرە پڕ مەترسییە دووبارە بکەمەوە. جاری یەکەم لەبەر ئەوەی نەمدەزانی ترسەکە چۆنە و چی ڕوو دەدات، کەمتر هەستم پێ دەکرد، بەڵام ئێستا کە ئەزموونم هەبوو زیاتر دەترسام. خوای من و تۆ کردی دوو سێ ڕۆژ لەسەر یەکە هەر ڕێک نەکەوت. ئیتر یا بای زۆر بەهێز و قایم بوو، یا کابرای کۆلارەوان نەدەهات. هەر جارێ هۆیەک هەبوو. بەڵام ترسەکەم هەر لە دڵدا بوو کە تووش دەبمەوە. هەر وایش بوو، تووش بوومەوە. ڕۆژێک کابرا پەیدا بووەوە، ڕۆژەکەیشی خۆش بوو، زەریایش لە جاران زیاتر حەزی دەکرد ئەو سەفەرە ئاسمانییە بکەین. ناچار ملم دا و پێکەوە سواری پیرە کۆلارە بووین. بەڵام هەتا چووینە ئاسمان و هەتا گەڕاینەوە لە ترسانا خەریک بوو دڵم بوەستێ.

ئەوە چیرۆکی دوو سەفەری پێشووم. ئەم جارەم دەمویست لەوانەی جارانم جیاواز بێت. لەبەر ئەوە مانگێ، مانگ و نیوێ پێشتر من بڕیارەکەی یەکێتی نووسەرانم پێ گەیشتبوو و دەمزانی دەتوانم سەرتاسەری مانگی یەکەمی ساڵی تازە لە ئەسینا بم، هەوڵم دا نەخشەیەک دابنێم و لەوێ هەندێ کاری باش ئەنجام بدەم و چوونەکەم بەرهەمێکی هەبێت. دەمویست هەندێ لەو نووسینانەم کە لە ڕابوردوودا دەستم بە نووسینیان کردبوو، بەڵام بۆم تەواو نەکرابوون، لە یۆنان سەرلەنوێ دەستیان بۆ ببەمەوە و تەواویان بکەم، یا هەر نەبێ شتێکیان لێ زیاد بکەم و ڕێکیان بخەم. هەروەها وام نیاز بوو چیرۆکێک (کتێبێک) لەبارەی ژیانی نیلسۆن ماندێلاوە بکەم بە کوردی. بێجگە لەوانەیش هەشت نۆ کتێبی باشم لە کتێبخانەی نوبێل وەرگرتبوو تا لەوێ بیانخوێنمەوە. بەکورتی وام دانابوو ئەو ماوەی مانگەی ئەسینام بە جۆرێ ببەمە سەر کە بەرهەمێکی باشم هەبێ.

دوای گەڕانەوەمان لە پاریس، دوو ڕۆژ لە ماڵ بووم و ڕۆژی دواتر، واتە دووی مانگ، دوای نیوەڕۆیەکەی چووم بۆ فڕگەی ئارلاندا، بۆ ئەوەی بە هێڵی ئاسمانیی

سووریا بچم بۆ ئەسینا. دەوروبەری سەعات هەشتی ئێوارە گەیشتمە فڕگەی ئەسینا. تاکسییەکم گرت بمگەیێنێتە ئەو شەقامەی ماڵەکەی لێ بوو، خانووی ئانیارا ڤالگرێن، کە یەکێتی نووسەرانی سوێد دەیبا بە ڕێوە و لە ساڵێکدا نۆ مانگی تەرخان دەکات بۆ نووسەران، هەر مانگێ نووسەرێک بچێت لەوێ بژی و خەریکی کاروباری ئەدەبی خۆی بێت. هەروەها ژوورێکیشیان داناوە بۆ ڕۆژنامەنووسان، بەڵام ڕۆژنامەنووسەکان بۆ ماوەی دوو حەفتە لەوێ دەبن. بە دەم ڕێوە لەگەڵ شۆفێرەکەدا کەوتینە قسەکردن. دەیگوت ئەم پارەی یوورۆیە زیانێکی زۆری لە ئابووری وڵاتەکەمان داوە. جا ڕاستیشی دەکرد، چونکە من کاتی خۆی چوومەتە ئیتالیا و پاریش دیسان چووم و بیست‌وپێنج ڕۆژ لەوێ ژیام. ئێستای ئیتالیا لەگەڵ جارانی جیاوازییەکی گەورەم هەست پێ کرد؛ هەموو شت دوو هێندە و سێ هێندە لە جاران گرانتر بووە. لە ڕێگا جاروبار جێگا دیارەکانی پێشان دەدام. وا بزانم بیست بیست و پێنج دەقەی پێ چوو تا گەیشتینە ئەو ناوچەیە. وتم پێشتر ببەرە هۆتێلی ئاوستریا. دەبوو کلیلەکانی ماڵەکە لەوێ وەربگرم و دەمزانی لەوێوە ماڵەکە هەموو ١٠-١٢ هەنگاوێکە. لە بەر دەرگای هۆتێلەکە ڕاوەستا. چووم کلیلەکانم وەرگرت و هاتمەوە و دیسان کەوتەوە ڕێ. هەرچەندە وتم نزیکە و پێویست ناکات، سوودی نەبوو، وتی دەبێ هەر بتگەیێنمە ئەو ناونیشانەی دەتەوێ.

گەیشتینە بەردەم پێپلکەکان، دەمزانی دەبێ لەوێوە سەر بکەوم، بەڵام کابرای شۆفێر وتی نا، لەو پشتەوە دەبێ ڕێگەی دیکە هەبێ. بە دەوری ماڵەکەدا وەرچەرخا، بەڵام هەر نەماندۆزییەوە. دابەزی و تەماشەیەکی پلیکانەکەی کرد، ئەم جارە لە سەرەوە بۆ خوارێ. ناوی جادەکە خۆی بوو، بەڵام یەک دو ژمارەیەک گەورەتر. کەواتە لە خوارەوەیە و ئیدی دەبێ هەر بە پێ بۆی بچم. جانتاکەمم هێنایە خوارەوە. پارەی تاکسییەکە، وەک ژمێرەرەکە نووسیبووی، پێم وایە ١٢-١٣ یوورۆیەک بوو، کەچی کابرا وتی دەبێ بیست یوورۆ بدەی. وتم بۆچی بیست؟ وتی ئاخر لە فڕگە زۆر چاوەڕێم کردووە و هەندێکیش وەک دیاری. پارەکەم دایێ و وردە وردە بە پلیکانەکاندا چوومە خوارێ بۆ بەردەم دەرگای چلوچوار. چوومە ژوورەوە. دیار بوو کەسی لێ نەبوو. ژوورەکەی خۆمم دۆزییەوە و جانتا و کتێب و شتەکانم ڕێک خست و بە ناو ماڵەکەدا کەوتمە گەڕان بۆ ناسین و ئاشنابوون. جێگەیەکی سادە و بچکۆلە بوو. هەمووی سێ ژوور و سەرشۆرێک و ئاودەستێک و مەتبەخێک و ژوورێکی بچکۆلەی دانیشتن بوو. هەستم کرد سەرم دێشێ و چاو و لووتم ئاو دەکەن. هێشتا لە سوێد بووم هەستم بە نەخۆشی دەکرد، بەڵام وا دیارە ئێستا ڕوو لە زیادبوون بوو. چوومە خوارەوە بۆ ئەوەی دووکانێ بدۆزمەوە. بە پلیکانە درێژەکاندا بەرەوخوارتر داکشام، دووکانێکی بچکۆلەم دۆزییەوە و هەندێ ئاو و کێکم کڕی. دەمویست نان بکڕم، بەڵام دووکانی دیکەم نەدۆزییەوە. وتم جارێ بۆ ئەمشەو ئەمە بەسە. ئەو یەک دوو ڕۆژەی دواتر هەر زیاتر ڕووەو خراپی چووم. شەوان سەرێشە و هەموو کاتێکیش چاو و لووتم ئاویان لێ دەچۆڕا. خۆیشم نەمدەزانی چی بکەم. وردە وردە هەستم بە بێهێزی و ژانی ئەژنۆ و پشتیش دەکرد. دەمزانی نەخۆشم، بەڵام وتم هەڵامەتە، هەمووی دوو سێ ڕۆژە و چاک دەبمەوە.

شەوان ئەگەرچی هەموو ئێش و ئازارێک ڕووی تێ دەکردم، دیسانیش هەر حەزم دەکرد کتێب بخوێنمەوە. دوو ڕۆمانی (پاولۆ کۆیلۆ)ی برازیلیم لەگەڵ خۆم بردبوو: ئەلکیمیست (کیمیاگەر) و شەیتان و خانمی پریم. بەڕاستی هەر کە دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەلکیمیست، یەکسەر هەستم کرد ئەمە نووسەرێکی جیاوازە و زۆریش بەتوانایە. من ڕۆمان زۆر دەخوێنمەوە، بەڵام زۆر جاریش کە ڕۆمانی ئەورووپایی دەخوێنمەوە، یا هی عەرەبی، وا هەست دەکەم هەموویان هەر وەکوو یەکن. بەڵام کۆیلۆ هەر لە سەرەتاوە جیاواز بوو. وا بزانم ڕۆمانەکەم بە دوو شەو تەواو کرد، بەڵام چ دوو شەوێک بوو؟ سەرم خەریک بوو دەتەقی، ناوچەوانم دەتگوت ئاگری تێ بەر بووە. چاوم لە پەسادا ئاوی پێدا دەهاتە خوارەوە. کۆمەڵێ دەستماڵی کاغەزینم لە خۆم کۆ کردبووەوە، بەڵام هەر بەشی نەدەکرد. تا درەنگێ خەوم لێ نەدەکەوت. ناچار حەبم دەخوارد، بەڵام دیسان سوودی نەبوو. جاروبار چاوم دەچووە خەو، خەونی وا سەیرم دەبینی. وام هەست دەکرد لەناو سەرمدا شەڕێکی گەورەی پڕ لە چەک و فڕۆکە و بۆمب ڕوو دەدات. ئێش و بێخەوی و ماندووبوون بە جۆرێ بڕستیان لە بەر دەبڕیم کە ئیتر دەمەو بەیان خەوم لێ دەکەوت.

ئەم بەزمە چەند ڕۆژێک بەردەوام بوو. لەو ماوەیەدا وام بە سەر هاتبوو کە زۆر بە زەحمەت دەمتوانی خواردنێ، یا چایێ، قاوەیێ لێ بنێم. نەمدەتوانی بچمە دەرەوە بۆ کڕینی نان و میوە و پێویستی دیکە. وردە وردە هەستم کرد کە بەم جۆرە ناکرێ بەردەوام بم، دەبێ سەری پزیشک بدەم. شەوێ تەلەفۆنی دۆستێکم کرد، گوتم ئەگەر سبەی لەگەڵم بێی بچینە لای دۆکتۆر. ڕۆژی هەشتی مانگ، دوای نیوەڕۆیەکەی هات. دوای نانخواردن بە مێترۆ چووین بۆ مەیدانی سینتاگما. پارلەمان و وەزارەتی دەرەوە و ئەو شتانەی پێشان دام، بەڵام من لە بارێکدا نەبووم گوێ بەو شتانە بدەم. خوا خوام بوو تاوێ زووتر بگەمە لای دۆکتۆرێک و شتێکم بۆ بکات و لەم ئازار و سەرێشە و بێهێزییە ڕزگارم بکات. چووین بۆ نەخۆشخانەیەک، بەڵام دەبینم ئەو پاکە نییە کە من لە سوێد پێی ڕاهاتووم و ئەوجاریش نزیکەی حەفتا هەشتا کەس لە پێش منەوەن و چاوەڕوانن چاویان بە دۆکتۆر بکەوێت. ئەمە نەخۆشخانەی دەوڵەتی بوو. وتم ئەگەر لێرە ڕاوەستم خراپترم بە سەر دێت، هەڵستە با بڕۆین بۆ کلینیکێکی تایبەت. سواری تاکسییەک بووین، بردینی بۆ کلینیکێ. ناوی خۆمان نووسی و دوای تاوێ دۆکتۆر خانمێکی ئێسک سووک هات و بردینی بۆ ژووری

...ەکەی خۆی، کۆمەڵێ پرسیاری لێ کردم. بە ئینگلیزی قسەمان دەکرد، بەڵام لەبەر هاوڕێیەکەی من جاروبار دەیکرد بە یۆنانی. ...ی دەبێ بە تیشکی ڕۆینتگەن وێنەی سینگ و دەموچاوت بگرن. چووین بۆ بەشی ڕۆینتگەن و ئەو وێنانەیان گرت. کە هاتینەوە بۆ ...ی دۆکتۆر خانم، وتی تۆ هەم ئینفلوێنزاتە و هەمیش سینۆز ...وسانی کونی چاو و لووت) کە بە عەرەبی پێی دەڵێن (جیوب ...ـیە). ئێ چار چییە؟ وتی دەبێ ئەنتیبایۆتیک وەربگری بۆ ...ی ڕزگارت ببێت. زۆر چاکە، تۆ چۆن دەفەرموویت، ئەمن لە خزمەتتدام (سا فەرموو، سەبر بێ بە فیدای خاکی بەری پێت). ...چێتەی بۆم نووسی و چووینە دەرەوە. لە دەرمانخانەیەک حەبەکەمان کڕی. لەوێوە گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم. ئیتر لەو ئێوارەیەوە دەستم کردە خواردنی حەبەکان. دەبوو بە ڕێکوپێکی هەر هەشت سەعات جارێک دانەیەکی لێ بخۆم. پاکەتەکە دوانزدە حەبی تێدا بوو، کەواتە بەشی چوار ڕۆژ بوو.

دۆستێکم، کە کوردی سووریایە، بانگهێشتنی کردبووم و ڕۆژی شەممەی دانابوو بچم بۆ ماڵیان. کە چووم کوڕێکی کوردی تورکیایشی لەبەر من بانگ کردبوو. پێشتر ئەو دۆستەم بۆی باس کردبووم کە ئەو کوڕە زمانزانە. باسی منی بۆ ئەویش کردبوو، وتبوی حەز دەکەم بیبینم. دەی چاکە. کابرا هەر دانیشتم و دانەنیشتم دەستی کردە پرسیارکردن لەسەر زمان و وشەی کوردی و ئێتیمۆلۆگی ئەم وشە و ئەو کردار. ئەوجا وەک بڵێی من تاقی بکاتەوە، پرسیاری وشەیەکی دەکرد و منیش بە دووردرێژی وەرامم دەدایەوە. دوا بە دوای وەرامەکەی من، ئەو دەستی دەکردە ڕوونکردنەوەی دیکە. بەڵام چ ڕوونکردنەوەیەک؟ شتی سەیر و سەمەرە. کابرا، وەک هەموو کوردێکی تورکیا، بیر و عەقڵ و مێشکی بە بیر و فەلسەفە و ئاوەزی تورک و کەمالیزم داگیر کراوە. فڕی بەسەر زمانی کوردییەوە نییە و هەموو شتێک بە چاویلکەی تورکی تەماشا دەکات. تا درەنگێ دانیشتین. قسە و باسمان زیاتر لەسەر کورد و ئەمریکا و عیراق و پاشەڕۆژی کوردستان بوو.

دوای چوار ڕۆژ بەکارهێنانی حەب، وردە وردە هەستم بە چاکبوونەوە دەکرد و ئیدی نەمدەویست ئێرە بە جێ بهێڵم و سەفەرەکەم لە ناوەڕاستدا ببڕم. وتم وا چاکە بمێنمەوە، نەک بچمەوە بۆ سوێد و جارێکی دیکە بێمەوە. بەڵام دیارە بەشێکی باشی ماوەی مانەوەکەم ڕۆیشتبوو، چونکە هەتا ١٤ و ١٥ی مانگیش هەر هەستم بە نەخۆشی و لاوازی دەکرد. دوای چاکبوونەوەم دەمویست دەست بە کار بکەم، بەڵام وام هەست دەکرد کاتێکی ئەوتۆم بە دەستەوە نەماوە و ئەو هێز و توانستەیشم نەبوو دانیشم سەرومڕ کار بکەم. لەوەیش بترازێ، گرفتی گەورەی من هەمیشە ئەوەیە کە زیاتر حەزم لە خوێندنەوەیە، کەچی کەمتر ئارەزووی نووسینم هەیە. ئەگەرچی من لە سوێدەوە بەو خەیاڵەوە هاتبووم کە کۆمەڵێ کار ئەنجام بدەم، بەڵام دیار بوو هیچیانم بۆ جێبەجێ نەدەکرا. پار کە لە ئیتالیا بووم ڕۆژنامچەی ئەو سێ حەفتەیەی ئەوێم بە ڕێکوپێکی نووسیبوو، بەڵام دەبوو پاکنووسی بکەم. لێرە دەستم بەو کارە کرد. هەر ڕۆژێ دوو یا سێ لاپەڕەم لێ پاکنووس دەکرد و باش بوو ئەو کارەم لە کۆڵ کردەوە. وا بزانم شەوێکیش دوو لاپەڕەم لە کتێبەکەی ماندێلا تەرجەمە کرد. ئەمانە کارێکی ئەوتۆ نەبوون، بەڵام دیسانیش شوکرانەی دەویست.

کۆمەڵێ کتێبم لەگەڵ خۆم هێنابوو. دوو ڕۆمانەکەی (پاولۆ کۆیلۆ)م هەر زوو خوێندەوە. ئەوجا کەوتمە وێزەی ئەوانی دیکە. دیوانە تازەکەی مەحموود دەرویشم خوێندەوە. شیعرێکی بۆ کورد نووسیوە و پێشکەشی کردووە بە سەلیم بەرەکات. دەرویش کاتی خۆیشی شیعرێکی جوانی بۆ کورد نووسیبوو، بەڵام کە ئیسرائیلی بە جێ هێشت و لەگەڵ برا عەرەبەکانی دنیای عەرەبدا شاد و شوکر بوونەوە، لێی پاشگەز بووەوە. کە سەرجەمی شیعرەکانی چاپ کرد ئەوە یەکێک بوو لەو شیعرانەی لێی دەرهاوێشتبوو. ئەوەیشی ڕاگەیاندبوو، ئەو شیعرانەی دەرهاوێژراون بە بەرهەمی خۆی نازانێ. ئەودەم ئەو شیعرەی مەحموود ویردی سەر زمانی هەموومان بوو. بەڕاستی شیعرەکەیش جوان بوو، دیار بوو لە دڵەوە نووسیبووی. ئێستا کە هەمدیس کوردی بە یاد کردۆتەوە، وا پێ دەچێ جۆرە هەلپەرستییەکی تێدا بێت. بەڵام شیعرەکەیش ئەو شیعرە جوان و پتەو و گەرموگوڕە نییە. بەڕاستی هەر دیوانەکەیش، بە لامەوە زۆر بەهێز نەبوو.

ڕۆمانە تازەکەی سەلیم بەرەکات: **دلشاد، فراسخ الخلود المهجورة**، لە پاریس کڕیبووم، لێرە دەستم کرد بە خوێندنەوەی. وەک زۆربەی ڕۆمانەکانی ئەم دوا ساڵانەی سەلیم، زمانێکی هەتا بڵێی جوان وپتەوی تێدا بە کار هێنراوە. هەندێ جاریش هەست دەکەی سەلیم هەر بە مەبەست دەیەوێ کۆمەڵێ دەربڕین و وێنەی سێکسی بترنجێنێتە ناو تێکستەکەیەوە. لەم ڕۆمانەدا ڕووداو زیاترە. ڕۆمانەکای پێشووی، هەندێ جار وات هەست دەکرد، ڕووداوی تێدا نییە. ئەگەر هەشبێ، ڕووداوەکان بە جۆرێ نین کە لە سەرەتاوە تا کۆتایی لە یەک چوارچێوەی لۆگیکیدا یەک بگرنەوە. یا بە شوێن یەکدیدا هاتنیان ئەنجامی گەشەکردنێکی سرشتی و لۆگیکی بێت. لەم ڕۆمانەدا وەک وتم ڕووداو باشتر جێگەی خۆی لە پێکهاتەی تێکستەکەدا کردۆتەوە. سەلیم ئەوەیشی بە لاوە گرنگە لە هەموو ڕۆمانێکدا کورد وەک بوونەوەرێکی سیاسی، لە سەردەمێکی دیاریکراودا، بهێنێتە گۆ و بیبزوێنێت. ئەمە لە لایێکەوە گرنگە بۆ تەئریخاندنی کورد و مەسەلەکەی لە تێکستێکی ئەدەبیدا، کە ڕەنگە بەرگەی هاتوچۆی زەمان بگرێ، بەڵام، لەلایەکی دیکەوە، قەتیسمانی هونەرمەندە لای کەڵەکەبەردێکی سەرەڕێدا، کە ڕەنگە بەشێکی یەکجار بچووکی دیمەن بێت. سەرنجێکی دیکە ئەوەیە کە سەلیم زۆر خۆی بە دنیای ناوەوەی پاڵەوانەکانیەوە خەریک ناکات. کەمجار

دەهێڵێ کەسێک بە تەنیا دابنیشێت و ناوەوەی خۆی بخوێنێتەوە. دڵێی هەر پێی خۆشە هەمیشە کەسانی ڕۆمانەکەی بڕەتێنێ و لەملاوە بۆ ئەولا ڕاویان بنێت، بۆ ئەوەی دەرفەتی ئەوەیان نەبێت ئاوڕێک لە دنیای دەروون بدەنەوە.

ئیڤۆن ڤێرا Yvonne Vera کچێکی خەڵکی زیمبابڤەیە و لە ئینگلستان دۆکتۆرای لە ئەدەبیاتی ئینگلیزیدا هەیە و چیرۆکنووس و ڕۆماننووسە. ڕۆمانێکی ڤێرام هێنابوو بیخوێنمەوە، بەڵام زۆر ڕاینەکێشام، وازم لە خوێندنەوەی هێنا. بەڵام کتێبێکی دیکەی ڤێرام پێ بوو، ئەگەر لە بیرم مابێ، وا بزانم ناوی Open Spaces بوو. نازانم، دڵنیا نیم، ناوی وا بوو یا جۆرێکی دیکە بوو. ئەمە ئەنتۆلۆگییەکی کورتەچیرۆک بوو، نزیکەی بیست چیرۆک، کە نووسەرانی ژنی وڵاتانی جۆربەجۆری ئافریقا نووسیویانن. لە هەندێ وڵات دوو یا سێ چیرۆکی هەڵبژاردبوو، لە هەندێکیش تەنیا یەک نووسەر. بەشی زۆری نووسەرەکان خەڵکی ناوەڕاست یا خوارووی ئافریقا بوون. بەم پێیە لە وڵاتە عەرەبییەکانی ئافریقاوە تەنیا خانمێکی سوودانی تێدا بوو. لە ناو نووسەرانی وڵاتەکانی دیکەدا یەک دوویەکیان موسڵمان بوون. بەڵام لەم بوارەدا مەسەلە دین و نوێنەرایەتی دینی نەبوو. شتی هاوبەشی ئەم نووسەرانە مەسەلەی ژن بوو، ژنی ئافریقایی. ئەم کتێبە بۆ من چێژێکی یەکجار زۆری هەبوو. ناسینی دەرد و ئازار، هیوا و چاوەڕوانی و ژیانی ژنی ئافریقا، لەپێشدا وەک مرۆڤ و ئەمجاریش وەک ژن و دواتریش وەک ژنی ئافریقایی، ئەزموونێکی پڕ بایەخە. ئاشنابوون لەگەڵ ئەزموونی ژنی ئەو وڵاتانە لایەنێکی مەسەلەکەیە، بەڵام لەوەیش گرنگتر ئەو زمانەیە کە ئەوان مەسەلەی خۆیانی پێ پێشکەش دەکەن. ئامانجی کتێبەکە، بێگومان، بەشێکە لە پرۆژە و بیری فێمینیزم، بەڵام ڕێک بە پێچەوانەی ئەو دیاردە دزێوەوە کە کۆمەڵێ ژنی کورد ناویان ناوە فێمینیزم، ئەمان بە شێوەیەکی زۆر ڕاستگۆیانە و زۆر دڵسۆزانە دێنە پێشەوە و خۆیان و کێشەکانیان پێشکەش دەکەن. ئەو قاووقیژەی فێمینیستی کورد دەیکا، لێرە نە هەیە و نە بە پێویستی دەزانن. ئەمان نەک باسی ژنی ئافریقا دەکەن، بەڵکە خۆیان ژنی ئافریقان و قسە دەکەن. هەندێ لە چیرۆکەکان هێندە کاریگەر بوون کە بە ڕاستی منیان هێنایە گریان. بە چەند فرمێسکێک هاودەردی و تێگەیشتنی خۆمم پێ دەربڕدرا. سەیر ئەوەیە کە بەرهەمی فێمینیستانی کوردم بەرچاو دەکەوێ، هەر دوای چەند دێڕێک بێز لە خوێندنەوەی دەکەم و وا هەست دەکەم ئەم قاووقیژە نە لە پێناوی ژنی کوردایە و نە دەشیەوێ پەیامی مرۆڤێکی زۆرلێکراو و چەوساوە بگەیێنێ. کەچی ئەمان، ژنە نووسەرەکانی ئافریقا، دەنگیان دەنگی مرۆڤە و باسی مرۆڤ دەکەن و بۆ مرۆڤ دەنووسن و دەدوێن.

کتێبێکی دیکە، کە وام دەزانی حەزم لێ دەبێت و دەیخوێنمەوە، ئانتۆلۆگییەکی چیرۆکی چینی بوو. ناوی کتێبەکە شتێک بوو لە بابەتی (سەرۆک ماو حەزی لێ نەدەبوو) و زۆریش گەورە بوو. بەرهەمی ٢٠-٢٥ چیرۆکنووسی چینی کرابووە ئینگلیزی. ئەم بەرهەمانە یا دوای ئەمانی قۆناغی (ماویزم) نووسرابوون، یا هەر لە سەردەمی ماو خۆیدا، بەڵام لە دژی کۆمونیزم نووسرابوون. جارێ هەر پێشەکی ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام درێژیی هەندێ لە چیرۆکەکان بوو. چیرۆکی وای تێدا هەبوو نزیکەی ٤٠ تا ٥٠ لاپەڕە. بەڕاستی زۆر زەحمەتە تێکستێکی وا بخوێنیتەوە و باوەڕیش بکەیت ئەمە کورتەچیرۆکە. وا بزانم هەمووی سێ یا چوار چیرۆکم خوێندەوە و ئیتر کتێبەکەم خستە لاوە و وازم لێ هێنا. ئەو چیرۆکانەی خوێندمنەوە لە ڕووی هونەرییەوە زۆر نزم بوون و ناوەڕۆکیشیان زۆر بێتام و ساکار بوو. هەروەک چۆن زۆر لە چیرۆکەکانی سەردەمی ماو تەنیا دروشمی سیاسی و پێداهەڵدانی سیاسەت بوو، ئەمانەیش پێچەوانەی ئەوان، بەڵام هەر بەو شێواز و داڕشتنە. یەکێک لە چیرۆکەکان باسی دوو سەرباز بوو، کە برای یەکدی بوون و لە بەرەیەکی شەڕدا بوون. ئەمانە قەحپەیەکی گوندەکەی خۆیانیان لەگەڵ خۆیان هێناوە. کاتێ مەترسی لێیانەوە نزیک دەبێتەوە، قەحپەکە هانیان دەدات کە بێن بە نۆرە لەگەڵی بنوون، بۆ ئەوەی کۆتاییی ژیانیان خۆش بێت. بێجگە لەوەی باسەکە شتێکی زۆر گەوجانەیە، لە زۆر جێگەدا نووسەر هەوڵ دەدات زمانێکی سێکسی و نزم بە کار بهات. دیارە من لەوە تێ دەگەم کە ساڵانی دوورودرێژی دەمکوتکردن و سانسۆری سیاسی و ئیدیۆلۆگی وا لە نووسەری دژ بکات پێچەوانەی ئەو نرخانە بە ڕاست بزانێ. بەڵام نووسەرێکی هونەرمەند هەرگیز نایەت ئەم باوەڕە دژانەی خۆی لە فۆرم و زمانێکی نزم و ناهونەریدا پێشکەش بکات. ماویزم و کۆمونیزم خۆی لە بنەڕەتدا هونەری لاواز کردبوو. نووسەر و هونەرمەندی دژ دەبوو بۆ ئەوەی بنووسیایە کە نرخ و پلە و پایەی بەرزی ئەو هونەرە سەرلەنوێ دامەزرێنێتەوە، نەک زیاتر تێکی بشکێنێت.

ڕۆژی جومعە ٣٠-١-٢٠٠٤، دوای بەرچایی خواردن، دوو سێ جار تەماشای جلک و جانتام کردەوە تا دڵنیا بم هیچم لێ بە جێ نەماوە. بە مێترۆ چووم بۆ مەیدانی سینتاگما. لە وەستگەی پاسەکە برادەران چاوڕێیان دەکردم. دوای تاوێ سوار بووین بۆ فڕگە. لەوێ ویستم جانتاکەم چێک بکەم، بەڵام دیسکی هێڵی سووریا هێشتا نەکرابووەوە. چووین لە قاوەخانەیەک دانیشتین، تا دەرەنگێ دیسکەکە کرایەوە. ئیتر وردە وردە کاتی خواحافیزی و گەردنئازادی هاتبوو. سوپاسێکی زۆرم کردن و چووم بۆ دەرگای فڕین. بەم جۆرە سەفەری یەکمانگەی یۆنانیش تەواو بوو. ئەگەرچی نەخۆشی بەشێکی باشی لە کیس دام، بەڵام دیسانیش پێم وایە سەفەرێکی خۆش بوو. ئێستا وای دادەنێم کە ئەسینا یەکێکە لەو شارانەی، ئەگەر بۆم هەڵبکەوێ، لە دەرفەتی دیکەدا حەز دەکەم بچمەوە بۆ سەردانی.



# کۆمەڵگەی زانیاریی نوێ و ئاکامی گۆڕانکارییەکان
# گفتوگۆ لەتەک مانوێل کاستێلس

ئازاد حەمە
(سوید)

**«بەشی سێیەم»**

### ئەفسانەی ئابووری نوێ
### یان سەرمایەداری زانیاری

ئابووری نوێ ئەو واتایەیە کە بەهۆی کارە سێ کوچکەییەکەی کاستێلس لەبارەی چاخی زانیاری لەنێوەندی ئەکادیمی و میدیای گلۆبالدا دەورووژێ. بەپێی تێگەیشتنی ئەم کۆمەڵناسە ئیمپریە، ئەم ئابوورییە نوێیە واتە گەشەیەکی زۆر و بێ کاربێکی کەم و هەڵاوسانێکی لاواز کە بەوەدەچێ ئەمە جۆرە شادبینییەکی تەکنیکی بێ، ئەگەر نا ئەی چۆن! لەهەمانکاتیشدا باس لەوەش ددکا ئابووری نوێ، واتە ئابووری گلۆباڵ و کات (زەمەن)ێکی تازد، بەڵام مرۆڤ لەمیانەی کارکردنە گلۆبالییەکانی ئەم ئابوورییە نوێیەدا بەباشی لەوەددگا کە ئابووری نوێ ناوێکی ترد بۆ سەرمایەداری نوێ و تەکنەلۆژیای زانیاری و جیهانگیری سەرمایە و بازاڕ. هەروەها ئەم ئابوورییە نوێیە واتە جێگیری سیاسی و ئابووری نێتۆرک. ئەمەش (واتە ئابووری نێتۆرک) ئەو ئابوورییەیە کە گەشەیەکی نابەردەوام و ناجێگیر دەخولقێنێ و جێگیری سیاسی و ئابووری تێک دەدا. کەچی ئەم ئابوورییە نوێیە بە باوەڕی کاستێلس ئەو ئابوورییەیە کە ئەو گەشەیان خولقاندووە کە هەمیشە باس دەکرێ و هەروەها ئەم ئابوورییە مەرجی کۆتاییهێنان بەبازنەی بارودۆخی ئابووریشی تێدایە. ئەو رێسێسیۆن (ڕکود)انەی کە پەیتا پەیتا لە بازاڕی مالیش ڕوودددن، بۆ ئەم کۆمەڵناسە پێوەندیان بە تەکنەلۆژیا، زانیارییەوە نییە. بەپێی ئەمەش ئابووری ناوبراو بریتییە لەسەرمایە و بازاڕێکی گلۆباڵی ئەلەکترۆنی کە بەبەردەوام لە بزاوتن و جووڵەدایە. ئەم سەرمایە و بازاڕە شوێنی کارکردنی دیاریکراو نییە و باوەڕیشی بە جوگرافیا و هیچ سنوورێ نییە. هەروەها لەهەموو شوێنێ کە کاردەکا دسەڵاتی خۆی هەیە و خۆشی لەوێڕا خاوەن بڕیارەکانیەتی. ئەنتۆنی (گێدینس)یش وتەنی بۆ یەکەم جارە لەمێژوو سەرمایە لەبازاڕێکی مالی یەکخراوی گلۆبالدا و لەکاتێکی (فیعلی-Real)دا شەو ڕۆژ کاردکا (١٨) کە ئەمە هەمان بۆچوونی کاستێلسیشە.

بەگشتیش زۆربەی ئەوانەی توێژینەوەیان بۆ بازاڕی مالی نوێ کردووە، بەو باوەڕە گەیشتوون کە ئەم بازارە توانایەکی زۆری هەیە و چالاکییەکانیشی زۆر گلۆبالە.

مەبەستمان ئەوەیە کە لە ئابووری نوێدا دەسەلات بەدەست کارگە گەورەکانەوەیە کە لەناواخندا کارگەهایەکی مولتی ناسیۆنالی (فرە نەتەوەیی)ین و دەسەلاتیشیان سەرووی دەسەلاتی دەولەتە. ئەم کارگانە کە ئەرکی دروستکردنی ئابوورییەکی جێگیر و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی خەلک دەگرنە ئەستۆ و خۆیان بەنیتۆرک پڕ دەکەن و بەمەش دەبن بە پشت بۆ ئابووری نوێی گلۆبال و زانیاریی. وەکی تریش ئەوی پێی دەوترێ جیهانگیری، ئەو نیتۆرکەیە کە پرۆسەی کارکردنەکەی هەموو بوارەکانی گرتۆتەوە و توانیویەتی گەشەی خێراو پەلە بە کارگەکان ببەخشێ و خۆی لەو ئابوورییە هێرارکییە ڕێکخراوە جیاکاتەوە کە پیشەسازیگەریی پشتی پێ دەبەست. ئەم ئابوورییە نوێیەی ئەم کۆمەلناسە کاتالانییە (ئیسپانییە) باسی دەکا بەدەوری ڕەمزێک دەخولێتەوە کە ئەوەش نێتۆرکە. ئەم نێتۆرکەش ئەو شتەیە کە کاستێلس هەر لەسەرەتای کارکردنەکەی لەسەر چاخی ئەمڕۆمان، کە بەچاخی زانیاری ناوی بردووە. خۆی گرفتاری دەکا.

ئەم جۆرە تیۆرەش لەسەر ئابووری ئەمڕۆ بەرەو ئەوەمان دەبا بلێین کە زۆر بەئاسانی دەرک بەوە بکەین کە بەهۆی تەوژمی ئابووری نوێوە کەوتووینەتە ناو گۆڕانە فرە جەمسەرەکانەوە کە ئەوانەش دەرگایان لەجەمسەرگەرییەکی نوێ لەدونیادا کردۆتەوە کە بەرهەمی سەرمایەداری گلۆبال/ زانیارییە. ئەم جۆرە گۆڕانکارییە هەڕەشەیەکی زۆر لە چارەنووسی سیاسی گلۆبال و باری مرۆڤایەتی سەردەم دەکا. بۆیە ئێمەی مرۆڤی سەردەم کاتێ کە گوێمان لەگوزارەی کۆمەلگەی زانیاری نوێ دەبێ، یەکسەر لەوە دەگەین کە دیاردەی ئابووری نوێ بەری ئەم کۆمەلگایەیە و ئەم ئابوورییەش کە بوونیادێکی گلۆبال و زانیاری (گەر بشێ دەلێین زانیاریاوی لەسەر ئەو بناغەیەی کە بەزانیاری بووە و هەروەها بەزانیاریکراوە) هەیە توانایەکی باشیشی لەگەشەدان بەخۆی هەیە و بەدلنیاییشەوە بلاوکردنەوەی زانینی نوێ هەر یەکێکە لەخەسلەتەکانی ئەم ئابوورییە نوێیە و هەر ئەمەش جوودای دەکاتەوە لەو ئابوورییەی کە لەمەوبەر تیای ژیاوین، بەلام هەموو ئەمانە ناتوانن ئەوە روون کەنەوە کە ئەم ئابوورییە ئەگەر ئابوورییەکی ڕەوشتی، یان هیۆمانی تر بێ لەو ئابوورییانەی مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیویەتی، چونکە یەک لە خەسلەتە سەرەکییەکانی ئەم ئابوورییە نوێیە. ئەوەیە کە مرۆڤەکان گەیشتوونەتە ئەو قۆناغەی بکارن بە پەلەترین کات و بەکورتترین ماوە و لە هەچ جێگایەکەوە کە بخوازن و ئارەزوو بکەن، دەست پێبکەن و بۆ ئەو مەبەستەش کۆمۆنیستێرە (لە کۆمۆنیکەیشنەوە وەرگیراوە- واتە گەیاندن-) لە تەک یەکدا بکەن و، لەگشت ئەمانەش سەرنج ڕاکێشتر لێرەدا ئەوەیە کە ئەم ئابوورییە گلۆبالە /زانیارییاوییە وای کردووە کە بازرگانی پارە، کاغەزی بەهادارو هێزی کار بە ڕێگای تازە کاری خۆیان ئەنجام بدەن. بەبێ ڕاراییشەوە دەشێ باس لەوەکرێ کە ئەو تەوژمە نوێیانەش کە لەژێر سایەی ئەم جۆرە ئابوورییەدا دروست دەبن، گەلێ خالی یەکگرتنەوەو چەقی نوێ دەخولقێنن کە لەوێڕا دەسەلات و دەولەمەندی شوێن بۆ خۆیان دەدۆزنەوە، بە کورتی، لەگەل هاتنی ئەم شێوە تازەیە لە ئابووری دەسەلات دەبێ بەنێت و زۆر بە وریایی و بەجۆرێکی نادیار و ئالۆز لەڕووی نێودەولەتییەوە ئۆرگەنیزە دەکرێ (ڕێک دەخرێ). مەبەستە سەرەکییەکەش لم حالەتەدا ئەوەیە کە دەمانەوێ ئەو مەسەلەیە بەرباس بخەین کە نێت بووە بە بناغە بۆ ئابووری نوێ و هەروەها ئەم نێتە لەتوانایدایە دەسەلات شاراوە و ناڕوون کا و تێگەیشتنیشمان بۆ دەسەلات بگۆڕێ. ئەمەش لەبەر ئەوەی ئابوورییەکانی لەمەوبەر، بۆ نموونە ئابووری پیشەسازی، جۆرە دەسەلاتێکی تایبەت بەخۆی بەرهەم هێناو ناوەڕۆک و میکانیزمی ئەم دەسەلاتەش زۆر پێوەندی بەتوانای ئەو ئابوورییەوە هەبووە کە لەلایەن ئەو شێوازی بەرهەمهێنانەوە بەرهەم هاتووە، واتە دەسەلاتی کۆمەلگەی زانیاری نوێ ناکرێ وەک دەسەلاتی کۆمەلگەی پیشەسازی (سەدەی هەژدە و نۆزدە) تەماشاکرێ، ئەمەش لەبەرئەوەی دەسەلاتی چاخی زانیاری جێگایەکی دیار و نێوەندێکی ئاشکرا و جەمسەرێکی ناسراوی نییە، بەلام لە هەمان کاتیشدا دەشێ دەرک بەوەکرێ کە لەکوێدا ئامادەیە، چۆن؟ چونکە مادام ئابووری تازەی ئەمڕۆ لەدەوری نێتۆرکێ گلۆبالی پشتبەستوو بەسەرمایەیەکی زانیاری و زانینێکی تەکنیکی بالا کۆبووەتەوە دەتوانێن ئەو شوێنانە دەستنیشان کەین کە لەسەر ئەم پلانێتەی ئەمڕۆ تارماییەکانی ئەم دەسەلاتەی تێکەوتووە بارودۆخی ئەم پلانێتەش بەجۆرێکی ئەوتۆ چنراوە کە دەسەلاتی ڕاستەقینە تەنێ ناکەوێتە دەستی سیاسییە گلۆبال و بەڕێوەبەری ڕێکخراو و بانقە نێودەولەتییەکانەوە، بەلکو دەکەوێتە دەستی ئۆپێرەتۆر و ئەندازیاری تەکنیکە ئالۆز و پسپۆڕە دەگمەنەکانی بواری بازاڕی مالیشەوە.

هەر لەمیانەی ئەم قسانەشدا لەبارەی ئابووری نوێ، ئەوە یاددەخەینەوە کە لەجیهانی ئابووری نوێدا، ئەوەی پێی دەلێن سیستەم، گرنگی نامێنێ و دەبێ بەخال، یان گرێ و ئەم خالانەش خالی هاوبەشی نێوان نێتەکانن.

واته جیهانی ئابووری نویٚ لەو خاڵانە پێکدێ و لەنێو ئەم خاڵانەشدا دەسەڵاتە کولتووری، سیاسی و ئابوورییەکان شەپۆل لێدەدەن. گرنکییێکی تری ئەم خاڵانە لەوەدایە کە کۆنترۆڵی تەوژمی سەرمایەشیان لەدەستدایە و ئەمەش کۆنترۆڵی مێدیاکان دەکا کە ئەمانەش بەخۆیان کاردەکەنە سەر بڕیاری سیاسی، بەمجۆرە بێ ئەم خاڵانە بوونە بە شوێنی بردنەڕێوەی دەسەڵاتی ئابووری. ئەو جۆرە دەسەڵاتانەش کە بەهۆی ئەم خاڵانەوە دروستبوونە بەئاسانی دەگوێزرێتەوە و ئەوەندەش بە وردی چنراون کە گۆڕینیان ئەستەمە.

ئابووری نوێ هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانیەوە ئەوەی نیشان داوە کە لە ئابووری پێشوو، یان لە ئابووری کۆن، جوداوازە، چونکە ئابووری نوێ لەسەر بناغەی زانیاریگەریی و هێزێکی گلۆباڵ خۆی پێک هێناوە کە شەیدای پێشبڕکێیە. کەچی ئابووری پێشوو، واتە ئابووری پیشەسازی، ئابوورییەکی بەراوردکاریی (کۆمپەرەتیف) بوو و توانایەکی گەورەشی نە لە پێشبڕکێ و نەش لەمەسەلەی خۆ ڕێکخستن و خۆیەکخستندا هەبوو کە ئابووری نێتۆرک پسپۆڕە تیای. ئابووری نیتۆرک، یان نوێ کە داوای فلێکسبلیتێ و گۆڕانی گەورە دەکا بەکارکردنەکانی لەسەر بناغەی ڕێکخستن و یەکخستنی بەرهەمهێنانی زانیاری و زانین جەوهەری خۆی گلۆباڵ دەکا و بەهێشتنەوەی چەند لۆکالێ هەوڵی پەراوێزکردنی بەشێکی زۆر لەهێزی کار و پەرتکردنی کاریش دەدا. ئەم ئابوورییە نوێیە ئەوەمان یاد دەخاتەوە کە زانیاری لەم دوادوایەدا بووە بە بەشێکی گەورە لە ئابووری- زانین لەو ڕۆژەوە بووە بە فاکتەرێکی گرینگ کە مرۆڤ دەستی کردووە بە بەکاربردنی سیمبۆل و هەروەها ئابووری زانیاری وای لەخۆ کردووە کە بەپلەی یەک لەبواری بەرهەمهێنانی زانیاریدا نەک شتێکی تردا پسپۆر بێ. ئەمەش بەخۆی ناوەرۆکی ڕاستەقینەی کۆمەڵگەی زانیارییە (یاخود کۆمەڵگەی پاش پیشەسازی) کە بەرهەمهێنانی شمەکی پیشەسازی تێدەپەڕێنێ(١٩)، بەڵام ناشکرێ گومان لەتەکنیکی زانیاری نەکرێ کە ڕۆڵێکی زۆری لەبەرزکردنەوەی بەرهەمهێنان نەدیوە و ئەمەش کاریگەری خۆی بەسەر هێزی کارەوە بەجێ نەهێشتووە. گەر ئەمە بەلایەنێکی پۆزەتیڤی ئەم جۆرە ئابوورییە لەقەڵەم بدرێ، ناکرێ ئەوە لەبیرکرێ کە ئەم لایەنە چەند شوێن و ناوچەیەک لەجیهانا دەگرێتەوە و ناکرێ بەسەر هەموو دنیادا گشتی کرێ.

لێرەدا زۆر بە ئاسانی دەکرێ دەرک بەوەکرێ کە ئەم ئابوورییە نوێیە لەتوانایدایە گەشەی زۆر بۆ خۆی و نابوودیێ زۆریش بۆ ئابوورییەکانی دەرەوەی خۆی دروست کا. ئەمەش لەبەر ئەوەی ناوەرۆکی ئەم ئابوورییە لەسەر ئەوە پێک هاتووە کە موڵکی ژمارەیەکی دیاریکراوە لەسەر زەوی و هەموو لایەک ناتوانێ بێتە ناویەوە و ئەو نێتۆرکەش بەکاربەرێ کە پشتیوانی گەورەی ئەم ئابوورییە نوێیەیە. ئەو گەشە گەورەیەش کە بەهۆی نێتۆرکەوە هاتووەتەدی تەنێ دوو لەسەر سێی دانیشتوانی سەر زەوی دەگرێتەوە و ئەو بەشەی تری دەکەونە دەرەوەی دەستکەوتەکانی ئەم گەشە تازەیە و ئەم ئابوورییە نوێیەشەوە. ئەو گۆڕانکارییانەش کە بەهۆی تەکنیکی نوێوە دروست بووە هەر کارگەکانی نەگرتۆتەوە، بەڵکو هەر لە کولتوور و ژیانی خێزانەوە بەرێ کەوتووە تادەگاتە فۆرمی نانخواردن و پێوەندی سێکسی و دابونەرێتی نوێی هەڵگرتنەوەی منداڵ و ئاستی جوانکاری هونەر، بەڵام دەکرێ بۆترێ کە خاڵی هاوبەشی نێوان ئەم گۆڕانانە ئەوەیە کە هەموو لەژێر سایەی جیهانگیری ئابووری ڕوودەدەن. خودی ئەو جیهانگیرییە ئابوورییەش بە گەشەی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە بەندە.

لەهەمان کاتدا دەشخوازین بڵێین کە ئەوەی پێی دەڵێن جیهانگیری هەندێ جار خۆی وەک پرۆسەیەکی ئابووری ڕووت دەردەخا، بەڵام ئەمە گروندێکی تەکنیکی هەیە کە لەم ساڵانەی دواییدا ڕیتمێکی نوێی بەجیهان داوە. واتە بوونی ئابووری بە ئابووری نێت هاوکات لەتەک ئەو فۆرمە سەرمایەدارییە گلۆباڵە هاتۆتە مەیدان کە بەسەرمایەداری زانیاری ناودەبرێ. بەپێی ئەوەی کەشۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری بووە بەبەشێکی سەرەکیی لەبونیادی ئابووری جیهانی سەرمایەداری و هەروەها لەهەمانکاتدا ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییە بووە بەوەش کە فۆرمی نوێ لە سەرمایەداری بەرهەم بهێنێ و ئەم جۆرە سەرمایەدارییەش بووە بەسەرمایەدارییێکی ئاڵۆز و دیگیتالیزەکراو بۆ کورتکردنەوەی گشت ئەوانەش دەڵێین، سەرمایەداری زانیاری ئەو سەرمایەدارییەیە کە دوا دەستکەوتی سەرمایەداری جیهانە و سەرپەرشتی و بردنە ڕێوەی ئابووری سیاسەتی لەئامانجە سەرەکییەکانیەتی.

وێڕای ئەوەی کە لەبارەی ئەم جۆرە ئابوورییەوە وترا دەمانەوێ ئەوەش بڵێین کە یەک لە ڕووخسارە سەرەکییەکانی ئەو ئابوورییە نوێیەی بەسەرمایەداری زانیارییەوە گرێ دراوە ئەو بازاڕە مالییە گلۆبالەیە کە بەهۆی تەکنیکی گەیاندنی نوێوە لەگشت جیهانا کاری خۆی ئەنجام دەدا. ئەم بازاڕە گلۆباڵە مالییە لە هەموو بوارەکانی تر بێ شوێن و بێ کاتترە. گلۆبالیتێی ئەم بازاڕە بەرهەمی ڕاستەقینەی ئەو گەشەکردنەیە کە کۆمەڵگەی نێتۆرک پێی گەیشتووە. ئەم لایەنەش بەرەو ئەوەمان دەبا پێ لەسەر ئەوەداگرین کە نابێ بەهەڵە لەیەکانگیری و گلۆبالیتێی ئەم بازاڕە بگەین، چونکە ئەم

بازاڕە تەنێ مۆڵکی ئەوانەیە کە لەتوانایاندایە بێنە ناویەوە و لەگەیاندندا بن لەتەک ئەوانەی لەگۆڕەپانی ئەم بازاڕەدان. کەواتە بوونی ئەم بازاڕە جەخت لە بوونی دووجۆر لە ولات، یان کارگە یاخود ئۆقیانووس دەکا. جۆرێ کە دەتوانن بێنە ناو ئەم بازاڕەوە و کاری خۆیان لەگەڵ یەکدا جێبەجێ بکەن و جۆرێکی تر کە لەتوانایاندا نییە بێنە ناوەوە. ئەم ئامادەنەبوونە لەناو بازاڕی ئابووری گلۆبال و نێتۆرکی مالی جیهانی تەنیا ئاکامەکەی دوورکەوتنەوەیەکی جوگرافی، یان ئابووری رووت نییە. بەڵکە زانیاری و سیاسیشە. ئەمەش لەبەرئەوەی کە دواجار هەر ئەم بازاڕەیە بەشدار دەبێ لەدارشتنی بڕیارە سیاسی و ئابوورییەکان و سەرپەرشتیکردنی هێزە سەربازییە نێودەوڵەتییەکانیش. بەکورتی کەوتنە دەرەوەی بازنەی ئەم بازاڕە، واتە نەبوون بەهێزێکی کاریگەر و دابڕان لەمافی بردنەڕێوە و سەرپەرشتیکردن. ئالێرەدا دەکرێ باس لە مەسەلەی ئەو بارودۆخە بکرێ کە نێتۆرک، جیهانگیری و ئابووری نوێ دروستی دەکەن بۆ مەسەلەی بردنەڕێوەی سیاسی و دارشتنی یاسای نێودەوڵەتی و مەرجی بازرگانی. ئەوانەی کە پێیان دەوترێ دەوڵەتی نێتۆرک خاوەنی چەند فۆرمێکن لە دەسەلات. بەپێی توانای ئابووری و زانیارییان دەسەلاتێکیان لەناو سنووری دەوڵەتی نێتۆرکدا هەیە، کە لێرەدا سنوورەکە تەنیا لەناو ستاتۆسی دەوڵەتی ناسیۆنالدا نییە، بەڵکە لەناو گشت ستاتۆسی دەوڵەتی نێتۆرک دایە کە ئەوەش دەکرێ بەدەوڵەتی سەرووی (ترانس) ناسیۆنال، یان دەوڵەتەکانی نێتۆرک ناوببرێ. دەسەلاتێکی تریش هەیە کە لەناو دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانە (EU, NATO, EMU, UN...و) ئەگەر تەماشای دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان بکەین، ئەوە دەبینین کە ئەو یاسا ئابووری و فۆرمە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی لەوێرا دادەڕێژرێن و دواتر کاریان پێدەکرێ بەزۆری پێشنیاری دەوڵەتەکانی نێتۆرکن (دەکرێ هەر بەتاک ئەم دەربڕینە بەکاربرێ، واتە بوترێ دەوڵەتی نێتۆرک لەبری دەوڵەتەکانی نێتۆرک کە مەبەست لێی ئەو دەوڵەتانەیە کە خاوەنی ئابوورییەکی زانیارییاوی و گلۆبالن و لەتواناشیاندایە خۆیان وەک یەک دەوڵەتی ڕێکخراو و کۆک نیشان دەدەن.) و بەپێی باری ئابووری و تەکنیکیان دەتوانن گەشە بەپێشنیار و داواکانیان بدەن. بۆیە لەکۆتاییدا کە بڕیار لەسەر بایکۆتکردنی ولاتی، یان ناوچەیەک دەدرێ، دەتوانن بەچەندین شێوەی سیاسی و یاسای جۆراوجۆر بۆچوون و داواکانیان بە ئاکام بگەیەنن گەر بۆ نموونە بیانەوێ باسێ بێننە پێشەوە لەسەر مەسەلەی بە ئەورووپا بوونی، یان بە ئەورووپاکردنی تورکیا، دەتوانن ئەمە بەچەندین مەسەلەوە گرێ دەن کە بەهۆیەوە مەبەستە سیاسی و ئابوورییەکانیان بپێکن. جا ئەوەش هەمیشە لەسەر باری سیاسی ئەو چرکە سیاسییە و ئەو مەسەلانە دەوەستێ کە لەدێباتی نێودەوڵەتیدا گرنگی هەیە گەر لەو چرکەیەدا پێویست کا تورکیا وەک ولاتێکی ئەوروپایی گەشەکردوو. ئەندامێکی بکەری ناتۆ و پردی نێوان خۆرئاوا و خۆرهەلات تەماشادەکرێ، یان بەپێچەوانەوە وێنەی ئەوتۆی لەسەر دروست دەکەن کە ولاتێکی سەربازییە و دژ بە مافەکانی مرۆڤە و هەروەها ولاتێکی ئاسیاییە کە جاری لەژێر کاریگەریی کولتووری ئیسلام و دیسپۆتیستی ڕۆژهەلاتییە، بەلام کاتێ تەماشای ئەو یارمەتییانە بکەین کە دەوڵەتی نێتۆرک بەناوی فۆندی نەختی نێودەوڵەتی بە ولاتی تورکیای داوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە چۆن دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان تەنێ ئامرازێکی سیاسی و بازرگانیین بەدەست ئەو ولاتانەوەی کە لە پرۆسەی جیهانگیری ئابووری و زانیاری ئەمڕۆ بەرپرسیارن، هەروەها بۆچوونە زاڵەکانی ناو ئەم دامەزراوانە بەری ئەندێشەی نەک هەر ئەم ولاتانەن، بەڵکو ئەو ولاتانەشن کە سالانە پارە بەو دامەزراوانە دەدەن و دواتر بەپێی ئەو بەشداربوونانەیان لەبەهێزکردنی بودجەی ئەو دامەزراوانە دەتوانن داوا سیاسی و خەیاڵە بازرگانییەکانیشیان بهێننە دی. مێژووی ئەم پراگماتیزییە سیاسییە ڕۆژئاواییە کۆنەو بەوەش ناچێ دەوڵەتی نێتۆرک ئاوا بە ئاسانی دەستبەرداری بێ بەتایبەت ناوەرۆکی پرۆژەی سیاسی و ئابووری دەوڵەتی نێتۆرک، کە مۆدێلێکی پڕ لە پارادۆکس و ناتەبا پیادەی دەکا، ئەم پراگماتیزمییە بەهێزتر و جۆراوجۆر تردەکا. ئەم جۆرە هەلوێستەی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان و وابەستەیەتیان بۆ ولاتی خاوەن وتاری ئابووری و سیاسی و زانیاری نوێ هەمیشە هۆکارێ بووە بۆ ئەوەی کە لەدەرەوەی خۆیان ناحەز و نەیارێکی زۆر دروست بێ و پەرچەکرداری و پرۆتێستێکی سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەردەوام لەگەشەکردندا بێ و ئەم لایەنەش وابکا کە رۆڵ لە خولقانی گەورەترین جەمسەرگەری و پۆلینکردنی ناوچەیی و ئیتنی و مەزهەبی ببینێ. زۆرجاریش وا ڕێکەوتووە کە ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەندازیارانی دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان زۆر گوێنەدەر و بێ باک خۆیان نیشان دەن و هەلوێستێکی دیاریکراو و دەستبەجێ نەگرنەبەر بەرامبەر ئەو دژایەتیکردن و ناحەزییانەی کە لە دەرەوەی چوارچێوەی جوگرافی خۆیان نەشونمادەکا. ڕەنگە ڕووداوەکانی (۱۱/۹)یەکێ بووبێ لەو پەرچەکرداری و برۆتێستانەی کە نەیار و دوژمنانی سیاسەت و ئابووری ڕۆژئاوا و دامەزراوە پراگماتییەکانی نیشانی جیهانیان

دا. هەر لەم ڕووەوە دەکرێ دەوڵەتی عێراقیش هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە بەیەکێ لە هەلە کوشندە و نارەوشتییەکانی سیاسەتی دوولایەنە و بەرژەوەندیگەرانەی وڵاتانی ڕۆژئاوا تەماشاکرێ کە چۆن سەرەتا ئەم وڵاتە لەڕووی سیاسییەوە پێکهاتوو و پاشان ئەم وڵاتە وای لێکرا بەم توانایە لەسەربازیی بگا و دواتر بشبێ بە هەڕەشەیەکی ساختە بۆ سەر ئەو جیهانگیرییە ئابووری و سیاسی و یاساییەی کە وڵاتانی ڕۆژئاوا کاری بۆ دەکەن و هەروەها بوونیشی بەسیمبولێ بۆ ناسیۆنالیتێیێ چەوت و ئیسلامگەرایێکی ڕێکخرا و پرۆگرامکراو.

دەگەڕێینەوە سەر باسەکەی خۆمان و دەڵێین ئامادەبوون لەناو مالی نێتۆرک، یان بوون بە بەشێ لە دەوڵەتی نێتۆرک، واتە بوون بەیەکێ دارێژەر و تویژەر و باسکەری ئەو یاسایانەی سەبارەت بە دیاردە ئابووری- سیاسیەکان و دواتر مەسەلە کولتوورییەکان دێتەپێش. ئەوانەش کە لەناو مالی نێتۆرکدا جێگیربوونە بەپێی باری ئابووری و تەکنیکیان بکەرێکی چاکی ناو ئەم ماڵە و ئەمجار ناو دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانن و خاوەنی بەلایەنی کەمیشەوە یەک تا سێ کارگەی مولتی ناسیۆنالین کە لەدەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەتی ناسیۆنال کاردەکەن و نەک هەر دەوڵەتی ناسیۆنال گوێڕایەڵی خۆیان دەکەن، بگرە ئەو وڵاتانەش وابەستەیی خۆیان دەکەن کە کاری تیادەکەن. ئەمەش زەوینەیەکی ترسناک لەوکاتانەدا دروست دەکا کە ئەم کارگە مولتی ناسۆنالییانە لە وڵاتهایەک کاربکەن کە نە بەشێ بن لەمالی نێتۆرک و نەش خاوەنی ئابووری گلۆبال و زانیاریاوی بن. ئەم کارگانەش بەو ڕابردووە ئابووری و تەکنیکی و سیاسیانەیانەوە دەتوانن بە ئاسانی کار لەگەڵێ جووڵەی سیاسی و ئابووری ئەو وڵاتانە بکەن و ئابووری نەتەوە و گەشەی ناوخۆش بەخۆیانە گرێ بدەن. ئەو جۆرە وڵاتانەش کە ئەمەیە قودرەتی ئابووری و تەکنیکیان تەنێ لەچوارچێوەی دەوڵەتی ناسیۆنالی خۆیان ئاوا ناکاریگەر و بێ توانا نین، بەڵکو لەدەرەوەی ئەو چوارچێوەیەش هەر بەو جۆرەن و هیچ ڕۆڵێکیان لە گۆڕانی ناواخن، یان دارشتنی یاسا سیاسی و بازرگانییە نێودەوڵەتییەکان نییە. بۆیە ئەو وڵاتانەی ناومان نا وڵاتانی دەرەوەی نێتۆرک کاتێک لەناو هەندێک لەدامەزراوی نێودەوڵەتی (نەتەوە یەکگرتووەکان، فۆندی نەختی نێودەوڵەتی و..)دا ئەندام دەبن لەچاو ئەو وڵاتانەی بەشە سەرەکییەکەی مالی نێتۆرک پێک دێنن ئامادەبوونەکانیان زۆرجار بێ هێزو بێ بەها دەبێ. ئەمەش لەجیهانی سیاسی و ئابووری ئەمڕۆدا مەسەلەیەکی بێ نرخ نییە، چونکە زۆرجار

فەرامۆشکردنی ئەو لایەنە بە زیانێکی گەورەی دۆزی سیاسی و کۆمەڵایەتی نێودەوڵەتی گەڕاوەتەوە و تەنانەت ئەم هەستی خۆ بەپەراوێز و بەکەمزانین و بێکاریگەر بوونەش وایان لەو وڵاتانەکردووە کە لەدەرەوەی مالی نێتۆرکی ئابووری و پارەو سیاسەت بێن بەگرووپی جیاجیا و ڕەوایەتی بە ڕەفتاری سیاسی و ئابووری یەکتر بدەن و پاساودانیش بۆ یەکتر بکەن. لەم ڕوودشەوە دەکرێ گەلێ نموونەی لەم جۆرە بهێنرێتەوە. لێرەدا بەکورتی دەچینە سەر دوو نموونە یەکەمجار دەچینە سەر رەوشتی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات و دواجاریش دەچینە سەر وڵاتانی، یان جیهانی عەرەبی- ئیسلامی.

بۆ نموونە باری وڵاتانی پێش هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و ئەوروپای ڕۆژهەڵات زۆر لەمەوە نزیکە کە ئێستا بە بارێکی تر گۆڕاوە و ئەم بارە نوێیەش زۆر لەوی پێشووش باشتر نییە. لەبەرئەوەی پێشتر هەموو یەکانگیرییەکی خۆیان لەسەر بناغەیەکی ئایدیۆلۆژی دروست دەکرد کە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەو جەمسەرگەراییە سیاسییەی جیهان تێی دەژیا. ئەمڕۆ دۆزەکە بەجۆرێکی تر وەگەڕ دەکەوێ و جەمسەرگەرایی و بێ هەڵوێستییەکەی ئەم وڵاتانە مانای تری هەیە و مەبەستە سیاسی و ئابوورییەکانیشیان بەشێوەیەکی دی مسۆگەر دەکەن کە زۆر لەو ڕەوشتە سیاسی و ئابوورییەوە نزیکە کە زانیاریگەری و ئابووریخوازی لەگەڵ خۆی هاوردوویەتی بۆ ئەوەی ڕوونتر بدوێین، دەڵێین ئەوی ئەم وڵاتانە (لێرەدا بەگشتی تێکرای بلۆکی سۆسیالیستی مەبەستە) لە ئەمڕۆدا ئاردزووی دەکەن ئەوەیە کە چۆن بکارن بێنە ناو یەکیەتی ئەوروپاوە و بێن بە ئەندام لەو دامەزراوانەی کە پێشتر کاریان تیانەکردووە و تەنانەت بە دامەزراوگەلێکی ئیمپریالیش لەقەڵەمیان داوە بۆ ئەوەش کە بێن بەوڵاتهایەک کە دارێژەری یاسا ئابووری و سیاسیەکان بن، وازیان لە هەموو چالاکییەکی سیاسی و ئینسانی خۆیان هێناوە و تەنێ خەون بەوەوە دەبینن کە چۆن بتوانن یارمەتی لەفۆندی نەختی نێودەوڵەتی، یان دامەزراوێکی سیاسی و ئابووری وەک یەکیەتی ئەوروپایی وەرگرن. ئەم وڵاتانەش کاتێک کە بەو ڕابووردووەوە ئابووری و تەکنیکی و سیاسیشەوە هاتوونەتە ناو مالی ئەوروپاییەوە، نەک هەر بەرامبەر بەکێشە ناوچەیی و نێودەوڵەتییەکان بێ هەڵوێست و ناکاریگەرن، بەڵکو ئەو ڕابردووە و ئەو شێوە هاتنە ناوەوە وابەستەییانەیەش بارێکی ئەوتۆی هێناوەتە گۆڕێ کە پێش هەموو شتێ، وڵاتەکانی خۆیان کردووە بە باشترین دالدە بۆ بێکاری، سوالکردن، نارکۆتیکە، مافیاگەری، سۆزانیەتی و هەژاریێکی مۆدێرن. ئەمە و جگە لە گەلێ دیاردەی دزێوتری وەک: سەربازە

گەورەوخانەنشینەکان کاری چەرچیەتی بەفرۆشتنی چەک و تەقەمەنیەوە دەکەن. بەشێکی زۆریش لەو بازرگانیانەیان لەگەڵ وڵاتە دیکتاتۆرو داپلۆسێنەرەکان دەکەن. هەروەها پسپۆرەکانی چەک دروستکردن و بەتایبەتی چەکە بیۆلۆژی و ترسناکەکان لەلایەن ئەو وڵاتانەوە دەکڕدرێن کە ناحەزی و دوژمنگەرایی لەسیاسەتیاندا سەقامگیرە (لەوانە ئێران، عێراق، ئیسرائیل، تورکیا). مافیاگەری تەنێ لەشەقامەکاندا ناخولێتەوە، بەڵکو ئەم مافیایانە تاقمی سیاسی و دیپلۆماسیشیان لێدەرچووە کە بەناو دامەزراوە سیاسی و ئابوورییەکانیشدا وەک نەخۆشی بڵاوبوونەتەوە. هەربۆیەشە پیاوە لێهاتوو و نوێنەرەکانی ئەم وڵاتانە لەنێوەندو دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانا، یان هەر کۆنە سیاسییەکانن، یانیش ئەو لاوانەن کە مێشکیان بەجیهانگیری ئابووری و سیاسی شۆراوەتەوە.

بەڵام ئەوەی پێوەندی بەدۆزی جیهانی عەرەبی-ئیسلامییەوە هەیە لەچاو وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵات. جیاوازە. نەک هەر لەبەرهۆی سیاسی (هەوڵی چەندین ساڵەی ئەم وڵاتانە بۆ خوڵقانی دوژمنێکی هاوبەشی بەناوی ئیسرائیل، یان تێکشکانە ئایدیۆلۆژی و ناسیۆنالیبیەکان) و یان توانای ئابووری (لەلایەک بوونی وڵاتانێکی بەدەرامەتی باش و لەلایەکی تر وڵاتانێکی تریش کە ڕۆژانە لەبەر هەڕەشەی هەژاری و برسیەتیدان) و سەربازی (نەبوونی ئەزموونێکی باش، یان پیشەسازێکی سەربازی خۆماڵی و هەروەها نەبوونی کەرتی سەربازی بە بوارێکی پیشەسازی زوو زانستی وەک ئەورووپا)، بەڵکو لەبەر هۆی تریش وەک کولتووری، زمان و ئاستی تەکنیکی و زانستی (نەخوێندەوارییەکی زۆر و دواکەوتوویێکی کۆمەڵایەتی گەورەو دانیشتوانێکی زۆریش) و هەروەها مەسەلەی مەزهەبی و ئێتنیش، چونکە هەموو لێکترنزیکبوونەوەیەک کە لەنێوان ئەم وڵاتانەدا ڕووی داوە هۆکاری مێژوویی خۆی هەبووە و زۆربەشی پێوەندی بەمەسەلەهایەکی وەک مەسەلەی مەزهەبی و ئێتنی و ناسیۆنالییەوە هەبووە وەک لەمەسەلەی ئابووری، یان زانستی. کێشەی ئەم وڵاتانە ئەوەیە کە نە ئایدیۆلۆژیایەک وەک ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم ڕۆڵی دیوە لە یەکگرتنەوەیان وەک ئەوەی کە لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات گرنگی هەبووە نەش ئایدیۆلۆژیایەک وەک ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم و ئابووری بازاڕ ڕۆڵی لەیەک خستنیان دیوە وەک ئەوەی کە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا ڕووی داوە. ئێستاش جیهانگیری زانست و ئابووری توانیویەتی هەردوو جەمسەرە دژەکە یەک خاو گەلێ پێوەندی پراگماتی جۆراوجۆر و هاوشێوە لەنێوان ئەو وڵاتە ئەورووپاییانەی لەپەراوێزی جیهانگیری ئابووری و زانیاریدان و ئەوانەش کە لەنێوەندان دروست کا، بەڵام هەرچی پێوەندی بەوڵاتانی عەرەبی-ئیسلامییەوە هەیە بەو جۆرە نییە، چونکە ئەم وڵاتانە دەمێکە پیشەیان بووە بەوەی گرووپ گرووپ سیاسەت بکەن و هەر جارەش لەدژی یەکتر نەک لەبەر هەڵوێستی سیاسی و ئابووری دیاریکراو خۆیان بکەن بەوابەستەی دەوڵەتێک لە دەوڵەتەکانی نێتۆرک، یان بەپێچەوانەوە لەدژی دەوڵەتی نێتۆرک و دامەزراوە نێودەوڵەتی و کارگە مولتی ناسیۆنالییەکانی ئەم دەوڵەتی نێتۆرکە دەکەونە پشتگیریکردن لە دیاردەی سەیر سەیر و بەخێوکردنی تاقم و گرووپی جۆراوجۆری ناحەز و بێ بار و بێ ئامانج و دواتریش دەکەونە بەکاربردنی ئەم تاقم و گرووپانە و بۆ مەبەستی سیاسی و ناسیۆنالی و ئێتنی خۆیان بەکاریان دەبەن. ئەمانەش هەر بەزەرەری جیهانی عەرەبی-ئیسلامی ناگەڕێتەوە، بەڵکو گەورەترین هەڵەن دەرهەق بە خودی مرۆڤایەتیش. تەماشاکە تا ئێستا وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامی هەڵوێستێ تەباو دیاریان بەرامبەر بەکێشەی نێوان فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان نییە و هەریەکێکیشیان بەجۆرێ کە خۆی باوەڕی پێیە دەستی لە داڕشتنی تێگەیشتنی سیاسی فەلەستینییەکاندا هەیە. ئەمەش، یان بەدروستکردنی ڕێکخراوی جۆراوجۆری فەلەستینی، یانیش بە بەخێوکردنی ڕێکخراوە سیاسییەکانی فەلەستینییەکان کۆتایی هاتووە. جا لە هەموو وڵاتێکی عەرەبی و ئێستا لە هەندێ لەوڵاتە ئیسلامییەکانیش فەلەستینی سەر بەڕێکخراوی فەتح هەیە و شانبەشانی ئەوە تاقمی جەبهەی شەعبی و ئیسلامی فەلەستینیش هەیە. ئەم وڵاتانە (بۆ نموونە ڕۆڵی سیاسی سووریاو ئایدیۆلۆژی میسرو مەزهەبی ئێران و ئەمجار ئابووری ناسیۆنالی هەندێ وڵاتی وەک ئوردن و عێراق و وڵاتانی کەنداو) ئەمە هەر لەبەر ئەوە ناکەن کە بیانەوێ هەمیشە خۆیان وانیشان بدەن کە بەشێکن لەکێشەی نێوان فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان، یان هەروەها بیانەوێ ببن بەیەکێ لەنوێنەرانی فەلەستینییەکان و بەهۆی ئەمەشەوە لەگەڵ دەوڵەتی نێتۆرک و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکانی لە دیپاتی بەردەوامدابن تا هەمیشە پێکەوە چوارچێوەی سیاسی بۆ ئەم کێشەیە دانێن. نەخێر ئەم وڵاتانە ئەمە دەکەن لەبەر ئەوهۆیانە و لەبەر ئەوەش کە لەلایەک دەیانەوێ ببن بەبەشێ لەوتاری ناسیۆنالیزمی عەرەبی (بەتایبەتی سووریاو میسرو عێراق) و هەروەها مەزهەبی و ئایدیۆلۆژی ئیسلامیش (لەوانە ئێران) و هەروەها لەلایەکی تر دەیانەوێ بەهۆی ئەم هەڵوێستانەیانەوە دەمکوتی ناحەزەکانیان لەناو وڵاتەکانی خۆیان بکەن و لەهەمووشی سەیرتر هەوڵ بدەن

وێنەیەکی نەتەوەیی و ئینسانی لەیەک کاتدا لەسەر سیاسەتەکانیان دروست کەن (دوو ساڵ لەمەوبەر عێراق(٥) ملیۆن ئیرۆی کرد بەدیاری بۆ ئەو ماڵە فەلەستینییانەی کە لە خۆپیشاندانەکانا کوژراویان هەبوو). جیهانگیری ئابووریش دۆزی سیاسی پارادۆکسالی ئەوتۆی لەتەک خۆدا هێناوە کە کێشەی فەلەستینیش دووچاری ئەو دۆگما سیاسی و ستراتیژییە دوانەییە کردووە کە وڵاتانی نێتۆرک دەیانەوێ بیخەنە ناو کێشەی نێوان فەلەستینی و ئیسرائیلییەکانیشەوە. بۆ نموونە میسر لە پلەی یەک و ئوردن بەپلەی دوو توانیویانە بەجۆرێ ئەم کێشەیە بەر دێبات بخەن کە نزیکە لەزمانی جیهانگیری ئابووری و سیاسەتی نوێوەو بەرامبەر بەوەش ساڵانە و وەرزانە زۆرترین یارمەتی لەفۆندی نەختی نێودەوڵەتی وەردەگرن و هەرچی سوریایە جارێ هەر لەلیستی ڕەشدایە بەهۆی هەڵوێستە توندڕەوەکانی بەرامبەر بەم کێشەیە، بەڵام ئەم یارمەتییەکانی لە وڵاتانی کەنداو وەردەگرێ کە ئەمەش بەخۆی بەشێکی ترە لەو یارمەتییە سیاسییەی کە جیهانگیری زانیاری و ئابووری باوەڕی پێیەتی. ئەمە هەڵوێستی وڵاتانی عەرەبییە و کەچی لەواقیعدا کاتێ کە تەماشای کامە وڵاتی عەرەبی دەکەی، دەبینی هەریەکە لەم وڵاتانە فەلەستینێکی لەناخی خۆیدا دروست کردووە و خۆشی بووە بە ئیسرائیلێک بەسەریەوە (بۆ نموونە دۆزی کوردەکان لەسوریا، یان ئیسلامییەکان، یان گرووپە ئیتنی و مەزهەبییەکانی تر لەزۆربەی وڵاتانی عەرەبی). ئەوەی بەوڵاتانی ئیسلامیشەوە تایبەتە ئەوەیە کە ئەم وڵاتانە ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد، دەیکەن، یەک لەبەرئەوەی نوێنەرایەتیکردنی ئەم کێشەیە دەچێتە خانەی وتاری یان ئیسلامیزمەکەیانەوە، دووش لەبەرئەوەی پێی دەڵێن وڵاتانی جیهانگیری و دەوڵەتی نێتۆرک کە لەهەمان کاتدا ئەو لایەنە (واتە جیهانیبوونەکەو نێتەکەی ڕۆژئاوا) گەلێ شتی تری وەک وتاری دیموکراسی و مافی مرۆڤ و دادپەروەری کۆمەڵایەتی دێنێتە پێشەوە بۆ ئەم وڵاتە ئیسلامییانە دیاردەهایەکی سەلبیی- مەسیحین و لەپشت زۆربەی کێشەکانی مرۆڤەوەن. کێشەی نێوان فەلەستینی و ئیسرائیلییەکانیش تاکە کێشەیەک نییە کە بەمجۆرە لەلایەن وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامییەوە ڕەفتاری لەگەڵ کراوە، بەڵکو گەلێ کێشەی تری ناوچەیی و هەرێمی هەن کە جارێ ئەم وڵاتانە زۆر تەماشاکردنێکی ناحەزو نادادپەروەرانەیان بۆ هەیە، بۆ نموونە کێشەی کوردەکان و دەوڵەتی عێراق، یان کێشەی کورد بەگشتی و هەروەها تازەترین کێشەی جیهانیش کە ئەوەش دیاردەی تیرۆریزمە.

ئێمە کاتێ کە تەماشای کامە وڵاتی عەرەبی- ئیسلامی، یان سەرجەم وڵاتانی ئیسلامی دەکەین، دەبینین خۆیان بەناشرینترین و زۆردارانەترین شێوە ڕەفتاریان لەتەک ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی ناو وڵاتەکانی خۆیان کردووە، کەچی پشتگیری لەکاری تیرۆریستی دژ بە ئیسرائیلییەکان دەکەن و تاقمی ئیسلامی توندڕەو و بکوژ دروست دەکەن و مەشقیان پێدەکەن و بۆکاتی تەنگانە و بۆ خستنەڕووی داواکانیان بەکاریان دەبەن. ئەلبەتە ئەو چەوتییەش لە سیاسەتی ئیسرائیلییەکاندا هەیە، هەمیشە کاریگەری خۆی بەسەر ئەو شێوە سیاسەتکردنەی وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامییەوە هەبووە و هەشیەتی. وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامیش لەئاکامی ئەو جۆرە سیاسەتەی ئیسرائیلییەکان. کە ئیسرائیلییەکان ئەم سیاسەتەیان بەپشتیوانی دەوڵەتی نێتۆرک و دامەزراوە نێودەوڵەتییەکان لەو دەوروبەرە خۆیان پیادەیان کردووە، دووچاری نائومێدی و بەدڕەفتاری بوونە و واشیان لێکراوە کە ئیسلام وەک ئەلتەرناتیڤێکی تەکنەلۆژیای زانیاری نیشان بدەن و بیکەن بەهیوایەک بۆ دروستکردنی ناسنامەی ناسیۆنالی و ئیتنی خۆیان. بۆیە ئەم وڵاتانە نایانەوێ ئەوە نیشان دەن کە ئیسلام دەتوانێ تیرۆریزم دروست کا، یان ئیسلام لەئەمڕۆدا پێویستی بەوەیە بۆ ماوەیەک وەک تیرۆریزم ناوزەد کرێ و وەک هێزێکی ترسناک تەماشاکرێ تا بە ئاکامەکانی خۆی دەگا. هەروەها ئەم وڵاتە عەرەبی- ئیسلامییانە و تەنانەت ئۆپۆزیسیۆنە ئیسلامی و ڕادیکاڵ و چەپەکانیشی ناخوازن باوەڕ بەوەبکەن کە ئیسلام دەتوانێ هەروەک هەموو بزووتنەوە ئایینییەکانی تر (مەسیحی، یەهوودی، هیندۆسی، بوودی) لە دروستکردنی دیاردەی فۆندەمینتالیستانە و هەروەها جموجۆڵی توندڕەوانە بەشداربێ. بەقسەی کاستێلسیش ئەم بزووتنەوە ئایینییانە لەگەڵ داهاتنی چاخی زانیاری بەدووی ناسنامەی خۆیان وێڵ دەبن و نێتیش بۆ بە ئەنجام گەیاندنی چالاکییەکانیان بەکاردەبەن و بەجۆرێکی ئەوتۆش بلاودەبنەوە کە گشت جیهان دەگرنەوە. لەلایەن خۆمەوە پێموانییە کە هەموو مەسەلەکە هەر ئەوەبێ، چونکە کاستێلس بە وردی نەچۆتە ناو ئەم لایەنەوە و ئەو وردەکارییانەی لەبارەی چالاکییەکانی دەوڵەتی نێتۆرک کاری لەسەر کردووە، هەمان شتی لەبارەی وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامی نەکردووەو لەتوێژینەوەکەیدا ئەو بایەخە قووڵەی نەداوەتێ. هەروەک لەسەرەوەش ئاماژەمان پێکرد کە وڵاتانی عەرەبی- ئیسلامی نایانەوێ ڕووداوەکانی نێوان خۆیان و وڵاتانی نێتۆرک وەک خۆی تەماشاکەن و بینینی خۆیان بگۆڕن. ئەم داخ

لەدلّییەش یەک تەرەفی نییە و هەردوولا چ ولاّتانی جیهانگیری و چش ولاّتانی عەرەبی- ئیسلامی، سالّەهایە لەدروستکردنی وێنە هەلّە و ناتەباکان بەشدارن. دروستکردنی ئەو وێنانەش تەنێ دەستی رژێمەکانی ئەم ولاّتانەی تیا نییە، بەلّکو ئەو دەستبژێرە ئەکادیمی و رووناکبیرە رادیکالاّنەش هەمیشە رۆلّیان لە بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە وێنە و تەماشاکردنانە دیوە. ئەم لایەنە لە رۆژئاواش ئامادەبووە و بگرە زۆر بەزانستیش کراوە. کاتێ کە رووداوەکانی (٩/١١)ش هاتە پێشەوە زۆربەی ولاّتانی عەرەبی- ئیسلامی سەیرکردنێکی روون و دیاریکراویان لەو بارەیەوە نەبوو و تەنانەت لەمیدیاکانیشیاندا ولاّتانی رۆژئاوایان کرد بەقەسابخانەیەک بۆ گشت عەرەب و ئیسلامێک، گومانی ناوێ کە ولاّتانی نێتۆرک لەسەرەتادا هەموو توانای خۆیان وەگەرخست تا ناشیرینترین وێنە لەسەر خەلّکی جیهانی عەرەبی- ئیسلامی دروست کەن. ئەمەش لەگەلێ رووەوە سەری گرت و بەتایبەت زەمینە بۆ ئەم دوژمنایەتییە نەرم و رقە هێمنە دەمێک بوو لە ئارادابوو. لەلایەک دەولّەتی نێتۆرک لەدوای نەمانی مەترسی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی پێویستی بەوە هەبوو کە جارێکی تر بکەوێتە دروستکردنی دوژمنی هاوبەش و جەمسەرێکی نوێ. جا ئیسلامیزم لەم حالّەتەدا بۆ ولاّتانی نیتۆرک، باشترین جەمسەر بوو چ لەبەرئەوەی خۆیان بەدوژمنی تەکنەلۆژیای زانیاری و ئابووری گلۆبال دەزانن و چش لەبەر ئەوەی دالّدەن بۆ بەرهەمهێنانی دیاردەی فەنەتیزم. لەلایەکی تر خەلّکی ولاّتانی نێتۆرکیش دەمێک بوو ناحەزێکی شەفاف و بووغزێکی نەرمونیانیان لەناخی خۆیاندا سەبارەت بەخەلّکی ولاّتانی جیهانی عەرەبی- ئیسلامی حەشاردا بوو، لەدوای زۆربوونی شەپۆلی کۆچیش لەولاّتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە بەرەو ولاّتانی نێتۆرک، خەلّکی ولاّتانی نێتۆرک پتر لەجاران زانیاریان لەسەر ناوەرۆکی ئاینی ئیسلام و خووڕەوشتی ئیسلامی پەیداکرد و بەهۆی ئەمەشەوە ئەمان (واتە خەلّکی ولاّتانی نێتۆرک) بەوە گەیشتن کە هەموو ئەوەی پێی دەلّێن خووڕەوشتی ئیسلام و جەوهەری ئەم ئاینە پێچەوانەی ئەو کراوەیی و ئازادی و بێ سنوورییەیە کە ئەوان کاری بۆدەکەن، بەلاّم گشت ئەو کراوەیی و ئازادی و بێ سنووریێەش کە دانیشتووانی ولاّتانی نێتۆرک دەخوازن خۆیانی لەسەر رابێنن و شانازی پێوە دەکەن، بۆ موسلمانێ کە لە ئاکامی جەنگ و هەژاری و زولّم و بێ شوێنی پەنای بۆ ولاّتانی نێتۆرک و بنکەی تازەگەرییەکان بردووە. بریتییە لە بێ ئیمانی و سەرەڕۆیی و بەرەلاّیی.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**


18- Anthony Giddens, Modernitetens folj-der, Studentlitteratur, Lund, 1996, ss.103.
19- Moderna Tider, Bokrec,1998:96, ss, 40-41.

# ئامرازی بەستن (ی) لە چەند گەمەیەکی شرۆڤەکاریدا

**د. شێرکۆ بابان**
**(زانکۆی سەلاحەدین - کۆلێژی ئەندازیاری)**

**دستپێک:**

ئامرازی بەستن (ی) ڕێزمانێکی زۆر زۆر ورد ئاڵۆزی هەیە، بەتایبەتی ڕۆڵێکی زۆر گەورەی هەیە لە ڕێزمانی (بڕگەی ناو)داو لە چەندین جێدا بە نارەوا بەناڕێزمان پەیوەست دەکرێت. لە بڕگەی ناودا، یان بڵێین لەکۆمەڵەی ناودا، ئامرازی (ی) زۆر زۆر بەئاڵۆزی وەردەسووڕێت لەسەر زمان و مەگەر هەر بەزمانی شیری بتوانرێت ڕێزمانەکەی دابین بکرێت. بێگومان، ئەوە گرنگ نییە کە بەزەبری زمانی دایک ڕێزمانەکەی لە ئاخاوتندا دابین بکەین، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بە ڕێزمانی لێی وردببینەوە و یاسا ڕێژی بکەین. لە ئەم نووسینەدا، بە ئەو هیوایەی کە نەختێک لە گلۆڵە ئاڵۆزکاوەکە خاو بکەینەوە، چەندین دیاردەی سرک و ئاڵۆز وەردەگرین و دەیانخەینە ژێر وردبینی ڕێزمانی.

**نموونە و شرۆڤە**

لەسەرەتادا، ئەم نموونانە وەردەگرین بۆ بەراورد:

ئاوی پاک ــ (ناو+ی+ ئاوەڵناو)

ئاوی کانی ــ (ناو+ی+ ناو)

لەنموونەی یەکەمدا، ناوی (ئاو) بارکراوە بە ئاوەڵناوی (پاک) و لە نموونەی دووەمدا، ناوی (ئاو) بارکراوە لەناوی (کانی). کەواتە، لە دوو دەستەواژەی جودا پەیدابووە. یەکەمیان بریتییە لە دەستەواژەی پەسنی (وەسفی) و دووەمیان بریتییە لە دەستەواژەی بار[illegible] سەربار (ئیزافە). لە ئەم هەڵوێستەدا دەتوانین دەستەواژەی یەکەم (ئاوی پاک) ناو بنێین دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو) و دووەمیان (ئاوی کانی) [illegible]اوبنێین دەستەواژەی (ناو و ناو) سەبارەت بە جیاوازی، لەنێوان ئەو دوو نموونەیەدا چەندین خاڵی بەراورد هەیە کە لەیەکتری جودایان دەکاتەوە، وەک:

یەکەم: ئەگەر ئامرازی ناساندن (ەکە) بکەین بە مەحەک و بی خشێنین لە هەردوو نموونەکە، ئەوا جیاوازییەکی گەورە پەیدا دەبێت، بە ئەم چەشنە:

ئاو ی پاک ــ ئاوە پاکەکە

ئاو ی کانی ــ ئاوەکەی کانی

لەنموونەی یەکەمدا، ئامرازی (ەکە) دوو کەتنی کردووە. یەکەمیان ئەوەیە کە (ئامرازی (ی) گۆڕیوە بۆ ئامرازی (O). دووەمیان ئەوەیە کە لەناوی (ئاو) ترازاوە و چووەتە سەر ئاوەڵناوی (پاک). ئەمەش وەک ئەوە وایە، کە ئاوەڵناوی (پاک) سەربەخۆ نەبێت و بریتی بێت لەپاشکۆیەک بۆ ناوی (ئاو).

لە نموونەی دووەمدا، بارەکە جیاوازە، چونکە دوو (ناو) هەیە و هەر ناوێک قەوارەی سەربەخۆی خۆی هەیە. هەر لەبەر ئەوە، ئامرازی (ەکە) بۆی هەیە کە بچێتە سەر ناوی یەکەم (ئاو)یان بچێتە سەر ناوی دووەم (کانی)، یان بچێتە سەر هەردوویان وەک:

ئاوی کانی ــــ ئاو (ەکە)ی کانی

ئاو (....)ی کانی یـ (ەکە).

ئاو (ەکە)ی کانی یـ (ەکە).

لەڕاستیدا، ئەم جیاوازییە وا دەکات کە چەند بەرەنجامێک تۆمار بکەین، وەک:

١- ئامرازە (ەکە) دەچێتە سەر (ناو) نەک (ئاوەڵناو).

٢- ئاوەڵناوی (پاک) سەربەخۆ نییە بە قەوارە و بریتییە لە گیرفانێک لە بەژنی (ناو)دا.

٣- ئامرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا بەزەبری ئامرازی ناساندن (ەکە) بووە بە (ــە). بێ گومان، ئەم ڕوخسار گۆڕینە بێ مەڵامەت نییە. ئەگەرنا، بۆچی لە دەستەواژەی (ناو و ناو)دا ئامرازی (ی) ناگۆڕێت بۆ (ــە).

دووەم: بە تەریبی لەگەڵ خاڵی یەکەمدا، ئەگەر ئامرازی ئاماژە (ئەو...ە) بکەین بە ئەندازە، دەتوانین جارێکی دی بگەینەوە بەهەمان ئەنجام. بۆ نموونە، لە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا، دەتوانین بڵێین:

ئەو ئاوە پاکە

بەڵام لە دەستەواژەی (ناو و ناو)دا، سێ باری شیاو هەیە:

ئەو ئاوەی کانی

ئەو ئاوی کانی یە

ئاوی ئەو کانی یە

لەڕاستیدا، لە ئەم خاڵەشدا، جارێکی دی هەموو ئەو بەرەنجامانە دەچەسپێن، کە لەکۆتایی خاڵی یەکەمدا تۆمار کران.

سێیەم: بە تەریبی لەگەڵ خاڵی یەکەم و دووەمدا، دەبینین کە ئاوەڵناوی (پاک)، وەک ئامرازی ناساندن (ەکە) و ئامرازی ئاماژە (ئەو..ە) ڕەفتار دەکات و بۆی هەیە کە سێ دەستەواژە دروست بکات لە نموونەی دووەمدا، وەک:

ناوی کانی: ئاوی (پاک)ی کانی (-)
: ئاو (....)ی کانی (پاک)
: ئاوی (پاک)ی کانی (پاک)

بێ گومان، ئەمە ئەوە بەبیردەخاتەوە کە:

١- دەستەواژەی یەکەم یەک قەوارەی سەرەکی تێدا هەیە، کە بریتییە لە قەوارەی ناوی (ئاو). لەبەرانبەردا، لەدەستەواژەی دووەمدا، دوو قەوارەی سەرەکی هەیە، یەکەمیان بۆ ناوی (ئاو) و دووەمیان بۆ ناوی (کانی).

٢- بەپێی خاڵی پێشوو، وشەی (ناو) قەوارە دروست دەکات و وشەی (ئاوەڵناو) بریتییە لە گیرفانێک، یان لە خانەیەک، کە لە قەوارەی (ناو)دا هەیە، بەواتایەکی دی، (ناو) بریتییە لەبنج و بنچینە لەدەستەواژەی ئامرازی (ی)دا.

٣- بەپێی ئەوەی گوترا، دەتوانین لە هەر دەقێکدا ژمارەی قەوارەکان دیاری بکەین بەژمارەی ناوەکان. بێ گومان وشەی (ناو) ئەو ناوانە دەگرێتەوە کە لە بنجەوە بریتین لە (ناو)، نەک ئەو وشانەی کە بریتین لە ڕوویەک لەناو، وەک (ئاوەڵناو، جێناو، ئاوەڵکار... تاد).

چوارەم: ئێستا، ئەگەر دیاردەیەکی دی بکەین بە پێوەرو ئەندازە، دەتوانین جارێکی دی جیاوازی بدۆزینەوە لەنێوان دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو) و دەستەواژەی (ناو و ناو)دا. بۆ نموونە، دەتوانین ئامرازی بەستن (ی) لاببەین، وەک:

ئاو (ی) پاک ــ ئاو پاک

ئاو (ی) کانی ــ ئاو کانی

لە نموونەی یەکەمدا، هیچ ئاسەوارێکی ئامرازی (ی) نامێنێت و ئاوەڵناوی گشتی (پاک) تەسک دەبێتەوە بۆ ئاوەڵناوێکی تایبەتی وەک:

کانی ئاو پاک: کارێزی ئاو پاک

کووپەی ئاو پاک: ڕووباری ئاو پاک

بۆری ئاو پاک: لوولەی ئاو پاک

لەڕاستیدا، زمانەکەی ئێمە زۆر زۆر دەوڵەمەندە بە ئەم ئاوەڵناوە تایبەتی و تەرخانکراوانە وەک:

دەستپاک، دڵپاک، سەرپاک، چاوپاک سەربەرز، چاو تیر، چاو تیژ، [illegible] دەم هار، دەم پیس، چاوپیس، دڵخۆش، دڵشا[illegible]وەدان، سنگ فراوان، کلاولار، دەم سوور، چاوکاڵ، چاوشین، ڕوومەت پان، لووت باریک، دەم زل، دان شاش،...تاد.

[illegible] نموونەی دووەمدا کاتێک کە ئامرازی (ی) لادەبەین) ئاسەواری ئامرازەکە هەر دەمێنێت و ماکی (خستنە سەر)، یان ماکی (بارو سەربار) بە تەواوی ون نابێت. لەزۆر ناوچەدا بە ئەو چەشنە بەکاردەهێنرێت، وەک:

باوک ئازاد، دایک منداڵ

دەشت گەرمیان، دەست چەپ

لەبەرانبەردا، لە هەندێک وشەدا، کە کۆتایی یان بە (بزوێن) هاتبێت، ناتوانین ئامرازەکە لاببەین وەک (برای ئازاد، مەمەی منداڵ).

سەرەڕای ئەوەی کە گوترا، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ نموونەی (ئاو پاک) و ئەو نموونانەی کە لەسەر ئەندازەی ئەو ڕیز کراون، دەبینین کە چەند خاڵێک هەیە بۆ تۆمارکردن وەک:

١- ئاوەڵناوی (پاک) چەند وشەیەکی بەستووە بەخۆیەوە و ئاوەڵناوی تەرخانکراو و تایبەتی چێ کردووە، دەشێت، ئاوەڵناویش قەوارەی هەبێت.

٢- بەپێ خاڵی پێشوو، دەشێت قەوارەی ئاوەڵناوی گیرفانێکی بچووکی تێدا هەبێت بۆ (تەرخان کردن)، وەک:

(ئاو) پاک، (دەست) پاک، (دڵ) پاک (چاو) پاک، (دەم) پاک، (سەر) پاک... تاد.

٣- ئەوەی دڵخۆشکەرە لە ئەو قەوارەیەدا، ئەوەیە کە دیاردەکە گشتییە و بریتییە لە مەکینەیەکی چوست و چالاک بۆ ڕۆنانی (ناوەڵناوی تەرخانکراو) لە (ئاوەڵناوی سادە)وە.

٤- لە ئەم هەڵوێستەدا، کە تێیدا دەڵێین ئاوەڵناو قەوارەی هەیە، دەتوانین بە ڕەوانتر بڵێین، ئاوەڵناو گیرفانێکی هەیە لە قەوارەی (ناو)دا و ئەو گیرفانەش خۆی لەخۆیدا کراوە بە قەوارەیەکی بچووکتر. کەواتە، قەوارەی (ناو) بریتییە لە چینی بنەڕەت و نەگۆڕو قەوارەی (ئاوەڵناو) بریتییە لە چینی دروست کراو بگۆڕ لەسەر چینی بنەڕەت، وەک:

[ئاوی (پاک)]: [قەوارەی ناو (قەوارەی ئاوەڵناو)]

٥- بەپێی ئەو زانیارییانەی کە لە پێشەوە باس کرا، جیاوازییەکی زۆر زۆر هوردو زانستی و دانسقە دەردەکەوێت، ئەو جۆرە زانیارییەش مەگەر هەر بە توێژینەوەی ئەکادیمییانە دەستگیربکرێت و هەندێک کەسی بیرتیژو پسپۆڕ لێی تێ بگەن. ئەو جیاوازییەش بریتییە لە ئەو ڕاستییەی کە ئامرازی (ی) لەدەستەواژەی (ئاوی پاک)دا یەکسان نییە بە ئامرازی (ی) لەدەستەواژەی (ناو و ناو)دا، وەک (ئاوی کانی). بەواتایەکی دی، ئەو دوو ئامرازە بریتین لە دوو ڕەگەزی زمانەوانی جیاواز لەناخی بیرداو لە بیرکاری ڕێزماندا بە ئەم شێوەیەیە:

١- ئامرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو و ناو)دا، وەک (ئاوی کانی) بریتییە لە ڕەگەزە گشتی و فراوانەکەی بارو سەربار، کە دوو قەوارەی (ناو) دەبەستێت بەیەکترییەوە.

٢- ئامرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا، وەک (ئاوی پاک)، بریتییە لە ئامرازێکی تایبەت بە (ئاوەڵناو). واتە، گیرفانێکی هەیە لە قەوارەی (ئاوەڵناو)داو لەگەڵ (ئاوەڵناو)دا پەیدا دەبێت و هەر لەگەڵ (ئاوەڵناو)یشدا ئاوا دەبێت.

٣- بەپێی ئەوەی لەخاڵی (١)دا گوترا، ئامرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو و ناو)دا لەسەر زەمینەی قەوارەی (ناو) نییە و لەدەرەوەیە. ئەمجار، بەپێی ئەوەی لەخاڵی (٢)دا گوترا، ئامرازی (ی) لەدەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا لەسەر زەمینەی قەوارەی جێی بووەتەوە و لەدەرەوەی قەوارەکە نییە وەک:

ئاوی کانی: [ئاو] ی [کانی]

ئاوی پاک: [ئاو ی (پاک)]

لە ئەم دواییەدا، دکتۆر عەلی ڕوخزادی کتێبێکی ڕەنگینی بڵاوکردەوە لەسەر ڕێزمانی کوردی، بەڵام بەزمانی فارسی، بە ناوی (ئاواشناسی دستور زبان کردی). لەئەو کتێبەدا، بە بەراورد لەگەڵ زمانی فارسی، زانیاری زۆر جوان ڕیز کراوە و بابەتی بەپێزی تۆمار کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا، چەند ساتمەیەک ڕووی داوە، کە لە ڕەنگینی کتێبەکە کەم ناکاتەوە. بۆ نموونە، لە ئاستی ئاوەڕۆکی ئەم خاڵەدا (خاڵی چوارەم) نووسەری بەڕێز جیاوازی بەدی نەکردووە لەنێوان هەردوو جۆرەکەی ئامرازی (ی) و بەیەکسانی لە هەردوو دەستەواژەکەدا سەوودای کردووە. ئێمە دەستخۆشی لەمامۆستا دەکەین و خۆزگا بەکوردیش بڵاوی دەکردەوە، وەک خۆی باسی کردووە. لەگەڵ ئەوەدا، دەتوانین چەند خاڵێک دەربارەی ئەو کتێبە تۆمار بکەین، وەک:

١- کتێبەکە بە تەریبی و لەسەر بنچینەی ڕێزمانی فارسی دانراوە و کەڵک لە ئەو خزماتییە وەرگیراوە کە لەنێوان ڕێزمانی کوردی و ڕێزمانی فارسیدا هەیە.

٢- دانەری کتێبەکە لەزمان و ڕێزمانی فارسیدا زۆر شارەزایە و وەک زمانی شیری وایە بۆی. هەر لەبەر ئەوە لەئەو کەسانە جودا دەبێتەوە کە کەڵکیان لەڕێزمانی فارسی وەرگرتووە، بەبێ ئەوەی وەک پێویست ڕێزمان و زمانی فارسی بزانن.

٣- دانەری کتێبەکە، شارەزاییەکی بەرفراوانی هەیە لە زمانی کوردیدا، بەزمانی شیری، نەک بەڕێزمان. هەر لەبەر ئەوە، ئەوەی نووسراوە بریتییە لە ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی ڕێزمانی فارسی.

٤- ئەگەر نووسەری کتێبەکە لە ئاستی ڕێزمانی کوردیدا وەک ئاستی ڕێزمانی فارسی با، ئێمە لە ئەو باوەڕەداین کە ئیشەکە جوانتر و نیانتر و کوردیتر دەردەچوو.

پێنجەم: لەدەستەواژەیەکدا، وەک:

کراس (ی) جوان

دوو واتای شیاو هەیە. یەکەمیان ئەوەیە ئەگەر (جوان) ئاوەڵناو بێت. دووەمیان ئەوەیە کە وشەی (جوان) بریتی بێت لە (ناوی کەسان)، وەک ناوی (کچان). ئێستاش دەتوانین هەردوو بارەکە بەراورد بکەین بە برشتی خاڵەکانی پێشوو (یەکەم تا چوارەم) بە ئەم چەشنە،

باری یەکەم: وشەی (جوان) یەکسانە (ئاوەڵناو):
لەخاڵی یەکەمدا دەستەواژەکە دەبێت بە:

کراسە جوان (ەکە)

لەخاڵی دووەمدا، دەبێت بە:

(ئەو) کراسە جوان (ـە)

لەخاڵی سێیەمدا، نموونەکە بەڕێزمان وەرناسووڕێت.

لەخاڵی چوارەمدا، دەبێت بە:

کراسی جوان ـــ کراسجوان

وەک، (کچی کراسجوان).

باری دووەم: وشەی (جوان) یەکسانە (ناوی کەسان):
لەخاڵی یەکەمدا دەبێت بە:
کراسەکەی جوان
لەخاڵی دووەمدا، دەبێت بە:
ئەو کراسەی جوان
لەخاڵی سێیەمدا، دەبێت بە:
ئەو کراسە جوانەی جوان
لەخاڵی چوارەمدا، نموونەکە وەرناسوورێت بەرێزمان.

لەڕاستیدا، ڕێزمانەکە، زۆر بلیمەتە و زۆر زۆر چروپرو پڕ جەنگەڵە، بەڵام ڕێزمانەکە خۆی خۆی ڕاست دەکاتەوە، ئەگەرنا، ڕێزماننووسان ئەگەر ئەم دیاردانەش بزانن، یان باسی بکەن، ئەوا بەزمـانی شـیـری دەیزانن، نەک بە (ڕێزمان).

شەشەم: هەندێک جار ڕیزێک لە ئامرازی (ی) دەچنە نێو دەستەواژەیەکەوە، وەک:
[ئاو (ی) پاک (ی) سازگار (ی) ڕوون]
لە ئەم نموونەیەدا، کـە بریتـیـیـە لە (ناو و ئاوەڵناو) دەتوانین تەمـاشـا بکەیـن و بـبـینین کـە چۆن ئـامـرازی ناسـاندن (ەکـە) و ئامـرازی ئـامـاژە (ئەو...ە) هەڵ دەسووڕێن:
- ئامرازی (ەکە):
[ئاو(ە) پاک (ە) سازگار (ە) ڕوون]ەکە
[ئامرازی ئاماژە (ئەو...ە):
ئەو [ ئاو (ە) پاک (ە) سازگار (ە) ڕوون]ـە
بەسـەرنجـێکی هورد و ژیرانە، لە ئەو نموونانەی سـەرەوەدا دەردەکـەوێت کـە هەر سێ ئامـرازەکـەی (ی) بەزەبری (ناسـاندن) وەرچەرخـاون بۆ ڕوخـسـاری (ـە). بەرانبەر بە ئەم دەستەواژەیە، دەتوانین ڕوو بکەین لە ڕیزە ئامرازی (ی) لە نێوان (ناو و ناو)دا، وەک:
[ئاوی ڕووباری دەڤەری بادینان]
لە ئەم نموونەیە دەتوانین هەردوو ئامـرازی (ەکـە) و (ئەو..ە) بخەینە کار، وەک:
- ئامرازی (ەکە):
[ئاوەکەی ڕووباری دەڤەری بادینان]
یان: [ئاوەکەی ڕووبارەکەی دەڤەری بادینان]
یان: [ئاوەکەی ڕووبارەکەی دەڤەرەکەی بادینان]
- ئامرازی (ئەو....ە):
ئەو [ئاوی ڕووباری دەڤەری بادینان]ـە
یان [ئەو (ئاو)ەی ڕووباری دەڤەری بادینان]
لەڕاستیدا، لە ئەم بارەدا وەک چوار ناو (ئاو، ڕووبار، دەڤـەر، بادینان) ڕیز بووە، چوار قـەوارەی (ناو) لەیەکـتری دراون و چەندین باری شیـاو هەیە و پێویست نابێت کـە هەمـوویان ڕیز بکەین. پاشـان، وەک بەرەنجـامـێک بۆ ئەم کـۆیلەیە دەتوانین ئامـرازی (ی) لەدەسـتـەواژەی (ناو و ناو) جـودا بکەینەوە لە ئامـرازی (ی) لە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا.
جیاوازییەکەش ئاشکرایە و زمانەکەش خۆی لەخۆیدا زۆر بلیمەتە و زۆر ڕێزمانییە.

حەوتەم: لە دەستەواژەیەکدا، وەک:
[ئاو (ی) پاک (ی) ڕووبار]
یان [ئاو (ی) ڕووبار (ی) پاک]
یان [ئاو (ی) پاک (ی) ڕووبار (ی) پاک]

دەسـتـەواژەکـە تێکەڵاوە (ناو) و (ئاوەڵناو) بە چەند جۆرێک دراون لە یەکـتری. ئێـسـتـاش ئەگـەر ئـامـرازی ناسـاندن. بکەین بە پێـوانە و ئەندازە، دەبـینین کـە ئەو کەرەستەیە دەزووی ڕەش و دەزووی ڕەش لەیەکتری هاوێر دەکات و چەند ڕاستییەک دەچەسپێت، وەک:
١- وەک دوو (نـاو) هەیـە لـە ئـەو نموونـانـەدا، دوو قـەوارەی (ناو) هەیە و ئەو دوو قەوارەیە بۆیان هەیە کـە دوو ئامرازی (ەکە) وەربگرن، وەک:
- [ئاو(ە) پاکەکەی ڕووبارەکە]
- [ئاوەکەی ڕووبار (ە) پاکەکە]
- [ئاو (ە) پاکەکەی ڕووبار (ە) پاکەکە]
لەنموونەی یەکـەمـدا ئامـرازی یەکـەم گـۆڕاوە بۆ (ە) لە نموونەی دووەمـدا ئامـرازی دووەم گـۆڕاوە و لە نموونەی سێیەم ئامرازی یەکەم و سێیەم گۆڕاون. بەواتایەکی دی، هەرچەند ئـامــــرازی (ی) لە چەشنی تێکـەڵاو بن لە دەسـتـەواژەکـەدا، بەڵام ئامـرازی ناساندن (ەکـە) زەبری ڕێزمانی خۆی دەسەپێنێت و تەنها ئەو ئامرازانە دەگۆڕێت بە (ـە) کە لەدەستـەواژەی (ناو ئاوەڵناو)دان. ئەگەرنا، وەک لە هەرسێ نموونەکەدا دوو (ناو) هەیە (ئاو ڕووبار) ئامرازێکی (ی) هەر ماوەتەوە بۆ ئەوەی قەوارەی (ناو) ببەستێت بە قەوارەیەکی ترەوە.
بە هەمـان شـێـواز، ئامـرازی ئامـاژەش دەتوانێت ئەو دەورە ببینێت و هەمان ئەنجام ببەخشێت، وەک:
- [ئەو (ئاو)ە پاکەی ئەو (ڕووبار)ە]
- [ئەو (ئاو)ەی ئەو (ڕووبار)ە پاکە]
- [ ئەو (ئاو)ە پاکەی ئەو (ڕووبار)ە پاکە]

لەڕاستیدا هەرچی بۆ ئامرازی (ەکە) گوترا، لە ئامرازی ئاماژە (ئەو..ە)شدا دەچەسپێت.

هەشتەم: لەڕووی بەرەنجام و پوختەسازییەوە دەتوانین چەند خاڵێک بخەینە ڕوو، وەک:
* ئامـرازی بەسـتن (ی) لەدەسـتـەواژەی (ناو و ناو)دا جـیـاوازە لە هەمـان ئامـراز لەدەسـتـەواژەی (ناو و

ئاوەڵناو)دا.
* کاتێک کە دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو) دەبێت بە بارگەی ئامرازی ناساندنی (ەکە)، یان بە بارگەی ئامرازەکانی ئاماژە، ئامرازی (ی) ڕوخسار دەگۆڕێت بۆ (ـە). لەبەرانبەردا، لە دەستەواژەی (ناو و ناو)دا ئەم دیاردەیە ڕوو نادات.
* ئامرازی بەستن (ی) لەڕەسەندا، دوو قەوارەی ناو بەیەکەوە دەبەستێت و لە هەر قەوارەیەکی ناودا، ئامرازی (ی) بۆی هەیە جێی ئاوەڵناو بکاتەوە. بەواتایەکی دی، ئامرازی (ی) لەدەستەواژەی (ناو و ناو)دا دوو قەوارەی (ناو) لەیەک دەدات، بەڵام لەدەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا لە قەوارەی ناودایە و لەناو ئەو قەوارەیەدا ئاوەڵناوێک بەناوەکەوە دەبەستێت.
* بەپێی خاڵی پێشوو ئامرازی (ی) لەدەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو)دا هیچ هەبوونێکی نییە لە ئاستی (ئاوەڵناو)دا، ئەگەر قەوارەی ناوێک لە ئارادانەبێت، بەواتایەکی دی قەوارەی (ناو) بریتییە لەچینی بنەڕەت لە دەستەواژەی (ناو و ئاوڵناو)دا.
* ئامرازی بەستن (ی) ئەگەر لە قەوارەی (ناو و ئاوەڵناو)دا لابرا، ئەوا ئاوەڵناوێکی تەرخان کراو پەیدا دەبێت. لە بەرانبەردا، ئەگەر لەدەستەواژەی (ناو و ناو)دا لابرا، ئەوا دوو ناوی بێ پێوەندی ڕیز دەبن.
* لەوانەکانی ڕێزماندا، لەیەکەم هەنگاودا پێویستە ئەو ئامرازە بخوێنرێت کە (ناو)ێک دەبەستێت بە ناوێکی ترەوە و دەستەواژەی (ناو و ناو) دروست دەکەن. لە دووەم هەنگاودا، پێویستە ئەو ئامرازە بخوێنرێت کە لە هەر یەکێک لە قەوارەی ئەو دوو ناوەدا جێی ئاوەڵناو دەکاتەوە و دەستەواژەی (ناو و ئاوەڵناو) دروست دەکات.

**سەرچاوە:**
**- د. وریا عومەر ئەمین، زمان و ماتماتیک، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (٩٧)، بەغدا، ١٩٨٣.**
**- د. وریا عومەر ئەمین، ئامرازەکانی بەستن، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان، ژمارە (٦٧)، بەغدا، ١٩٨٤.**
**- د. عەلی ڕوخزادی، ئاواشناسی دستور زبان کردی، تاران.**
**-د. شێرکۆ بابان، گەمەیەک لەگەڵ ئامرازی (ی)دا، ڕۆژنامەی برایەتی ئەدەب و هونەر، ژمارە (١٤٠)، هەولێر، (١٩٩٩/٨/٢٠).**

# ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان و مۆژدەیەک

**فەخرەددین تاهیر**
**(سوید)**

بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردی لە هەندەران بە چەند قۆناخێکی گرنگ و بەرچاو تێپەڕیوە، بەڵام موخابن هەتا ئێستا نەتواندراوە هەموو لایەنە شاراوەکانی بەسەر بکرێنەوە، یان لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لەسەر بکرێت، ئەوەی دەربارەی ئەم بزاڤە ڕۆشنبیرییەش ئەنجام درا بێت، بێگومان سەد لە سەد لەو باوەڕەدام کە کارێکی ناکامڵ و ناتەواوە، چونکە هەتا ئێستاکە بیبلۆگرافیایەکی تەواوی ئەو هەموو ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاڤۆکە کوردییانەی لە تەواوی هەندەران چ بە زمانی کوردی، یان بەزمانانی دیکەی بیانی دەرچوون بەچاپ نەگەیشتوون. ئەوەی کراشبێت هەروەک لە بەرایی ئاماژەم پێدا ناکامڵ و ناتەواوە، چونکە پێموایە ژمارەیەکی ئێجگار زۆری ئەو ڕۆژنامە و گۆڤار و بڵاڤۆکانە بەتەواوی نەدۆزراونەتەوە.

بێگومان ئەو جۆرە تەرزە کارانە کاری تاکە کەسی نین، بەڵکو کاری دامودەزگایەکی مەزنی ڕۆشنبیریین، کە دەبێ چەند لیژنەیەکی پسپۆڕ لەم بوارەدا پێک بهێنن بۆ ئەوەی بتوانن لە هەر وڵاتێک ئەو لیژنەیەی کە ئامادە دەکرێت خۆی بۆ ئەم کارە تەرخان بکات، بە واتەیەکی دیکە کاری کۆکردنەوە و بە ئەرشیف کردنی بزاڤی مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی لە هەندەران ئەوەندە سانا نییە بە تاکە کەس ئەنجام بدرێت، بەڵکو کاری گرووپێکی پسپۆڕە لەم بوارەدا، بەڵام موخابن هەتا ئەمڕۆکەش ئەم کارە گرنگ و بەرچاوە بە تاکە کەس ئەنجام دراوە و ئەنجام دەدرێت، هەر لەبەر هەندێش نەتواندراوە هەموو لایەنە بزر بووەکەی بخرێتە ڕوو، بەڵام خۆ ناکرێت لایەنە گرنگ و کاریگەرەکەشی فەرامۆش بکرێت، چونکە ڕۆڵی بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردی لە هەندەران لە نێوەندی ڕەوەندی کوردیدا هەنگاوی بەرچاو پۆزەتیڤی لە بواری میدیای کوردیدا بینیوە .

بەڵام ئەگەر باس لە بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردی لە هەندەران بکەین، دەبینین گەلێک لایەنی نهێنی هەیە هەتا ئێستاکە لەلامان بەتەواوی ڕوون نەبۆتەوە، بەڵکو دەتوانین بڵێین گەلێک نهێنی و بابەتی شاراوە ماون کە هەتا هەنووکە بۆ میدیای کوردی ئاشکرا نەبووە.

ئەز بەش بەحاڵی خۆم ماوەیەکی دوورو درێژە لە هەندەران لە گەڕان و بەدواداچوون دام بۆ ئاشکرا کردنی ئەو نهێنیانەو لەم ڕووەشەوە گەلێک کاری بەرچاوم ئەنجام داوە.

ئەوەی شایەنی باسە هەر لەو چەند ساڵەی ڕابردوودا چ لە ئەورووپا و ئەمریکا و ئوستراڵیا و سۆڤیەتی جاران بەگشتی و ڕوسیای ئێستا بەتایبەتی دەیان و سەدان گۆڤارو ڕۆژنامەو بڵاڤۆک و چاپەمەنی چ بەزمانی کوردی، یان زمانەکانی دیکەی بیانی لەسەر کورد دەرچووبن، یان دەردەچن بەشی زۆریانم دۆزیوەتەوە و لە ئەرشیفی خۆمدا لە سوید پاراستووە.

ئەوەی شایەنی باسە لە ساڵی (١٩٩٢)دا بۆ یەکەمین جار لە سەفەرێکی هونەری سەردانی شاری (سانکت بیترسبوورگ و مۆسکۆ)م لە ڕووسیا کرد.

ئەود بوو هەرچەند مانگێک دواتر لە مۆسکۆ دەستم کرد بەخوێندن، ئەمەش بۆ من بوو بەهەلێک کە بەدوای

ئەو چاپەمەنی و ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بگەڕێم کە لەپێش هەڵوەشانەوە و دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و ڕووسیای فیدراڵی ئەمڕۆدا دەرچوون، بەو نیازە سەردانی کتێبخانەو ئەرشیفخانەکان بکەم. دوای گەڕان و سۆراغێکی چەند ساڵی، توانیم لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠١)دا لە شاری سانکت بیترسبوورگ بەشی زۆریان بدۆزمەوە. بێگومان یەکێک لەو ڕۆژنامانەی کە بۆ یەکەمین جار دۆزیمەوە، ڕۆژنامەی (سۆڤیەت کوردستان) بوو. پێم وایە من یەکەمین کەسم کە ئەو شەرەفە گەورەیەم پێ دەبەخشرێت کە ڕۆژنامەیەکی کوردی لە سۆڤیەتی جاران دەرچووبێت دوای حەفتا ساڵ دەرچوونی لە ئەرشیفخانەیەک لە شاری (سانکت بیترسبوورگ) لە ڕوسیا بیدۆزمەوە.

ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان بەگوێرەی ئەو ژمارانەی لە ئەرشیفدا خوێندمەوە دیارە کە یەکەمین ژمارەی لە ساڵی (١٩٣١)دا لە شاری لاچین بەزمانی ئازەری چاپ وبلاو کراوەتەوە، ئەو ژمارانەی کە لە ئەرشیفخانەی رووسیادا دۆزیمەوە دەکەوێتە نێوان ساڵانی (١٩٣٨ - ١٩٤٥)، بەڵام مخابن ژمارە سەرەتاییەکان کە لەنێوان ساڵانی (١٩٣١- ١٩٣٧)دا دەرچوون هەتا هەنووکە چەنگم نەکەوتوون. ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان ڕۆژنامەیەکی هەفتانە بووە تیراژەکەشی لە نێوان «٧٠٠» دانە و هەندێک جاریش گەیشتۆتە «٨٠٠» دانە، قەوارەکەشی وەک ڕۆژنامەکانی ئەمڕۆی کوردستان بۆ نموونە وەک (خەبات، میدیا، جەماوەر، هاوولاتی...تاد) بەڵام تۆزێک درێژاییەکەی لەم ڕۆژنامانەی ئەمڕۆی کە ناومان هێنان بە «١٠» سانتیمەترێک درێژترە، ئەم ڕۆژنامەیە بە شێوەی ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمەی سۆڤیەتی جاران چاپ و بلاوکراوەتەوە، ئەو ژمارانەی کە من بینیومن، هەندێکیان لەسەر کاغەزێکی تەنکی زەردن و بەشێکی زۆریشیان کاغەزەکەیان تۆزێک ئەستوور ترە لە کاغەزی نۆرماڵ، ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان بەشی زۆری ژمارەکانی چوار لاپەڕەیین ناوە ناوەش بەدوو لاپەڕەیی بلاوکراونەتەوە ناوەڕۆکی ڕۆژنامەکە لاپەڕەی یەکەمی

Sovet Kurdystanь

SSRI birinçi çaqrьş Baş Sovetinin birinçi Sessijasь

Informasija ma'lumatь

بەشی هەرە زۆری ژمارەکانی تەرخان کراوە بۆ پڕوپاگەندە کردن بۆ دەسەڵاتدارانی ئەو سەردەمەی سۆڤیەتی جاران بەشی زۆری لاپەڕەی یەکەمی ئەم ڕۆژنامەیە بە وێنەی لینین و ستالین ڕازانراوەتەوە، بەڵام لە لاپەڕەکانی دیکەیدا زۆرتر گرنگی بە هەواڵی دەڤەرەکە دراوە کە ئەو دەڤەرەش لەو سەردەمەدا دەڤەرێک بووە بەناوی (سۆڤیەت کوردستان) ناسراوەو کە خاوەن ئۆتۆنۆمی بووە لە ماوەیەکی کەمدا. هەرچەند لە زۆر نووسین و وتاردا ناوی بەکوردستانی سۆر ناسراوە، بەڵام دوای گەڕان و سۆراغ کردن و دۆزینەوەی ئەو ژمارانەی ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان، بۆم دەرکەوت دەڤەرەکەش هەرناوی سۆڤیەت کوردستان بووە ئەوەی لای من سەرنجڕاکێش بوو ڕۆژنامەی سۆڤیەت کوردستان لە زۆربەی بابەت و نووسینەکانی کە تێیدا بلاوکراوەتەوە لە زۆر شوێندا ناوی (کوردستان)ی زۆر بە ڕاشکاوانە هێناوە بە پێچەوانەی ڕۆژنامەی ڕێیا تازە کە زێدەتر کوردو کوردستانی بە ناوی کرمانجی ناو بردووە.

مخابن لەبەر ئەوەی لە زمانی ئازەری باش تێنەدەگەیشتم زۆر بابەتی گرنگ هەبوو وەک شیعرو هەواڵ و ڕەوشی ئەو دەڤەرە بەباشی لێی حاڵی نەدەبووم. ئەو ژمارانەی کە لە ئەرشیفدا مابوونەوە زۆر بوون منیش فریای ئەوە نەدەکەوتم کە هەر هەمووی بەتەواوی بخوێنمەوە، هەر لەبەر هەندێش لەو کورتە نووسینەمدا دەمەوێ تەنێ ئەم ڕۆژنامەیە بۆ خوێنەرانی بەڕێز ئاشکرا بکەم وهەوڵ دەدەم لە گەڕانەوەم بۆ ڕوسیا لە داهاتوودا لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلی لەسەر ئەنجام بدەم.

ئەوەی جێگای باسە هەتا ئێستاکە هیچ نووسەرو ڕۆژنامەنووسێکی کورد بەهیچ شێوەیەک ئاماژەیان بەناوی ئەم ڕۆژنامەیە نەداوە، بۆیە لێرە دووبارەی دەکەمەوە کە من بۆ یەکەمین جار ناوی ئەم ڕۆژنامە لە میدیای کوردیدا لە باشووری کوردستان ڕادەگەیەنم.

لە دوماهیدا بەباشی دەزانم ئاماژەیەکی خێرا بەو ژمارانەی ڕۆژنامەی (سۆڤیەت کوردستان) بدەم کە لە ئەرشیفخانەی تایبەت بە ئەرشیف کردنی گۆڤارو ڕۆژنامە کۆنەکان لە شاری (سانکت پیترسبوورگ) لە ڕووسیا کە چاوم پێیدا خشاندوون و هەندێک لە ژمارەکانی بخەمە ڕوو، کە بریتین لەمانە:

١- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە«٣» [٣٤٠]، ١٥-١-١٩٣٨، لەسەر ناوی «سۆڤیەت کوردستان» دروشمی (هەموو پرۆلیتاریای جیهان یەکگرن) بە زمانی ئازەری نووسراوە و لەژێر ناوی ڕۆژنامەکەش نووسراوە: «ئۆرگانی دەڤەری لاچین»ە.

لەژێری ژێرەوەی لاپەڕە چواردا بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە: «سدیخ باژرامۆڤ» نووسراوە، ئەم ژمارەیە بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٢- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٤» [٣٤١]،

٢١-١-١٩٣٨، بەهەمان شێوەی ژمارەی پێشوو دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەر نووسراوە و ئەو ژمارەیەش بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٣- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٥» [٣٤٢]، ٢٥-١-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان وەک ژمارەکانی پێشتر وایە، بەڵام بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە گۆڕاوە کە ئەمە ناوەکەیەتی: «مامەش ئەحمەدۆڤ»، ئەم ژمارەیەش بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٤- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٧» [٣٤٤]، ٥-٢-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش بە هەمان شێوەی ژمارەکانی پێشوو، دروشم و ئۆرگان نووسراوە، بەڵام جارێکی دیکە ناوی بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە گۆڕاوە و لە کۆتایی لاپەڕە چواردا، (سدیخ باژرامۆڤ) نووسراوە، ئەم ژمارەیەش بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٥- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٨» [٣٤٥]، ١٠-٢-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە هەروەک ژمارەی حەوت وایە و ئەمەشیان بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٦- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە«١٠» [٣٤٧]، ١٨-٢-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە هەروەک ژمارەی «٨» وایە و بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٧- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١١» [٣٤٨]، ٢٣-٢-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە وەک ژمارەی پێشتر وایە بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٨- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١٢» [٣٤٩]، ٢٨-٢-١٩٣٨، بە هەمان شێوەی ژمارەکانی پێشوو دەرچووە و دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە دەستکاری نەکراوە و بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٩- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١٣» [٣٥٠]، ٥-٣-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش وەک ژمارەکانی پێشوو دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە دەستکاری نەکراوە و بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١٠- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١٥» [٣٥٢]، ١٥-٣-١٩٣٨، ئەم ژمارەیە پێشوو دروشم و ئۆرگان وەک ژمارەکانی پێشوو دەستکاری نەکراوە، بەڵام بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە: (میرهاد عەبدوڵلاژێڤ»ە، ئەم ژمارەیەش هەر بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١١- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١٧» [٣٥٤]، ٣١-٣-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان وەک خۆیەتی، بەڵام جارێکی دیکە بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە بۆتە (سدیخ باژرامۆڤ) و ئەمجارەشیان بەشەش لاپەڕە دەرچووە.

١٢- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١٨» [٣٥٥]، ٥-٤-١٩٣٨، ئەم جارەشیان دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە وەک ژمارەی «١٧»وایە، بەڵام تەنیا بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١٣- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٤٣» [٣٨٠]، ٢١-٨-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان دەستکاری نەکراوە، بەڵام بەڕێوەبەری ڕۆژنامە: (سامان ئەحمەدۆڤ)ە، ئەمجارەشیان هەر بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١٤- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٤٤» [٣٨١]، ٢٨-٨-١٩٣٨، ئەم ژمارەیەش وەک ژمارەی «٤٣» بڵاوکراوەتەوە. هیچ دەستکارییێک لە دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەر نەکراوە.

١٥- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٤٥» [٣٨٢]، ١-٩-١٩٣٨، بەهەمان دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە هەروەک ژمارەی پێشوو بڵاوکراوەتەوە، لە لاپەڕەی یەکەمی ئەم ژمارەیەدا دوو وێنەی لینین و ستالین بەگەورەیی چاپ کراون.

١٦- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «١» [٤٦٨]، ٥-١-١٩٤٠، لەم ژمارەیەشدا دروشم و ئۆرگان وەک خۆی ماوەتەوە، بەڵام بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە گۆڕاوە و لەژێری ژێرەوەی چوارەم لاپەڕەدا (محەمەد هاشم زادە)ی لەسەر نووسراوە و بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١٧- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٢» [٤٦٩]، ١٠-١-١٩٤٠، لەم ژمارەیەشدا دروشم و ئۆرگان و بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە وەک ژمارەی «١» وەک خۆی (محەمەد هاشم زادە) ماوەتەوە و هەر بە چوار لاپەڕە دەرچووە.

١٨- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٥» [٤٧٢]، ٢٧-١-١٩٤٠، بە هەمان دروشمی پێشوو، بەڵام ناوونیشانی ئۆرگان بەم شێوەیەی لەسەر نووسراوە: (ئۆرگانی پارتی کۆمەنیستی ئازەربایجان لە لاچین). بەڕێوەبەری بەرپرسی ڕۆژنامە: (مامەش ئەحمەدۆڤ)ە، بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

١٩- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٥٢» [٧٦٤]، ٢٨-١٢-١٩٤٤، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان وەک خۆیەتی، بەڵام لەسەر لاپەڕەی یەکەمی ئەم ژمارەیەدا نووسراوە: [ئەم ڕۆژنامەیە لە ساڵی (١٩٣١)ەوە بە بەردەوامی بڵاودەبێتەوە]. بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە (محەمەد هاشم زادە)یە و ئەم ژمارەیەش هەر بەچوار لاپەڕە دەرچووە.

٢٠- سۆڤیەت کوردستان، ژمارە «٤٩» [٨١٣]، ٢٧-١٢-١٩٤٥، ئەم ژمارەیەش دروشم و ئۆرگان وەک خۆیەتی، بەڵام بەرپرسی بەڕێوەبەری ڕۆژنامە «دلارا ماهیشۆڤا»یە و ئەم ژمارەیەش بە دوو لاپەڕە چاپ و بڵاوکراوەتەوە.

٢٠٠٤/٦/١٥

# هونەری تەلارسازی
# لەپێناو بەرهەمهێنانی هونەرێکی ڕەسەنی هاوچەرخی کوردیدا

کامەران تاهیر

ژمارەی کەسەکان، مرۆڤەکان، کۆمەڵەکان زیادی دەکردو لە ئەشکەوت و پەناگەیەکدا جێگەیان نەدەبۆوە، ئیدی ئەو کەسانەی دەرەوەی ئەشکەوت بۆ ئەوەی لەحەشارگەو پەناو پەسارێکدا خۆیان داڵدەبدەن، بیریان کردەوە، کە لە نزیک ئەشکەوتی کۆمەڵەکەیان، یاخود گروپەکەیان، بناغەی یەکەمین خانووبەرە، یان ماڵ چێ بکەن، یاخود کلۆری دارو درەختەکان بکەنە شوێنی پشوودان و حەسانەوە، یان دواتر فێری ئەوەبوون، کە غەرە بەرد لەسەر یەک هەڵبچنن و سەری بە دارو درەخت بگرن و بە پووش و پەڵاش و قوڕ سوراغی بدەن، بەشێوەیەک لە گەرماو سەرما بیانپارێزێت و تێیدا بحەوێنەوە، ئەم شوێنە بۆتە بنەمای یەکەمین پرۆسەی تەلارسازی، کە بەرە بەرەو بەگوێرەی پێداویستی قۆناغەکان، سەردەمەکان. تێپەڕبوونی کات گۆڕانکاری ڕیشەیی بەسەردا هاتووە. چەندین ڕەهەندی جۆراوجۆر و دەلالەتی روون و تێڕوانینی سەرتاپاگیرانەی لەخۆگرتووە، بەواتایەکی دی سروشتی تەلارسازی لە ئاکامی ئاڵوگۆڕە جۆراوجۆرەکانی سەردەمەکان گۆڕانکارییەکی مەزنی بەخۆیەوە بینی، ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرانەی تەکنەلۆژیاو زانست و زانیاری وایکرد هونەری تەلارسازی بە ڕەنگ و تەرزی نایاب بەرجەستە بێت و، گیانێکی نوێی پێ ببەخشرێت، ببێتە مایەی ئەوەی دۆخێکی هارمۆنی گونجاو چێ بکات، بگاتە ڕادەی خەمڵین و تەواوکارییەکی لەبار وەربگرێت و گۆڕانی لە ئەندازەبەدەر بەخۆوە ببینێت، سەرومڕیش تەلارسازو ئەندازیاران لەهەوڵی ئەوەدان، کە پێودانگی تایبەت بەهونەری تەلارسازی دابهێنن، کە ڕەنگدانەوەی ئەو کولتوورو کەلەپوورە بێت، کە لە ژینگەکەیاندایە، بەم پێیە بە هەند وەرگرتنی دابونەریت و ژینگە و چەندین هۆکاری دی لەلایەن نەخشەسازانەوە، پەیبردنە بە سروشتی کولتوورو نەریتی کۆمەڵەکەمان، لە هەمان کاتدا ئەوەش دەگەیەنێت، کە تا چ ڕادەیەک نەخشەو مۆدێل و تەرزی تەلارسازی لە سەرانسەری دنیادا، تا چەند ئەو هۆکارانە بە هەند وەردەگرن و چۆن چۆنی سەودایی لەگەڵ ئەو توخم و ڕەگەزانە دەکەن.

تەلارسازی داهێنەر هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدایە هونەری تەلارسازی دەرباز بکات، لەو پێودانگە باوانەی، کە دەیان ساڵە کاری پێ دەکرێت، بۆیە بەردەوام لە سۆراخ و منەکردن و توێژینەوەی مۆدێل و پێکهاتەو شێوە جیاجیاکانی هەر تەلارێک ڕادەمێنێت، چونکە پێیوایە، دەبێ تەرزو مۆدێلەکانی پێشتر زەمینەسازی بۆ پێودانگێکی جیاوازو نوێتر چێ بکەن، نەک لاساییکردنەوە و بەرهەمهێنانەوەی هەمان پێودانگی باو و دیاریکراوی پێشتر دووپات بکەنەوە، کەواتە پەیوەندییە هاوبەشەکانی نێوان ڕەگەزەکانی هەر تەلارێک ستراتیژیەتێکی روون دیار دەکات، بۆ دەستنیشانکردنی هێلکارییەکی گشتی، لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەو نەخشەیەی کە هەر تەلارسازێک گەرەکێتی بێتەدی یاخود لەدایک ببێت.

هەڵبەتە ئەو ئاڵوگۆڕە بەرفراوان و تێکەڵاوبوونە سەرتاپاگیرەی نێوگەلان، هەرچەندە لەلایەکەوە دەرەنجامێکی ئەرێبیانەی لێدەکەوێتەوە، بەڵام لەلایەکی دی ڕەنگە هەندێک جار کاریگەرێتی نەرێیانەشی هەبێت، ئەگەر لایەنی ئەرێیانە خۆی لەوەدا دەربخات، کە ئاسۆیەکی بەرفراوانی بەرووی میللەتاندا کردبێتەوە، لایەنی نەرێیانەش خۆی لە لاوازکردن و کاڵکردنەوەی تایبەتمەندییە نەتەوەیی و خۆماڵییەکان دەنوێنێت، نەک هەرهێندە، بەڵکو ڕەنگە ئەو خەسڵەت و پەسنانە بە تەواوەتی لەناوبچن و بپووکێنەوە، لەم چوارچێوەیەدا پێویستە قسە لەسەر چەمکی (کەلەپوور) بکرێت، دواتریش دەستنیشانی سروشتی ئەو ژیارە بکەین، کە گەرەکمانە بەرهەمی بێنین.

مرۆڤەکان، کەسەکان، کۆمەڵگەکان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان ئەو شتەی ئەوان هەیانە لەشتی کەسانی دی باشتر بێت، یاخود جیاوازتر بێت، خودان جۆرێک لە پەسن و تایبەتمەندێتی بن، تاکو لە شتەکانی خەڵکانی دی جیابکرێنەوە، هەر بۆیە کاتێک ئێمە دەڵێین مرۆڤەکان، کەسەکان، کۆمەڵگەکان لە هەوڵی ئەوەدان شارستانی و ژیارێک چێ بکەن، کە بۆن و بەرامەو ڕوخسارەکانی جودابێت، بەڵام کاتێک ژیارێک خودان هیچ مۆرک و ڕەنگێکی دیاریکراو نەبێت، ئاخۆ دەکارین ئەوە بە ژیار ناو ببەین، کە هیچ تایبەتمەندی و شەقڵێکی جیاکراوەی لەخۆ نەگرتبێت.

دیرۆکی مرۆڤەکان، کۆمەڵەکان ئەوەمان بۆ دەگێڕنەوە، کە گەلان بەردەوام لە هەوڵی گەلاڵەکردن و هاتنەکایەی ڕەوشێکی کۆمەڵایەتی لەباربوون، تاکو تایبەتمەندێتی خۆیان پەرەپێ بدەن و بتوانن قەڵەمبازی مەزن بهاوێژن، ژیارو هونەرێکی جیاوازتر لەخەڵکانی دی بەرهەم بهێنن، بۆ ئەوەی هونەری تەلارسازی خودان ئەدگارو خەسڵەتە دیاریکراوەکانی خۆی بێت، پێویستە تەلارسازان هەلومەرجێکی ماددی و ژینگەیی گونجاو ساز بکەن، تاکو کەشێکی گیانی و سۆزمەندی گونجاو بۆ تاکەکان، مرۆڤەکان، کەسەکان دەستەبەر ببێت، لەم سۆنگەیەوە دەبێژین تایبەتمەندێتی پێویستە لەبازنەیەکی بچووکەوە بەرەو جغزێکی مەزنتر گوزەر بکات، بەواتایەکی دی تایبەتمەندێتی پێویستە لەسەرەتادا لەپێکهاتەی ژینگەیی و خۆماڵیدا ڕەنگ بداتەوە، تاکو دواتر مرۆڤەکان، شانازی بەتایبەتمەندێتی سەرتاپاگیری بکەن، کەواتە ئەم پرۆسەیە بەم شێوەیە خۆی بەرجەستە دەکات، کە دەبێت لەتایبەتەوە بەرەو گشتی هەڵبکشێین، لەم چوارچێوەیەدا هونەری تەلارسازی پلەوپایەیەکی گرنگ وەردەگرێت، پێویستە ڕێگەچارەی گونجاو بدۆزرێتەوە، بۆ توانەوەو ئاوێتەبوونی تایبەتمەندێتی کولتووری خۆماڵی لە بۆتەی تایبەتمەندێتی ئەمڕۆدا، ئەگەرنا هونەری تەلارسازی دووچاری شکستهێنان و نغرۆبوون دەبێت و، ناکارێت بەشداری کارا لەم ڕووەوە بکات، بۆیە پێویستە تەلارسازو ئەندازیاران لە هەوڵی ئەوەدابن، بەشێوەیەکی زانستیانە سەودایی لەتەک کەلەپووردا بکەن و ئاوێزانی هونەری تەلارسازی نوێ و هاوچەرخی ئەمڕۆی بکەن، ئەمەش نابێ تەنیا بەو شێوەیە سەرنجی بدرێتێ، کە بۆ خۆشی و چێژوەرگرتنە، بەڵکو پێویستە وەک پێداویستییەکی گرنگ و شارستانی بەرجەستە بکرێت.

دیارە گەلی کوردستانیش خودان کولتوورێکی یەکجار دەوڵەمەندو مەزنی هونەری تەلارسازییە، ئەگەرچی تاکو ئێستا ئەندازیاران نەپرژاونەتە سەر ئەوەی بکارن ئەو شارەزایی و ئەزموونانەی، کە هەزاران ساڵە لەم خاکەدا کەڵەکەبووە، بەشێوەیەکی زانستیانە کۆبکەنەوەو لە نەخشەو بەرنامەو هێڵکارییەکانیاندا کەڵکی لێوەربگرن یاخود وەگەڕی بخەن، نەک هەر ئەوەی بە تەنیا ئەو کۆشک و تەلارو خانووبەرانە بکرێنە مۆزەخانە یاخود لەڕووی ئابوورییەوە سوودیان لێ وەربگیرێت، وەک کردنیان بە بنکەو مەڵبەندی کولتووری و ڕۆشنبیری، یاخود ببێتە جێگەو بایەخپێدانی گەشتیاران، هەرچەندە دەکرێت لەو ڕووەوە سوودێکی یەکجار زۆریان پێ ببینرێت، بەڵام ئەوەی ئێمە مەبەستمانە، ئاخۆ چۆن بتوانین ئەو کولتوورو کەلەپوورەی گەلەکەمان لەبوارە جیاجیاکانی وەک ئەفسانەو بەسەرهات و داستان و چیرۆک و سەرگوزشتەکانی خۆمان بگوازینەوە و لەهونەری تەلارسازی ئەمڕۆماندا بەرجەستەی بکەین، واتە چۆن سەودایی لەتەک کولتوورو کەلەپووردا بکەین و چۆن بەکاریان بهێنین و بەچ شێوەو تەرزێک لەم هونەرەدا ڕەنگ بداتەوە.

بۆ ئەوەی چەمکی کەلەپوور چاکتر ڕوون بێت، وا پێویست دەکات لەسەرەتادا ئەو چەمکە بەگشتی پێناسە بکرێت، دواتریش هەوڵ بدەین لە هەموو ڕوویەکەوە ڕوونی بکەینەوە:

کولتوور ئەو هەبوونە ماددی و گیانیانە دەگرێتەوە، کە مێژووی هەر نەتەوە و گەلێک پێک دێنێت، ئەو هەبوونانەش لەهۆشمەندی تاکەکانیدا لەدوو دۆخدا گەڵاڵە دەبن، یەکەمیان دۆخی (کارا) و دووەمیشیان بە دۆخی (ناکارا) نێوزەد دەکرێت، ئایا سروشت و پەسنەکانی ئەو دوو دۆخەش خۆیان لەچیدا بەرجەستە دەکەن؟

دۆخی کارایی لەکەڵەکەبوون و کارلێکردنی نێوان ئەو هەبوونە ماددی و گیانیانە پێک دێن، دواتریش ئەم توخم و ڕەگەزانە لەنێوان خۆیاندا سیستەمگەلێکی هەبوونی تایبەت بە قۆناغێکی دیاریکراو لە قۆناغەکانی مێژوو پێکدێنن، هەروەک چۆن تاکەکان، مرۆڤەکان، کۆمەڵگەکان پەیان پێ دەبەن، هەر سیستەمگەلێکیش خودان کۆمەڵێک هەبوونی کەڵەکەبووە، کە ئەوانەش بەگوێرەی زنجیرەیەکی تایبەت بەخۆیان ڕێک دەخرێن و، سەرەتایەکی دیاریکراویان هەیە.

ئەم کەلەپووە کارایەش بنەمایەکی هزری بەرفراوان لە هۆشمەندی تاکەکانی کۆمەڵگە دەنوێنێت، بەڵام هەمان هزری کۆمەڵگەش هەتاسەر بەرهەم ناهێنێت، بەم پێیە سیمایەکی جێگیر وەرناگرێت، کە بەردەوام خۆی دووبارە بکاتەوە، کە توانای گۆڕان و ئاڵوگۆڕکردنی نەبێت، بەڵکو لەکارلێکردن و ئاوێتەبووندایە لەتەک دەرهاویشتە هزریە نوێیەکاندا، تاکو بەگوێرەی ئەو پێداویستیانەی کۆمەڵگە دەیانسەپێنێت، خۆی بگونجێنێت و پەرەبسێنێت، ئەم کرداری کارلێکردن و پەرەسەندنەش دەبێتە مایەی لەنێوچوونی هەندێک لەڕەگەزو کەڵەکەبووەکان و پووکانەوە و هاتنەدی و کەڵەکەبوونی نوێی دی لە شوێنیاندا، بەم شێوەیە کۆمەڵگە لە سایەی پرۆسەیەکی بەردەوامی کەڵەکەبوونی هەبوونەکان و پووکانەوەی هەندێک لە کولتوورو کەلەپوور لەقۆناغێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگوازرێتەوە.

هەرچی دۆخی (ناکارا)شە، لە هەبوونە ڕاستەقینەکان پێک دێت، لە هۆشمەندی کۆمەڵگەدا، خودان هێزێکی کاریگەر نییە، کاتێک کۆمەڵگە لە بزاوتێکی هەمیشەیی و سوراخکردنێکی بەردەوامدایە، هەندێک جار کارلێکردن لەتەک هەندێک ئەو هەبوونە (ناکارا)یانە، ئەنجام دەدات، ئەم کارلێکردنە چالاکە نوێیەش دەبێتە بەشێک لە پەیبردنەکانی تاکەکانی هەر



کۆمەڵگەیەک و، جێگەی گونجاو و ڕیزبەندی خۆی لە سیستەمگەلی هۆشمەندی گشتی لە قۆناغێک لە قۆناغەکانی مێژوودا دەکاتەوە.

ئەگەر سەرنجی کەلەپووری تەلارسازی بە هەردوو دۆخەکەیدا بدەین، یەکجار دەوڵەمەندو چڕوپڕو تێکچڕژاوەو خودان چەندین پێوەندی و پێکهاتەی ئاڵۆزو تێکئاڵاوە، کە هونەرمەندی تەلارساز تەنیا هێندەی لەسەرە زیرەکانە بچێتە پێشەوە و سەودایی لەگەڵدا بکات، بەڵام ئەگەر هەڵوەدای سوراخ و گەڕان و مشتومالکردن بێت، دەستی لەگەنجینەی بەنرخ و ئاڵوواڵای وەها گیر دەبێت، کە هەرگیزاو هەرگیز لەبن نایەت.

بەڵام ئێستا قسە لەسەر چۆنێتی تێئاخنینی کەلەپوورە، لەپێکهاتەی تەلارسازی نوێدا، کە ناشێت سەوداییکردن لەتەکیدا بەشێوەی وەرگرتن و پێوەلکاندنی کەلەپوور بێت، لەسەر خانووبەرە و تەلاری نوێ، کە ئەمڕۆ چێ دەکرێت، چونکە تێئاخنینی کەلەپوورو گواستنەوەی شکستی و بێ توانایی ئەندازیاران نیشان دەدات، کە ناکارن باڵەخانە و تەلاری نایاب ڕۆبنێن، کە ڕەنگدانەوەی ئەم پەرەسەندن و پێشکەوتنەی سەردەم بێت، نەک هەر هێندەش، بەڵکو کاتێک بەو شێوەیە سەودایی لەگەڵ کەلەپووردا بکرێت، ئەوا دەرکردنێتی لە چوارچێوەی تایبەتمەندێتی و داماڵینێتی لە پێوەندی و پێکهاتە مێژووییەکانی، هەنگاوهەڵێنانیش بەو ئاراستەیە، ئەنجامدانی کردارێکە دژ بە ژێربێژی دیالێکتیکیانەی هونەری تەلارسازی و پێکهاتەکانیەتی، ئەگەرچی دەبێت شێوەو شێوازی تەلارسازی بەرەنجامی کارلێکردنی دیالێکتیکانەی نێوان خواستە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەک و تەکنەلۆژیاو ئامرازەکانی سەردەم لەلایەکی دیکەوە بێت، بۆیە تێگەیشتنی چەوتمان، لەبارەی شێوەو تەرزی هونەری تەلارسازی دووچاری پاشاگەردانی و سەرلێشێواوی دەبێن، بەواتایەکی دی وەرگرتنی کەلەپوورو لکاندنی بەتەلاری ئەمڕۆ، دەبێتە مایەی شێواندن و چێژوەرنەگرتن لەم هونەرە مەزن و خرچاندنی هونەری تەلارسازییە بەگشتی.

ئەمڕۆ قسەکردن لەبارەی شێوەی تەلارسازی نوێ و هاوچەرخە، کە هاوشان بێت، لەگەڵ ئەو پێشکەوتن و شۆڕشە تەکنەلۆژیەی سەردەمدا، ئەم تەرزەش پێویستە خودان تایبەتمەندێتی خۆماڵی ڕوون و ئاشکرا بێت لە پێکهاتەیدا، دیارە ئەم کردارەش تەنیا بە تووانەوە و ئاوێتەبوونی گیان و ڕوخسارەکانی کەلەپوور لە پێکهاتەی هونەری تەلارسازی دێتەدی، کە ئەمەش لە

ئاکامی سروشتی چەمکە نوێ و گۆڕاوەکانی هونەری تەلارسازی خۆماڵی و جیهانییەوە هاتۆتە کایەوە، کەواتە شێوەی گشتی تەلارسازی خۆماڵی و جیهانی دەرئەنجامی پەرەسەندن و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ و جوانکارییە نوێ و پیشەنگەکانی ئەم سەردەمەیە، ئەم دوو چەمکەش (تەکنۆلۆژیاو جوانکاری) دوو تەوەری هاوکات و کارلێکەرن و یەکیان دەبێتە مایەی لەدایکبوون و سەرهەڵدانی ئەوی دیکەیان.

ئەو پرسیارەی، کە جارێکی دیکە ڕووبەڕوومان دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە، ئاخۆ مەبەستمان چییە لە ئاوێتەبوونی کەلەپوور؟ هەڵبەتە توانەوەو بەکاربردنی کەلتوور لەهونەری تەلارسازی هاوچەرخدا، ئەوە ناگەیەنێت، کە پەسن و ڕوخسارەکانی ڕابردوو بگوازینەوە یاخود لەبەری بگرینەوە و لاسایی بکەینەوە، چونکە دیالێکتیکی پێکهاتەی داهێنانی شێوە، گواستنەوەو وەرگرتن ڕەت دەکاتەوە، بۆیە هەموو جۆرە گواستنەوەیەکی کتومت و وەرگرتن و لەبەرگرتنەوەی دەقاودەقی کەلەپوور، کە هیچ ئاڵوگۆڕو گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهێنراوبێت دەبێ ڕەتبکرێتەوە، چونکە ناکۆک و دژن لەتەک پێداویستییەکانی بەرهەمهێنانی نوێ و چەمکە جوانکارییە نوێیەکاندا.

تەلارسازی داهێنەر هەرگیز بەوەرگرتن و لەبەرگرتنەوەی شێوەی کەلەپووری تەلارسازی قایل نابێت، بەڵکو هەوڵ دەدات لەسەرچاوە جۆراوجۆرەکانەوە داهێنانەکانی خۆی هەڵگۆزێت، بێگومان ئەم هەڵێنجانەش بنەماو ڕێسای تایبەت بەخۆی هەیە، تاکو ببێتە مایەی ئەوەی کرداری هەڵگۆزین سوودمەندبێت:

دەبێ ئەو تەلارسازەی لەو بوارە کار دەکات، کارامەو لێهاتووبێت و بڕوای بەوە هەبێت، کە تێئاخنینی کەلەپوور پێویستە، هەروەها پەی بەچەمکی کەلەپوور ببات و بەتەواوی هەرسی کردبێت.

کرداری توانەوە و ئاوێتەبوونی کەلەپوور بۆ بەرهەمهێنانی شێوە نوێیەکان بەگوێرەی بنەماکانی دیالێکتیک ئەنجام بدات.

ئەوەی جێگەی ئاماژەپێکردنە بە خورتی بەکارهێنان و تێئاخنینی کەلەپوور لە هەر کارێکدا هیچ ئاکامێکی سوودمەندی لێ ناکەوێتەوە، چونکە کارامەیی و ئەڤین و بڕوابوون و کارکردنی بەردەوامی ڕاست و دروست لە هەر کارێکدا دەستەبەری ئەفراندنی تەلارسازی دەکات، دیارە هەر کەلەپوورێکی تەلارسازیش خودان ڕوخساری پەسنی جیاوازەو لەکەلەپووری کۆمەڵگەیەکی دیکەدا نابینرێت.

بەڵام هەندێک جاری دیکە لەبەر ئەوەی چەندین کۆمەڵگەو نەتەوەی جیاجیا سەر بەیەک کەلەپووری ئۆلی و بیروباوەڕن، ئەوە بەچاکی دەتوانرێت تەرزی هونەری تەلارسازی ئەورووپی لەتەرزی دیکەی وەک هیندی و چینی و ئیسلامی جیابکرێتەوە، کە دەستنیشانکردنی خەسڵەتی کەلەپووری هەریەکێک لەم ژیارانە دەبێتە مایەی دیاریکردنی چیەتی هەر هونەرێکی تەلارسازی لە هەر کۆمەڵگەیەک ئەمە لەلایەک، لەلایەکی دی ڕەنگە دەیان گەل و نەتەوەی جیاجیا بەشداری کاراو دیاریان لەڕۆنان و بەرەوپێشڤەبردنی هونەری تەلارسازی ئەورووپی یاخود هیندستانی یاخود چینی یان ئیسلامیدا کردبێت، هەربۆیە بەراوردکردنێکی خێرا لەنێوان تەلارسازی سەربەم ژیارانە دەکارین چەندین پەسن و تایبەتمەندێتی لەنێوانیاندا بە ئاشکرا بەدی بکەین:

یەکەم: لە تەلارسازی ڕۆژهەڵاتی بەگشتی پانتاییەکی دەورەدراو واتە پانتایی ناوەوە بەدی دەکرێت، ڕەنگە هەندێک جار بۆ بۆشایی یاخود پانتاییە بەتەنیا بەدی بکرێت، یاخود بۆ کۆمەڵ، کە چەندین ڕەگەزی جیاجیا بەنێویەکداچوون، ئەو پێکهاتانەش پێوەندی نێوانیان ئاڵۆزە لەبەرامبەر پانتایی ناوەوەدا، لەهونەری ئەورووپی و هیندستانیدا بەزەقی پەیکەرتاشی دەرەکی بەئاشکرا بەدەردەکەوێت.

دووەم: پەسنێک هەیە بە (تەلارسازی شاراوە) نێوزەد دەکرێت، لێرەدا ئەم خانووبەرەیە وەک تەلارێک خۆی نمایش ناکات، کە لە دەرەوەڕا وەک گشتێک و لە هەموو لایەک بشێت سەرنجی بدرێتێ، بۆ نموونە پەرستگەیەکی یۆنانی یاخود تەلارێکی سەردەمی ڕێنیسانس، تەلارسازی شاراوە کارلێکردن لەگەڵ تاکدا دەکات، ئەودەمەی بەتەنیا لەنێویدا هامشۆ دەکات، نەک وەک کۆمەڵە تاکێک، ئەوکاتە هەست بەو پێوەندییە شاراوەیە دەکات و بەو پێکهاتە تەلارسازییە شەتەک دەدرێت.

سێیەم: دیمەنی گشتی دەرەکی لەتەلارسازی ڕۆژهەڵاتی بەگشتی گوزارشت لەناوەوە ناکات و ڕەنگدانەوەی نییە، پێچەوانەکەشی هەر ڕاستە، لەوانەیە دەرەوە دیوارێکی یەکجار بەرزو مەزن و سادەبێت، کەچی ناوەوە لەکۆمەڵێک پانتایی ئاڵۆز پێک دێت.

چوارەم: لەتەلارسازی ڕۆژهەڵاتی بەگشتی پێویست بە جووتبوونی نێوان شێوەو فەرمانەکەیدا ناکات، چونکە ڕەنگە شێوە بۆ پێکهاتەیەک بگۆڕێت کە لە ڕاژەی چەندین فەرمانێکی جۆراوجۆرو جیاوازبێت، بۆ نموونە هەیوان دەتوانرێت لەدیدگەو دەروازەی پێکهاتەی قوتابخانە یاخود نەخۆشخانە، یان خان یاخود مزگەوت یان هەندێک خانووبەرەو کۆشک دابنرێت، لە جێگەی



جۆراوجۆریشدا دەتوانرێت لەڕاژەیاندا بێت.

پێنجەم: لەزۆربەی تەلارسازی رۆژهەلاتی بەگشتی و ئیسلامی بەتایبەتی فەرامۆشکردنێکی بە ئەنقەست بەدی دەکرێت لەپێناو جووتبوونی هێزی تەوەرەکان لەگەڵ هەندێک لەهێزی بۆشاییەکان، کە ئەمەش رۆڵی هێزی ئاراستەکراو لە تەلارسازیدا دەنوێنێت، هەر تەنیا بۆ نموونە ئەگەر هێزە ئارستەکراوەکانی دەروازەی کۆشک یاخود مزگەوتێک تێبینی بکەین، هەمیشە لەگەڵ هێزی تەوەرەکان جووت نابێت، کە لە هەیوانەکان پێکدێت، هەرچەندە ئەم خەسڵەتە یەکجار ناوازەو دەگمەنە، بەڵام وەک ئەدگارێکی زەق و دیار لەکاتی بەراوردکردنی نێوان تەلارسازی ئەوروپی و رۆژهەلاتیدا دەبینرێت.

شەشەم: لە هاوسەنگی پێکهاتەو هاوواتاکانی تەلارسازی رۆژهەلاتی بەگشتی فەرامۆشکردنێک تێبینی دەکرێت، دیارە هەیوانیش لەم پەسن و روخسارە بەدەرە، چونکە یاسای گشتی بۆ پێکهاتەکانی تەلارسازی بریتییە لە جێهێشتنی دەرەتانی کراوە بۆ خستنەسەر یاخود رەتکردنەوەو گۆرانکاری لەهەر شوێنێک، یان ئاراستەیەک لە تەلارسازیدا. دەرئەنجامی ئەمەش دەوڵەمەندکردنی پێکهاتەکانی تەلارسازی و هەمەرەنگ کردنێتی.

حەوتەم: رازانەوەو رەنگدنی تەلارسازی رۆژهەلاتی بەگشتی زیاتر لە رووی ناوەوە بەرجەستە دەبێت، کە رێک پێچەوانەی تەلارسازی ئەوروپییە.

هەشتەم: سوودمەندی رازانەوە لەتەلارسازی ئەوروپیدا، لە راژەی فەرمانەکییە دامەزراوەکان و جەختکردنە لەسەر پێکهاتەی تەلارسازییەکانی وەک پەیکەر و هاوسەنگی و چەندانی دی، چونکە ئەوان شێوە ئەندازەییەکان دەخەنە سەرووی رەگەزە دامەزراوەکان، ئەمەش جەختکردنە لەسەر شێوە ئەندازەییەکان، ئەم جەختکردنەش بۆ پێکهاتە ئەندازەییەکان ئاراستەکراوە، لەباتی ئەوەی بۆ شێوە یاخود بۆ رازاندنەوە بێت، لێرەشدا جەختکردنە رەگەزی دروستکردن پتر بەدەردەکەوێت، بۆ نموونە: کاتێک بەراورد لەنێوان تەلارسازی ئیسلامی و قوتییەکان ئەنجام بدرێت ئەو خەسڵەتانە زۆر بەچاکی هەستی پێدەکرێت، شێوەی ژوورەکانیش لە تەلارسازی قوتییەکاندا ئەم فەرمانەکی دامەزراندنەیەی پتر بە دەردەخات، سەرباری ئەمەش رازاندنەوە لەتەلارسازی رۆژهەلاتی بەگشتی و ئیسلامی بەتایبەتی لەشێوەیدایە، کە لە کەرەستەیەکەوە بۆ یەکێکی دی دەگوازرێتەوە، بەبێ ئەوەی کاریگەرێتییەکی یەکجار زۆری هەبێت لەسەر سروشتی ئەو کەرەستەیەی، کە ئەو نەخشاندنەی لەسەر ئەنجام دەدرێت، بۆ نموونە: هەمان نەخشاندن و رازاندنەوە لەسەر دار یاخود گەچ، یان کاشی بەدی دەکەین.

زۆرجار خودی شێوەیەک لە پانتاییەکەوە بۆ پانتایی دووەم، یان سێیەم دەگوازرێتەوە، بەبێ ئەوەی بەو فەرمانەکییە سوودمەندییانەی ئەو پانتاییانە کاریگەر بێت، هەرچەندە جۆرێک لەم پەسن و ئەدگارانە لە تەلارسازی ئەوروپی بەدی دەکرێن، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ کارلێکردن و کاریگەرێتی تەلارسازی رۆژهەلاتی.

نۆیەم: داماڵینی سیانەیی ئەندازەیی، لە دوو شێوە یاخود زیاتر پێکدێت، هاوجووتن، یان لەیەکدی جودان، شێوەیەکی نوێی دی چێ دەکەن، بۆ نموونە: لە بە یەکگەیشتنی دوو چوارگۆشە شێوەیەکی لێکدراوی نوێ پێکدێت، کە شێوەی هەشت پاڵوویەکی دەرەکی و یەکێکی ناوەکی و هەشت سێگۆشەیی بەرجەستە دەکات، دەشێت چەندین پێکهاتە و شێوەی دی ئاڵۆزی لێ پێک بهێنرێت، کە شێوەکان لە سێ گۆشەوە بۆ لەبزینەیی و دواتریش بۆ بازنەیی بگۆرین.. تاد، ئەم داهێنانەش لە پێکهاتە ئەندازەییەکاندا نموونەی باڵاو بەرزو نایابی تەلارسازی رۆژهەلاتی دەنوێنێت، ئەگەر لەهونەری تالارسازی ئەوروپیدا رازاندنەوە لەسەر شووشەی رەنگاورەنگ لە کاتدرائییەکانی فەرەنسا یاخود بەریتانیادا جوانکاری لەم چەشنە بەدی بکرێت.

دەیەم: ڕۆڵی جوانووسین لە پێکهاتەی تەلارسازی ڕۆژهەڵاتیدا تەنیا مەبەستێکی ڕاگەیاندن ناگێڕێت، بەڵکو لایەنێکی جوانکاری و شکۆمەندی و پلەوپایەیەکی زیاتر دەبەخشێتە ئەو کۆشک و تەلارو پەرستگە جۆراوجۆرانەو مەزنێتیان دەردەخات.

ئەو خاڵانەی ئاماژەیان پێدرا چەندین پەسن و ڕوخساری گشتی تەلارسازی ڕۆژهەڵاتی بوون، کە ڕەنگە هەندێک لەم ئادگارانە لە دەڤەرێک زیاتر زەق و دیاربێت، لە وڵاتێکی دیکە هەمان پەسن بەدی نەکرێن یاخود فەرامۆش بکرێن، ئەمەش پێوەندی بە چەندین هۆکاری ژینگەیی و کۆمەڵایەتی و ئۆلییەوە هەیە.

هەڵبەتە دیاریکردنی ئەم پەسن و خەسڵەتانەش لەهەر دەڤەرو وڵاتێکدا پێویستی بە لێکۆڵینەوە و تێرامان و گەڕان و منەکردن و ماندووبوونێکی یەکجار زۆر هەیە، تاکو بکارین بگەینە دەرەنجامێکی گشتی و هێڵە گشتییەکانی هونەری تەلارسازی لەناوچەیەکی دیاریکراودا دەسنیشان بکەین، ئەمەش دەبێتە مایەی ئەوەی لە ئاکامدا بتوانرێت بە ئاسانی تایبەتمەندێتی خۆماڵێتی لە دەڤەرێکەوە بۆ دەڤەرێکی دی لە یەکدی جودا بکرێتەوەو بناسرێتەوە، کە ڕوخسارە گشتییەکانی ئەو کەرەستەو ئامرازانەی ئەو خانووبەرەو تەلارانەش لە زۆربەی کاتدا سادەن وەک خشت و بەردو گەچ و.. تاد، هەروەها چەند ڕەگەزێکی ساکارو لاوەکی دیکەی وەک دارو شتی دیکە بەشداری تیایدا دەکەن، ئەگەرچی ئەو کەرەستانەی لەدیوار دروستکردندا بەکاردەهێنرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی گۆڕانی بەسەردا دێت، ئەگەر بە وردیش لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی ئەو خانووبەرە و گەڕەکانەش وردبینەوە بە ئاسانی هەست بەو ڕەگەزە سادەو ساکارو دیاریکراوانە دەکەین، هەرچەندە پێوەندی و پێکهاتەکانی هەر خانووبەرەیەکیش لەگەڵ یەکدیدا سادەو ساکارە، ئەو پێوەندییانەش لەسەدان خانووبەرەی دیکەدا دووبارە دەبێتەوە و تارادەیەکی یەکجار زۆر نەگۆڕە، ڕووی دەرەوەی هەر خانوویەکیش پێکهاتەیەکی سادەو ساکارە، کە چەند ڕەگەزو ڕەنگێکی دیاریکراو بەشداری تیایدا دەکەن، هەندێک جار ئەم پێکهاتەیە بە ئاڵۆزییەکی ئاشکرا خۆی دەنوێنێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێکهاتەو دۆخی کەسایەتی هەر خانووبەرەیەک لەتەک پێکهاتەی خانووبەرەیەکی دی جودایە و سەربەخۆیە، ئەمەش بەهۆی پێداویستییەکانی هەر خانوویەک و مەبەست و سوودمەندییەکانی لەو ڕووەوە.

هەرچەندە وەک ئاماژەمان پێکرد هەر خانووبەرەیەک خودان پێکهاتەیەکی سەربەخۆیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕووی دەرەکیدا جۆرە پەیکەرسازییەکی جیاکەرەوەی ئەوتۆ بەدی ناکرێت، بەڵکو سەرتاپای کۆڵانەکە پێکەوە یەکەیەکی جیانەکراوە خۆی بەرجەستە دەکات، لەبەر ئەوە خانووەکانیشی شێوە پەیکەرسازییەکان تیایدا بەدی ناکرێت، کە لە پێشرا سەرنجیان بدرێتێ، چونکە خانووەکانیش لەسەر پارچە زەوییەکی سەربەخۆ لە یەکدی چێنەکراون، بەڵکو بەشێوەیەکی سەیرو سەمەرە و خوار و خێچ ڕۆنراون، چەندین کۆڵانی تەنگەبەریان پێکهێناوەو بەنێو یەکدا چوون، دواتر خانووی ئەو ماڵانە بۆ ئەوە دروست نەکراون، کە لێیان ناڕوانێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو خانووبەرانە لە پەنجەرە و بانیژە و گوزەبان و لە پشت ئەو پەردانەی کە نێو ماڵەکانی شاردۆتەوە لە ڕێبواران دەنۆڕن، بۆیە مرۆڤ لەو کۆڵانە تەنگەبەرانەدا، لەگەڵ هەر هەنگاوێک هەڵی دێنێت، ڕووبەڕووی هەمەچەشنی و هەمەڕەنگی بەردەوام دەبێتەوە، تەنانەت ئەو کاتەی لە سەرنجدان بۆ پێشەوە یاخود بۆ دواوە، یان بۆ سەرەوەش بوەستێت، بەڵام ئەم هەمەچەشنی و هەمەڕەنگییەش تایبەتمەندێتی خۆی هەیە. تایبەتمەندێتیش بەوە جیادەکرێتەوە کە پێکهاتەی تەلارسازی توخم و ڕەگەزی بەدیارکەوتن دەشارێتەوە، چونکە مرۆڤ لە شوێن و خاڵێکی دیاریکراوەوە، ناکرێت سەرنجی تێکڕای پێکهاتەیەکی تەلارسازی بە تەواوی بدات، بەڵکو پێویستە لەبەردەمیدا گوزەر بکات، تاکو پێوەندییە تەلارسازییەکانی هەر خانووبەرەیەکی بە تەواوی بۆ ئاشکرا بێت، هەرچەندە ڕەنگە ئەمەش بەس نەبێت، چونکە ئەم پێوەندییانە لە سەرووی ئاستی ڕووانینەوە خۆیان حەشار دەدەن، هەربۆیە گەر کەسێک بخوازێت، سەرنج بدات لە سەرێتی بۆ پێشەوە و بۆ سەرەوە بڕوانێت و بەردەوام بێت لەسەر بینین، تاکو بە تەواوەتی ئەو پێوەندییانەی کە بەدوای یەکدا دێن بناسێت و بکارێت چێژ لەو هەمەچەشنی و هەمەجۆرییە وەربگرێت، چونکە ئەو کۆڵانە تەنگەبەرو خواروخێچانە بەشێوەیەکی ڕێزبەندی و زنجیرەیەکی هۆشمەندانە چێنەکراون، چونکە پێکهاتەی هەر خانوویەک لە پێوەندییەکانیدا لەگەڵ پێکهاتەی خانوویەکی دیکەدا، بەشێوەیەک ڕێک کەوت و ڕەمەکییانە ڕۆنراون، بەڵام دووبارەبوونەوەی هارمۆنێکی ڕەگەزەکانی هەر ماڵێک ئەو بەتوندی خۆی نیشان دددات، لە ئاکامیشدا هەمەڕەنگی هەمەکییانە لەپێکهاتەی تایبەتی هەر خانوویەک یەکجار بەشێوەیەکی بەرزوباڵا بەدەردەکەوێت، بەم جۆرە ئەم دووبارەبوونەوە و هەمەچەشنییە دەبێتە

مایەی ئەوەی ئەو کوچە و کۆلانە لوول پێچ و مارئاساییە، کە ماڵ و خانووبەرەکانی ئاوێزان و ئاوێتەی یەکدی بوون، بینە یەکەیەکی تێکئالاوی گرێدراو، وەک ملوانکەیەکی ڕازاوەی قەشەنگ و ئاڵ و واڵا خۆیان بەرجەستە بکەن، کە هەر دانەیەکی ڕەنگ و بۆن و چێژێکی تایبەتی دەبەخشێت.

پەیکەرسازی و هەیکەلیەتی هەر کۆلان و خانووبەرەیەکی دێرین پەیکەرسازییەکی دینامیکیە، چونکە سەرلەبەری تژییە لە بزاوتن، ڕەگەزەکانیش خودان هێزێکی جوولەبەخشن، هەر بۆ نموونە بەرزی و نزمی ڕووگەی ئەو کۆشک و خانووبەرانەو، شوێنە بەدوای یەکدا دەربەریوەکان زیاتر هێزو پێزێکی دیکە دەداتە لایەنە جوانکارییەکانی هونەری تەلارسازی دێرین و بە ئاراستەیەکی هارمۆنیکی زیاتر ناسک و نیانی دەبات، بەڵام ڕەزمێک زیاتر خۆی دەنوێنێت، لەدووپاتبوونەوەو هەمەڕەنگی ئەو هارمۆنیکییە لەیەکچوانەی خانووبەرەکانی تەنیشت و بەرامبەر ئەو ماڵانەی، کە ئەو کۆلانەی لێ پێکدێت زیاتر قەبەو زل دەبێ، سەرجەم ئەو ڕەگەزو توخمانەش بەشێوەی جۆراوجۆر دەردەکەوێت و هەڵدەگەڕێتەوە و بەرزدەبنەوە، بارستەو ڕووگەی دەربەریوی هەمەچێزەییان لێ دێتەکایەوە.

قسەکردن لەسەر ئەوەیە ئاخۆ چی لە کەلەپووری دێرین هەڵێنجین و چۆن ئاوێتەو ئاوێزانی هونەری تەلارسازی نوێ و هاوچەرخ بکرێت؟، بەجۆرێک کە بکارێت وەدەنگ خواست و تێڕوانینەکانی سەردەمەوە بێت؟ بەرەو پێکهێنان و ڕۆنانی شارستانییەتێکی نوێ، هەڵبەتە ئەم هەولانەش بەر لە هەموو شتێک پێویستی بە هەبوونی داهێنان و نۆژەنکردنەوە و بڕواهێنانێکی ڕاستگۆیانە بە کەلەپوور هەیە، بەتایبەتی ئەوانەی لەو بوارەدا کاردەکەن، لەهەمان کاتدا ئەم پرۆژە مەزنە پێویستی بە نەخشە و پلانێکی سەرتاپاگیرانە و بەرفراوان هەیە، کە ستراتیژیەتی ئەم قۆناغە بە هەند هەڵبگرێت، بەمەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی گونجاو، چۆنیەتی سەوداییکردن لەتەک کەلەپوورو پێوەندی بە نۆژەنکردنەوە لە هەردوو ڕووەوە:

یەکەم: پاراستن و پارێزگاریکردنی ئەو خانووبەرەو کۆشک و تەلارانە، لە هەمان کاتدا نابێ هیچ ئاڵوگۆڕێک یاخود گۆڕانکارییەک تیایدا ئەنجام بدرێت، هەروەها نۆژەنکردنەوە و پاراستنی ئەو دامودەزگە دێرینانە.

هەڵبەتە بۆ نۆژەنکردنەوە و سەرلەنوێ ڕۆنان و دروستکردنەوەی هەر خانووبەرەیەکی دێرین یاخود کۆشک و تەلارێک، پێویستە گەلێک هۆکاری جۆراوجۆر بە هەند هەڵبگیرێت، لەوانە پاراستن و پارێزگاریکردن لە ڕەگەزو بنەما ڕەسەن و تایبەتمەندییەکانی هەر تەرزێک ڕەچاو بکرێ، کە نەبێتە مایەی شێواندن و لەنێوچوونی خەسڵەت و پەسن و ڕوخسارە بنچینەییەکانی، تەنیا گەر بە ناچاری نەبێت، ئەو دەمەش دەبێ هەمان ئەو ئامرازو کەرەستە ڕەسەنانەی خۆی بەکاربهێنرێت، یاخود زۆر نزیک بێت لەو کەرەستە بنەڕەتییە وردو خاشبووەکە یاخود ڕووخاوەکە، چونکە هەر خانووبەرەیەک کەسایەتیەکی سەربەخۆی دیاریکراوی خۆی هەیە، بۆیە تا بکرێ نابێ ئەو بنەمایانە فەرامۆش بکرێن،

ڕەنگە هەندێک لەو تەلارە دێرینانە بتوانرێت بۆ هەمان فەرمانی پێشتری بەکاربهێنرێت یاخود ئەمڕۆ بۆ مەبەستێکی نوێتر سوودی لێ ببینرێت، بۆ نموونە دەشێت خانووبەرەیەکی دێرین بۆ بنکەیەکی کارکردنی پیشەیی یاخود فەرمانگەیەکی ڕاگەیاندن یاخود کولتووری، یان بۆ هەر شتێکی دی لەو چەشنە بەکاربهێنرێت، هەرچەندە هەر ژوورێک یاخود خانووبەرەیەک بۆ ئامانج و مەبەستێکی دەستنیشانکراو، کاتی خۆی بەکارهاتووە، شێوازێکی ئەندازەیی قەشەنگ بەرجەستە دەکات، بەڵام دەشێت ئەمڕۆ ئامانج و فەرمانێکی دی لە ئەستۆ بگرێت، ئەگەر کۆمەڵێک ڕەگەزو توخمی گرنگ تیایدا ڕەچاو بکرێت.

ئەگەرچی ئەوەی لێرەدا جێگەی قسە لەسەرکردنە، چۆنێتی پاراستن و نۆژەن کردنەوەیە لە نەخشەسازی ژیاریدا، کە ببێتە سەرچاوەیەک بۆ لێتوژان، بۆ ئەمەش پێویستە چەند خاڵێک بە هەند هەڵبگرین:

١- پاراستن و پارێزگاریکردنی کەلەپووری دێرین، کە ببێتە چاوگەیەک بۆ توێژینەوە جیاجیاکان لە ئێستاو ئایندەدا.

٢- پارێزگاریکردنی تەلارسازی دێرین وەک هەبوونێکی کەلەپووری بۆ مەبەستی چێژوەرگرتن و تێرکردنی ئارەزووەکانمان بەو جۆرە تەرزانەی پێشتر، هەروەها هەندێک لەو خانووبەرانە بکرێنە بنکەی کەلەپووری هەمەچەشن لە گەڕەکە نوێیەکاندا، ئەمەش دەبێتە مایەی ڕەوینەوەی بێزاری، کەشێکی زیندووی دیکەش دەخاتە بەر ئەو گەڕەک و شارانە.

٣- پاراستنی هونەری تەلارسازی دێرین بەوپێیەی پاشخان و قەوارەی ژیاری و پێکهاتنی هزرمان بەرجەستە دەکات، ئەو ڕووەش وادەخوازێت، کە پاراستن و نۆژەنکردنەوە ئەنجام بدرێت و، کاربکرێت بۆ دیاریکردنی ئەو هۆکارانەی سوودبەخشن و، دەستەبەری

دەستنیشانکردنی ئەو شوێنە دێرینانە و پلەوپایەی دەکەن، کە لە ڕیزی پێشەوەی بەرنامەکانی پاراستن و دیاریکردنی نۆژەنکردنەوەی ئەو شوێنانەدابن.

دووەم: دیرۆکی کەلەپووری تەلارسازی دەگرێتەوە، ئەمەش واپێویست دەکات لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەکان بەردەوام بن، تاکو بکارین لە ئاکامدا ئەدگارەکانی هونەری تەلارسازی لەسەردەم و قۆناغە جیاجیاکانی شارستانیەتدا دەسنیشان بکەین.

بێگومان دیاریکردنی ئەو ڕوخسارە گشتییانەش دەبێتە مایەی ئەوەی تەلارسازان بکارن بە بەرچاوڕوونیەوە کارەکانیان بەگوێرەی بنەمایەکی زانستیانەی توندوتۆڵ و کۆنکرێتیەوە ئەنجام بدەن، ئەم ڕێساو بنەما زانستیانەش وا دەکات تەلارسازان بەگوێرەی چەندین پێودانگی ڕاست و دروستی هەمەچەشن سەودایی لەگەڵ کەلەپووردا بکەن، ئەم هەمەچەشنی و هەمەڕەنگییەش لە ئاکامدا ژیارو شارستانیەتێکی هەمەچیزەی لێدەکەوێتەوە، کە گیانێکی نوێ ببەخشێتە شادەمارەکانی ژیان، سەرباری ئەمەش هەمەجۆری و هەمەڕەنگی دەستەبەری ئەوەمان بۆ دەکات، لەکۆتاییدا بە بنبەست نەگەین، کە لە چوارچێوەی تەرزێکی دیاریکراوی هونەری تەلارسازیدا گیربخۆین.

کەواتە بۆ ئەوەی بکارین کەلەپووری هونەری تەلارسازی دێرین لە تەلارسازی هاوچەرخدا بتوێنینەوە و ئاوێزانی یەکدیان بکەین، پاڵپشتی یەکتربن، پێویستە کرداری توانەوەو ئاوێتەکردن لەگەڵ گیانی سەردەم و پێداویستییەکانی قۆناغەکەو پەرەسەندن و ئامرازو کەرەستەکانی کەلەپوور لە شوێنە جیاجیاکانی تەلارسازیدا هاوسەنگ و گونجاو بن.

لەم سەروبەندەدا دەگەینە ئەم دەرەنجامە، کە پێویستە بەرنامەیەکی سەرتاپاگیر لە ئارادابێت:

١- دیاریکردنی خەسڵەتەکانی کەلەپووری کاراو ناکارا.

٢- شوێن و پێگەی هەبوونەکانی کەلەپوور و پێوەندیان بە ژینگەوە.

٣- پاڵپشتیکردنی تەلارسازان لە کاری داهێنەرانەی نوێخوازو دۆزینەوەی ڕێوشوێنی هەمەچەشن بۆ چۆنیەتی توانەوەی کەلەپووری تەلارسازی و بەکارهێنانی لەبوارو ژینگە جۆراوجۆرەکاندا.

٤- هاندان و پشتگیریکردنی تەلارسازانی داهێنەرو لێهاتوو بۆ پێشخستنی ئامرازو چەمکە هەمەچەشنەکان و، چۆنێتی سەوداییکردن لەگەڵ کەلەپووری تەلارسازیدا، ئەم ئاراستەیەش پێویستە بەردەوام بێت، هەوڵ بدرێت ڕێگەچارەی جۆراوجۆر بدۆزرێتەوە بۆ چۆنێتی سەوداییکردن لەگەڵ هونەری تەلارسازی دێرین و ئەزموونی وەستا دەست ڕەنگین و کارامەکان لەو بوارەدا، ئیشکردنیش لەم بوارەدا لە وەرگرتن و توانەوەی کەلەپووری دێرین لە بۆتەی هونەری تەلارسازی نوێدا پێویستە کاری لەسەر بکرێت، لەپێناو بەرهەمهێنانی هونەری ڕەسەنی هاوچەرخ، کە ڕەنگدانەوەی گشت خەسڵەتە گشتییەکانی ئەم هونەرە بێت، هەر بەم ئاراستەیەش دەکارین هونەرێکی مەزن ڕۆبنێین، کە خودان تایبەتمەندیەکی دیاریکراو بێت و، بە سانایی بتوانرێت ئەدگارەکانی جودابکرێتەوە و بناسرێتەوە.

ئێمە کاتێک دەتوانین قسە لەسەر ناسنامەو تایبەتمەندێتی و پاراستن و پارێزگاریکردنی ڕاستەقینە بکەین، (ئەوکارانەی بەشێوەیەکی داهێنەرانەو بە بەرهەم جێبەجێ دەکرێن، بریتین لە هۆکارێک بۆ پیادەکردنی ناسنامەو تایبەتمەندێتییەکانی)، بێگومان گرفت لەوێوە سەرچاوە دەگرێت ئاخۆ چۆن سەودایی لەتەک کەلەپووردا بکرێت و چ جۆرە پێوەندییەک پێکەوە گرێمان دەدات، وەلێ نهۆ دەکارین پرسیارەکە بەشێوەیەکی دی دابڕێژین و بێژین، ئاخۆ سەروکاری تەلارسازان چۆن بێت لەتەک کەلەپووری دێرین و کەلتوورو چەمکە نوێیەکاندا، کەواتە کێشەکە لەم دوالیزمەی نێوان ئەو دوو لایەنە زیاتر قووڵ دەبێتەوە، ئەویش ئەوەیە جۆری ئەو پێوەندییانە بەتایبەتی تەلارسازانی ڕۆژهەڵاتی چۆن سەودایی لەتەک کەلەپووردا بکەن و چۆنیش دەکارن تایبەتمەندییەکانی خود بەرامبەر کەلتووری ئەوی دی بپارێزن، گرفتەکە هەروەک (عەلی حەرب) دەڵێ لە پاراستنی بنەما دێرین و بەها نوێیەکانە پێکەوە، ئەمەش گرنگترین کۆسپ و لەمپەرەکانی بەردەم نۆژەنکردنەوە و داهێنان و گەشەسەندن و پێشکەوتن دادەنرێت، کە دەخوازێت پێوەندی داهێنەر بە کولتووری زیندوو و دەوڵەمەندەوە بگۆڕێتەوە بە کەلەپوورێکی دێرینی بێگیان و مردوو، کە ناکارێت هاوشان بێت، لەتەک پێداویستییەکانی سەردەم و گۆڕانکارییە نوێیەکان، هەربۆیە ئەو بەرهەمەی لەسەر زەمینەیەکی فشۆڵ ڕۆبنرێت، داهێنانی بەرزومەزنی تێدا بەدی ناکرێت، چارەنووسی لەنێوچوون و پووکانەوەیە، خاوەنەکەیشی ناکارێت نەمری نە بۆ خۆی، نە بۆ بەرهەمەکەی تۆمار بکات.

گرنگترین ئەو کۆڵەگانەی نەمری بۆ هەرکارێکی تەلارسازی چێ دەکەن بریتییە:

١- زانین و زانیاری بەرفراوانی هەمەجۆر.

٢- داهێنان و ئەفراندن.
٣- ئەڤین و باوەڕهێنانێکی ڕاستگۆیانە بە کەلەپووری تەلارسازی.
٤- ئازادی کارکردن.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا سەرنجدان ل ئایندەو کارکردن بۆ بەرەوپێشڤەبردنی پەرەسەندن و پێشکەوتن تا ئەندازەیەکی یەکجار زۆر ناکۆکە لەگەڵ ئاوڕدانەوە بۆ ڕابردوو، هەوڵدان بۆ خۆشەتەکدان و مانەوە لەو چوارچێوەیەدا، چونکە دەقاودەق وەرگرتن و تێئاخنینی هەندێک ئەدگاری کەلەپووری هونەری تەلارسازی دێرین کۆسپێکی مەزن دروست دەکات، هۆکارێکیشە بۆ بەربەست چێکردن لەبەردەم تێڕوانین بۆ ئاینده بە دیدێکی نوێکارییەوە، ئەمەش لە دوو ڕەگەزی بنچینەیی لەهونەری تەلارسازیدا زیاتر خۆی دەنوێنێت، ئەویش جوانکاری و نوێکارییە لەلایەک، بەرهەمهێنانی کەرەستەو ئامرازو تەکنۆلۆژیای نوێ لەلایەکی دی خۆی بەرجەستە دەکات، ئەم دوو ڕەگەزەش تا ئەندازەیەک زۆر لەگەڵ تەرزو شێوە کەلەپوورییەکاندا ناکۆک و ناتەبان، بۆ ئەوەی زیاتریش ئەم ناکۆکی و ناتەباییە نیشان بدەین، ئەوا ئەگەر لە ڕووی جوانکارییەوە سەرنجی هەر پێکهاتەیەکی هونەری تەلارسازی بدەین، زۆر بەچاکی پەی بەوە دەبەین، کە هەر تەرزێکی تەلارسازی تام و چێژێکی تایبەتمان پێدەبەخشێت و، شێوەیەکی جوانکارییانەی تایبەت و جیاکەرەوە لەخۆ دەگرێت، یەکجار دروست و گونجاوە لەگەڵ ئەو کەرەستەو ئامرازانەی، کە لە ڕۆنان و دروستکردنیدا بەکارهاتوون.

بێگومان تاکو ئەمڕۆ هونەری تەلارسازی بەشێوەیەکی گشتی بەدوو ڕێگەو شێوازی جیاواز کارەکانی خۆی ئەنجام دەدات، ئەویش شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەگەری دێرین و باوە، کە شانبەشانی شێوازی بەرهەمهێنانی ئامێرە هاوچەرخەکان درێژەی هەیە، هەر یەکێک لەم دوو تەرزەش شێوەی جوانکارییانەی تایبەت بەخۆی هەیە، زۆر بەچاکیش هەست بەو هەماهەنگی و گونجانە دەکرێت، کە لەنێوان کرداری بەرهەمهێنان و پێکهاتەو بەها جوانکارییەکاندا هەیە، ئەویش هەروەکو ئاماژەمان پێکرد پێوەندی بەجۆری ئەو کەرەستەو ئامرازانەوە هەیە، کە بەشدارییان لەپێکهاتە تەلارسازییەکە کردووە، ئەم هۆکارانەش وای کردووە، لەگەڵ یەکدی جیاوازبن و هەریەکەیان بەهایەکی جوانکاری تایبەت و چەشنەیەکی جودا ببەخشن.

دیارە شێوازی بەرهەمهێنانی هاوچەرخ بە ئەدگار و مۆرکێک دەناسرێتەوە، کە بەرهەمهێنانی بەکۆمەڵە، ئەندازیار و تەلارسازان لەسەرجەم بوارە جیاجیاکانی تەلارسازیدا ئەو کەرەستەو ئامرازانە بەکاردەهێنن، بەرهەمی تەکنۆلۆژیای نوێیە، ئەگەر سەرنجی ئەو کەرەستانەش بدەین، ئەمڕۆ لە ئاکامی ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنانەی تەکنۆلۆژیای نوێیە، ئەوا بەکارهێنانی ئەم کەرەستە نوێیانە تا ڕادەیەک ناکۆک و ناتەبایەو وێک نایەتەوە لەگەڵ تەرزو شێوەکانی کەلەپووری تەلارسازیدا، لەم سۆنگەیەوە پێویستە تەلارسازو ئەندازیارو نەخشەسازان مەنەی جۆرە شێوازێک بکەن و شێوەو تەرزێکی نوێی وەها دابهێنن، کە لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم و کەرەستەو ئامرازەکانی ڕێزبەرییەک چێ نەکات، چونکە شێوەو فۆرمەکانی کەلەپوور ڕەگوریشە و سەرچاوەکانی خۆی لە پیشەگەرییەکی دەستکردەوە هەڵدەگۆزێت، کە بنەچەو کۆڵەکەو هەلومەرجی بەرهەمهێنانی یەکجار جیاوازە، **لەگەڵ تەکنۆلۆژیای** هاوچەرخدا، کە لەدوو ڕووی سەرەکییەوە **جیاوازە** هەروەکو پێشتر ئاماژەی پێکرا، **ئەویش لایەنی** جوانکارییە لەلایەک، **هەروەها لایەنی ئابوورییە** لەلایەکی دی، لایەنی ئابووری **لە بەرهەمهێنانی** هاوچەرخدا جیاوازییەکی تەواوی هەیە، لەگەڵ ئەوەی لە ڕابردوودا هەبوو، لەبەر ئەوەی بەرهەمهێنان لە ڕابردوودا پشتی بە پیشەگەری دەستی دەبەست بۆ بەرهەمهێنانی شاکارێکی نایاب و ناوازە، کەچی شێوازی بەرهەمهێنانی هاوچەرخ دەقاودەق بەپێچەوانەیەتی، بەلێشاو کەرەستەو ئامرازی هەمەچیزە بەرهەم دەهێنێت، کە مۆرکێکی بەکۆمەڵ لەخۆ دەگرێت، لەکارکردن و بەرهەمهێنانی پیشەگەرییە دەستیەکاندا ئامرازو کەرەستە خۆماڵییەکان بەکاردەهێنرا، کە لەبارو گونجاو بوو لەگەڵ کارکردن و کارامەیی و شارەزایی خۆماڵیشدا، هەرچی شێوازی بەرهەمهێنانی هاوچەرخە، پشت بە ئامرازو کەرەستەی ئاڵۆز دەبەستێت و ڕێگەی بەرهەمهێنان شارەزایی و تەکنۆلۆژیای گەرەکە، کە لەودیوی سنووری خۆماڵی و نەتەوەییەکانەوە بەرهەم هاتوون، هەر ئەمەش وای کردووە هونەری تەلارسازی نوێ زیاتر ئەدگارو مۆرکێکی جیهانی لەخۆ بگرێت، ئەم بەرەو پێشڤەچوونە سەرسووڕهێنەرەی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ، ببێتە مایەی ئەوەی کەرەستە دێرین و باوەکان پاشەکشە پێ بکات، هەر بۆ نموونە وای کرد ئەو کەرپووچ و خشتە سوورکراوەی کە دەستکردەو بە شێوازێکی کلاسیکی بەرهەم دەهێنرێت، لەچاو ئەو بارستە کۆنکرێتیانە و بلۆکانەی، لە خانووبەرەو باڵەخانە ئامادەکراو و نوێیەکاندا بەکاردەهێنرێت کە زادەی بەرهەمهێنانی

بەکۆمەڵن، یەکجار هەرزانتر بکەوێتەوە لەرووی ئابوورییەوە.

لەگۆشەیەکی دیکەوە باقسە لەبارەی بەها کەلەپوورییەکان بکەین، کە پەیوەستە بەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنی هاوچەرخ، بێگومان ئەو شۆڕشە زانیاری و تەکنۆلۆژییە گۆڕانکارییەکی مەزنی لەسەرجەم بوارەکاندا لێکەوتەوە، کە تاکو ئەمڕۆ ئەو پێشکەوتنانە هەر بەدەوامە بەتایبەتی داهێنانی ئەنتەرنێت و سەتەلایت، دەکارین بە پەرجووی ئەم سەدەیە نێوزەدی بکەین.

هەڵبەتە ڕاگەیاندنی هاوچەرخ ئەمڕۆ لەسەردەمی جیهانگەراییدا پێوەندیەکی ڕاستەوخۆ و کاریگەرێتییەکی کارای لەسەر ژیانی ڕۆژانەو چالاکییە هزری و ڕۆشنبیرییەکانی هەر تاکێکی کۆمەڵگەدا هەیە، وەنەبێ ئەم کاریگەرێتییە تەنیا لەچوارچێوەی دابونەریت و هونەر و ڕۆشنبیریدا گیر بخوات، بەڵکو ئەو چوارچێوەیە دەبەزێنێت و بەرەو بوارێکی دی گرنگ دەخزێت، ئەویش ئاوێتەبوون و تێکەڵاوبوونێتی لەگەڵ کرۆکی ژیانی خەڵکیدا، دیارە ئەم کاریگەرێتییەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، بووەتە مایەی ئەوەی ئەو مۆرک و هێڵە گشتیانەی، کە هەر بوارێکی هونەری یاخود کولتووری لەیەکدی پێ جودا دەکرایەوە کاڵ بکاتەوە، وای کرد بە ئەدگارو مۆرکی هاوبەش ڕەنگ بکرێت.

کەواتە دەگەینە ئەم ئەنجامگیرییە و دەبێژین، ئێمە بخوازین، یان نەخوازین، کاریگەرێتییە هەمەجۆرەکانی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن لەبوار- جیاجیاکانی ژیانی هەر تاکێکدا ڕەنگ دەداتەوە، بۆیە بمانەوێ و نەمانەوێ دەبێ هونەرو کولتووری پێشکەوتووی ئەمڕۆ قبووڵ بکەین، هەوڵ بدەین زەمینەی لەبارو گونجاو بۆ ئەو قبوولکردن و جیاوازی و وەرگرتنانە سازبکەین، لەو ڕووەوە هەموو دەروازەکان بکەینەوە، خۆمان بەتەواوی ئامادە بکەین، چونکە هیچ ناسنامەیەک نییە، چەمکی ناسنامە بە پاراستنی تایبەتمەندێتییەکان بە ئاسانی فەراهەم بکات، (گوتاری ناسنامەی پەتی یاخود پوخت، کەڤاڵابێت لەکاریگەری ئەوی دی، شتێکی بێ بنەمایە، بە ئەندازەش ئەوەی بریتی بێت لەخۆ چەواشەکردن) ئەم ڕەوشە وای کرد مۆرکێکی گشتی لەسەرجەم بوارو دەرەتانەکانی ژیانی میللەتاندا سەرهەڵ بدات، لە هەمان کاتدا بووەتە مایەی ئەوەی ڕەوتێکی شکستخواردی دیکە بێتە کایەوە، ڕەوتێک بە پەرۆشەوە بڕوانێتە کەلەپووری دێرین، لە هەوڵی زیندووکردنەوەی بێت و کار بۆ ئەوە بکات، لەسەرجەم بوارە جیاجیاکاندا بەدەربکەوێت، بانگەشەکارانی ئەم جۆرە تێزو

بۆچوونانەش وەک ئەوەی لەدەرەوەی مێژوو بژین و بیانەوێت ڕەوتی مێژوو بەرەو دواوە بگەڕێننەوە، دیارە ئەمجۆرە تێڕوانینانە لە هەر بوارێکدا بێت جگە لە پاشەکشەکردن بۆ دواوە نەبێ هیچ شتێکی دی ناگەیەنێت، کە ئەمەش پێچەوانەی یاساو ڕێساکانی گۆڕان و گیانی سەردەمەکانە، ئەستەمە هزری لەم جۆرە هەتاسەر بتوانێت خۆی ڕابگرێت، ڕەنگە وابەستەبوون و گەڕانەوە بۆ کەلەپووری دێرین لەبواری هونەری تەلارسازی تا ئەندازەیەکی دیاریکراو سوودمەندبێت، بۆ گرێدانی قۆناغی ئێستا بە ڕابردوو، لەوانەشە زەمینە بۆ سەرهەڵدانی کولتوورێکی پڕ بەهاو بەپرست خۆش بکات و ببێتە مایەی بەرەوپێشڤەبردن و دەوڵەمەندبوونی هونەری تەلارسازی ئەویش ئەگەر لەچوارچێوەیەکی دیاریکراودا خۆی شەتەک نەدات و نەهێڵێتەوە.

لەم سۆنگەیەوە پێویستە ئەندازیارو تەلارسازان لە هەوڵی ئەوەدابن قەڵەمبازی دیارو بەرچاو بەهونەری تەلارسازی بدەن، کا..کانیان لەبەرگرتنەوەی یەکدی نەبێت، هەر تەن... ...ر ...نیستا نەبێ، چونکە هەر بەرهەمێکی داهێنەرانە وا دەخوازێت، ئاینده بە هەند هەڵبگرێت و تێڕوانینێکی دووربینانەی لەبارەوە هەبێت، واتە هەر تەلارێک پێویستە لە هەردوو جەمسەری تەکنۆلۆژ... ...وێ و پێداویستییە کۆمەڵایەتییەکانی هەر کۆمەڵگەیەکەوە سەودایی لەتەکدا بکرێت، چونکە لایەنی جوانکاریانەی هەر تەلارێکیش لەو پێوەندییە هارمۆنیکی و دیالیکتیکیە گەرم و گوڕو ناوازانەی نێوان ئەو دوو جەمسەرە بەرجەستە دەبێت.

هەر لەو پێودانگەشەوە هەندێک لەتەلارسازان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن دەسبەرداربوون لەکەلەپووری دێرین و فەرامۆشکردنی جۆرە لەنگییەک چێ دەبێت، پێکهاتە و شێوەکانی هەر تەلارێکیش ساردو سڕییەک دەتوێنێت، بۆیە لێرەوە بانگەشەی تێئاخنین و بەرجەستەکردنی کولتووری دێرین لەچوارچێوەی هەر خانووبەرەیەک بە گرنگ دەزانن، لێ هەروەکو ئاماژەشمان پێکرد، ئەمە تا ڕادەیەکی یەکجار زۆر ناکۆکە لەگەڵ تێڕوانین بەرەو ئایندەیەکی پڕشنگدار، ئەم گرفتەش جۆرە نیگەرانییەکی لەلای پسپۆڕانی هونەری تەلارسازی لەزۆر جێگەدا پەیداکردووە، کە پێویستە بە وریایی و شارەزاییەوە سەودایی لەگەڵ ئەو ڕەوشە ئاڵۆزەدا بکەن، بۆیە پێویستە پسپۆڕان و تەلارسازان هەوڵی بەردەوام بدەن، بۆ نەهێشتنی ئەو ناکۆکی و تەختکردنی ئەو کۆسپانە و ڕەوینەوەی ئەو نیگەرانیانە، تاکو تەلارسازان بکارن بەوپەڕی ڕاستگۆیی و جدییەوە شاکاری نایاب بەرهەم

بهێنن.

لەم سەروبەندەشدا بۆ ئەوەی ڕەوتێکی تەلارسازی نوێ و ڕەسەن سەرهەڵ بدات، پێویستە ئەندازیاران بە تەواوەتی پەی بە ڕەهەندە ڕاستەقینەکانی ئێستا ببەن، چونکە ئێستا ئەڵقەی زنجیرەیەکە، بۆ قووڵایی مێژووی دێرین شۆڕبۆتەوە، ئەگەر بە تەواوەتی ڕابردوو ڕەت بکەینەوە یاخود فەرامۆش بکەین نوێیەکە ساردوسڕو بێ گیان بەدەردەکەوێت، ئەو دەمەش تێڕوانینمان بۆ ئایندە نەزۆک دەبێت لەبەر ئەوەی لە ئێستایەکی تەمومژاوییەوە پێنگاڤی هەڵێناوەو سەرچاوەی گرتووە.

لەم پێودانگەوە هاوسەنگبوونی نێوان ئێستاو ڕابردوو کارێکی پێویستە لەهونەری تەلارسازیدا، بەواتایەکی دی پێویستە تەلارسازان شێوازێکی گونجاو بۆ ئەمڕۆ بگرنەبەر، بکارێت تەکنۆلۆژیای هاوچەرخانە لەتەک چەمکی جوانکاریدا کۆبکاتەوەو ئاوێزانی یەکدیان بکات، بەم شێوازەش لە هەمان کاتدا بە ئاراستەی ئاوێتەکردن و توانەوەی چەمکە کەلەپوورییەکان، لەبەرهەمە تەلارسازییەکاندا کاربکات، هەر ئەم ڕەوتەش دەکارێت ئێستا ڕۆبنێت و ئایندەیەکی گەش و پڕشنگداری شارستانی و ژیاری بێنێتە کایەوە، خودان تایبەتمەندێتییەکی دیاریکراو بێت، بەوپێیە (پیادەکردنی تایبەتمەندێتی بەشێوەیەکی بە بەرهەم و دەوڵەمەندانە، کاریگەرو لەبەرچاو بێت، بەشێوەیەک کار لەسەر تێکشکاندنی کۆت و بەندە باوەکان و بە بەجێهێشتنی بە پەراوێزبوون بکات، ئەویش بە بەرهەمهێنانی هزرێک یان شێوازێک یاخود ئامرازێک، یان زانیارییەک، یان شمەکێک، کە سنووربەزێنەر بێت، بۆیە نابێت ئێمە ترسی ئەوەمان لێ بنیشێت، کاتێک سوود لە کولتوورو شارستانیەتی ئەوانی دی وەربگرین بۆچی هەڕەشە بێت لەسەر تایبەتمەندییەکانمان، چونکە سەرجەم کولتوورو کەلەپوورو ژیارو شارستانییەتی مرۆڤەکان، کاریگەرێتی لەسەر یەکدی جێدەهێڵن) چەندین ڕەگەزو توخمی دەرەکی و ناوەکی و هۆکاری جۆراوجۆرو نەتەوەی جیاواز بەشدارییان لەبەرهەمهێنانی هەر کولتوورو ژیارێکدا کردووە، کەواتە نابێ بە بروبیانووی پاراستن و پارێزگاریکردن لە تایبەتمەندێتی کەسانێک چەواشەمان بکەن و بەرەو گۆشەگیری و پەراوێزبوونمان ببەن، بەڵکو ڕەسەنایەتی و بەرجەستەکردنی تایبەتمەندییەکانی من ئەو دەمە دێتەدی، ئاخۆ من تا چەند توانیومە کەڵک لە کەلەپوور وەربگرم و بیکەمە سەرچاوەیەک بۆ داهێنان و ئافراندنەکانم و شاکاری مەزنی پێ ئەنجام بدەم نەک بەپێچەوانەوە کەلەپوور کۆت و بەندم بکات و پەکم بخات، بەهیچ جۆرێک نەکارم ڕۆڵی کاریگەرانەی خۆم بگێرم لە ڕۆنانی تەلاری شارستانییەتدا.

ئەرکی نەخشەسازو تەلارسازان ئەوەیە، کە بەشێوەیەکی عەقڵانی لەگەڵ ئەم چەمکەدا سەودایی بکەن، کارکردنیش بەو ئاراستەیە بێت، کە بەهاو چەمکی نوێتر بەرهەم بهێنن، بۆیە دەبێ بەو شێوەیە هەم ڕووبەڕووی بەرەنگارییەکان ببنەوە، هەمیش وەک سەرچاوەیەکی گرنگ بڕوانینە کەلەپووری دێرین، ئەگەرچی پێویستە ئاماژەش بەو ناکۆکییەی نێوان بەرهەمی هاوچەرخ و کەلەپووری دێرین بکەین و لەم چەند خاڵەدا چڕیان بکەینەوە:

یەکەم: ناکۆکی نێوان هونەری تەلارسازی هاوچەرخ و بەها کەلەپوورییەکان ناکۆکییەکی کاتییە، کاتێک ئەو بەرهەمە چەندایەتییە، بەرەو ئەو هەمەچیزەییە، بەگوێرەی بەرنامەیەکی پێشکەوتوو پەرەدەسێنێت، ئیدی ئەو هەلومەرجەش کە ئەو ناتەباییەی چێ کردووە، کاتیە و ئەویش نامێنێت.

دووەم: هەر کارێکی داهێنەرانە وادەخوازێت، لە چەمکە جیهانییەکان، ئاوێتەکردن و توانەوەی گەوهەری کەلەپووری دێرین بەرهەمەکە زیاتر دەوڵەمەند دەکات، پشتگوێخستن و فەرامۆشکردنی کەلەپوور، هونەری تەلارسازی لەو سێبەرو ڕەنگ و بارستانە دادەماڵێت و جوانکارییەکی ساردو سڕی پێدەبەخشێت.

سێیەم: کارکردن بە ئاراستەی نزیکبوونەوەی گەلان لەیەکدی دەبێتە مایەی ئەوەی میللەتان، ئاگاداری هونەرو ڕۆشنبیری یەکدی ببن، لە ئاکامیشدا ئەم کارلێکردنە دەبێتە مایەی دەوڵەمەندبوونی توانستە هونەری و ڕۆشنبیرییەکان و بەرەو پێشڤەبردنیان، هەر ئەمەش وادەخوازێت، کە نەخشە و بەرنامەی تایبەت دابڕێژێت بۆ پاراستن و نۆژەنکردنەوەی کەلەپووری دێرین.

چوارەم: پاراستن و پارێزگاریکردنی کەلەپووری دێرین، لەسەرتاپای دنیادا گرنگییەکی مەزنی هەیە، بۆیە پێویستە ئەدگارو خەسڵەتە گشتییەکانی لەهونەری تەلارسازی و ئێستاو ئایندە ڕەنگ بداتەوە، لەم هەنگاوەش لە ئاکامدا بەشدارییەکی کارا لە ڕۆنان و هاتنەدی شارستانی و ژیارێکی زیندوو و هاوچەرخانە دەکات.

هونەری تەلارسازی هەر میللەتێک نابێ هاوشێوەی تەلارسازی گەل و نەتەوەیەکی دی بێت، کتومت وەک ئەوبێت، بەڵکو پێویستە ئەندازیارو نەخشەسازان داهێنان و ئەفراندن لەکارەکاندا ئەنجام بدەن، هونەرێکی ئەوتۆ بەرهەم بهێنن، خودان شەقڵ و تایبەتمەندێتی

جـیـاواز بێت، لێـرەوە ڕەنگە پێـویست بکات، تا ئەندازەیەک پارێزگاری لەکەلەپوور بکرێت و سوودی لێ ببینرێت، هەوڵ بدرێت تەلارسازی هاوچەرخ زیاتر پێش بخرێت، کرۆک و گەوهەری کەلەپووری دێرین لە بۆتەو چوارچێوەی کارو بەرهەمە تەلارسازییەکان لە ئێستاو ئاییندە خۆی ڕەنگڕێژ بکات.

لەکۆتاییدا دەگەینە ئەو ئەنجامگیرییە و دەبێژین، ئەو ناکۆکی و ناتەبایییەی لەنێوان تەلارسازی هاوچەرخ و کەلەپووردا خرایەڕوو، دەچێتە چوارچێوەی یەکێک لەم سێ ناکۆکیـانەوە، ئەوانیش بریتین لە ناکۆکی ڕواڵەتی یاخود کاتی، یان ڕاستەقینە.

کێشەکە بە هەر جۆرێک بێت، بەتەختکردنی کۆسپ و دۆزینەوەی ڕێگەچارەی گونجاو دەکارین بەشێوەیەکی بابەتیانە بەبێ ئەوەی زۆر لەخۆمان بکەین کارەکان ئەنجام بدەین، بەڵام لە هەموو گرنگتر لەگەڵ گشت ئەو تێبینیانەی قسەیان لەبارەوە کراوە، پێویستە هەوڵ بدرێت بۆ دروستبوونی تایبەتمەندێتی خۆماڵێتی، ئەوەش لە ئاکامدا دەمانگەیەنێتە خودان ناسنامەیەکی دیاریکراوی هونەری تەلارسازی نوێ و هاوچەرخانە.

مرۆڤی هاوچەرخ لەسەر بنەمای بەدەرخستنی لایەنی تاکێتی و خودێتی پەرە بە تواناکانی دەدات، خۆی بەرەو پێشڤە دەبات، گەشەسەندنی کەسێتیش، زیاتر دەوەستێتە سەر بەتاکبوونی دەروونی مرۆڤەکان لەلایەک لەلایەکی دی کاریگەرێتی کارلێکردنی ئەو هۆکارە ژینگەیییانەی، کە ویژدانی مرۆڤ، لەسەروبەندی پرۆسەی گەشەکردن و خەملیبوون ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

ئەگەر بەوردی بڕوانینە ئەو هۆکارانەی ڕۆڵێکی گرنگ لەسەر پێکهاتنی خەسڵەتە تایبەتییەکانی هەر تاکێک دەگێـڕن، دوو هۆکاری گرنگ لەو ڕووەوە بەخاڵی جیاکەرەوە دادەنرێت، هۆکاری بۆماوەیی و ژینگەیییە.

هۆکاری بۆماوەیی لەتاکێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە، هۆکاری ژینگەییش هەمەچەشنی و جیاوازی بەدی دێنێت، لەئاکامدا مرۆڤەکان، تاکەکانی هەر کۆمەڵگەیەک دەبنە خودان تایبەتمەندێتی تاکگەرایی و تاکێتی خۆیان، بۆیە سروشتی خودێتی تاکەکان ڕۆڵێکی دیارو بەرچاو لە هەر ژینگەو کۆمەڵگەیەکدا دەگێڕن.

ئەگەر مەسەلەکە لەسەر ئاستی تاکەکان و مرۆڤەکانی هەر کۆمەڵگەیەک بەو شێوەیە بێت، ئاخۆ لەسەر ئاستی خۆماڵێتی و نەتەوەیی و نیشتمانیدا چۆن بکەوێتەوە، کەواتە دەبێ هۆکارەکانی ئەو جیاوازیانەش لەلای میللەتان هەمەجۆرو هەمەڕەنگ بن لێ پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیای هاوچەرخ، میللەتان پێی بزانن یاخود نەزانن کاری خۆی دەکات، کاریگەرێتی ڕاستەوخۆی دەبێت لە نزیککردنەوەی ژینگە جیاوازەکان، بەهێزبوونی هۆکارە لێکچووەکانی نێوان نەتەوەکان، هێواش هێواش خەریکە شێوەو شێوازەکانی ژیان و ڕۆشنبیرییەکان نزیکتر دەکاتەوە، ئەو جیاوازیانەش لە ڕووی جلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە و هونەری تەلارسازی و چەندان بواری دی، یەکجار کەم بکاتەوە، تەنانەت لە هەندێک دەرتاندا هەر نەیهێڵێت، ئەم نزیککەوتنەوەیەش لە ئاکامی ئەو پەرەسەندن و پێشکەوتنانەی تەکنۆلۆژیای سەردەم هاتۆتەکایەوە، بووە مایەی زیاتر ئاڵوگۆڕکردنی ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیری و کولتووری و هونەری لەنێوان میللەتاندا، زیاتر کارلێکردنیان لەیەکدی و خۆگونجانیان تارادەیەکی زۆر، یاخود کەم، پێوەندی بە پایە و هەڵکەوتنی هەر میللەتێک و جۆری سیستمی ڕامیاری و کرانەوەی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا، لەو ئاڵوگۆڕکردنە ئاڵۆزو گۆڕانکارییە نوێیە تێکچڕژاوانەدا هەیە.

لێرەوە پێویستە کۆمەڵگەکان، مرۆڤەکان بە ئاراستەی چاوخشاندنەوە بە پێوەندییەکانیان لەگەڵ ئەوانی دی، سوود وەرگرتن لە ئەزموونەکانیان و ئەو چەمکە گشتیانەی سەردەم، کە موڵکی سەرجەم مرۆڤەکانە دەکارن، لێیان بەهرەمەندبن.

**سەرچاوە:**

*** گۆڤاری البناء الحضاري- ژمارە(١٠).**

*** ڕۆژنامەی «السفیر»ی ڕۆژی (٢٠٠١/٧/١٣).**

*** بەشی یەکەم و دووەم لە بیناسازی کوردی لەنێوان ڕەسەنایەتی و لاساییکردنەوەدا- کامەران تاهیر- برایەتی ئەدەب و هونەر ژمارە(٨١-٨٤).**



# فەرهەنگی هاوواتەکانی کوردی و... وتەیەک

عەزیزی مەلای ڕەش
٢٠٠٣/٥/١٢
٢٢/ی گوڵانی ٢٧٠٣

ئێمەی مەلا موعەلیمەکانی شاری هەولێر ساڵی (١٩٥٩-١٩٦٠) لەدەورەیەکی پەروەردەیی یەکساڵی و تایبەت بە پیاوانی ئایین، لە ئامادەیی «موسەللا»ی شاری کەرکووک وەرگیراین. دوای نیوەی ساڵ، بۆ «تەتبیق» منیان ناردە قوتابخانەی (تەپەی ئێواران).

بەڕێوەبەری ئەوسا خوالێ خۆشبوو مامۆستا «طاهر صادق»ی خاوەنی ئەم فەرهەنگە نایابە بوو. پیاوێکی زۆرگران و ڕۆشنبیرو خۆشەویست و قسەخۆش بوو. یەکجار زۆر ڕێزی دەگرتم. بۆیە لەو ساکەوە من بەشانازییەوە بە مامۆستاو ڕابەری خۆمم لەقەڵەم داوە. داوای لێبووردن لەگیانی پاک و پیرۆزەکەی دەکەم، ئەگەر خوانە خواستە قەڵەمەکەم لەنەزانینەوە، لەهێندە شوێنان، لە ئاستیدا سەرچێخ چووبێت، مەبەستم تەنیا خزمەتی زمانە شیرینەکەمانەو چیترنا. بەس من نازانم و سەرم سوڕماوە لەم فەرهەنگە قەشەنگە کە بەسەدان وشەی نامۆی وای لە فەوتان ڕزگارکردووە، کە جێگای سوپاس و ستایشی هەتا هەتایە، ئەگەر ئەمڕۆ بەچراش بەدوایاندا بگەڕێین، نایاندۆزینەوە، بۆ پیتی «پێ» دوای پیتی «تێ» و پیتی «چیم» دوای پیتی «حێ» و «خێ»، و پیتی «ڤێ» پاش پیتی «قاف» کەوتوونە. با دەستنووسەکەش وابووبێت، لەسەر مامۆستای ڕێزدار «فوئاد» پێویست بوو، لەکاتی چاپ کردنیدا بیگۆڕی بووایە، بەڵام ڕەنگە دڵی نەهاتووبێت، دەستکاریی بەرهەمە بەپێزەکەی باوکی بکات. لەم ڕووەوە حەرەجی لێناگیرێت.

## پیتی ئەلف

١- مامۆستا لەلاپەڕە «١٤»ی فەرهەنگەکە دەفەرمووێت:

«ئاقار= سنوور، تخوب، حدوود».

ئاقار لەدەشتی هەولێر: بەدەشت و زەوی و زاری دەرەوەی ئاوایی دەگوترێت. نەک سنوورو تخوب.

٢-ل١٦ «ئاموور= هەوجار، هاموون، مژان= الـة الحـراثة، محراث». ئاموور بەس بەدار هەموجار دەگوترێت. هەرکە، کەرستەکانی دیکەی وەک «گاسن، مژانە، خەپە، قەفیز...» وەکو دواتر ئەوسا پێی دەگوترێت «هەوجار». مژان، یان مژانە پارچەیەکە لە هەوجار.

## پیتی بێ

١- ل٢٩ «بابۆڵە= قەپوچکە، لیپ، شۆپ، زلەپاروو، پاروو= دبلة، لقمة».

شۆپ= تیکە و پارووی گەورە.

لیپ= پارووی گەورە.

هەردوو وشە دەگونجێت بۆ ڕاڤەکردنی «بابۆڵە» تەنیا وشەی «قەپوچکە» نەبێت. قەپوچک، یان قاپوچکە سێ مانای هەیە:

یەکـــەم: بەرزبوونەوەی ئاو لەکـــاتی باران بارینی بەرێژنە.
دووەم: قـونکێکی کـەسکە لە چەشنی «پەنجـە»یەو پەرەکانی گوڵی لەسەرە، واتە قۆزاخەکەی.
سێیەم: پارووە نان وەک ملاکی لێ بکرێت بۆ خواردنی ماست و شتی شل ئەمەش لەگەڵ مانای «بابۆڵە» یەک ناگرتەوە.
بەرەوای دەزانم لێرەدا کـەمـێک لەمـانای «بابۆڵە» و «پاروو» بدوێم.
هەمـبـانە بۆرینە دەڵێت: بابۆڵە= «تیکەی درێژ». پاروو= «ئەو پارچە خۆراکەی بۆ جارێک ئەیخەنە دەم، تیکە، لوقمە».
فـــەرهەنگی خـــاڵ دەڵێت: بابۆڵە= «پارووەنانی پێـچـراوی درێژی ئەسـتـوور». پاروو= «ئەندازەیەکـە لەخواردن کە بەجارێک بخرێتە دەمەوە».
کـــوردســتـــان دەڵێت: بابۆڵە= «پارووە نانی درێژو پێچراو». پاروو= «ئەوەندە خواردەمەنییەیە کە بەجارێک بتوانرێ لەزار بنرێ».
لەدەشتی هەولێر: پاروو بەدوو مانا دێت:
یەکەم: ئەو ئەندازە خواردنەیە کە بەجارێک دەخرێتە دەم. واتە لوقمە.
دووەم: نانی لوولدراوی درێژ. نانەکە بەوشکی بێت، یان پێخۆری تێدابێت.
بۆ ئەمـەیان: «ئازاد دوو هێلکەی کـردە پارووێک و خواردی». ئەمەیان دوو تەرجە: «گەورە» و «بچووک». بچووکەکە بابۆڵەش دەگرێتەوە، واتە بابۆلە پارووەنانی لوولدراوی بچـووکـە. بەبۆچوونی من «بابۆڵە» تایبـەتە بەمنداڵ: «بابۆڵەیەک بۆ منداڵەکە بکە».
سەیر لێرەدایە: فەرهەنگی خاڵ و کوردستان پێناسەی «بابۆڵە» یان بە «پاروو»ە نانی درێژو پێـچراو کـردووە. کـەچی لەپێناسـەی پارووە‌دا خـۆیان لێ لاداوەو هەر بە لوقمەیان داناوەو بەس.
٢- ل٣٠ «باخەڵ= گیرفان، بەری، بەرک=جیب».
باخەڵ نێـوان سنگ و کـراسـە، یاخۆ نێـوان دوو بەرگ لەئاست پەراسووەدا، یان نێوان بەرگ و پەراسووە. لەگەڵ «گیرڤان» و «بەرک» جیاوازە. ئەمەیان تایبەت بەدرومان دروست دەکرێت.
٣- ل٣١ «بارگە= وەردەک، وارگە= جهاز العروسة».
بارگــە= نوین و کـەل و پەلێکە، رێبـوار دەیخـاتە سەرپشتی ولاخ و گوێدرێژ. لەبارگەی بووک گشتیترە. ئەمەیان تایبەتەو بەشێکە لەئەوەی پێشوو.
٤- ل٣١ «بارگیر= یەختە، بارگین= کدیش».
بارگـیر ئەسپ و مـایینی بارەبەرە. ئەگەر ئەسپـە بارە بەرەکە خسێندرا، پێی دەگوترێت «یەختە». واتە یەختە ئەسپی خەساوە. واش دەبێت گـوێدرێژ دەخەسێندرێت

ئەوسا بە «یەختەکەر» ناو دەبردرێت.
٥- ل٣٣ «بالۆرە= سەردولکە= نواح».
بالۆرە سـەردولکە نیـیـە. ئەمـەیان لەگـەڵ گـریان دەگـوترێت، کـەچی ئەویان «حـەیران»ی ژنانە و لەگـەڵ لەرانەی گـەروو، لەکـاتی گـوتندا بە پەنجـە دەگـوترێت و دوورە لەسەردولکە.
٦- ل٣٧ (برک= بنج، پنج، پنچک= نبتة».
برک لە «پنج و پنچک» جوودایە. «پنج» بۆ بنەگـیاو تۆرکـەو دەغڵ دێت: «دەغـڵـی ئەمــســـاڵ پنجی باش رسکاوە»، کـەچی «پنچک» بنەگـیـایەکی ئەسـتـوورو پرۆچرە. «پـنـچـک»ە «پەرۆشـــــــە» و «پـنـچـک»ە «بۆنخۆشە»ش هەنە، بەڵام «برک» بۆ بنەگندۆرەو تەرۆزی و شفتی و تەماتەو.. بەکاردێت.
٧- ل٣٨ «برێشکە= چەرکە= کرزات».
برێشکە لە «د.هـ» تایبـەتە بەگەنمی برژا، یان بۆدراو بە ئاگرو بەس.
٨- ل٤٠ «بسـتـە= تەوەرە، جـومسـەر، جـەمسـەر= قطب».
لە «د.هـ»: بسـتــە بـەم مـانـایەش هاتووە: «داوێکی باریکی سـەوزەو لەبنەمـێـو، یان لە برکـە بێـسـتـان پەیدادەبێت و خۆی لەشتی دەوروبەری دەئاڵێنێت».
٩- ل٤٤ «بۆگەن= بۆنسار، گەنیو= فاسدعفن».
بۆگـەن بۆنسـار نیـیـە، ئەمـەیان لەگـۆشت مـاسی و هێلکەوە دێت. چ بۆگەنیش نییە.
١٠-ل٤٥ «بەتەگە= بەفاڵ، بەکەڵ، بەبا= شبق».
بەتەگـە تایبـەتە بە بزن. بەفـاڵ بۆ پشـیلەو بەکـەڵ بۆ مانگاو بەبا بۆ سەگ بەکاردێت.
١١- ل٤٥ «بەختە= بەران، مازماز= کبش».
=: «بەختە= «نێری، سابرێن= تیس».
لەدەشتی هەولێر= بەختە= (حزت). بەتەگەو بەرانێک دەگـوترێت کە تەمەنیـان سێ ساڵ بووبێت. ئەگەر کەمتر بوو لە سپیـان «شەک»ەو لەرەشـان «کوور»ی ناوە. ئەگەر تەمــەنیــان زیاتر بوو لە هەردووکـــیـان بە «قـــەیرە» ناودەبردرێن. تەگەی قەیردو بەرانی قەیرە.
نێری و تـەگـە لەیەک ئایرن. ئەویان خەسـاوەو شوان بۆ جـــوانی زەنگوڵی لەمل دەکـــات و وای دەحــەملێنێت لەبەرایی مـــێگەڵ بڕوات. کـــەچی تەگـــە بۆ «فـــەحل» رادەگیرێت.
١٢- ل٥٦ «بەڵم= کۆتەڵ، کوزر= قرضب».
بەڵم کـای برنج و هەرزنـە، کـای درشـتی دانەوێڵـەیە. کەچی کوزر پاشماوەی گوڵم گەنم و جۆیە دوای کۆتان. واش دەبێت دانی تێدا دەمێنێت و دووبارە دەیکوتنەوە.

**پیتی تێ**

١- ل٦٧ «تایەن= پاکانیار، بێ تاوان= بريء».

له «د.هـ» تایەن بەشتێک، یان کەسێکی ناوبراو دەگوترێت: «کابرای تایەن واهات».

٢- ل٧٢ «توور= تورەگە، جۆرک، توورەکە= علیقة».

له «د.هـ»: توورو تورەگە و جۆرک لەیەک جوودان. توور وەکو «بەڕە» بە «تەون» دروست دەکرا و کەل و پەلی تێ دەکراو دەخرایە سەرپشتی وڵاخی کۆچەران. بەرامبەرەکەی «مەلاکدان» بوو. پەنجا ساڵ لەمەوبەر زۆر برەوی هەبوو. تا بۆ جوانی بەدیواری ژووری ماڵەوە هەڵدەواسرا. «تورەگە» لەمەودوا باسی دەکەین. کەچی «جۆرک» بەزۆری لەخام بە درومان دروست دەکرێت نەک بەتەون.

٣- ل٧٧ «تەرس= قەرسە قول، قەستەقول= روث».

=: «تەرسەقول= پشقل، تەپارە، قشپل، ترۆل، سەرگین، شیاکە، لاس، دەوە، سەنێر، ریخ، کەرسۆنە= روث».

مامۆستا هەمووانی بەیەک حسێب کردووە. کەچی «تەرس» پیسایی ئاژەڵی یەکسمە، وەک ئەسپ و ماین و هێستر.

«قەرسوقول، تەرسەقول، قەستەقول» پیسایی گوێدرێژە.

«پشقل»و «قشپل» بۆ سپیان رەشانە.

«سەرگین و شیاکە و ترۆل و تەپاڵە و کەرسۆنەو دەوە و لاس و سەنێر». بۆگاو مانگایە.

مەڕوماڵات لەبەهاردا کە تێرشینکە بوون پیسایی یان شل دەبێت. ئەگەر شلیکەی ئاسایی بوو لەدەشتی هەولێر پێی دەڵێن: «سل». ئەگەر زۆر شلیش بوو ئەوسا بە «ریخ» ناو دەبردرێت: «مەڕەکە ریخاندوویتی».

لەمانگانەش ئاساییەکەی «سەنێر، شیاکە»یەو زۆر شلیش «ریخ»ە.

٤- ل٧٨ «تەشک= تەک، تەنیشت، لا، ئاتەک= جنب، طرف». له «د.هـ»: «تەشک»= بەرداوێن-ی کەواو کورتەک وکراسیش دەگرێتەوە. کەچی باڵای کورتەک و کەوا لە سێ پارچە پێک دێت. بە هەر پارچەیەک لەسێ پارچەکانیان دەگوترێت «ئاتەک». ئاتەکی پشتەوەو ئەملاوئەولا. بۆیە لەگەڵ مانای «تەک» و «تەنیشت» و «لا» ناگونجێت.

٥- ل٨١ «تەنگە= کەژوکەژی= حزام الخيل».

کەژی وەک گوریس لەبەن دروست دەکرێت، بەڵام تەرزی ئەو خرۆکی ناتەنرێتەوە، بگرە بەپانییە.

فەرهەنگی خاڵ دەڵێت: تەنگە قایشێکی پانەو «زین»، یان «کورتان»ی پێ قایە ئەکرێ لەژێر سکی وڵاخەوە»:

هەمبانە بۆرینە دەڵێت: «کەمەر بەندی یەکسم».

بەبۆچوونی منیش «تەنگە= قەبرغە». واتە ئەملاوئەولا سکی بنەوەی گیانلەبەر. کە پێی دەگوترێت «تەرۆک»: «لاتەرۆکێکم ژان دەکات».

بەو قایشەی کە زینی پێ شەتەک دەدرێت، یان بەو «سەرکەلە»یەی «تەنراوێکی «بەن»ی ڕەنگاورەنگە و تۆزێک لەدۆخێن ئەستوورترە»- کورتانی پێ قایم دەکرێت، دەگوترێت «بنزگ» نەک «تەنگە». ڕاستەهێندەجار دەگوترێت «زانا تەنگەی ئەسپەکەی باش توند کردووە»، بەڵام مەبەس بنزگەکەیەتی. ئەمەش دەیسەلمێنێت: «تۆ قسەیەکی وا بەسامان بڵێ تەنگەی پێ بگرێت».

٦- ل٨٣ «تێر= چێر= کیس».

وشەی «چێر»م لە «د.هـ» نەبیستووە. فەرهەنگی خاڵ دەڵێت: «چێر= تێر». هەمبانە بۆرینە دەڵێت: «چێر= جەواڵی دووتا». کەچی تێرو کیس زۆر لەیەک جوودان. کیس جۆرکێکی خامی بچووکە پارەی تێدەکرێت، یا خۆ کیسەی تووتن. لەم دواییەدا «کیسی کاغەز»یش سەری هەڵداوە. لەعەرەبیدا «الكيس مايخاط من خرق فتجعل فيه الدراهم والحبوب و نحوها». کەواتە لەیەک دوورن.

لەبەر ئەوە فەرهەنگە کوردییەکان «خاڵ و هەمبانە بۆرینەو کوردستان» لە ڕاقەکردنی ئەم وشانەدا «تێروتێرکەو خورجەو هەگبەو توورەگە و جەواڵ و خرار» یەکتر ناگرنەوە و هێندێکیان باشیان نەپێکاوە، لەبەر درێژدادری نەبووایە، ڕای یەکە یەکەیانم بلاودەکردەوە، بەپێویستی دەزانم خۆم لێیان بدوێم. داوای چاوپۆشیش لەخوێنەرانی ئازیز دەکەم ئەگەر کەم و کوڕیم لەنەزانینەوە بووبێت.

* تێر= بە تەون لەبەن دروست دەکرێت. دوو جۆری هەیە.

یەکەم: ساکارەو تەرزی بەڕەی ساکارو جەواڵ بێ نەخشەو لەجەواڵ بەرینترە.

دووەم: نەخشینە. بەگرێچن دروست دەکرێت وەک بەڕەی نەخشین ڕیشدارە. کاتی خۆی لەماڵەوە لەجیاتی سندووق کەل و پەلی بەنرخی تێدا هەڵدەگیرا. زۆرجاریش وابووە لەبریتی سەندووق دەکرا بەجیهازی بووک.

* تێرکە و جەواڵ و خرار بەتەون دروست دەکرێن. جەواڵ بەنەو خرار مووەو تێرکە لەبن و مووە. ئەمەیان تێرکە مووتاوی ناوبوو. درێژی و بەرینی هەرسێکیان وەک یەکە و هیچ جیاوازییەکیان نییە. تەنیا دوای دوورین دەردەکەون. ئەگەر کرا دوو (تا) و دەرگای لەناوەڕاست بوو پێی دەگوترێت: «تێرکە». خۆ ئەگەر بەدوو قەد بەیەکەوە دوراو لایەکی بەرینی کرا دەرگا بەنەکە «جەواڵ»ەو مووەکەش «خرار»ە.

تێرکە لە موشەماش بۆ ئاوکێشانەوە دروست دەکرێت. ئەمەیان هێندە جار «تێر»یشی پێ دەگوترێت: «تێرکە ئاو» و «تێرە ئاو».

* خورجە= بابەتێکە لەچەشنی تێر لەبەن «ساکارو نەخشین» دروست دەکرێت، بەڵام زۆر بچووکەو دەخرێتە پاشکۆی سوارولاخەوە. ئەوە ئەگەر دووتا بوو. خۆ ئەگەر جۆرکانی بوو، واتە یەک تا بوو بەشتێک لەپشت سوارەوە قایم دەکرێت. سەردەمایەک قوتابییان وەک جانتا بۆ هەڵگرتنی دەفتەرو کتێب و کەلوپەلی قوتابخانەیان بەکاردەهێنا.

هەگبەش بەبۆچوونی من ئەگەر بەهەڵە نەچووبم، لەگەڵ خورجە یەک دەگرتەوە. هەریەکەیان شێوەزاری ناوچەیەکە. تەنیا ئەوەندە جیاوازییان هەیە هەگبەی دووتا هێندەجار لەموشەما دروست دەکرێت و واش بووە سوار لەجیاتی هەگبەی یەک «تا»کە، هەمبانەی بەکارهێناوە.

* توورەگە: جۆرکێکی گەورەیە و بەزۆری لە موشاما دروست دەکرێت و بیرلێدەر بۆ دەردانەوەی «خۆڵ» بەکاری دەهێنێت. خۆ ئەگەر لە بەن و موو بوو ئەوکات «نالیک»ی تێ دەکرێت بەسەری ولاخەوەی دەکەن. واش دەبێ پەڕۆیە و شتی تێ دەکرێت.

٧- ل٨٤ «تیسک= موو، کولک، تووک، قژ= شعر».

لە «د.ھ» چەند داوە خوری، یان موو لە لەشی سپیان و ڕەشاندا بەیەکەوە دەنووسێن، پێی دەگوترێت «تیسک»: «ئەم مەڕە زۆر تیسکنە». کەواتە تیسک لەگەڵ وشەکانی دیکەی مامۆستا یەکترناگرنەوە. (کولک) بەعەرەبی «وبر»ە، نەک «شعر». تووک بۆ پەڕە مریشکیش بەکاردێت. قژیش تووکە درێژی سەرە.

## پیتی پێ

١- ل٩١ «پالە= سەپان، وەرزێر، درونەکەر= حاصد».

پالە و سەپان لەیەک جوودان. سەپان ئەو کەسەیە کە لەیەکەم ڕۆژی دروونەوە، تاکو گیشەو کوتانی جۆخین و داکردنی دان و کا بەشداربێت. کەچی «پالە» ئەو کەسەیە کە دروونە دەکات و بەس.

جا سەپان بێت، یان دەستەوا، یاخۆ بەکرێی ڕۆژانە درەو بکات، ئەمەیان «کرێپالە»ی ناو بوو.

## پیتی جیم، خێ چیم

١- ل ١٢٠ «جوانەگا= گۆلک، گۆلە، گوێرەکە، پانێر= عجل».

جوانەگا نێرەو دەبێ لەتەمەنی گۆلک ڕەتی دابێت. ئەگەرنا پێی دەگوترێت: گۆلکەنێر. کەچی گۆلک و گۆلەو گوێرەکە بەگۆلکی نێرومێ دەگوترێت. نەک تەنیا نێر. پانێر گۆلکی دوو ساڵەیە.

٢- ١٣٢ «خرێنە= بەن، بەندن= خیط من شعر الماعز».

خوری و مووی خراپ جوان نارستێن و ئەستوورو لپرلپر دەبێت و ناوی بە «خرێنە» دەربردرێت. خرێنە لەخوری و موو دروست دەکرێت. نەک هەر لەموو. لەبەنی ئاسایی ئەستوورترە.

٣- ل١٤٦ «چانە= لەوێ، لەورە، چاگە، ئەوێ= هناک».

لە «د.ھ»: «کەبەر» دڕکێکی لق قایم و دڕە، لەسەر دوو شەقرانیان دەپەستاوەو بەگوریسیان دەبەستاو لەملی گوێدرێژ و ولاخیان دەخست و لەجیاتی جەنجەڕ جۆخینیان پێ دەکوتا.

## پیتی دال

١- ل١٨٩ «دەهۆڵ= دۆڵ، چاتۆڵ، داهۆڵ= طبل کبیر».

لە «د.ھ»: چاتۆڵ و داهۆڵ= داوەڵ= لەنێو بێستان بۆ ترساندنی چۆلەکە، دوو پەلەدار لەشێوەی مرۆڤ، پەڕۆیان بەسەرهەڵدەکێشا.

هێندەجار لەجیاتی پەڕۆ پارچە تەنەکەیان بەبەن تێدەخست. کە بای بهات بووایە دەجوولایەوە و دەنگی لێوە دەهات.

٢- ل ١٩٠ «دێز= بۆز، بۆر= أسمر، رمادي».

دێز کە بە عەرەبی «اکهب»ە، دووجۆری هەیە:

یەکەم:شین. دووەم: شین بۆر. واتەکەوی. کەچی «بۆز» سپی و ڕەش، یان سپی و شینی تێکەڵاوە. لەعەرەبیش «أشمط»ە.

بۆر= «رمادي» و «أسمر»= ڕەشتاڵە، یاخۆ ڕەشئەسمەرە.

## پیتی ڕێ، زێ

١- ل١٩٦ «ڕین= دەسک، چەپک، قامک، گورزە= باقة، حزمة». لە «د.ھ» ڕین بەو زەوییە دەگوترێت کە گیای «چرگە»ی زۆر بێت و لەکاتی کێلانیدا گاسنی هەوجاڕ باش کاری لێنەکات.

٢- ل١٩٧ «ڕفۆک= چنگ، چەنگ، چڕنوک، جنجڕۆک= مخلب». لە«د.ھ» ڕفۆک زەوییەکە، یاخۆ قەدی کەندالْ و چاڵێکە زۆر برووخێت.

٣- ل٢٠٥ «ڕەشک= کەلاش، کلاش= حذاء منسوج».

ڕەشک لە «د.ھ» دەرمانێکە «ڕیس»ی پێ ڕەش دەکرێت. فەرهەنگە کوردییەکان دەڵێن= ڕەشک= کلاشی پەڕۆ و پێلاوی لباد». ئەگەر پیتە بزوێنی «ە» پێوە بلکێت لە «د.ھ» دوومانا دەگەیەنێت. یەکەم: ڕووەکێکی دەنک وردو ڕەشە دەکرێتە نانەوە.

دووەم: دەفرێکی کون کونی گرێچنە و لەموو دروست دەکرێت بۆ «کا» کێشانەوە.

٤- ل٢١٤ (زڕ= سهر= ربیب، ربیبة).

«زڕ» ماناگشتییەکەی= «نائەسڵ». لەڕووەکدا: «زڕتو» و «زڕگۆگەم» و لەبنیادەمدا «زڕباب، زڕدایک، زڕبراو خوشک، زڕکوڕوکچ». کەچی مامۆستا چاوی لە مانا گشتییەکەی پۆشیوەو تایبەتی کردووە بە «زڕکوڕ= ربیب و زڕکچ= ربیبة». بۆ پیاوێکە بێوەژنێکی هێنابێت کوڕوکچێکی لەمێردەکەی بەرایی بووبێت، وشەی «سهر» کوردی نییە و عەرەبییە. «سهر= ئاگادار» فرمانە «ماضي و مضارع»ەکەی «سهر يسهر». «سهر الحارس هذه الليلة= مانام». ئەم مانایەش زۆر لەمانای «زڕ»ەوە دوورە، ڕەنگە مامۆستا مەبەستی «صهر» بێت. کە بەزاوا دەگوترێت. زاواش زڕی پێناگوترێت.

**پیتی س، ش**

١- ل٢٤٠ «سوختە= قوتابی، فێرخواز، خوێنەر، خوێندکار= تلميذ، طالب، دارس».

سوختە، قوتابی سەرەتایی بوو. کاتی خۆی ئەوەی لە «حوجرە» و مزگەوتانی بخوێندبووایە پێی دەگوترا «فەقێ». ئەو فەقێیەی لەسەرەتای خوێندندا بوو «سوختە»ی ناوبوو. ئەوی دیکە «موستەعید» سوختە دەرسی لای موستەعید دەخوێندو هەرچی ئیش و کاری حوجرە بوو: «نان و شیو پەیداکردن و چایەلێنان و ئاوهێنان و مالینی حوجرەو...» سوختە ئەنجامی دەدا. موستەعید داری لەسەربەردی دانەدەنا. تەنیا دەرسی بە سوختە دەگوت و خۆشی لای مەلای ئاوایی دەیخوێند.

٢- ل٢٤١: «سوورانە= بەمێردانە= ضريبة الزواج».

بەمێردانە زێدەیە و مامۆستا خۆی دروستی کردووە. ئەو پارەیەی کە باوک لە بەمێردانی کچەکەی وەردەگرێت پێی دەگوترێت «شیربایی». بەعەرەبی (صداق المرأة: زيادة عن المهرالمقرر». زەمانی پێشوو هەرکەسێک لە گوندی ئاغانشین، کچی بەمێرد بدابووایە، دەبووایە ئاغای ڕازی بکات. بەزۆری پارە بوو. هێندە جار تفەنگ، یان شەشاگر بوو. پێی دەگوترا «سوورانە». مانای ئەم وشەیەش زۆر دزێوەو لێرە ناگونجێت ڕاڤەبکرێت. بۆنی سیاسەتی ئەو سەردەمای پێوە دیارە دژی ئاغان.

٣- ل٢٤١ «سوڕگوم= شاردنەوە، حەشاردان= إخفاء». ئەوەی مامۆستا دەفەرمووێت «سرگوم»ەو وشەیەکی لێکدراوە: «سر» عەرەبییە و «گوم» کوردییە. کەچی «سوڕگوم» بە پیاوێک دەگوترێت کە لە فرت و فێل و کاری قەلپ نەپەنگێتەوە: «فلان کەس پیاوێکی سوڕگومە».

٤- ل٢٥٠ «سەرەمر= بڕۆکە، ڤارۆک، وارۆک= فروج». سەرەمر لە «د.هـ» دەبێ لەتەمەنی بارۆکە ڕەتی دابێت و دوو بەهاری دیبێت.

٥- ل٢٦١ (شمشال= بلوێر، بلوور، فلوت، دودک، دووزەلە= مزمار».

شمشاڵ لە «د.هـ» ئاسنەو بلوێر= «بلوور» دارە. «دوو زەلە»ش قامیشی پێکدارە.

**پیتی قاف، لام، میم**

١- ل٢٨٥ (قۆدی= ئاوێنە، نەینۆک= مرآة».

قۆدی لە «د.هـ»= قوتی. وەک قوتی جگەرەو ئاوی تەماتە و...

٢- ل٣٥٨ (لەیلوک= جۆلانە».

لەیلووک تایبەتە بۆ نووستنی منداڵ و لە ئاسن و دارە، کەچی جۆلانە لەگوریس و شتی تر دروست دەکرێت.

٣- ل٣٧١ «مۆرە= زار، نرد».

نەرد: «تاولە» و زار= دەم، یاخۆ مورووەکانی تاولەیە. لە «د.هـ» کە دیواری حەوشە تەواوبوو، بۆ ئەوەی باران کارنەکاتە سەر خشتەکانی ڕیزی سەرەوەی قوڕێکی ئەستوریان لێدەدا. کە پێی دەگوترا: «مۆرە».

**پیتی واو، هێ**

١- ل٤٠٩ (وشی، هێشو، هۆشە= عنقود».

وشی لە «د.هـ» بەم مانایەش هاتووە: «پاش دروێنە و کۆکردنەوەی «سوارە= مەڵۆ»کانی کەسانی هەژار هەبوو گوڵە دەغڵی کەوتووی لە پەرێزەکە، یان داوەڵی جێماوی هەڵدەگرتەوەو بەکوتک دەیکوتا».

٢- ل٤١٠ (وەرد= دووگاسن= حراثة الثانية».

هەموو کێڵگەیەکی دووگاسن پێی ناگوترێت «وەرد» ئەمە مەرجی خۆی هەیە. یەکەم گاسنی دەبێ دوای بارانی پەڵەو کزربوونی زەوییەکە بێت کە بە «شۆ» ناو دەبردرێت. دووەم گاسن دوای بارانی زۆرو کزربوونەوەی شۆیەکەیە.

٣- ل٤٣٣ «هەڵەپاس= لاپار، لاقرتە، لاپڵە سەنگ، لاپواز، هەڵقوتێن= فضولي». هەڵە پاش لە «د.هـ» زۆرگۆ و چەقاوەسووە.

٤- ل٤٣٨ «هیزە= کوند، کوننە= جراب».

هیزە، پێستەی خۆشکراوی ڕەشانە، بۆ هەڵگرتنی ڕۆنەو کوندە بۆ ئاوەو جیاوازیان زۆرە.

# بنچینەی زمان و خەتی کوردی و پێشنیارێکی ڕێنووسی

ڕەحیم سوڵتانی
(مەهاباد)

به بەربڵاوی فەرهەنگ و ئەدەب و لەژێر قوبەی شینی ئاسماندا، به درێژایی مێژووی مرۆڤ، لەو کاتەوە کە وشە پێی ناوەتە ناو گۆڕەپانی ژیان، مرۆڤ توانای وەی پەیدا کرد سروشتی بەرچاوی خۆی به جوانی دەنگ و بێژە بڕازێنێتەوەو پێوەندی خۆی دەگەڵ سروشتی گیانلەبەرو بێگیان بەهۆی دانانی دەنگ و نیشانەکانی زمانەوانی بەدی بێنێ. بێرگسۆن لەسەر ئەم باوەڕەیە کە نیشانەکانی زمانی له ڕابردوودا به ماناکانەوە لکاون و پاشان بەرەبەرە ئەم نیشانانە له ماناکانیان جیابوونەتەوەو بەشێوەی وشەکانی «هەڵڕووتاو» هاتوونەتە ئارا، کە دەکرێ ئەم ئاڵوگۆڕانە بەسێ کەرتی دڵداری و ئیرادی و مانایی دابەش بکرێن.

زمانی کوردی به درێژایی مێژوو به وڕەی بەرزی «ڕاگوێزو بێژەرەکانی» شانازی کردووەو ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ پاراوتر بووەو ئەم پاراوییەش بەرهەمی ئەزموون و بەسەرهاتی باب و باپیرانمانە کە سینگ بە سینگ لێی دواون و ئاڕاستەی کۆڕی شەوانەیانیان کردووەو بوونەتە هۆی جێگرتنی ئەدەبیاتی سەرزارەکی لەناو کورداندا.

مێژووی مرۆڤ لەم کاتەوە سەرچاوە دەگرێ کە شێوەی نووسین و خەت دێتە ناو مەیدانی ژین و ژیانی مرۆڤ و مانا پەیدا دەکات.

خەتەکانی ڕابردووی کۆن بەشێوەی کێشانەوەی وێنەکان بوو کە پاشان ئەم خەتە جێگەی خۆی دەدا به خەتی ئیدۆئۆگراف، بەڵام ئەم خەتانەش کەندو کۆسپی تایبەت به خۆیان هەبوو، بۆ وێنە نەیان دەتوانی حاڵەتەکانی ڕووحی و زەینی وەکو ئەوین و پەژارەو خۆشی به جوانی ڕابگەیەنن؛ بەدوای واندا خەتی هیجایی و بڕگەیی و پاشان خەتی داتاشراوی «ئەلفوبێ» بەدی هات کە بۆ نیشاندانی هەر دەنگێک له پیتێکی تایبەت کەڵک وەردەگیرێ. هەوەڵین خەتی کە کوردەکان پێیان نووسیوە خەتی بزماری بووە.

لەکاتی دامەزرانی خەتی بزماریدا، پارسەکان و کوردەکان به جووتە نووسراوەکانیان به خەتی بزماری دەنووسی. نۆڵدکە دەڵێ: ئەگەر بەردە نووسراوەکانی کوردان وەدەست کەون وەکو بەردە نووسراوەکانی شایەکانی هەخامەنەشی دەبن.

بۆ نیشاندانی زمانی کوردی زۆر کارکراوە، بەداخەوە تاقمێکی زۆر کەم لەسەر ئەم بڕوایەن کە زمانی کوردی له زمانی فارسی وەرگیراوە و زاراوەیەکی فارسییە بۆ وێنە دوکتۆر عەبدولحوسێن مستەوفی له نیشاندانی وێنەی کوردان «تصویرکردها» کاتێک کە ئاماژە دەکاتە سەر بیروڕای مینۆرسکی کە له کۆنگرەی نێو نەتەوەیی ڕۆژهەڵاتناسان له شاری بروکسێل لەساڵی (١٩٣٨ز) دەربڕاوە، بەداخەوە له وەرگرتنی وتاری مینۆرێسکی تووشی هەڵە بووە، کە لەم وتارەدا زمانی کوردی دەخرێتە ژێر لکی زمانە ئێرانییەکان به گشتی، بەم مانایە کە زمانی ئێرانی گەورە، دوو لکی لێدەبێتەوە کە یەکیان زمانی پارسەکانە و ئەمەی تریش زمانی مادەکانە کە له باکووری ڕۆژئاوای ئێران دەژین کەوابوو کاتێک باس له زاراوەکان دێتە ئارا، مەبەست زاراوەکانی پارسەکان به جیاو زاراوەکانی مادی (کوردی) به جیایە، بەم مانایە کە

هەردوو زمانەکان سەربەخۆن و لە لقی گەورەی زمانی هیند و ئێرانییەکان وەرگیراون و هەر بەم چەشنە کە زمانەکانی ئەفغانی و بەنگالی و هیندی و سانسکریت و سەنگالی و ئوردوو... لە لقەکانی دیکەی زمانی هیندو ئێرانین و زاراوەکانیشیان لەیەک جیان.

زمانی کوردی و فارسیش لەم هەل و مەرجەدان و بنچینەی هەموو زمانەکانی کە باسمان لێکردن، دەچنەوە سەر زمانی هیندو ئێرانی و ئەویش لە ئاکامدا دەچێتەوە سەر زمانی هیندو ئەوروپایی، بەڕیز محەممەدی عەبباسی لە نووسینی پێشەکی کتێبی مێژووی بەربلاوی کوردستان (تاریخ مفصل کردستان) نووسراوەی ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی، دەقی وتاری مینۆرسکی بە جوانی شی کردووەتەوەو بەشێوازێکی پتەو، بناغەی زمانی کوردی هێناوەتەوە سەر بنچەکەی زمانی مادەکان، کەوابوو دەبینین کە زمانی کوردی نە تەنیا یەکێ لە زاراوەکانی فارسی نییە، بەڵکو لە باری کۆنینە ناسییەوە سەرڕێژە لە مێژووی پڕ لە بەڵگەو پرشنگدار کە بە خۆشییەوە زمانناسان و مێژووناسان لەم بارەوە زۆری لێدواون و خوێنەری هێژا دەتوانێ بروانێتە نووسراوەی لێکۆڵەرانی وەکو: مەلەکوشوعەرای بەهار، ڤاسیلی نیکیتین، مینۆرسکی، سیسیل جی ئیدمۆندز، دیاکۆنۆف، ویلیام سامارین، ئەمیر شەرەفخانی بدلیسی، مۆربێر، ویلچۆفێسکی، تەوفیق وەهبی، جەمال نەبەز، دکتۆر مارف خەزنەدار و سەدان شارەزای تر.

سێرسیدنی سمیستێر نووسەری کتێبی بەناوبانگی (ئاشوور) لەم بارەوە دەڵێ: «زمانی کوردی ئاڵوگۆری ڕاستەقینەو کۆنی هەیە و لە زمانی فورسی کۆن (لەوحی داریووش) زۆر کۆنترە»، ئەگەر بە چاوێکی ڕوون زەین بدەینە لاپەڕەکانی مێژوو، دەبینین کە سەدان گەورە پیاو و کەڵە پیاوی ناسراوی جیهان بەپێی بەڵگەکانی زمانەوانی و مێژوویی بنچینەی گەلی کوردیان بردووەتەوە سەر مادەکان و دیارە مادەکانیش هەر وەکو پارسەکان خاوەن دەوڵەت و دامودەزگای دەسەڵاتدار بوون و هەر لەو کاتەوە میراتی بناخەی زمانی کوردان شان بەشان گەیشتووەتە دەست ئێمە، بەپێی مێژوو و بەڵگەی لێکۆڵەرەکان، دەردەکەوێ کە مادەکان لە کوردەکان جیانین و هەر وەکی پسپۆری هەڵکەوتوو ڤیلادیمیر مینۆرسکی دەڵێ: هەر لێکۆڵینەوەیەک لە مەڕ کورد و زمانی کوردیدا، دەبێ لەسەر بنەڕەتی مادو زمانی مادی پێک بێ. هەروەها بەڕێز تەوفیق وەهبی چازانی شارەزا و کورد ناسی هەڵکەوتوو لە دەقی وتارێکدا کە لە ڕۆژی (٢٢/١٢/١٩٦٤ز)، لە کۆڕی پسپۆرانی کوردیزان لەسەر زمانی کوردی دواوەو دەڵێ: کورد و ماد پێوەندییێکی لە پسان نەهاتوویان پێکەوە هەیە و کورد و زمانی کوردی لەسەر پنجی ماد و زمانی مادی ڕوواوەو گووراوە.

وەکی باسمان لێکرد هەوەڵێن خەتی مادەکان خەتی بزماری بووە، پاشان بە پێی پێویست بەرەبەرە ئەم خەتەش ئاڵوگۆڕی بەسەرهات و خۆی دەگەڵ هەڵسوکەوتی دەربڕینی زمان ڕێکخست.

مامۆستا محەمەد تەقی بەهار لە پەڕاوی (سبک شناسی) لاپەڕەی (٦٥)دا دەڵێ: پیتی ئەلفوبێی میخی مادی (٤٢) پیت بووە کە (٣٦) پیتیان لە پیتی بزماری ئاشوورییەوە وەرگیراوە و ئەو شەش پیتەی تریان خۆیان دایان هێناوە، پاشان کە هەخامەنشییەکان هاتنە سەر کارو دەسەڵاتیان پەیدا کرد، ئەو (ئەلفوبێ)یانەیان لەبەردە نووسراوەکانی خۆیان بەکار برد.

ئەحمەدی کوڕی ئەبووبەکری نەبتی لەکتێبی (شوق المستفهام في معرفة (رموزالاقلام)دا دەڵێ: لە دەوروبەری سەدەی دەیەمی پێش زایین پیاوێک بە ناوی ماسی سوراتی، پیت گەلێکی لەڕووی (دەربڕاوە ئەبجەدییەکان) هێنایە ئاراو کوردەکانیش هەر بەم پیتانە نووسراوەیان دەنووسی، ئەم پیتانە شێوەی پیتەکانی ئاوێستای دەدەن کە دەگەڕێنەوە سەر سەدەی شەشەمی زایینی.

کەوابوو بۆمان دەرکەوت کە کوردەکان لەپێش داهاتنی ئیسلامەتیدا خەتی تایبەت بە خۆیان هەبووە، بەڵام پاشان بەدوای بەدیهاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام، زمانی عەرەبی بە بۆنەی زمانی قورئان بوون، جێگەی خۆی لەناو نەتەوەکانی تازە موسوڵماندا کردەوە و تەواوی نووسراوەکانی ئیداری و ڕەسمی بەزمانی عەرەبی دەنووسران، بەڵام بنچینەی بەهێزی فەرهەنگی نەتەوەی کورد بوو بە هۆی ئەوەی کە وێڕای وەرگرتنی بیروبڕوای پتەوی ئیسلام، ئەم میللەتە زمانەکەی خۆی بە پاراوی بپارێزێ و بە کەڵک وەرگرتن لە پیتەکانی ئەلفوبێی عەرەبی، بتوانێ خەتێکی تایبەت بۆ نووسینی کوردی بەدی بێنێ.

### مێژووی ئەلفوبێی ستانداردی زمانی کوردی

لەسەردەمی ئێستادا سێ جۆرە ئەلفوبێ لەزمانی کوردیدا بەکاردەهێنرێ کە بریتین لە:

١- ئەلفوبێ لەسەر بنج و بناوانی تیپی ڕووسی.
٢- ئەلفوبێ لەسەر بنج و بناوانی تیپی عەرەبی.
٣- ئەلفوبێ لەسەر بنج و بناوانی تیپی لاتین.

١- دوای شەڕی دووەمی جیهانی، ئەلفوبێی لاتینی هەموو نەتەوەکانی ڕووسیا لەناو ئەوانەش کورد، دەستی لێهەڵگیراو ئەلفوبێی تازەیان لەسەر بنچی ئەلفوبێی ڕووسی بۆ دانان، ئەم کارە هەموو نەتەوەکانی قەفقاس و ئاسیای ناوەڕاستی گرتەوە، بەڵگەی گۆڕینی لاتین بە ڕووسی بۆ کورد ئەوە بوو کە منداڵی کورد بە ڕووسی و کوردی و ئەرمەنی دەخوێنێ، واتە پێویستە سێ جۆرە ئەلفوبێ فێربێ، ئەگەر زمانی کوردییەکەی خۆی بە ئەلفوبێی ڕووس بنووسێ مانای ئەوەیە کە فێری دوو ئەلفوبێ دەبێ، ئەلفوبێی ڕووسی بۆ دوو زمانی ڕووسی و کوردی و ئەلفوبێی ئەرمەنیش بۆ زمانی ئەرمەنی. ئەمە ئەگەرچی بۆ کوردی ئەوێ قازانجی هەبوو، بەڵام بۆ کوردی دەرەوە زیانێکی گەورە بوو.

٢- ئەلفوبێ لەسەر بنچ و بناوانی تیپی عەرەبی: ئەمە لەسەردەمی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامەوە تا ئێستا بەردەوامە، لە چەند قۆناغێکدا گۆڕانی بەسەر داهاتووە لە پێناوی ئەوەی زیاتر تیپەکان لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردی بگونجێن:

١-٢. یەکەم هەنگاو هەر لە کۆنەوە تیپەکانی (پ. چ. ژ. گ) خراونەتە سەر ئەلفوبێی عەرەبی، چونکە ئەم دەنگانە لە عەرەبیدا وێنەیان نییە.

٢-٢. دووەم هەنگاو لەلایەن یوسف زیائەددین پاشای خالیدی لەساڵی (١٨٩٢) لەکتێبی (الهدیة الحمیدیة في اللغـة الكردیة) هەڵگیراوەتەوە کە لەم کتێبەدا هەستی بەوە کردووە کە سێ جووڵەکەی زمانی عەرەبی، (سەرو بۆرو ژێر) لە کوردیشدا هەیە و هەروەها دوو دەنگی (و) واوی کراوەو (ی) یێی کراوەشی ناسیوە و دانانی تیپی تایبەتی بۆ ئەم دەنگانە بە پێویست زانیوە.

٣-٢. لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا ئەم دەنگدارانە پەیدابوون (ـە، و، ی، وو)

هەروەها لەساڵی (١٩٢٦) ئەحمەدی عەزیز ئاغا لەکتێبی (ئەلفبای کوردی) پێشنیار دەکا تیپ بۆ هەندێ دەنگدار دابنرێ و بۆ جیاکردنەوە (ر) سووک لە (ڕ) قورس و پیتی (ل) سووک لە (ڵ) قورس، پیتی تایبەتی و هەڵکەوتوویان بۆ دابنرێ، لێرەدا نووسەر تەنیا پێشنیار دەکا و تیپ بۆ ئەم دەنگانە دانانێ.

٤-٢. لەساڵی (١٩٢٣) وەزارەتی مەعاریف داوای لەتەوفیق وەهبی کرد ڕێزمانی کوردی بنووسێتەوە، کە ئەم ڕێزمانە بە دوو بەش لە ساڵی (١٩٢٩ و ١٩٣٠) بڵاوکرایەوە، هەر لەو سەردەمەدا بوو سەعید سیدقی «مختصرصرف و نحوی کوردی) دانا (بەغدا ١٩٢٨) ئەمانە هەموویان بایەخی زۆریان بە ئەلفوبێی داوە، بەتایبەتی ئەو تیپانەی دەنگیان هەبوو و ڕەنگیان نەبوو، پێویست بوو بە دروشمی وەکو (i) ئەم تیپە تازانە بەدی بێنن.

٥-٢. لەساڵی (١٩٣٠) مارف جیاووک (بەرگی ئیملای کوردی) بڵاوکردەوە، لەوەدا پیتی بۆ هەر سێ جووڵەی عەرەبی دانا.

دوا هەنگاوی گۆڕانی ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنچی تیپی عەرەبی دەکەوێتە پاش شەڕی دووەمی جیهانی، لەو ماوەیەدا هەرچی پێویست بوو لە ئەلفوبێی عەرەبیدا بکرێ، بۆ ئەوەی بەتەواوی لەگەڵ زمانی کوردی بگونجێ، گەیەندرایە ئەنجام، تەنیا دەنگێک نەبێ (ژێری گوشراوی سووک)، هیچ جۆرە وێنەیەکی بۆ دانەنراوە و لە ئیملای کوردی بە تیپی عەرەبی نانووسرێ، بەڵام لە ئەلفوبێی لاتین ئەم پیتەی (i) بۆ تەرخان کراوە، وەکو ئەوەی بە پیتی عەرەبی «مردن» دەنووسرێ، بەڵام بە لاتین «Mirdin» دەنووسرێ.

کەوابوو لە ئاکامدا ئەلفوبێی کوردستانی عێراق و ئێران لەسەر بنچی تیپی عەرەبی گەیشتە ڕادەیەک کە نەتوانرێ زیاتر دەسکاری بکرێ، لەم کردەوەیەدا ڕۆشنبیر و خوێندەوارێکی زۆری کورد بەشداریان کردووە، لەسەرەوەی هەموویانەوە جێ پەنجەی تەوفیق وەهبی لەم لایانەوە ئاشکراو دیارە.

٣- ئەلفوبێ لەسەر بنچ و بناوانی تیپی لاتین: لەدوای شەڕی یەکەمی جیهانی لە سێ لا «عێراق و ئەرمەنستان و سووریا» هەوڵ درا ئەلفوبێی ستانداردی زمانی کوردی لەسەر بنچ و بناوانی ئەلفوبێی لاتین دابنرێ.

١-٣. لاتینی کوردستانی عێراق: لەبەغدا زانای ئینگلیسی ئی. ب.سۆن لەساڵی (١٩١٩) کتێبی (سەرەتای دەستووری زمانی کوردی) بڵاوکردەوە، ئەمە لەسەر بنچ و بناوانی دیالێکتی کرمانجی خوارووی زمانی کوردی بوو، کە تیپی دەنگەکانی بە لاتین دەنووسرا. کتێبی تەوفیق وەهبی بەنێوی (خوێندەواری باو) لەساڵی (١٩٣٣) لەبەغدا بڵاوکرایەوە، هەروەها زنجیرەیەک وتار لە گۆڤاری (دەنگی گێتیی تازە) لەساڵی (١٩٤٣-١٩٤٤) بەناوی دەستووری زمانی کوردی بڵاوکرایەوە، ئەمە هەمووی مەشق بوو بۆ جێگیرکردنی تیپی لاتین لەناو کوردی عێراقدا، بەڵام لەبەر هۆی سیاسی و هۆی ئایینی ئەم کارە سەری نەگرت.

٢-٣. لاتینی کوردی ئەرمەنستان: لەساڵی (١٩٢٩) ئیسحاق مۆرۆگولۆف و عەرەبی شەمۆ، لەسەر بنچی لاتین ئەلفوبێیان بۆ کوردی ئەو وڵاتە دانا، پاشان بوو بە ڕەسمی و ئەوجا کتێبی زانستی و هونەری و کتێبی قوتابخانەی پێ چاپ کرا، بۆ ماوەیەکی زۆر ڕۆژنامەی ڕێی تازەی پێ چاپ کرا و تا ساڵی (١٩٤٥) لە

قەفقاسی رووسیا بەردەوام بوو، لەو کاتەدا ئەلفوبێی رووسی جێگەی وی گرتەوە.

٣-٣. مەسەلەی ئەلفوبێی تازەی تورکی کارێکی گەورەی کردە سەر رۆشنبیری کوردی، لە ساڵی (١٩٣٢) لە سووریا جەلادەت بەدرخان ئەلفوبێی کوردی لەسەر بنجی لاتینی داناو لە کتێبی (رێزمانا ئەلفبایا کوردی، شام ١٩٣٢) بلاو کرایەوە، بێگومان دانەری ئەم ئەلفوبێیە پێرەوی دیالێکتی کرمانجیی سەرووی کردووە، ئەم ئەلفوبێیە لە بلاوکردنەوەی رۆشنبیری کوردی دەورێکی گرینگی هەبوو، تا دوای شەری دووەمی جیهانی، ئیتر نەک زمانی کوردی، بەڵکو بوونی کوردی لە سووریا قەدەغە کرا.

بەچاو لێکردنێکی زۆر کورت، بۆمان دەردەکەوێ کە نەتەوەی کورد وەکو هەموو میللەتەکانی سەربەخۆی دیکە پێویستی بە یەک جۆرە خەت و ئەلفوبێ هەیە و دەبێ بنچینەی وێژە و فەرهەنگی نووسینی خۆی لەسەریەک شێوە رێنووسی باوەڕ پێکراو دانێ، بەلام لە هەلومەرجی ئێستادا ئەم کارە هەڵنەسووراوەو ئێمەش دەبێ لانی کەم بۆ پاراستنی میراتی فەرهەنگی کاڵ و باپیرانمان هەوڵ بدەین و بۆ پاراوکردن و گەشەپێدانی زمانەکەمان و رێنووسی خەتەکەمان تێبکۆشین، کەوابوو ئەرکی سەرشانی مامۆستایان و پسپۆرەکانمانە کە لەم بوارەدا هەنگاوی چالاکانە هەڵگرنەوە و ببنە چرای رووناکیی زانست.

تازە لاوەکانمان دەبێ بزانن، ناسینی رابردوو هەوەڵین هەنگاویانە و دەبێ دوای ناسینی هەڵەکان پەندیان لێوەرگرن و بە سارێژکردنی برینە لەمێژینەکانمان، بناخەیەکی فەرهەنگی و باوەرپێکراو بەدی بێنن؛ لە زۆر بواریشدا دەبینین بنچینەی پتەو و باشمان هەیە و بەرە بەرە گەشەی کردووە، بەلام لە شوێنێکی تایبەتدا وێستاوە و ئیتر لە جووڵە کەوتووە، ئێمە دەبێ هۆی راوەستانی بدۆزینەوە و بۆ بزووتنەوە و پەرەسەندنی ئەم رەوتە تێکۆشین.

نالەبارییەکی دیکەی کە لەناو لێکۆڵەران و پسپۆرانەوە دێتە بەرچاو، ملۆزمی ترس لە دەربڕینی ویستی دڵ و بیرە، بەم مانایە کە شارەزایان هەست بە پێویستی بەدیهاتنی ئاڵوگۆڕی نوێ دەکەن، بەلام هەنگاوی بۆ هەڵناهێننەوەو هەر گەورە پیاوی چاوی لە کاری گەورەیەکی ترە، مامۆستای پایە بەرز عەبدورڕەحمان شەرەفکەندی ناسراو بە (هەژار)یەکێ لە گەورە پیاوەکانی وێژەو ئەدەبی کوردەوارییە کە بە پێچەوانەی ئەم بیرە نالەبارە هەڵساو لە هەموو بارێکەوە ژیانی خۆی لە پێناوی گەلەکەی دانا، بۆ وێنە کاتێک هەستی بەوە کرد کە ژێری گوشراوی سووک (بزرۆکە) دەنگی هەیە، بەلام رەنگی نییە، زۆر بە ئازایی نیشانەی تایبەتی (ڤ) بازنەی چکۆلەی بۆ تەرخان کرد و وەک پێشنیارێکی ئەدەبی هێنایە ئارا، بەلام لە ئەنجامدا بەم هۆیە کە ئەم نیشانەیە لە زەنەی عەرەبی (سکون) نیزیک بوو و هەروەها نووسینی قورس دەکرد، وەبەر دڵی جەماوەر نەکەوت و هەروەک پێشنیارێک ماوە، دیارە مامۆستا هەژار بە ناسینی ئەم پێداویستییە نە تەنیا خەوشی نەهاتەوە سەر بەڵکو وەک زمانناسێکی شارەزا، لاپەرەیەکی دیکەی بە هەڵکەوتوویی خۆیەوە لکاند، کەوابوو لە ئەنجامدا تێدەگەین کە مامۆستاکانمان دەبێ تارمایی بیری هونەری مردوو لەبەر چاویان لادەن و بە پێکهێنانی کۆڕ و لیژنەکانی ئەدەبی، گرێ پووچکەی نەزانی بکەنەوە و رێگەی بیری نوێ و پێشکەوتوویی کۆمەڵ بخەنە بەرچاوی تازە لاوەکان کە رووناکبیرانی داهاتووی نەتەوەکامانن.

دیارە باسی ئەم چەند لاپەرەیە سەبارەت بە ناسینی زمان و خەتی کوردی بە تەنیایی کەمە و هۆگران دەتوانن وەکو لێکۆڵەرێکی لێهاتوو بە خوێندنەوەی بەرهەمی پسپۆران، بچنە ناو رەگی باسەکەوە؛ بەلام سەرجەمی ئەم وتارە بیانوویەکە بۆ هاتنە نێو باسی گیروگرفتەکانی زمانەوانی و ئەوەی کە مەبەستی ئەم وتارەیە، نەنووسینی دوو پیتی (ئـ) و (ع) لەناو تیپی ئەلفوبێی لاتینی ئێستایی دایە. لە نووسینی ئەلفوبێی بەتیپی عەرەبی بە راشکاوی و ئاشکرایی دەبینین کە ئەم دوو پیتە لەباری فۆنەتیک و لەباری ئۆرتۆگرافییەوە وەبەر چاو دێن و جێگەیەکی تایبەتیان لە رێنووسی کوردی بە ئەلفوبێی عەرەبی دابین کردووە.

بەلام بۆ نووسینی ئەم دوو پیتە دە تیپی لاتینیدا، پیتی (ئـ) لە نووسیندا ون دەبێ و لە باتی نیشاندانی پیتی (ع) بەشێوەی تیپێکی تایبەتی، ئەم پیتەش دەکەوێ و نیشانەیەکی بەم جۆرە (,) بۆ تەرخان کراوە؛ کە لەباری زمانەوانییەوە بەگیروگرفت دێتە بەرچاو.

تاقمێک لەپسپۆران لایان وایە. چونکی تەنیا ئەم وشانەی کە لە هەوەڵیان پیتی (ئـ) دەنووسرێ کوردین و ئەگەر لەنێوان یا کۆتایی وشەدا (ئـ) هاتبێ ئەم وشەیە کوردی نییە، بنەچەکەی دەگەرێتەوە سەر عەرەبی و زمانەکانی تر، بەم هۆیە تاقمی ئەم پیتە کوردییانەیان پێ کەمە و دەرهاویشتنی (ئـ) یان پێ ساکارترە لە داهێنانی پیتێکی تایبەت بۆ جێی بەتاڵی وی؛ بەلام بەزەین دان بەوەی کە لەرێنووسی کوردی بەتیپی عەرەبی ئەم پیتە دەنووسرێ و تەنانەت لەزمانی فارسیشدا نیشانەی تایبەتی (ء) بۆ تەرخان کراوە، وەکو پێشنیارێک لامان

وایە کە لە ڕێنووسی کوردی سۆرانی بەتیپی لاتیندا پیتێک بۆ (ئـ) دیاری بکرێ. سەبارەت بە نووسینی پیتی (ع)، گەلێک مامۆستا لایان وایە کە ئەم پیتە ئاسایی نییە و لەزمانەکانی دیکەوە هاتووەتە ناو زمانی کوردی، هەر بەم بۆچوونەش لە نووسینی لاتیندا دیاردەیەکی تایبەتی بۆ نیشاندانی نییە و تەنیا بەنیشانەی (ʾ) لە هەوەڵی ئەم پیتانەی کە پێشەکییەکەیان بە (ع) دەست پێدەکا، مەبەستی نووسینی خۆیان دەربڕیوە، کە ئەم بۆچوونەش لە کوردی سۆرانیدا بە جوانی جێ ناکەوێ، چۆن لەکاتێکدا کە پیتی (ع) لە ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی پێناسەی وەرگرتووەو بە پیتێکی سەربەخۆ ناسراوە هەرچەندە کە ئاسایی و خۆییش نەبێ، لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە وشەی بێگانە لەزمانی کوردیدا بەکاردێن کە ئەم دەنگەیان تێدایە، چارەمان نییە و دەبێ لە (ئەلفوبێ)کەماندا وەری گرین و لە ڕێنووسەکەماندا پیتێکی بۆ تەرخان کەین.

بە تێبینییەکیش لەسەر نووسینی کوردی بە لاتین، بۆمان دەردەکەوێ کە نووسینی زمانی تورکی بەتیپی لاتین لە زۆر شوێندا نیسێی خستووەتە سەر نووسینی کوردیش بەلاتین، بۆ وێنە لەزمانی تورکیدا وشەی (عەلی) لەدەربڕیندا بە (ئەلی) دەردەبڕدرێ و لەتورکیدا (ع) دەبێتە (ئـ) کەوابوو لەنووسینی تورکیدا (ع)مان نییە و ئێمەی کورد زمان بەوەبەرچاو هێنانی فۆنۆلۆژی و ئۆرتۆگرافی زمانەکەمان دەبێ ساکارترین ڕێگە بۆچارەسەرکردنی گیروگرفتی خەت و ڕێنووسی زمانەکەمان بدۆزینەوە. لێرەدا منی بچووک بە سەرنجدان لەسەر مێژینەی خەتە کۆنەکانی زمانی کوردی و هەڵبەت بە وەبەرچاو هێنانی بۆ چوونی خۆم و ڕادەی تێگەیشتن لەباری زمانییەوە، دوو پیتم وەکو پێشنیارێک هێناوەتە ئاراو دیارە لەم بوارەشدا جگە لەوەی کە سەر پەڕی باسەکە بۆ پسپۆڕان و شارەزایانی زماناس هەڵدەدرێتەوە، چۆنیەتی بیروڕاو وەبەر دڵکەوتنی جەماوەریش دەبێتە هۆی هەڵسەنگاندن و بناغەی کارەکە، کەوابوو من تەنیا باسەکە دەخەمە ڕوو، ئەمجار پێویستە پسپۆڕان لەسەری بدوێن.

پیتی پێشنیار کراوی لاتین بۆ نووسینی (ع ← ≮) شایانی باسە کە لە ڕێنووسی کوردی بە خەتی ماسی سۆراتیدا کە بنچینەکەی دەگەڕێتەوە پێش داهاتنی دینی پیرۆزی ئیسلام، بۆ نیشاندانی دەنگی (ع) هەر لەم پیتە (≮) کەڵک وەرگیراوە.

پیتی پێشنیار کراوی لاتین بۆ نووسینی پیتی (ئـ)← (4) کە لە ڕێنووسە کۆنەکانی کوردیدا ئەم پیتە لە نووسیندا وەبەرچاو دێ.

ئەم پێشنیارە لەنووسینی پارچە هەڵبەستێکی کوردیدا شی دەکەینەوە:

| ڕێنووسی کوردی بە پیتی عەرەبی |
|---|
| لە عیسای چاوەکەت ویستم تەماشایەکی مردووکا |
| دەنا ڤینووسی ڕووت ئیزنێ بە ئەم ئیعجازە هەر نادا |

| ڕێنووسی کوردی بە پیتی لاتینی ئێستایی |
|---|
| Le ʾîsay çaweket wîstim temaşayekî mirdûka |
| Dena vînûsî r̂ût îznê be em îʾcazê her nada |

| ڕێنووسی کوردی بە پیتی لاتینی پێشنیاری |
|---|
| Le ≮îsay çaweket wîstim temaşayekî mirdûka |
| Dena vînûsî r̂ût 4îznê be 4em 4î≮caze her nada |

بە سەرنجدان بەشێوەی نووسین و حونجەکردنی وشەکانی ژێرەوە بە جوانی پێویستی هەبوونی ئەم دوو پیتەمان بۆ دەردەکەوێ.

ئێستا بۆ ڕوون بوونەوەی باسەکە سێ وشەی (عەلی و ئاو و ئیعجاز) بەش بەش دەکەین و پیتی دەنگدارو بێدەنگەکانیان جیا دەکەینەوە.

B: پیتی بێدەنگ
D: پیتی دەنگدار

| ڕێنووسی کوردی بە تیپی عەرەبی | | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی ئێستایی | | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی پێشنیاری | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| عەلی | | | | ʾEli | | | | ≮eli | | | |
| لی | | عە | | ʾE | | li | | ≮e | | li | |
| ی | ل | ـە | ع | ʾ | E | l | i | ≮ | e | l | i |
| D | B | D | B | B | D | B | D | B | D | B | D |

| ڕێنووسی کوردی بە تیپی عەرەبی | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی ئێستایی | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی پێشنیاری | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئاو | | | ⍰Aw | | | 4aw | | |
| و | ا | ئـ | ⍰ | A | w | 4 | a | w |
| B | D | B | B | D | B | B | D | B |

| ڕێنووسی کوردی بە تیپی عەرەبی | | | | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی ئێستایی | | | | | | ڕێنووسی کوردی بە تیپی لاتینی پێشنیاری | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئیعجاز | | | | | | ⍰îʾcaz | | | | | | 4î≮caz | | | | | |
| ـجاز | | | ئیعـ | | | ⍰îʾ | | | caz | | | 4î≮ | | | caz | | |
| ز | ا | ج | ع | یـ | ئـ | ⍰ | i | ʾ | c | a | z | 4 | i | ≮ | c | a | z |
| B | D | B | B | D | B | B | D | B | B | D | B | B | D | B | B | D | B |

بەتێبینی وشەکانی سەرەود و هەڵسەنگاندنی پیتە دەنگدارەکان و بێدەنگەکان لەناو وشەدا هەروەها زانینی ئەم مەبەستە کە هیچ وشەیەک بە پیتی دەنگدار دەست پێناکا، بۆمان دەردەکەوێ کە لەڕێنووسی تیپی لاتینی ئێستاییدا جێگەی ئەم دوو پیتە پێشنیارییە بەتاڵە و نووسینی ئەم وشانەی کە پیتی (ئـ، ع) یان تێدایە لەباری ئۆرتۆگرافی و بە ڕێنووسی ئێستایی لاتین هەڵەیە

و له ئاکامدا ئەم دوو پیتەش دەبێ قەوارە و قالبی تایبەت بە خۆیان لە لاتیندا بۆ تەرخان بکرێ کە لەباری فۆنۆلۆژی و ئۆرتۆگرافییەوە یەکتر بخوێننەوە و هێنانەوەی بیانووی قورس کردنی خەت و نووسین، بەهۆی وەی کە ئێمە ناتوانین چوارچێوەی زمان تێک بشکێنین، وەبەر دڵ ناکەوێ و نووسینی ئەم دوو پیتە پێویستە.

بەم هیوایە کە بە بیرورا بەنرخەکانتان یاریدەدەری رێگەی پڕ لە ئەوینی خزمەت بە گەلەکەمان بن، چاوەڕوانی سەرکەوتوویی بۆ هەموو خۆشەویستەکانم.

**سەرچاوەکانی کوردی:**

١- خەزنەدار. مارف: مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی یەکەم، هەولێر، ٢٠٠١.

٢- موکریانی. کوردستان: رێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، هەولێر، ١٩٨٢.

٣- زەکی. محەمەد ئەمین: کورد و کوردستان، بەغدا، ١٣٥٠.

٤- بۆرەکەیی. سەدیق: مێژووی وێژەی کوردی، بانە، ٧٠١٣.

٥- وەهبی تەوفیق: بنەچەکەی کوردان و بنچینەی زمانی کوردی، ١٣٦١.

٦- ئیبراهیمی. عەزیز: رێنووس و رێزمانی کوردی، بی چا، بی تا.

٧- نەبەز. جەمال: زمانی یەکگرتووی کوردی، بی چا، ١٩٧٦.

**سەرچاوەکانی فارسی:**

١- بدلیسی. امیر شرف خان. تاریخ مفصل کردستان (شرفنامه)، سال، ١٣٧٣.

٢- نیکیتین. واسیلی: کرد و کردستان، ترجمەی محمد قاضی، چاپ سوم، سال ١٣٧٨.

٣- رخزادی. علی: اواشناسی و دستور زبان کردی، چاپ اول، سال، ١٣٧٩.

٤- مستوفی. عبدالحسین: تصویر کردها، چاپ اول، سال، ١٣٧٦.

٥- امینی. امیر: تحقیقی پیرامون زبان کردی، چاپ دوم. سال، ١٣٧٨.

# پڕۆژەی کوشتنی خۆ

دلشاد عەبدوللا

شەڕ دەستی پێکرد.
ئەگەر دەستی پێ نەکردبا
بەو تەمەنە نەدەچوومە شەڕێ.
سی ساڵ بەر لە ئێستا،
خۆم لەشەڕ دەدزیەوە
سی ساڵ بەر لەئێستا،
ماڵە کۆنەکەمان فرۆشت
لەدیواری خشتی قوڕدا
لەو جێیەی دەلاقەکانمان پڕ کردبووەوە
باوکم خەنجەرێکی پڕ ئەفسوونی باپیرەمی شاردبووەوە
دەیزانی پێویستی پێی نابێ.
ئەو پیاوێکی ئاشتیخوازبوو
بەتەنێ دەچووە دەرێ
شەو درەنگ نەدەهاتەوە
کەسی دوژمن نەبوو
لێشم نەبیستبوو ڕقی لەکەس ببێتەوە.
شەڕ دەستی پێکرد
من دەچمە شەڕێ
بێ ئەوەی هیچ مەبەستێک لە گۆڕێ هەبێ
جگە لەوەی بیسەلمێنم
منیش دەتوانم پەنجەکانم توند لە دەسکی خەنجەر وەربێنم
لە کاتی وەشاندنیدا دەستم نەلەرزێ.
لەیەکەم هەڵمەتدا
خەنجەر لەکالان گیربوو
بە ئامان و زەمان نەدەهاتە دەرێ
کە لەبەردەمی یەکێکدا وەستابووم،
وام مەزەندە دەکرد ئەو کەسە دوژمنە
نەیکوژم، دەمکوژێ.
من هەڵە بووم ئەو کەسە هەونەبوو
ئەوی تریان پڕۆژەی منە بۆ کوشتن
دەچمە بەردەمی
سلاوم لێ دەکا سلاو دەستێنمەوە.
من دوژمنی خۆم بەزەحمەت دەناسمەوە.
دوژمن کێیە؟
دەستم لەسەر مشتووی خەنجەر سارد دەبێتەوە
زمانم تەتەڵە دەکا
ڕەنگم دەبزڕکێ
کەسێک نییە بشێ ببێ بەدوژمنم
دەمی خەنجەر بەلای خۆمدا دەسووڕێنم
ئەوەی پێویستە بکوژرێ
تەنیا خۆمم.



# تێلنیشان

نەژاد عزیز سورمێ

**ئایا باشتر نییە وەگیر قاتلێک کەوی**
**تا وەگیر خەیاڵی ژنێکی هەوسباز؟**
**«نیتشە»**

(١)

**سنووری کۆچەریان لەو سۆزەوە دوایی هات/ پێخوستی ئەرخەوانی پێوە بوو../ سۆمای چاوم مینا بوو/ سایە بێهاوتا.. بێنەزیر/ کنێر پاڵپشت/ تەم بەرکۆژە../ تۆ نیگارێک نی مەکۆی سیحرو ئەفسانە/ تۆ بێشەلانێکی؛ جوانیی و دڕەندەیت پێکەوە تێدایە../**

دنیا لە سەهەندی گومڕاییدا نووستووە؛
ئەو پیاوە سادەو دڵپاکە نەبێ
دەڕوا پێی لە دڵی خۆی دەنێتەوە..
دڵی شووشە لە یاری پێکردندا شکابوو..
مارەزیو، دڕندەی جەنگەڵان
پەسیوی پیلان..
مارەزیو شایانی تەلاری دڵ نەبوو
شایانی تەلاری مینابەند نەبوو مارە زیو..

(٢)

**کارێ، لە هەیوانی ڕوونایی/ فرمێسکبارانداهاتووە../ ڕوویەندی هەواداریە/ گۆشەی ڕەشداگەڕاو/ چاو کەوشەنی ئەوانی بڕیوەو بەردەوامە../ کارێ، پاسارییە؟/ نە،/ کارێ هەناسەی ڕەشی سەردەمە؟/ بەڵێ..**

نێرگسی گوڵڕەنگی بینایی بوو
فیراق نەورەسی تەنیایی..
نەدیواری خانەقا ما،
نە بەر ئاستانەی خەرابات
ئیدی مەددیار لەکامە ڕووگە
لە شەیدایان دەردەکەوێ..؟!

(٣)

**ژانری چی دادڕەس؟/ درەختی مەوسیمە/ نادیدە../ تیری غەدر لە بەیان دەگرێ/ تەتەر بەدەردیان نەخوارد/ مۆسیقا.. ئاواز/ لەکوێی مردنن...؟/**

خۆزگەکانم گوڵیان دا
گوڵنار چەتری خەرامان بوو..
ئەوە من نیم سنووری تەم دەبڕم
ئەوە ئاوێنەی (کارێ)یە
شەوق لە سۆز دەداتەوە..

(٤)

**کێ وای کرد وێنەی خۆمان نەناسینەوە؟/ توحفەیێک بوو لە مۆزەخانە/ بەڵام هەڵنەواسرابوو/ هەڵپەسێردرابوو../**



**لافاویش هات/ ئێمە هەر تینووەکەی جارانین../ زەنەکە../ زەنەکە../ زەنەک/ بۆ ئاگاداری!/**

چیا نایەڵێ بخەوم،
چیا نەیانهێشت بخەوم.
چیا تەماشامان دەکەن،
چیا تەماشایان کردین.
چیا دەبینن چ دەکەین،
چیا بینیان چمان کرد..
چیا ئیتر باوەشمان بۆ ناکەنەوە..
چیا ئیتر تێمانگەیین چماڵێکین...
چیا نایەڵن بخەوم...

(٥)

**باران بوو خۆڵەمێشی دامرکاند../ بەی بوو/ قوبەی هەڵداشتە فرۆکەخانەکان../ هەورازێکی سەخت نەبوو/ ئەگینا شەو هەر من دەزانم چی پێ دەکردین/ ئارێ ماسکفرۆش بازاڕیانە/ ئارێ(کارێ)یشی تێدا بەشدارە../**

لەو دیو جامخانە شینەکانەوە دەیانبینم
لەو دیو جامخانە شینەکانەوە دیتنم..
لەو دیو جامخانە شینەکان؛
دەستیان لە پرچی شیعرم نابوو
ئاگریان بەڕوودا دەپرژاندم..
بانگ هەر جارێک بوو:
خوداحافیز مەوسیمی خایین...

(٦)

**فیراق پێشوتاری کتێبێک بوو/ بەشەختە نووسرابووەوە../ باڵ بە باڵدارانەوە../ وچان بە سیمای ماندوو../ (دیسان شەوهات)/ (کارێ) شەوبەشارە..../ ئەرێ ماندوو نەبووی کارێ؟/**

سپێدە بەوازی ئێمە ڕوون دەبووەوە..
سپێدە بەوازی ئێمە ڕوون ببووەوە..
خەنەبەندانی ڕووبەندو
شینی سایەی ڕەشماڵان..
سپێدە ئەی دڵ درێژ دەبێتەوە..
درێژ دەبێتەوە..
درێژ دەبێتەوە.. درێژ
تا دەستی بە بووڵێڵ ڕا دەگا،
نایەڵێ تاریک دابێ..

# گەنجینەکانی ئەفرۆدۆت

نەوزاد ڕەفعەت

شەوی ٨-٢٠٠٤/٦/٩

سامالّ بێت یان باران و با
کە شەو درەنگان.. بە تەنیا
بەلارەلار
بەکۆلآنە قەوزەگرتوو و
شەقامە بێ ڕەنگەکاندا شۆڕدەبمەوە
کە بەمەستی و هەوەسەوە
بەدەم گۆرانی گوتنەوە
گرکانانە تۆپەلّ تۆپەلّ دەتۆپێمەوە
کە بەدەم چەخماخەدان و هەورەتریشقەی تاسەوە
شەق دەبەم و دەسووتێم و دەڕوێمەوە
وا دەزانرێت
وا زەن دەکرێت
لە مەیخانەکان دێمەوە
منیش نادرکێنم... ناڵێم:
لە پەرستگەی ئەفرۆدۆت بووم
لەوێی پیرۆز... دەمخواردەوە
بۆ بەردی بن گۆمیش نادوێم:
هەر جامێکی جوانی و جیلوەی ئەو خواوەندە
کووپەیەکی پڕ پڕ مەیە
بەڵام بەخۆر، بەشای نەمرم گوتووە:
ئەو شەوانەی وەک شالووری
شەرابی ترێی ماچ نۆشیو
ئەو شەوانەی وەک زەردۆڵەی
تووی گۆپکە خواردوو... سەرخۆشم
ئەو شەوانەی وەک پەپوولە تازە باڵقەکان... بێ هۆشم
ئەو شەوە درەوشاوانەی قەقنەسێک دەخولقێتەوە
لەکوژرانەوەو فرمێسک و خۆڵەمێشم
قەت هەڵمەیە
با لەتەک ئەستێرەکاندا
بچریکێنم و بچریوێنم و نەنیشمەوە
با پاش خەونی دۆزینەوەی گەنجینەکان
پاش تاسانی بینینەوەی گەنجینەکانی میهرو چێژ
ئازاری بێداربوونەوە و سەرگەردانی نەکێشمەوە
با دیسانەوە ڕێی دۆزەخ
ڕێگای جیهانی خوارەوە نەگرمەوە
نەمرمەوە
نە..
مر..
مە..
وە..



* زەردۆڵە: بسنکی ... یە و مەردقی تووخواردنە.

# کاتژمێر... بە سەعات و دەقە و چرکەوە

عەباس عەبدوڵلا یووسف

٢٠٠٣/١٢/٢١



کاژمێر، لەیەک بوو، دەقە لەیەک بوو، چرکەش لەیەک بوو
بەدەمی کیسەلێکی ئاشق بەرەو ژووان دەچوو
وێنەگرێکی هەتاوی خۆی و کامیرای سێپێک
دەستێک هاوێنەی هەڵدەدایەوە و بە نیدیکەی
دەست بەناو سندووقی تاریک دا دەگێڕێ
لەو پزدانەوە بە ڕەشو سپی، شتێ هەر دەزێ!
سولاوکەی پیرە خانوو،
لەپێنج و هەشت دەقەو سێ چرکە
لەکاژمێری ئاشێکی کەمگریز
باراناوی بەسەر بلوولی لانکێک داکرد
لەسێ و سێ دەقە و سێ چرکە
لەدەمژمێرەی قاورمەچیەکی هورگن
لەمۆزەخانەی هەولێر
خەریکی نۆڕینی پارچە بتێکی بەرد بوون
سەگێک لێی فڕاندن و زوو صندانی کرد
شەش و چوار دەقە و یەک چرکە
بەکاژمێرکەی قەڵەوێک مەراقی قدیلاتەکردنی برادەرانە
ماینی کاکم زا
منیش لە زەلاتەی زمان گەیشتم
بۆیاغی مدبەق، بەلای شێرەوە، چێن چێن هەڵوەری
دوازدە و دوو دەقە و نۆ چرکەکەی
بەکاژمێری شێتێکی نوستووی ناو توونی گەرماوێکی گشتی دا
درەختێکی پەلکن، گەلە مێون
هێر بووی بۆنی ئەمۆنیا
بەسەر شوورەی ئاسن پازی دا
خۆی لەڕۆخ کۆلیتی مریشکان چاند
بەچوارەی کاژمێر و چوارەی دەقە و چوارەی چرکەوە
تۆزێک زەوی لەرزی.
بەشەقەشەقی شووشەواتی ناو جامخانەوە
زانیت قەوماوە
کاژمێرەکەی ئی سیپالپۆشێکی بێ سحات بوو
دەو یازدە دەقەو چوار چرکەیە
پێچەکانی ناو گوێی خۆی بەلۆفەکانی چیا پێک شوبهاند
هەر تووتەی تێدەوەژاند

تا لۆرییەکی پڕ مەڕمەڕی پێ وەرگەڕاند
بەکاتی پاسەوانێکی سکراپی ئاسنوپاسن لەمانگی ئاب دا
لە هەشت و نۆو سێ چرکەدا بەکاتژمێری دالغەچییێکی ناو
شەمەندەفەری خێرای رێی هەزار میلە
بینی، ئاژەڵی مەمکدار چەندی دلۆڤانە
بە پرسیارێکی پڕ سەفسەتە، وەڵامی لەزەقزەقە نا
لەبەرد، لەڕووەک، لە گیاندار، لە ئافرەتان، لەنیشتمان
کامی دایکانەترە؟
لەحەوت لەگەڵ حەوت دەقە لەگەڵ حەوت چرکە
بەکاژمێری سان ئیکزۆپریی فرۆکەوان
ئەو لە گرێخووی ئۆدیپ چا بوو
نەشزانرا بەیانی بوو یا ئێوارە
لەدوو و دوو دەقە و دوو چرکە
گومانی کرد،
بێگومان بەکاژمێری سستەرێکی ناوکبڕ بوو
پیس گومانی لەیەکسانی کرد
چوو بە فووتە،
پێی ڕاستە و پێی چەپەی پیوا.
ئیدی ئەو جۆتانەی جەستەی خۆی بەراورد کرد
تا گەیشتە برۆ
بەکاژمێری سێزدە خوازێکی خێردیتە
مرۆڤێک وەک تۆی خوێنەر، دەچێتە سەر قەلات
سەیری کات دەکات
کامەی پێ گرنگە؟ چرکە، یا دەقەقە، یان سەعات؟
بەشەو بوو یا بە ڕۆژ؟
بڵێ کاژمێرێکی شەو یەکسانی ئی ڕۆژە بیت؟
نا... کاژمێرەی شەو سستره
خولەکی کاژمێرەی شەو خێراترە
کەس لە چرکەی کاژمێرەی شەو، تێناگا
ئۆف ف ف!
ئەوەی لەناو کاژمێرو دەقە و چرکەدا دەژێ
بێ مەبەست لەوانەی ئێرە
چ درندەیێکی دڵرەق و گەمژەڵە؟!

* مدبەق = مطبخ.
* شێرە= خنفیة.
* صندانی کرد= خواردی، لرفی کرد، قوتی دا (وەسفیکی نەتییە (سەلبە).
* مێون = بەمیود.
* ئەنتۆن دی سانت ئەگزۆپری (١٩٠٠- ١٩٤٤) ڕۆماننووسێکی فەرەنسییە، بە پیشە فرۆکەوان بوو.
* لەزەقزەقە نابوو= بێزار کردبوو.
گرێخوو= عقدة نفسیة.
* پیس= زۆر خراپ.
* سەعات = کاتژمێر.
* تووتە = پەنجە گچکە.

بەشێکی دی لە چامەی

# مەحرومیەتی فرمێسکە ڕژاوەکانی زولەیخا

ماریا ئەحمەد

تاکەی بە بارینی حەزرەتی قاقای پێکەنینی
ژەهراوی لێوەکان،
لەناو مەیتخانەی ژیان
فریو دەخۆی!!
بۆ بەتریفەی ماچە زەرەندیەکانی مەحرومیەتی عیشق
لەبەر پەنجەرەی دڵە ئاسنینە داخراوەکان بوەستین!!
ئیدی لەناو تەمی غوربەتی خۆمان و
وەحشەتی دووکەڵە چرەکانی سووتان نارِوانین
لەم مەملەکەتە ڕوانینی ئێمە و هەموو ڕوانینەکانی دیکە
حەرامە
لە دووڕیانی بەڵێنە ئەزیەتدراوەکان
لەمیحرابی چارەنووسە هیچەکان
لەسەر مەرقەدی خەونە نەزۆکەکان ناگریێین
لەمێژە سیمای حەزە میهرەبانییەکانمان
لەخەیاڵدانی بێڕەحمی و موزەیەفییەکان
درایە بەر چەقۆی هەرەس و غەدری دابڕان
لەمێژە وڵاتە خوێن لێبەربووەکەی دڵی مە
ئاوێتەی جەنگەڵی ژێر پێ کرا
خاتوونەکەم ئەوان بەخۆیان و هەستێکی مردووکاس
قەت لە ئاستی شریقەی شکانی پارچە کریستاڵییەکانی
ڕۆح و
زریکەی سۆزە بریندارە ڕفێندراوەکانی ئێمە ناوەستن
وامەزانە ڕۆژێک بێت و
درزی شکاوی ئەستێرەیەکی خۆیانمان بدەنێ
تا مەرجانە قنجاوەکانی نهێنی سادە دڵییەکەی
خۆمانی تیا بنێژین
قەت لەعەزابی هەقیقەتی ڕوانینی ئێمە تێناگەن!!
دڵنیابە خوێنی ڕژاوی برینی تەنیاییە ڕووخاوەکەمان
کۆناکەنەوە



ئیمشەو شای عیشق هات و دەستە نازکە تەزیوەکانی
بەسەری ئاهی ڕووخانم داهێنا
شەرمەزارانە لەحزووری تەنیایی ڕۆحمدا وەستا
خوێنی فرمێسکە برینداربووەکانی
لەناو کەموولەیەکی شەرابی کردو
هەڵیداو سەرخۆش بوو
خۆڵەمێشە زیوینیەکەی برژانگە ژەنگاوییەکانی
خۆری بێداری کۆکردەوە
زامی چاوی خەولێتۆراوی نواندم
خوای سووتانیش دەگەڕا لە دۆزەخێک
تا سۆتەکی سووتانی خەمەکانی زولەیخای پێ بسپێرێ
ئەوانیش شێتانە دەستی بێرەحمی و زبراوی خۆیان
لەناو گۆمیلکەی خوێناوی بوونی زەمەن و
هەستە تاریکەکانی ئەستەمیەتی خۆیان وەردەدا
چاوم لێبوو لەتەکانی دڵی ئێمەیان
لەسەر چاوی مەزلوومیەت ڕادەکێشا
یاریان بەوەتەرەکانی غەدرو
پەپوولەی خەون و
شەفافیەتی مەرگی ئێمە دەکرد
کەچی مخابن ئێمە چەند سەدەیە بێتاگا
لەسەرابی سێبەرو ڕکی سۆز، تاڵی ماچ
درکی هەست، بەردی دڵ، ئاگری سەما
وەهمی گەورەیی ئەوان و
ژەهراوی بوونی پێکەنینەکان و
سیناریۆی ئازیزیەتی ئەوان
خەوێکی سەرخۆشانە خەوتبووین!!
بۆیە عیشق کڕنووشی بۆ شاژنی خەم برد
کە لەسەر عەرشی ئازار، لەنێو کۆشکی خوێن
چاوی ژانەکان خوێنیان تێزابوو
فرمێسکەکانیش هێدی هێدی دەبوون بە بەرد
بە یاساکانی نەفرەت
حوکمرانی لەچاوەڕوانی هەموومان دەکرد
ئەوانیش گوناهە ڕوو داماڵراوو
چاوە پڕ لە بەفرەکانیان
دەکردە جوتێ پێڵاوی سۆلانی و ئیتر
بەسەر بەرماڵ و
دووگردەکانی بەرائەت کەوتن
لێوی دۆزەخیان برینداز کرد
تەیەمومیان بە خوێنی ڕژاوی تەنیایی ئێمە کرد
خۆیان لەکانیەکانی دوودڵی هەڵکێشاو
جەستەیان بە پێخەفەکانی جەهەنەم سپارد
خەمە خواروخێچەکان
چاوولێویان ماچ کردین
هێشووی غوربەتییەکانی هۆش
سێبەری سوانەیەکی ماڵی خۆیانیان
پێرەوا نەدیتین
تا حەرمەتییەکاغان لەچل چرای
عەدەمیەتی هەست بسێنەوە
مخابن کیژەکان
کە ئێمە بێئاگا لەکۆڵانە دڕکاوییەکانی
ماڵی تاریکی دڵی ئەوان
دەگەڕاین و ئیتر
بێهۆش دەسووڕاینەوە، تا ونبووین
زریکەی ژانە پێخواس و
ڕۆحە عاقیقیە بزمار ڕێژو
چاوە مەرجانییەکانی عیشق و
باڵە خوێناوییەکانی سەردەم و
فنجانەی شکاوی
سەدە جێماوەکانی لێداهێنێن
بێئاگا لە ڕژانی زەمەنە شەرابییەکانی ئێمە
کەزی براوی عیشقێکی فیردەوسی
بوونە کەرنەڤاڵێکی هەڵمی
پێکەنینی یەقین
هێڵە ساردەکانی وەهم
سووتانی هەناسە عاسێکانی داپیرم
مردنی ئەو پیاسانەی
کە خوشکە دڵ گەورەو
خۆشباوەڕەکانم
لەسەر شۆستەکانی
دڵی شەوێکی فریشتەیی دەیان کردو ئیتر
لەدوماهیدا خۆیان بەمەودا ساردەکانی فیراق و
تونێڵە تەنگەکانی لێکترازان
کە تەنگتر لە ڕۆحی من لە ڕۆژی لەدەستدانی وان سپارد
کە قەت لەبیرم ناچنەوە
سەرسەختی شاخەکانی یەئسی دایکم
بارانە شووشەییەکان
بوونە مشتێ لەخۆڵەمێشی ئەزیەت
ئەفسووس زەمەنێکە
هەموو ئەو کیژانەی کە لێوەکانیان
بەتاڵی ژانە قووڵەکان قڵێشابوون
کەچی ئیمڕۆ
غافڵانە بە سووراوەکانی فێڵ لەخۆکردن
سارێژیان دەکەن

# پایز

تۆماس هوود (١٧٩٩- ١٨٤٥)
لە ئینگلیزییەوە:
مەحموود ئیبراهیم پێماڵکی

پیرە پایزم لە ماتەمییەکی تەماویدا دیت
وەکو خامۆشی بێ سێبەر وەستابوو، گوێی
لە خامۆشی دەگرت، چونکە یەک باڵندەش لەناو
دارستانی چۆڵدا بۆ گوێ کلۆرەکەی نەیدەخوێند،
نە پەرژینی نزم و نە تاکە درکێک؛
پەرچەمە لاوازە شێدارە تروسکاوەکانی دەهاژاند
هێزی ئەو تروسکانەوەش تەڵەمیرانەی ئاڵۆزبوو کە بەشنە
کەوتبوو،
تا جۆلکەکەی دانەوێڵەی زێرینیان بە مرواری ڕازاندبۆوە.
گۆرانییەکانی هاوین لە کوێن؟ کە ڕۆژ
پێڵووی چاوی تاری باشوور دەکەنەوە،
تاکو سێبەرو بێدەنگی وەکو یەک لە خەوڕاپەڕن و
بەیانی گۆرانی بڵێ بە دەمێکی گەرمی بۆنخۆشەوە.
باڵندە شادمانەکان لە کوێن؟- ڕۆیشتوون، ڕۆیشتوون،
بە هەناسە بڕکەوە بە ئاسمانی ساردداا فڕیون،
تاکو چاو پڕووشاو نەبن لە کاتی نیوەڕۆدا و
کوندەبەبۆ بیانکاتە نێچیری خۆیان و
بەدندوکە شاخییەکەیان(١) چاوە درەوشاوەکانیان
دەربێنن.
گوڵەکانی هاوین لە کوێن؟- لە ناوچەی ڕۆژئاوادا،
دواگوڵیان سوور هەڵگەڕاوە بۆ ئاخر ساتەکانی هەتاو،
کاتێک ئێوارەی فێنک، بە شەوی لەناکاو هێرشی
دەکرێتە سەر
وەکو (پرۆسیرپاین)(٢)ی فرمێسک ڕشتووی گوڵ لێ
دارناو
تاکو زۆربەی قەدە تاریکەکەی.
فیزی هاوین لە کوێیە، - جەنگەی سەوزایی، -
چەندین گەڵا تێکڕا دەتروسکێنەوە؟ - سێ گەڵا
لەسەر داری بناوی قەوزەدار، سیانیش لەسەرداری
لیمۆی شیرینی ڕووت
دەشەکێنەوەو - یەکێکیشیان لەسەر پیرە داری
بەڕوویێک!
نەمریی سوورە چنار بۆ کوێ چووە؟ -
چۆتە ناو سەرووی ماتەمێن و سوورەداری غەمبارەوە،
یان سەرانسەر زستانی تاریکی دووروودرێژ لەبەردەکا
لەناو (بەهشییە)(٣)ی لووسی هەمیشە سەوزدا.
سمۆرە بە شانازییەوە سەیری ئازووقەی تەواوی داکراوی
خۆی دەکا،
مێرووستان عەمارەکانی خۆیان لیپاولیپی گەنم کردووە و
هەنگ شیریناتیی وەرزی



**هاوینی لەناو شانە بەتامەکانیدا داکردووە؛**
**پەڕەسێلکە بەتێکڕایی بەرەو دەریا کۆچیان کردووە؛**
**بەلاّم لێرە پایزی غەمبار نیشتەجێ بووە و**
**جار دوای جار ئاخە فرمێسکاوییەکانی هەڵدەکێشێ**
**لەناو سێبەرەکانی دەشتی بێ خۆرەتاودا.**
**تاک و تەنیا**
**پایز لەسەر بەردێکی قەوزەدار،**
**دادەنیشێ و مردووەکان سەرژمێر دەکا لەگەڵ ئەوانەی**
**لەگەڵ دوا گەڵای گوڵستانی ئەویندا ڕۆیشتوون،**
**لە کاتێکدا هەموو جیهانی پەژموردە بێ شەوق دیارە،**
**وەکو وێنەیەکی کزی ڕابوردووی نوقوم بوو**
**لە مێشکێکی کپی ئاڵۆزی دووردا،**
**کەس نازانێ چی ترسناکییەک لە دوایدا بە کتوپڕی**
**دەچێتە ناو ئەو مەودایە دوورەوە، ماتەمینی لەسەر ماتەمینی.**
**دەبڕۆ لەگەڵیدا دانیشە، با سێبەرت لێ بکرێ**
**لەژێر قژە لاوازە شۆڕەکەیدا:**
**پایز تاجێکی گوڵی سیسی پۆشیوەتە**
**سەر ناوچاوانی و دەموچاوێکی ماتەمی هەیە؛ –**
**لێرەو لەوێ شتی پەژموردەی تەواو لە هەموو شوێنێک هەیە**
**تاکو کەپری خۆی لێ دروست بکا – و ماتەمی تەواویش هەیە؛**
**خەفەتباری تەواویش هەیە کە داوەتی بکا،**
**هەر تەنیا بۆ گوڵە باخی مردوو، کە چارەنووسی**
**جوانییە، – لەگەڵ خونچە زیندووەکانیدا**
**هەرچەند بە کوڵمەکانیان شەرمەزارن، بەلاّم فرە ڕووناکی دەڕازێننەوە:**
**لێرەدا خەفەتباری تەواو هەیە و میوەجاتی**
**تاڵی تەواویش هەیە کە زەمین هەڵیدەگرێ – و**
**دڵۆپی تەزیویش بۆ ناخی زەوی هەیە؛**
**ترسی تەواو و سێبەری نائومێدیش هەیە،**
**تاکو پایز بەندیخانە هەوراوییەکەی بۆ گیان بنیات بنێ!**

پەراوێز:
١- دندووکیان وەکو شاخی ئاژەڵە.
٢- دەوەنێکی ئاوییە لە ئەمەریکادا پەروەردە دەبێ.
٣- دەوەنێکە گوڵی بچووکی سپی دەگرێ.

سەرچاوە:
ENGLISH VERSE
VOLU ME IV. Scott to E. B Browning

# کرمەکان

عەبدوڵلا سەڕاج
(فنلاند)

حەزو ئارەزووە پەنگاوەکانی، لەو دوورە وڵاتییەدا، لەناو گەڵیدا پەنگی خواردبۆوە. «ئەم» تاکێک بوو لەو مێگەلەی ناچاریان کرد مل بەنادیارییەوە بنێ، هەر نەبێ داوەدەزوویەک بۆ کۆتاییە بێ ئاکامەکەی بدۆزیتەوە. خۆی دواند.

[ڕاپەڕین و.. خۆبەختکردن و .. نسکۆ! هەم دیسانەوە بزاف و.. قوربانی پاشان نشوستی ...... بەدایکی شوانم وت، ئەگەر ڕەوشەکەم بەدڵ بوو، ئەوا وێنەیەکتان بۆ دەنێرم، بەپێوە وەستام. بە پێچەوانەیش، فۆتۆکە بە چوارمشقی دەگرم. ئەمێستا مێشکم ئاڵۆزە و لە بازنەیەکی ژەنگدام، لەوانەیە فۆتۆیەک ڕەوانە بکەم، لەسەر سک ڕاکشابم، یان سەرمەقولات، تەقلەم داوە.. ئیتر چۆن تێدەگەن، کێشەی خۆیانە]

هەستی کرد کۆمی دەخورێ. [هەر دەخۆم و تێرنابم! دەبێ کرمم هەبێ! کێ کردی و کێ خواردی!!) وای بەچاک زانی، خۆی بئاخنێتە سێکسخانەیەکەوە بۆ ئەوەی تەنگەتاویی نێرایەتی و چلێسییەکەی «حەمەی برای» دامرکێنێ. تابلۆی ڕەنگاو ڕەنگی ئیرۆسی، چوارگۆشەیی و بازنەیی و تەنانەت سێگۆشەیی، دیوارەکانیان کردبووە وێستگەی چاوە برسییەکان. بلیتی بڕی. لەنوایەوە، مەیموونێک مۆزی بەدەستەوە بوو، لە دواوەش، پیرێکی گۆچان بەدەست. لەولایشەوە، ورچێک و چەند سەرێکی ژن و پیاوی دی. هەر یەکەیان بە گوێرەی ژمارەکانیان، لەسەر کورسییەکی ڕەنگین ئۆقرەیان گرت کە لە خولگەی ژوورێکی هێلکەییدا دانرابوون بەرامبەر بەکونی بچکۆلانە. «ئەم» کونەکەی بە چاوی مراوی چواند. کونەکان دەیانڕوانییە ناوەندی ژوورەکەوە، سیستەمێکی شیری و پۆشاکەکەی پەمەیی، ڕەنگەکان لە چاو «ئەم»دا ڕەشبەڵەکیان دەگێڕا کاتێک نەشمیلێکی باڵازراڤ بە مایۆیەکی گۆشت ڕەنگییەوە خۆی هەڵدایە سەر دۆشەکی سیسەمەکەوە. لە ژوور سەرییەوە، تابلۆ بەناوبانگەکەی ئادەم و حەوا، نیگای پێهەڵکشاند. لەپڕ گەنجێکی گەنم ڕەنگ تابلۆکەی پێش چاوی بزواند. دوو ڕەنگی کۆنتراست بوون، وەلێ ئەو دەمامکی پۆشیبوو. هەر زوو پەرژانە باوەش توندکردن و یەکتری گەوزاندن. گەشتی ماچ لە لێوەوە بەرەو بەرزەخی گەردن و نیمچە دورگەی مەمک و کیشوەری ناوک و خوارتر، لە نمایشێکی سرووت ئامێزی سروشتی بوو. دەستی گەنم ڕەنگەکە کەوتە گەردش و مایۆقوتەی سورفلەکەی داماڵی و... دەستی سورفلیش بەرەو مایۆی «ئەم» چوو. دایکەناند و... بوونە ماری ئاشقە و ماشقە، بان و بنیان دەکرد. گەر تۆی خوێنەر چواندنێکی شیاوترت هەیە، بیڵێ.. ئا.. سوارە دەبووە مایین و ماینەکە لەناکاو جڵەوی دەگرتە دەست و دەمامکدارەکەی دەپەستایە ژێر خۆیەوە. «ئەم» لە دەرەوەدا، تفێکی مزری قووتدا و.. مەیموونەکەی تەکی پەیتا پەیتا، قەپی لە مۆزە سۆمالییەکەی دەدا و دەستەکەی تری ناردبووە ناوگەڵی. پیرەکە لیکی دەتکاو توندتوند گۆپاڵەکە گرتبوو. ورچەکەی نەدی، بەڵام مرخە و هەناسەی ژنەفت. «ئەم» چاوی کردە مەلۆچکەیەک و ناردییە ناو ژووری نمایشەکەوە. کار لەکار ترازابوو. ڕیتم و جموجۆڵی کۆتاییان دەنواند. بە گوڕم دەلەنجان، تەکانیان دەدا و یەکتریان دەهەژاند، ئارەقەی ڕەش و مۆر، بەڵکو خەنەیی و نارنجییان



دادەوەراند و شەلاڵ بوون. «ئەم» ئاواتی خواست کە خۆی لە بری گـــەنم ڕەنگەکــــە بوایە و.. چەند هونەرێکی ڕۆژهەڵاتیی بەو خانمە ئاڵۆشدارە نیشان بدایە. هەستی کرد سێگۆشەی خوارەوەی، پاپۆرێکی نەوتە و خۆی بەتاڵ دەکات..

[ئارەزوویەکی بتـپـەرستـانە لەناخـمـدا دەبزوێ بۆ خـــۆهەڵدانە ناو کـــوورەی هەڵایـســـاوی چێـــژەوە! ســـێگۆشـەیەکی تووکنی بریقـەدار بەرچاومی نوتەک کـردووە! ئەگەر دەڵێن: ئەم دنیـایە بۆ ئێـوە و دنیـاکـەی ئەولاش بۆ ئێـمـــە. زۆرباشـە و بە دە پەنجـە، بگرە بە پەنجـەکـانی پێـشم مـۆری دەکـەم، با ژیانی باخـۆسی و ڤینۆسی بۆ ئێمـەمانان بێ و حورو غـیلمانیش بۆ ئێوە. پەیمان دەدەم، ئەز ئێـستـام دەوێ و بەس و.. گـرەو لەسەر دۆڕاو ناکەم. ئەوەتا.. برسێتییەکی کافرانە جەرم دەدا بۆ خۆ تێوەردانی ناو دۆزەخی تێکـئاڵان و.. لەناو یەکتری ژیان و.. توانەوە، مـانەندی جـووتێ شـامـاری ئاشـقـەو ماشقە کە لە دەوروبەر بێئاگابن، بەڵکو خۆمان، خولگە و کات و هەمـوو شـتێک بین. ئەوەنییـە لەسـەر ڕێتـمی خوانپەرستی دەجووڵێینەوە! کە هەم زیندەگی بەخشە و هەم مەرگبەزێن و هەم پێشێلکردنی نەبوون!! ئەی ئەگەر ئەمە پەیامی ژیان و ئەڤین نەبێ، چ کلۆڵییەکی تر هەیە ملی پێـــوەنێم؟ دەنا، لەناو ئەم کـەوڵەی لەشـمـــدا دەخنکێنم.. دەخنک.. دە سەرنج لەخۆت بدە. سـەرەتای مەرگت لە زایینتەوە دەستی پێکردووە. پێش بوونت، تۆ لە نەبوونێکی سەرمەدیدا دەژیای، هەش بەسەرت... بە چەند سوورێکی ئەم چەرخوفەلەکەی زەمەنە، ئەمێستـات دەبێتـە ڕابردوو. ئاوهاش دەبیـیـە ئاژەڵێکی دووسم و ڕەدووی مێگەل و نێرگەلە بەنجکراوەکـە دەکـەوی. چۆن دەتوانی بەرەنگاری بکەی و خـۆی نەدۆڕێنی؟ ئەمـەیە بارەکە و هەم پرسیـار. دەشێ تاکە باڵندەیەک بۆ خۆی بفڕێ؟ یان لەناو پۆلدا ببێتە ژمارەیەک؟ تۆ ئەم پرسیـارە لەخۆت بکە وەک چۆن من کردم و گەیشتمە ئەنجام. با هەر کەسێ کڕنووش بۆ پەرستگەی خۆی بەرێ؛ وەلێ ئەو بتانەی لە ڕۆحمدا ڕووخاندمن، هەرگیـز قیت نابنەوە. تەنیا کڕنووش بۆ ئیبلیسی خۆم دەبەم، مەگەر «حەمە» نەیوت: «هەرکـەسـە و شـەیتـانی خـۆی هەیە». خـۆم سـەروەری خـۆمم. هەست و ئاگـاییم قـیـبلەنومـامـە. ئاوهەڵانە مرۆڤایەتیی خۆم دەبینم. ئەزموونێکی تاڵ بوو و ملم پێوەنا، ئەمێستـا ئێرەشم لێ بۆتە دۆزەخ. لەمێژ بوو بەدوای ئارامـیی گـیـــاندا دەگـەڕام، مـخـابن، نەمدۆزیبیەوە، بۆیە خۆم لەم دۆزەخەدا دەسووتێنم، بەڵکو لەوانەیە، دەشێ، بە هەشتی ونبووی زەوی بەدی بکەم.. بەشکو...»

هاتە خۆی و لینجییـەکی گەرم موچرکی پێخست، بۆیە کشایە پاش و تەوێڵی سڕییەوە.

ئەوجا داوای بیـرەیەکی کـرد و لەسـەر کـورسییـەکی دواوە، خـاو خـاو دانیـشت. زەنگی کـۆتایی نمایشـەکـە ڕایچـەناند و سـەیرکـەران بوونە دوو بەشـەوە، برێک یەکـراست بۆ دەرەوە، بەشـەکەی دی دانیشتن بۆ دیمانەی باڵا زراڤەکە و گەنم ڕەنگەکە. هەندەی نەخایاند، خانمی سوورفل بە مـایۆیەکی کـووژەکەییەوە و بەبێ سووتیـان، کـەوتە دەسگوشـینی سـەیرکـەران. گـەنم ڕەنگەکـەش دەمـامکەکەی بەدەستـەوە بوو. بە جووتە هاتیـان دان کە هامشۆی سێکسخـانەکەیان بکەن و بەڵێنی شەبەقی و تەکنیکی نوێیـان دانێ و بەخـۆڕایی بزەیان بەشـاندەوە. گەنم ڕەنگەکە گەیشتـە ئاستی «ئەم» و سەرسام بوو، حەپەسا و باوەڕی بە چاوەکانی نەکرد.

– سیروان!!

– خوسرەو!!

«کام ڕەشەبا هەڵیدایتە ئێرە؟!»

«ئەی کام یاسا، تۆی لەم سێکسخانەیەدا چاند؟! ئەمە ناوێزەیی نییە!!»

خـوسـرەو ئامـاژەی بۆ دوو بیـرەی کـەللەتەزێن کـرد. گارسۆنەکە ناو قەدباریکێکی کەسکپۆش بوو، قژی وەک مایین کلکاندبوو. لەپشتـەوە هیچی ئەوتۆی لەبەرنەبوو. جووتە گوڵمی پاشەڵ و سمتەکانی خرین خرین دەلەنگان. سیروان ئارامی لێهەڵگیرایەوە.

– سیـروان، لەوە چاکـتـر نییـە، وەک کرمـەکـانی لای خـۆمـان، لەگـەڵ مـردوودا جـووتبم!! بیـرەکـانیـان بەلەز هەڵقوڕاند، خوسرەو پەلی سیروانی ڕاکێشایە ژوورێکی تەنگەبەر.

(لیزا) بایبایی کرد و بەدەنگی زەنگەکەوە چوو.

– لیزای هاوکارم نمایشێکی تری لەگەڵ یەکێکی تردا هەیە..

لە ژوورەکەدا، خوسرەو کاسێتێکی ڤیدیۆی هاویشتێ و واقیان وڕما..

– خـۆ دەبینی چۆن گـوارەی ژنان لە نەرمـە گـوێیـان دەپچڕن! بازنگ و خشڵیان دادەماڵن!!

– ئەویش ئاژەڵ و ماڵاتەکانە! یەخچاڵ و تەلەڤزیۆن و کەلوپەلی ناوماڵ، خۆ چاک دەیبینی، کە بۆیان نەفرۆشرا کردیان بە کۆی زوخاڵ!!

– ئای! ئەوە ئاقای «تارانی»یە! کە سەرلەشکر بوو.

– ئەویش «قـەهاری» و «مـحـەمـەدی» و نازانم کێ. لەپاشان کۆڕی ماتەمینی و پۆستەریان بۆ جینۆسایدەکە سازاند!!

گەڕانەوە بۆ جێگەی خۆیان. بیرەی نوێیان گازکرد.

– ســـیـــروان، ئەم بیـــرانە لە ناوی (بانیـــخـێـــڵان) هەرزانترن!

– خوسرەو، ناوی بانیخێڵانت هێنا، ئێـمـە لێرەدا، دەبینە تری بـنگۆم، پاش وەچەیەک و دووان مــــۆرکی ڕەسەنایەتیمان کاڵدەبێتەوە گەر نەسڕێتەوە.

– تۆ دەزانی ئەو ســەربازانەی لە جــەنگی کــەنداودا

بەشــداربوون، تۆوی پیــاوەتیــیــان لە بانکدا بۆ دەزگیرانەکانیان جێهێشت، بۆ ئەوەی لەپاش مەرگیان تۆوەکــەیان لە منداڵدانی ژنە ئەمــریکاییــەکــاندا بچێندرێن!! بریا ئەنفالکراوەکانیش وایان دەکرد.

ســیروان قــاقــا بە پشــتــا چەمــایەوە و ئاو زایە دوور چاوەکانی.

– خوسرەو، بە چەند ساڵێک شتەکانت لێشێوا!! کوڕی باوکم بۆ لەکن ئێمە بانکی خوێن هەیە هەتا بانکی «سپێرم» هەبێ.!

پاش بێدەنگییەک..

– ... ئەوا گریمان هەبوو، دیسانەوە نەوەکانیش ئەنفال دەکەنەوە، یان بەشەڕی خۆترێن لەناویان دەبەن.

خوسرەو تاوێک تێڕاما و ئەمجا وتی:

– ئۆباڵی دۆزەخی ڕەنگستــان بە ئەستــۆی خۆمــانە. سیروان، دوێنێ لە ڕێگەدا کەلاکی پشیلەیەکی تۆپیوم بینی، ورگ و هەناوی بە جۆرێک شێواوبوو، خەریکبوو برشێمەوە سەوزێکی ڕەشباو تێکەڵ بە لیمۆییەکی قێزەون.

سیروان ئاخافتنەکەی قاچی و خۆی هاویشتە چەقی مەبەست و دەمی تێژەند.

– تۆ باس لەمن بکە، لە خــۆت، نەک لە پشــیلەی مردارەوە بوو!!

– بۆ نا ... ســیــروان گیــان، لاکی ئەو پشیلەیە پاش ماوەیەکی تر، کرم هەڵدێنێ، کرمی دەزوولەیی سپی وەک قلە برنج..

ســیــروان دەمی داچەقــاندبوو. چاوەکــانی ترێ بوون دەبریسکانەوە.

– ئەو سەدان کرمانە دەپەرژێنە پاشماوەی پشیلەکە.

– وایە.. وایە، خــوسرەو گــیــان، تەنیــا ئێــسک و پرووسکی دەهێڵنەوە. دواتریش کە بژێویان نەماو کەوتنە قات و قڕی، دەزانی چی دەکەن؟

خوسرەو ئەم ئاکامە پرسیاراوییەی مەبەست بوو، بۆیە هەڵیێذایێ و..

– دیارە یاسای ژیان دەخوازێ پەلاماری یەکدی بدەن. هێزدار لاواز هەڵدەلووشێ. جا سەیرو سەمەرە ئەوەیە، لەکۆتاییدا، تاکە کرمێک دەبێتە خاوەنی (کون فە یەکون).

سیروان، لەخۆشبەختیدا، چەپڵەی کوتا و بەدەم گەرمییەوە وتی:

– دەق وەکو لای خۆمان. ئەم ئەو دەخوا، ئەویش ئەم قووت دەدا..

– وەی ئافەرین و بارە قەرتاڵە... گەیشتییە سەر خاڵی پێویست. جا سیروان گیان، کە کرمێک بووە سەروەری تەرمی سیاسەتکارێک، دەبێ چ سەربردە و تەڵەکەبازی و یاداشتی ترسناک و ڕەفتاری دزێوی نا مرۆڤانە تۆمار بکات!!

سیروان، جڵەوی وتنی لێساندەوە.

– دە وەرە.. کرم .. سەرگوزشتەی .. بنیادەم.. بگێڕیتەوە!! ئەم عاجباتی و سەمەرەیە لەکوێ ڕوویداوە!! خوسرەو.. ئەوانە کەی مرۆڤن، هەردوو بڕۆی گەیاندنە یەک و نیشانەی پرسەکە بە سورمانەوە لە کێڵگەی ڕوویدا ڕووا.

– ...!؟

– لە خانەی (بنیاژەڵ)*.. کێ کردی و کێ خواردی!! لە پێتەختەکاندا کارتلیان خزاوەتە شیراتۆن و هیلتۆنە پێنج ئەستێرەییەکانەوە! کە شەهیدان و قەڵەندەران زیندەخەونیان پێوە دەدی و بە BMWش هامشۆ دەکەن!!

سەرو هەناسەیەکی قووڵیان هەڵکێشا.

– وای ... لە چ هەڵەیەکی گەورەدا بووین! ئای لە چ سیناریۆیەکی ساماناکدا، کۆمبارس بووین!! ئەوان کێڵی گــۆڕی شــەهیــدانیــان دووبارە بە شــەهیــدی نوێ دەفرۆشتەوە!!

وەک قسەیان نەمێنێ، هەستانە سەرپێ و بە توندی تۆقەیان کرد.

– دەسکەوتمار[illegible]یە نە لە ڕاستی گەیشتین و ئیتر هەرگیز نابینە بەردی دامە و بەیدەقی شەترەنجیان.

– وایە. بانگی زەردەشتییانەی ئاشکرا خۆشە و ... شت بەناوی [illegible]یەوە دەڵێین.

[illegible]ڕەوە نا، دەست لەناو دەست، تێکەڵاوی شەوی شارە مێروولە بوون. بەدەم ڕێگەوە خوسرەو بە سیروانی وت:

«من و تۆ، بە گوێرەی ئەم شارە و گۆی زەوی و (کۆستارە)* و سەرانسەری گەون و ئەم لۆگۆسە، دوو مێروولەین..»

خوسرەو وەڵامی دایەوە.

«لەوانەشە، دوو پشقل بین»

ئەمجا بەجووتە و دەنگی بڵند:

«...بەڵام هەین و هەین، گەر لێرەشدا بێت، هەر نەبێ، دەبزوێین. ڕەوەکە کۆتایی نەهاتووە و وا زوو کۆتایی نایەت»

بە جووتە چاوی هەرەشەیان لە هەورێکی ڕەش و چڵکن بڕی و تێکەڵی جێگات* بوون.

**تامپرێ**

**تێبینییەکان:**

حەمەی برا: ئاماژەیە بۆ ئامرازی پیاوەتی.

بنیاژەڵ: زاراوەیەکە لە بنیادەم + ئاژەڵ تاشیومە.

کۆستارە: بۆ (المجرة) تاشیومە وەکو (کۆچیرۆک) بۆ (مجموعة قصصية).

جێگات: الزمكان.

# چرکه قوربانییه‌کان

جه‌زا چنگیانی
(ئه‌ڵمانیا)

له سه‌ر چه‌ند وشه‌یه‌کی زبر له یه‌ک زویر ببوون، نێوانیان به قولانجێک ده‌پێورا، هیچیان دڵیان نه‌ده‌هات پشت له‌وی تر بکات، هه‌ر چه‌نده له ژێر لێفه‌که‌شه‌وه چاویان نووقاندبوو، به‌ڵام که سه‌یری ئاوێنه‌ی ڕۆح و گلێنه‌ی ژێر پێڵووه داخراوه‌کانیان ده‌کرد. ساته ناسک و پڕ زه‌رده‌خه‌ناوییه‌کانی چه‌ند کاتژمێرێک له‌مه‌وبه‌ریان ده‌بینی، ته‌نیا هه‌ناسه‌یان و بێ ویستی ئه‌وان له ژێر لێفه‌که‌وه تێکه‌ڵاوی یه‌کتری ده‌بوون و له بۆن و گه‌رمایی یه‌کتریدا ده‌توانه‌وه، ئه‌م ده‌وه‌ستا تا ئه‌و هه‌ناسه بدات و ئه‌م هه‌ڵی بمژێ، جارێکیش ئه‌و ده‌وه‌ستا تا ئه‌و هه‌ناسه‌بدات و ئه‌م هه‌ڵی بمژێ، به بۆنی ده‌م و هه‌ناسه‌ی یه‌ک وا ڕاهاتبوون خۆراکێکی ڕۆح و ئارامگیری ده‌روونییان بوو. جارجاره هه‌ریه‌که له لای خۆیه‌وه دزه‌پێڵوویه‌کی ده‌کرد و به کزی سه‌یری یه‌کتریان ده‌کرد. یه‌که‌م شه‌وه، سه‌ره‌تای ناوجێگه‌یان بێ ورده ماچ پێچابێته‌وه، وا چه‌ند مانگه ئه‌م دوو شه‌یدایه شه‌یدای یه‌کتری بوون و تێر له هه‌ڵمژینی لێو و باوه‌شی له‌شی ڕووت و بۆنی بنباخه‌ڵی یه‌کتری ناخۆن، ئه‌مه یه‌که‌م نه‌گبه‌تیی ڕۆحه که چه‌ند وشه‌یه‌کی زبر ببێته له‌مپه‌ری نێوانیان و له‌یه‌کیان بترازێنێ، له دڵی خۆیاندا نه‌عله‌تیان له ساته تووڕه و چه‌مۆڵه‌ی په‌شیمانییان له‌و چه‌ند وشه زبره ده‌نا که به ڕووی یه‌کتریدا پژانیان. ئه‌م ده‌یویست ئه‌و هه‌نگاو بۆ ڕووخاندنی له‌مپه‌ری تووڕه‌بوونی نێوانیان بنێ، ئه‌ویش چاوه‌ڕێی ئه‌وی ده‌کرد و ده‌یویست هێنده‌ی تر خۆی نازدار و جوانتر بکات و چۆک به هه‌ستی نێرینه‌ی ئه‌و بدات، له به‌رده‌میا بپاڕێته‌وه و باوه‌شی بۆ بکاته‌وه، له دڵه‌وه خه‌ریک بوو زیره‌ی بۆ تووکه زبره‌کانی سه‌ر سنگ و لێوه قاوه‌ییه‌کانی ده‌کرد. ئه‌ویش هه‌موو له‌شی بۆ مژینی گۆپکه و لستنه‌وه‌ی سنگ و شلکه‌ی ده‌وری خاڵی ناوکی، ببووه پارچه‌یه‌ک له شه‌هوه‌تی گڕگرتوو، وه‌لێ غرووری نێرینه‌ی ڕێگه‌ی گلێپه‌ی لێگرتبوو. جارجاره که په‌نجه‌کانی پێیان له‌یه‌ک ده‌خشا و ته‌زوویه‌کی شه‌هوه‌تاوی به تیژی به جه‌سته‌یاندا تێده‌په‌ڕی، ڕۆحیان له‌رزوتای چه‌پکه ماچێکی گه‌رمی ده‌گرت. ئه‌م سه‌رتاپای ڕووت بوو. ده‌یزانی له‌شی گه‌نمڕه‌نگی ڕۆژهه‌ڵاتی باوه‌شی پڕ سۆزی ئه‌و شێت ده‌کات، ئه‌ویش عه‌یارانه ده‌یزانی شه‌یداکه‌ی شه‌یدای کام به‌شی له‌شێتی و چ ژێرکراسێکی کورتی لووسی ته‌نکی بێ ده‌رپێ و مه‌مکه‌وانه ڕۆحی ئه‌و شێت ده‌کات. پێش هاتنه ناوجێگه‌که‌یانه‌وه له ناو شامپۆکاندا تاقانه‌ترین شامپۆی هه‌ڵبژارد و ئه‌و شه‌وه نه‌ک جارێ، به‌ڵکو دووجار له‌شی خڕین و باڵای شووشه‌ی له شامپۆ هه‌ڵکێشا. ئه‌و عه‌یاربوو ده‌یزانی هه‌موو بۆنه‌کانی خۆشده‌وێ ته‌نیا ئه‌و بۆنه نه‌بێ که له بنباخه‌ڵی ده‌دا، هه‌رکاتێک بیری له بۆنه‌که‌ی بنباخه‌ڵی بکردایه‌ته‌وه یه‌کسه‌ر تکاکانی ئه‌وی ده‌هاته‌وه یاد.

– شیرینه‌که‌م تکایه چه‌ند جارم پێ وتی به‌م بۆنه دروستکراوه کیمیاوییه



بۆ بۆنی ڕەسەنی بنباخەڵتم لێ دەکۆڕێت؟ ئەی تۆ نازانی بۆمن بۆنی بنباخەڵی سروشتییت خۆشترین بۆنی ئەم دنیایەیە و شێتکەری ڕۆحمە؟ ئەی بۆچی لە سەفەری لستنەوەی پێستی لەش و مژینی گۆیکەکانتا چەند جار دوا بێخی تووکە تاشراوەکانی بنباخەڵت دەمژم؟ و تا دوا هەناسەی بە ئاگابوونم سەرم لەسەر قوڵ و هەناسەم بەرامبەر بۆنی بنباخەڵتە !؟.

بۆنی لە بنباخەڵی نەدا و بەمەبەستی تێکەڵاوکردنی هەردوو ڕەنگی پێست و ڕەنگی ژێر کراسەکەی. ژێرکراسێکی کورتی مۆری کاڵی لەبەرکرد. گۆیکەکانی مەمکی ببوونە دووخاڵی پارسەنگهانینەوەی تابلۆی لەشی ڕووتی، ئەمە یەکەم شەو نییە بەم ژێرکراسە تەنکە مۆرەوە بنوێ. هێندە بە تامەزرۆ و نیان و سێکسییەوە لە شەوانی ڕابردوودا بۆی داکەنبوو، یەکە یەکە تاڵەکانی جەستەی ژێرکراسەکە گەرمی دڵی پەنجە تووکاوییەکانی ئەوی دەناسییەوە، ئیمشەو هەموو بێنازن و چاوەڕێی نازایەتیی لایەک دەکەن.هەردوولایان هەناسەکانیان دەژمارد و یەک لەدوای یەک چاوەڕێی ئەوەی تری دەکرد لە دوای ژمارەیەکی تایبەتی هەناسەوە باوەش بەیەکدا بکەن.

– ئافرەت جیهانێکی هێندە پیرۆز و بەنرخە، شایەنی هەموو ستایشێکە. شەرم نییە پاش چەپکە هەناسەیەکی تر ئەگەر ئەو هەنگاوی بۆ ڕمانی ئەم دیوارە تووڕە تەنکە نەعلەتییەی نێوانمان نەنا. ئەوە من دەیرمێنم و دەچم و سەرتاپا دوورگەی لەشی نێو دەریای پڕ شەهوەتی دەلێسمەوە.

– پیاو هێندە پێویستە بۆ ژیانی ئافرەت شایستەی هەموو لێبوردن و ڕێزێکە. ئاخر کوا و چ سەرچاوەیەک هێندەی لەشی پیاو ئەو هەموو نیانییە بە ڕۆحی ئافرەت پێشکەش دەکات؟

– نابێ چاوەڕێی ژمارەی هەناسەکانی بکەم. شەرم نییە من هەنگاو بۆ مژینی گۆیکەکانی دەنێم.

– نابێ چاوەڕێی ژمارەی هەناسەکانی بکەم. شەرم نییە من هەنگاو بۆ لستنەوە و بۆنی تووکەکانی سەرسنگی دەنێم.

– چۆن لە کوێوە دەست پێبکەم؟ دڵنیام ئەویش پێی خۆشە، ئەوە نییە پشتی تێنەکردووم و نێوانمان تەنیا قولانجێکە، ئاگام لێیە بە کزی و شەرمەوە پێڵووەکانی دەترازێنێ و چاوەڕێمە؟. دڵنیام لەوەی ئەویش وەک من هەر بۆ خۆشاردنەوە لە ساتی وشە زبرەکان پێڵووەکانی نووقاندووە. دەزانم ئۆقرەی نەماوە، دەزانم ئێستا بە دیمەنە ڕووتەکانی شەوانی ڕابردوودا دەگەڕێت و ڕۆحی پێ ئارام دەکا. نا هەر ئەو وا نییە منیش وام چەند نیانە وردە نازی تەکانەکانی، ئەرێ بۆ ئەوەندە شەیدای سەر سنگمە. لێومی هێندە بە توندی دەمژی هەستم بە کزانەوەی دەکرد؟ دەیویست ڕەنگی قاوەیی لێببڕێ؟ نا لەبیرمە تازە یەکتریان ناسیبوو دەیوت: (گەرەکمە هەردوو لێوت بەگاز بخۆم، ئاخر ئەم ڕەنگە قاوەییە سروشتییەت لە کوێوە هانیوە؟) نا ئەمە هەمووی حەزی چەند ساڵ چاوەڕوانی و برسێتیی ڕۆحی ئافرەتێکی تەنیایە.

– نازانم بۆ ئەوندە پیاوێکی دڵگەرمە؟ گوناهە نەک شەوێک چەند چرکەیەک بکەم بەقوربانی تووڕەبوونێکی تەنک و چەند وشەیەکی زبر. من دەچم باوەشی پێدادەکەم و ئەم دیوارە شەفافەی نێوانمان دەڕمێنم. منی ئافرەت با خاوەنی لەشی ناسک و مەمکی خڕ و نیانی ڕۆح بم، خاوەنی هێز و کەسایەتیی خۆشمم. هیچ سووکی نییە هەنگاو بۆ لێو و باوەشی زبری شەیداکەم بنێم. هەردووکمان یەک مافمان هەیە، خۆ ئەو ئەوەندە ڕۆشنبیرە، بەم یاسا سروشتییە نامۆ نییە، ڕاستە وایە منی ئافرەت حەزدەکەم هەمیشە گوڵ بم و ئەویش هەنگ بە دەورما بخولێتەوە، ئاخر ئەو شێلەی منی دەوێ و منیش باڵەفڕێ تەکانە حەزاوییەکانی ئەوی پیاو. بەم شێوەیە ژیان ڕەنگاڵەیی دەبێت، بە هەردووکمان چرکەکان عەشقاوی دەکەین.

هەردوولایان سەقامگیری بیرکردنەوە و نەخشەکێشانی هەنگاوی یەکەم و ڕووخاندنی دیواری نێوانیان ببوون. لەبەر دیدی ڕۆحیاندا لەم لا و لای دیوارە تووڕەکەوە هەزارەها چرکە، چرکە بە چرکە سات لە دوای سات خەڵتانی خوێن دەبوون، دەبوون بە قوربانی، تا ساتی بێدەنگییان زۆر بوایە ژمارەی چرکە قوربانییەکانی ژێر لێفەکەیان زیادی دەکرد.

– ئەم هەموو تاوانە ئێمە لەو چرکانە دەیکەین یەخەی ویژدانمان دەگرێ.

– هەتا ئێمە وابین تاوانبارین بەرامبەر بە کوشتنی ژمارەی چرکەکانی تەمەنمان. تەمەنی چەند ساتێکی زبری ڕووتی ناو جێگە. من حەزناکەم بەرەو ڕووی پرسیاری ویژدانم ببمەوە، ئاخر چۆن وەڵامی بدەمەوە.

(ویژدان وتی):

– تۆی ئافرەتی نازدار تاوانباری بەرامبەر بە کوشتنی ئەو هەموو چرکانە.

– قوربان ویژدان ڕاست دەفەرموویت تاوانبارم.

– تۆش پیاوی غروور تاوانباری بەرامبەر بە کوشتنی ئەو هەموو چرکانە.

– قوربان ویژدان ڕاست دەفەرموویت تاوانبارم.

– نا با ژمارەی چرکە قوربانییەکان زۆر نەبێت هەر ئێستا باوەشی پێدادەکەم و پێش هەموو شتێ تێر بۆنی بێخی سەر و لا مل و بنباخەڵی هەڵدەمژم و دواجار گۆیکەی مەمکەکانی، تا فێی ڕۆحم ئارام نەبێت زمان و لێوم لە پێستی لەشی ناترازێنم.

– هەر ئەوەندە تەنیا پەنجەیەکی بجووڵێنێ، هەر ئەوەندە تۆزێ زیاتر پێڵووی چاوە قاوەییەکانی بکاتەوە،

من باوەشی پێدا دەکەم و با ئافرەتیش بم با زۆر شۆخ و سێکسیش بم ئاخر خۆشم دەوێت، ئەگەر شەوێک بێ تەکان و بۆنی هەناسە و ماچی لێوە قاوەییەکانی ئەو بنووم، تووشی هەزارەها خەوی ئاڵۆسکاو دەبم. ڕۆحم ئۆقرە ناگرێت. هەر کەمێک بجووڵێ پێش ئەوەی ئەو هەنگاو بۆ لەشی ڕووتم بنێ من بێخی تووکەکانی سەر سنگی بەزمان دەلێسمەوە. دواجار پاڵێدەخەم. نا ... نایەڵم وەک دوێنێ شەو بە لێسانەوە شێتم بکات من ئیمشەو دەسپێشخەری دەکەم. من ئەو شێت دەکەم، دەبێ حەقی ئەو هەموو چرکە قوربانییانە بکەمەوە و مەرج بێت لە سەریشەوە تەواو ببم. من چاوەڕێی تەنیا بزواندنی پەنجە تووتەی دەستیم و فراوانیی پێڵووی چاوە قاوەییە پڕ شەهوەتەکانی. دە هەنگاو بنێ. کوڕی خوا زیرەم کرد.

هەردوولایان بە تووڕەبوونێکی تەنک و نازی ئافرەتانە و غرووری نێرینەوە، دەمی ڕۆحیان جەڕاندبوو هەر دوولایان دڵنیابوون لەوەی ناتوانن بێ یەک بژین بێ یەک بنوون.

ئەم ڕۆمانە سکالاوییە بێدەنگ و وشانەی نێوانیان زیاتر ژمارەی چرکەکانیانی بە قوربانی دەکرد.

– نا کەڵکی نییە چاوەڕوانییەکەم درێژەی کێشا. ئەی چی بکەم خۆ ئیمشەو بۆنی سەرسنگی نەکەم و گەرمی ناودەمی هەڵنەمژم ناتوانم بنووم. چار؟؟؟ خۆم دەکەم بە خەوتوو بە ناز و فێڵەوە قۆڵێکم دەخەمە سار شان و ملی ڕووتی و وردە وردە بە دەم خەوەوە لێی نزیک دەبمەوە، گۆپکەی مەمکەکانم لە تووکەکانی سەرسنگی هەڵدەسووم، ئیتر غرووری نێرینەی دەپسێنم و وەک شێت پەلامارم دەدا. ئاخر ئەو شێتی گۆپکە و نەرمۆڵەی مەمکەکانمە، لە سەرەتادا کەمێک نازدەکەم خۆمی بۆ شل ناکەم ئا خۆم بە خەواڵوو دادەنێم. با وەک دوێنێ شەو لە پەنجەکانی پێمەوە تا دوا تاڵی مووەکانی سەرم بلێسێتەوە، سەد جار بە قوربانم ببێت، وەک چۆن مریەم غرووری خواوەندی پساندو کێشی کرد بۆ سەر زەوی(*) منیش غرووری دەپسێنم. کە دوێنێ شەو خۆش بوو، ئاخ بزواندنێک. وەک شەوانی تر تا خەو ماندوومان نەکات یەکتری دەمژین. ئیتر تۆبە جارێکی تر نایەڵم تەنیا وشەیەکی زبر بە زارما گوزەر بکات و لێم زویر ببێت، تاقە نیو چرکە لە ژیانم ناکوژم، چەند سەختە لەتەک شەیداکەتەوە بە ڕووتی و لە ژێر لێفەیەکەوە بن و نێوانتان قولانجێک بێت و نەتوانی سێکسی لە تەکدا بکەیت؟ ئەمەیە کارەسات و ڕۆح جەڕاندن!!! چۆن؟؟؟ وایە تاوانە ئەم هەموو چرکانە بۆ ببنە قوربانی چەند وشەیەکی زبر؟ تۆبە شیرینەکەم سەد جار تۆبە.

– نا کەڵکی نییە چاوەڕوانییەکەم درێژەی کێشا، ئەی چی بکەم خۆ ئیمشەو بۆنی قژ و بنباخەڵی و ژێر مەمکەکانی نەکەم و گۆپکەکانی نەمژم ناتوانم بنووم. چار؟؟؟ خۆم دەکەم بە خەوتوو بە ناز و فێڵەوە قۆڵێکم دەخەمە سەر شان و ملی ڕووتی و وردە وردە بە دەم خەوەوە لێی نزیک دەبمەوە، تووکەکانی سەرسنگم لە گۆپکە پەمەییەکانی مەمکی هەڵدەسووم، ئیتر نازی جوانی و عەیارییەکەی دەپسێنم و وەک شێت پەلامارم دەدا، ئاخر ئەو شێتی تووکە زبرە ڕەشەکانی سەرسنگمە، لە سەرەتادا کەمێک خۆم قورس دەگرم و خۆمی بۆ شل ناکەم، ئا خۆم بە خەواڵوو دادەنێم. با وەک دوێنێ شەو لە پەنجەکانی پێمەوە تا دوا تاڵی مووەکانی سەرم بلێسێتەوە، سەد جار بە قوربانم ببێت. وەک هاجەری ژنی برایم بە بیابانی وشکدا کێشی دەکەم(** )منیش نازی جوانییەکەی دەپسێنم، کە دوێنی شەو خۆش بوو، ئاخ بزواندنێک، تا خەو ماندوومان نەکات یەکتری دەمژین. ئیتر تۆبە جارێکی تر نایەڵم تەنیا وشەیەکی زبر بە زارما گوزەر بکات و لێم زویر ببێت، تاقە نیو چرکە لە ژیانم ناکوژم، چەند سەختە لە تەک شەیداکەتەوە بەڕووتی و لە ژێر لێفەیەکەوە تەنیا نێوانتان قولانجێک بێت و نەتوانی سێکسی لە تەکدا بکەیت!! ئەمەیە کارەسات و ڕۆح جەڕاندن!!! چۆن؟؟ چۆن وایە تاوانە ئەم هەموو چرکانە، بۆ ببنە قوربانی چەند وشەیەکی زبر؟؟؟ تۆبە شیرینەکەم سەد جار تۆبە.

وەک دوو میلی دوو کاتژمێری میقاتکراو لە ناکاو قۆڵیان لەیەک ساتدا بەرزبوونەوە باوەشیان بەیەکداکرد و لە ساتە چرکەی هەناسەیەکدا بە عەزرەتەوە دەمیان خستە دەمی یەکتری و بە خێرایی وەک تینوویەکی چاوەڕوان. تەرایی سەری زمانی یەکتریان دەنۆشی. لەیەک ئاڵان، ئاڵاندنێک لە خۆشیاندا چرکە قوربانییەکانی ساتە سرەکانیان، وزەیان بەگیاندا برا. وەک بەڵێنی بە ڕۆحی دابوو تا دوا چرکەی تەکانەکان نەیهێشت لەژێریا جووڵە بکات و لە سەرەوە بە سەر لەشی تووکن و توندو تۆڵیدا توایەوە، تەواو بوو. لە باوەشی خەوێکی نەرمی سێکساویدا وردە وردە بە ناز و نیانییەوە دەستیان لە ملی چرکەکانی شەوەکە کرد و خەوتن. کە خەبەریان بووە، خۆری بەری بەیانی پەنجەرەکەی بەر لەشی ڕووتیانی کردبووە ئاوێنەیەکی ڕوون. یەکتریان بە ڕووتی تێدا بینی. بەڵێنیان دا جارێکی تر تۆبە تاوان بەرامبەر بە سات و چرکە ڕۆحییەکانیان نەکەن و دیمەنی لەشی ڕووتیان لە ئاوێنەی مێژوویاندا بە تەنیا نەکێشن.

*** لە هۆنراوەیەکی خوشکی بەڕێزم مەهاباد قەرەداغی-یەوە وەرگیراوە.**

**** لە ڕۆمانێکی خۆمەوە وەرگیراوە.**

**مۆسکۆ : ٢٢/١١/٢٠٠٢**

# من و ئەوانی تری من

**بەدرخان محەمەد عەلی**
**(نەغەدە)**

تەواوی لەشم گەرمە، تاولەرزم نییە، هەتاو عەزیەتم دەکا، ناتوانم هەناسە بکێشم.. هەست دەکەم دموچاوم کەوگ بوونەتەوە، وەختە بخنکێم. دەزانم، دەزانم کە ئەوە دەمرم، بێدەنگی، بێ سایە... گەلێک سامناک و دەرداوییە کە هیچ کەسێک ئاگای لە مردنی مرۆڤ نەبێ، تەنانەت دوای مردنیشی... هەموو پێ خۆشییەکانم ئێستا دڵم دەشێوێنن... دەمەوێ تەواوی پەلوپۆی گیانم زاریان بکەنەوەو دەست پێ بکەن بە ڕشانەوە... دەمەوێ هاوار بکەم بڵند، زۆر بڵند، بڵندتر لە دیوار، بەڵام نا سوودی نییە...

خۆزگە بارانێک باری با...

لێ بگەڕێ با پێیان وابێ کە ئەمن ئەم دیوارەم کێشاوە، بۆ سەلماندنی بەرزاییەتی خۆم یا هەر شتێکی تر، بەڵام ئەوان بوون کە ناچار بەو ئیشەیان دەکردم. خۆیان نەیانەویست بیر بکەنەوە، خۆیان نەیانەویست لە پشت سەرم گاڵتەم پێ نەکەن. من هیچ داوێتکم نەبوو. ئەوان خۆیان ئیشەکانی گچکەیان گەورە دەکردو هی گەورەیان گچکە. من هەستم دەکرد کە دەبێ خۆم بم، بەڵام ئەوان هەمیشە دەستیان بۆ لای دەلقەکێک درێژ دەکرد کە من هەوڵم دەدا لە ناخی خۆمیدا بیشێرمەوە. کاتێک کە من دەمەویست خۆی ڕاستینم بدوێ دەلقەکە کەزارمی داگیر دەکردو ڕشتەی پەیڤینی بەدەست دەگرت و ئەوان بوون کە هاندەری بوون و ئەویان دەویست و هەر لەبەر ئەو هەوڵدانی زۆری من بوو- منی ڕاستین- کە تەرکیان کردم و گاڵتەیان پێ کردم. منیش ئیتر گوێم نەدانێ و هێندە ڕشامەوە تاکو هیچ شوێنکارێک لە دەلقەکەکە لە ناخمدا نەما.

پاش ئەوەی ساناترین وشەو لە دەستڕەسێنیان بۆم وشەی «نەفرەت» بوو لەمەوبەر من و نەفرەت پێکەوە دەژیاین و هەر کەسێک کەمن دەستم لەسەر دادەنا- هەر کەسێک تەنانەت ئەو منداڵەی گوڵی شینی بۆ هێنابووم- پێی دەلقەک بوو و بارانێکی وەک لافاوی بە سەریدا دەباراند تا ئەو کاتەی کە کوڵەگری گەلوومی دەگوشی و لە ناخی دڵمدا ئومێدەوار بووم کە باران بباری...

ئیتر ئێستا خوێنم پڕ لە نەفرەت بووە و ناتوانم خۆم و نەفرەتی لێک بناسمەوە، هەروەها ئەو دەستانەی کە فشارێکی هێدی هێدی دەمخنکێن... بەڕاستی ئەوانە دەستی منن کە دەمواومی کەوگ کردوون دەبێ پێش لەوەی کە بە تەواوی بمرم خۆم پەیدا بکەم و بناسمەوە. بڕیارم داوە، ئەم شەو بە خەنجەرێکەوە دەچم سۆراخی خۆم... کاتێک کە چاوم کردەوە، دنیام بینی، ئەوساکە بوو.. لاشەی خۆم دیتەوە کە لەژێر بارانی دوێنێ شەوێ تەڕ تەڕ ببوو و برینەکەم کە تەواوی خوێنی ڕشابووەوە و من خۆم بووم کە هەستام گوڵاڵە سوورێکم دی کە لە کەناری دیوار شین ببوو... زانیم کە سپێدەیە... هەستم بەخۆشییەکی غەریب لەناوخۆدا کرد. دڵم لە نوێ دەستی بەلێدان کرد.. ئیتر ئێستا هەر کەسێک کە بێت ئەو گوڵاڵە سوورەی پێ نیشان دەدەم و داوای لێبوردنی ناگوتراوەکەی لەبەر لە دەستی بۆنی گوڵی بەنەوش دەپەژێرم.



# کتێبەکەی ڕۆنی

**جودیث نەی چانس**
**لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن**
**(سلێمانی)**

لە یەکەمین سەرنج و نیگادا هەرگیز لەوە نەدەچوو کە (ڕۆنی) لە هاوپۆلەکانی خۆی جیاوازبێت، دیارە من وەک کەسێ ئامادە بووم لەو سەرەتای تەمەنەی ئەوانداو لەپۆلی یەکدا خۆبەخشانە شیعرو چیرۆک و بابەتی دیکەیان بۆ بخوێنمەوە. ڕۆنی قژ بژو ئالۆزکاو وەک ئەوەی «با» تێکی دابێت، پێلاوەکانی کۆن و هەلاهەلا، پشت گوێکانی پڕ لە چلک و قرێژ، پاشماوەی شتێک وەک سەندەویچ بە دەوری دەم و لێوییەوە.

کە لە نزیکترەوە لێی ورد دەبوومەوە توێخێکم لە پیسی و قرێژ بەدی دەکرد بەسەر دەم و چاوی (ڕۆنی)یەوە، بەسەر لووتە وشک و قەلاّنگییەکەیەوە، ژێر نینۆکەکانی هەر هەمووی چلک بوو، لەگەڵ ئەوەشدا من هەستم نەدەکرد کە ئەم لە قوتابخانەدا وەها پیس وپلۆخ بووبێت، بەڵکو دیار بوو کە (ڕۆنی) ئەو هەموو قرێژو چلکەی لەدەرەوە هێنابێت.

جلەکانی بەری هەر هەموو پینە پینەو زۆر بەناشیرینی بەیەکەوە دوورابوون، قەیتانی پێلاوەکانیشی دوو پەتی باریک بوون، جانتاکەی پشتی جگە لە تورەگەیەک هیچی دیکە نەبوو.. تورەگەیەک لەوانەی کە خەڵکی بۆ کرینی شت و مەک دەیبەنە بازاڕ.

سەرەڕای ئەو شێوەو سەرو سەکوتە سەیرەی، ڕۆنی لە زۆر ڕووی دیکەوە لەهاوپۆلەکانی جیاواز بوو، کە قسەی دەکرد زمانی تەتەڵەی دەکرد، لەخوێندنەوە و نووسیندا لە ئاستی ئەو قۆناغە و هاوپۆلەکانیدا نەبوو، ساڵێکیش لەدواوە بوو، بەتەمەنی هەشت ساڵەوە لەوە گەورەتر دەردەکەوت کە لەپۆلی یەکدا قوتابی بێت. ماڵەکەیان وێران و کاول، دایکە و باوکەش هەمیشە لەدەرەوە بوون و لەماڵ نەدەگیرسانەوە، دایک و باوکێک کە هەرچی هەوەس و ئارەزوو لەدڵی کوڕەدا هەبوو، مراندبوویان! بەس خۆ دەبوو (ڕۆنی) لەهەر شوێنێکدا بووایە ئەو ساڵە لەوێندەر بژبایە.

من هەر زوو دەرکم بەوە کرد کە لەژێر ئەو ڕووخسارو جل و بەرگە پیس و پلۆخەیدا (ڕۆنی) ڕۆحێکی زیندووی هەیە، ژیری و توانایەک کە بتوانێت بەرگەی زۆر شتی ناخۆش بگرێت، من لە ژیانمدا منداڵێکی وەهام نەدیبوو کە بەم تەمەنە ساوایەوە بەرگەی ئەو هەموو سەراو و دەراوە بگرێت.

هەڵبەتە من لەو پۆلەدا، نەک بە تەنیا لەگەڵ ڕۆنی-دا، بەڵکو لەگەڵ هەموو قوتابییەکاندا مامەڵەی (یەک- بە-یەکم) لەگەڵ دەکردن تاوەکو بتوانم تواناکانی خوێندنەوەیان باشتر سەرنجدەم. هەموو ڕۆژێک ڕۆنی بەچوار دەوری خۆیدا سەری وەردەسووڕاند هەر کاتێک من دەهاتمە پۆلەکەیان، چاوەکانی هەر بەدوامەوە بوون تا ئەو گۆشەیەی کە لەپۆلەکەدا هەڵم دەبژاردو لێی دەوەستام، هەر بە چاو داوای لێ دەکردم و دەپاڕایەوە:

«من.. من هەڵبژێرە مامۆستا!»



هەڵبەتە نەدەکرا هەموو ڕۆژێک بایەخ بەو بدەم. کوڕەکانی دیکەش پێویستیان بەیارمەتی من هەبوو.

لەو ڕۆژانەی کە نۆرەی (ڕۆنی) بوو، خامۆشانە سەرێکی ڕادەوەشاند، ئەوسا بەدەم باڵەفڕەوە تەختەکەی خۆی بەجێ دەهێشت و لەچاوترووکانێکدا بە پۆلەکەدا بەدەم ڕاکردن و قەڵەمبازەوە دەگەیشتە لام، ئەوەندە لێمەوە نزیک بوو قەڵسی دەکردم- دەبێ دانی پێدابنێم کە سەرەتا وابوو- ئەو کتێبەی دەگرت بەدەستەوە کە لە بەرنامەی خوێندنەکەماندا بوو، هەر دەتوت گەنجینەیەکی دۆزیوەتەوە کە لە مەوبەر کەس لەدونیادا نەیبینیوە.

من لە پەنجە، پیس بووەکانی بە ورتکەکێک، ورد دەبوومەوە کە لەژێر پیتەکاندا گران و لەسەرخۆ دەجووڵان، لەولاوەش هەوڵی دەدا کە وشەکان حونجە بکات، لەبری ئەوەی بڵێ (بەد/ذ/ سەب) دەیوت (باو/ داو/ ساو)، هەڵبەت وشەکانی بۆ نەدەوترا، چونکە لالەپتە بوو.. زمانیشی دەگیرا، گرفتی گەورەی هەبوو لە وتنی وشەو پیتەکانی ئەلف و بێ بەشێوەیەکی ڕاست و دروست.

وتنی هەر وشەیەک بۆ خۆی ململانێیەکی گەورەو هەم سەرکەوتنێکیش بوو بەیەکەوە؛ ڕۆنی بەوپەڕی زەحمەتەوە هەر پیتێکی لەزار دەهاتە دەر، پاشان هەوڵێکی زۆری دەدا کە لەو کۆمەڵە پیتەدا وشەیەک دروست بکات. بە چاوپۆشین لەو هەموو شتانەش ئەگەر وشەیەکی وەکو (تۆپ- ball) وەک (باه- لاه- Bah-Lah) یان (باو/ Bow) کۆتایی بهاتبایە، ئەو خەندەیەکی پان و گەورۆنە هەر هەموو ڕووخساری داگیر دەکرد، چاوەکانی پڕ لە باق و بریق دەدرەوشانەوە و شکۆ و شانازیان لێ دەڕژا. هەموو جارێک کە ئاواهی دەمبینی، دڵم ژانی دەکرد. من یەکسەر لەوکاتانەدا حەزم دەکرد کە لەو ژیانە دەری بکەم، لەگەڵ خۆمدا بیبەمەوە ماڵەوە، پاک و خاوێنی بکەمەوە و لە دڵی خۆم نزیکی بخەمەوە و خۆشم بووێت.

چەندەها شەو.. دوای ئەوەی منداڵەکانی خۆم دەبردنە ناو جێگاو دەمخەواندن، دادەنیشتم و بیرم لە (ڕۆنی) دەکردەوە، دەمپرسی: ئاخۆدەبێت لەکوێ بێت؟ تۆ بڵێی لەمەترسی دووربووبێت، تۆ بڵێی لەژێر بەتانیەکەیداو لەبەر ڕۆشنایی لایتێکی دەستی کتێبێک بخوێنێتەوە؟ تۆ بڵێی هەر بەڕاستی بەتانیەی هەبێت؟

ساڵان تێژ تێپەڕین و (ڕۆنی) تا ڕادەیەک پێش کەوت، بەڵام زۆر قورس بوو بگاتە ئاستی ئەو قۆناغەی خۆی و توانای هاوپۆلەکانی. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم تاکە کەسێک بوو کە بۆخۆی ئەم شتەی نەدەزانی. تاڕادەیەک کە دەرکی بەو دۆخە خەراپەی خۆی کرد، ئیدی وای لێهات کە باشتر لەجاران بخوێنێتەوە.

چەند هەفتەیەکی کەم بەر لە تەواوبوونی ساڵی خوێندن، من توانیم ئاهەنگێکی خەڵات بەخشینەوە ساز بدەم. چەندەها کەسم بانگهێشت کرد، خەڵات و دیاری و بڕوانامەم بەسەر سەرکەوتووەکاندا دابەش کرد: خەڵات بۆ باشترین خوێندنەوە، بۆ باشترین ڕەوانبێژ، جوانترین دەربڕین و دارشتن، بۆ دلێرترین دەنگ لەوەختی خوێندنەوە، خێراترین کەس کە فریا ناکەوێت لاپەڕەکان هەڵبداتەوە.

کاتێکی زۆری لەمن ویست تاوەکو بزانم لەچ بوارێکدا (ڕۆنی) چالاکە تاوەکو خەڵاتێکی بدەمێ. شتێکم لەودا دەویست کە تێیدا کارامەو خاڵی سەرکەوتنی بێت، بەڵام لەڕاستیدا شتێکی ئەوتۆم نەدەدۆزیەوە. دواجار بڕیارمدا کە خەڵاتی ئەم لەژێر ناوی «لە پێشترین خوێنەری خۆماندووکەر»- دەمزانی ئەم شتە زێدەڕۆیی تێدایە، بەڵام هەستم دەکرد کە (ڕۆنی) دنیایەک شاگەشکە دەبێت و پێی خۆشە.

لەپاڵ بڕوانامەکەی، من کتێبێکم کردە دیاری (ڕۆنی)- یەکێک بوو لەکتێبە زەرکەفتییە بچکۆلەکان کە نرخی تەنیا چل و نۆ سەنت بوو کە لای وردەواڵە فرۆشەکەی دەرگای دەرەوە کڕیبووم. فرمێسک سێ ڕیز بەچاوەکانیدا هاتنە خوارێ و لەسەر ڕوومەتە چڵکنەکەی جۆگەلەیان دەبەست، جۆگەلەی فرمێسکەکان ئەو توێخە چڵک و پیسییەیان ڕادەماڵی و چەند هێڵێکی لەسەر هەردوو ڕوومەتی (ڕۆنی)دا دروست دەکرد، لەهەمان کاتدا توند کتێبەکەی بەسینگییەوە نووساند ڕووەو تەختەکەی خۆی هەڵفڕییەوە! شتێک لەقورگمدا وەکو تۆپێک خەریک بوو بمخنکێنێ، بەڵام توانیم قووتی بدەم.

بەدرێژایی ئەو ڕۆژە من لەگەڵ پۆلەکەدا مامەوە؛ بۆیەکجاریش چییە، ڕۆنی کتێبەکەی فڕێ نەدا، دەتوت ئەو کتێبە بچکۆلەو زەرکەفتییە بەدەستەکانییەوە نووساون.

دوای چەند ڕۆژێک گەڕامەوە بۆ قوتابخانەکەم تاوەکو سەرێک لەستافی مامۆستایان و هاوەڵەکانم بدەم. ڕۆنی-م بینی لەسەر تەختەیەک دانیشتبوو نزیک بە یاریگا کە، کتێبەکە لەسەر کۆشی کراوە بوو. توانیم لێوەکانی ببینم کە دەجووڵان، ئەوکاتەی لەبەرخۆیەوە موتاڵای دەکرد.

مامۆستاکەی (ڕۆنی) لەتەکما پەیدا بوو.. پێی وتم: «لەوەتەی تۆ ئەم کتێبەت داوەتێ بۆ ساتەوەختێک چییە فڕێی نەداو بەجێی ناهێڵێت. هەر دەڵێی کراسەو لەبەری کردووە، دەینووسێنێ بەدڵییەوە. ئایا تۆ دەزانیت کە ئەوەیان یەکەمین کتێبە تا هەنووکە کە هی خۆی بێت؟»

دیسانەوە فرمێسکەکانم قووت دایەوە، لە ڕۆنی نزیک

بوومەوەو لەسەر شانییەوە لەپەنجە چلکنەکەی ڕادەمام کە هێواش و لەسەرخۆ بەسەر لاپەڕەکەیدا دەیخشاند، دەستێکم لەسەر شانی داناو لێم پرسی:

«ڕۆنی.. ئاخۆ دەتوانم بەدەنگی بەرز شتێکم لەو کتێبە بۆ بخوێنیتەوە؟»

هەڵێروانی و بەدوو چاوی نیوە داخراوەوە لەتێن و تاوی خۆرو زۆر بە پەلە لەسەر تەختەکە جێگەیەکی بۆ من چۆڵ کرد.

پاشان بۆ چەند خولەکێکی دواتر بەوپەڕی هەست و نەست و دەربڕینێکی جوانەوە، زۆر ڕوون و ئاشکرا، زۆر سادەو ئاسان دەستی کرد بەخوێندنەوە، بەجۆرێک کە من هەرگیز مەزەندەم نەدەکرد ئەم بتوانێت، لاپەڕەکان وەک گوێی سەگ لۆچ ببوون، ئەوەندە زۆر نووشتابوونەوە، وەک ئەوەی کە ئەو کتێبە تا ئەو حەڵە هەزارەها جار خوێندرابێتەوە.

پاش ئەوەی لەخوێندنەوە بۆوە، ڕۆنی کتێبەکەی داخست، بەدەستە چلکنەکەی لەکتێبەکەی داو بەوپەڕی ڕەزامەندییەوە وتی:

«کتێبی چاکە.»

خامۆشانە هەردووکمان لەناو شکۆ و شانازیدا نوقم ببووین ئەوکاتەی بەیەکەوە لەسەر تەختەی ناو پارێگاکە دانیشتبووین، لەوکاتەی کە دەستەکانی (ڕۆنی) لەناو دەستەکانی مندا بوون. خۆم بۆ نەگیراو گریام و زۆر سەرسام بووم بەو مێردمنداڵەی کە لە تەکمدا دانیشتبوو. چ هاوکاری و بەشدارییەکی بەهێزو گەورەی کرد، نووسەری ئەو کتێبە زەرکەفتی و بچکۆلەیە و چۆن چۆنی توانی ژیانی کوڕێژگەیەکی دۆڕاو و بێ کەڵک بگۆڕێت.

لەوساتە وەختەدا بوو کە من زانیم ئیدی سەبارەت بە پیشەی خۆم، وەک نووسەرێک دەبێ دڵگەرمترو مکوڕتر بم، ئەو شتە بکەم کە ئەو نووسەرە لەژیانی (ڕۆنی)دا دروستی کرد، کە لەوانەشە ئەو سیحرو کاریگەرییە تا ئێستا بەردەوام بێ- پتر گرنگی و بایەخ بەخۆم و تواناکانم بدەم تاوەکو چیرۆکێکی وا بنووسم کە ژیانی منداڵێک بگۆڕێت، گرنگی و بایەخێک و خۆ خەریککردنێکی ئەوتۆ کە جیاوازی دروست بکات.

من هەوڵ دەدەم و کۆشش دەکەم کە ئەو نووسەرە بم.

**سەرچاوە:**

Chicken Soup For the Writer's Soul
Jack Canfield Pages (2 -5).

# ڕێگا و جۆرەکانی ڕێنماییکردنی دەروونی

د. کەریم شەریف قەرەچەتانی
(زانکۆی سەلاحەدین - کۆلێژی پەروەردە)

٢ - ٢

**ڕێنماییکردن و چارەسەرکردن بەیاری**

یاریکردنیش یەکێکی ترە لەو ڕێگاو شێوازانەی کە یارمەتیدەرە بۆ منداڵ، تا لە ڕێگەیەوە لەترس و گرژی و دڵەڕاوکێ ڕزگاری بێت و چاک ببێتەوە و ئەو زەبرو هێدمە دەروونییەی لەکۆڵ ببێتەوە. شایانی باسە یاریکردنیش لە هەندێک ڕووەوە وەک سایکۆدراماو چیرۆک گێڕاندنەوە وایە و هەمان ئامانج و ئاراستەیان هەیە.

یاریکردن وەک ڕێگاو شێوازێک بنەمای دەروونی خۆی هەیە، چونکە جیهانی منداڵ مانای یاریکردنە، واتە پیشەی منداڵ یاریکردنە. یاریکردن یەکێکە لەو کەرەستانەی کە لە ڕێگەیەوە منداڵ فێری زۆر شت دەکرێت و لە هەمان کاتیشدا لەمیانەیەوە دەست نیشانی زۆر لەکێشەو گرفتە دەروونییەکانی منداڵ دەکرێت.

لەڕاستیدا یاریکردن لەسەر گریمانێک بنیادنراوە، ئەویش ئەوەیە، کاتێک منداڵ یاری دەکات لە هەمان کاتدا بەیاریکردنی ڕۆڵەکان هەڵدەستێت و گوزارشت لە هەست و سۆزو کێشەکانی دەکات، لەبەر ئەوەی زۆربەی منداڵان (بەتایبەتی بچووکەکان) ناتوانن وەک گەورەکان بەقسەکردن و زار گوزارشتیان لێبکەن، لە هەمان کاتیشدا یاریکردن پێداویستییەکی دەروونی و کۆمەڵایەتییە و هەردەبێت تێربکرێت.

زۆرجار یاریکردن دەبێت بەدەروازەیەک بۆ چارەسەرکردن و ڕزگاربوون لە فشارو گرفتەکانی ژیانی ڕۆژانە، هەروەها منداڵ لەمیانەی یاریکردنەوە قەرەبووی زۆر لەوبێبەش بوونانەی ژیانی ڕۆژانەی دەکاتەوە، واتە کاتێک ناتوانێت لەواقیعدا تێریان بکات ئەوا هەوڵدەدات لەڕێگەی یاریکردنەوە گوزارشتیان لێ بکات و تێریان بکات.

بۆ ئەوەی ئەم شێوازە سوودبەخش بێت، پێویستە ژوورێکی یاریکردن هەبێت کە جۆرەها یاری و کەل و پەلی تێدا بێت کە گوزارشت لە کەسایەتی و کەسەکانی چواردەوری منداڵ بکەن لەوانە (ئەندامانی خێزان، مامۆستا، قوتابی، هاوڕێ، پۆلیس، باڵندە، ئاژەڵ، کەل و پەلی خانوو دروست کردن و ڕێگاوبان، دروومان، چەک و کەرەستەکانی شەڕ، لم، ئاو، قوڕی دەست کرد، کاغەزو قەڵەم و ماجیک، جۆلانەو کەرەستەکانی مۆسیقاو شتی تر). ئینجا ڕێگە بەو جۆرە منداڵانە دەدرێت کە خاوەن گرفتن بۆ ئەوەی بە ئارەزووی خۆیان لەو ژوورەدا یاری بەو کەل و پەلانە بکەن. ئالێرەدا دەبێت کەسی ڕێنماییکاری دەروونی سەرنجی منداڵەکان بدات و بزانێت (چ جۆرە یارییەک دەکەن، یاری بەکام کەل و پەل دەکەن، چۆن یاریان پێدەکەن، واتە شەڕانی و توندوتیژن، یان لەسەرخۆن، یان کەل و پەلێکی دیاریکراو دەشکێنن و پانی دەکەنەوە).

لەبەر ئەوەی منداڵی خاوەن گرفت بەشێوازی جیا لە منداڵی ئاسایی لەکاتی یاریکردن ڕەفتار دەکات و هەوڵدەدات لەکاتی یاریکردن گوزارشت لەباری دەروونی و تووڕەیی و ترس و دڵەڕاوکێکانی بکات، بۆ نموونە ئەگەر منداڵێک ڕقی لەباوکی، یان دایکی، یان خوشک و برای، یان مامۆستای بێت، ئەوا هەوڵدەدات کە یەکێک لە یارییەکان بکات بەو کەسەی کە ڕقی لێیەتی، ئینجا دەست دەکات بە لێدان و پانکردنەوەو چاوهەڵکۆڵینی و لەمیانەی ئەو ڕەفتارو یارییەوە لەو ڕق و کینەو خەم و خەفەتە ڕزگاری دەبێت و دەگەڕێتەوە باری دەروونی ئاسایی خۆی. کەواتە ڕێنماییکاری دەروونی دەتوانێت لەڕێگەی یارییەکانەوە شارەزای باری دەروونی منداڵە خاوەن گرفتەکان ببێت و دەست نیشانی سەرچاوەو هۆکارەکانی بکات و ڕێگاچارەی گونجاویان بۆ بدۆزێتەوە.

لەڕاستیدا ڕێنماییکردن بەیاری پێویستی بەڕابەرێک هەیە کە لە منداڵ و ڕەفتارەکانی بێزار نەبێت و حەز بەکارکردن بکات لەگەڵ منداڵ و لەهەمان کاتیشدا بە ئارام و خۆڕاگر بێت و ئارادەیەکی باش شارەزایی لەسایکۆلۆژیای منداڵدا هەبێت و بتوانێت دەست نیشانی نیشانەو هۆکارو سەرچاوەکانی گرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکانی منداڵ بکات. دووجۆر یاریکردن هەیە، جۆری یەکەم لەیاریکردن پێی دەگوترێت یاریکردنی سەربەست، بەڵام جۆری دووەم یاریکردنی دیاریکراوو سنووردارە.

لەجۆری یەکەم کە یاریکردنی سەربەستە، منداڵ خۆی جۆری یاری و شێوەو شێوازی یاریکردنەکە هەڵدەبژێرێ و ڕێنماییکار بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ڕێنمایی منداڵ دەکات و بەهیچ شێوەیەک هەستی منداڵ بریندارو هەرەشەشی لێ ناکات، هەروەها ڕێنماییکار دەکرێت بەشداری یارییەکانی منداڵ بکات، یان نەیکات، ئەوەش بۆ ویست و ئارەزووی منداڵەکە دەگەڕێتەوە، بەڵام لەجۆری دووەم کە یاریکردنی سنووردارە، ڕێنماییکار بەڕۆڵی سەرەکی هەڵدەستێت و ئەو یارییەکە ئاراستە دەکات و نەخشەی بۆ دەکێشێ و جۆری یاری و شوێن و کاتەکانی دیاری دەکات، بەتایبەتیش ئەو یاریانەی کە بۆ تەمەن و ئاستی ژیری منداڵەکە گونجاوە، یان پێوەندیدارن بەجۆری کێشەی منداڵەکە (ئایا کێشەی خێزانییە، یان قوتابخانەیە، یان کۆڵانە). بۆ نموونە ئەگەر منداڵ لەدایک و باوک، یان ئاژەڵێک بترسێ ئەوا ڕێنماییکاری دەروونی هەوڵدەدات کە ئەو کەش و هەواو بارودۆخە دروست بکات کە بوونەتە هۆی ترساندنی منداڵەکەو چۆنیەتی چارەسەرکردنی.

ڕێنماییکردنی دەروونی دەتوانێت لەکاتی یاریکردن پرسیار لە منداڵ بکات لەوانە (ئەوە چ یارییەک دەکەیت؟ بۆچی ئەو یارییە دەکەیت؟ ئەو کەسە کێیە؟ بۆچی وا لەو یارییە دەکەی؟ حەز لەکام یاری دەکەیت؟ ڕقت لەکامیانە..؟ تاد)، لەئەنجامی چاوپێکەوتن و سەرنجدانی منداڵ و ئەو پرسیارانە زانیاری باشی دەربارەی ڕەفتارو باری دەروونی منداڵی خاوەن گرفت دەست دەکەوێت، کە ڕێنماییکاری دەروونی لەکاتی ڕێنماییکردندا سوودیان لێوەردەگرێت، لەبەر ئەوەی منداڵ لەکاتی یاریکردن بەوپەڕی سەربەستی بەبێ سانسۆر گوزارشت لە هەست و سۆزەکانی دەکات و دوور نییە هەوڵی دووبارەکردنەوەی ئەو ڕووداوو کارەساتانە بدات کە بوونەتە هۆی تووش بوونی بەزەبرو هێدمەی دەروونی، کە ئەوەش لە دوولاوە سوودبەخشە لەلایەک دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەو ڕزگاربوون لەو فشارو هەڵچوونانەی کە ئەو ڕووداوە دروستی کردووە لەلایەکی تریشەوە ئەو یارییە دەبێتە هۆی هێماو کەرەستەیەک کەلەمیانەیەوە ڕێنماییکاری دەروونی دەست نیشانی کێشەو گرفتەکانی منداڵەکە بکات.

### نووسین

نووسین یەکێکی ترە لەو ڕێگاو شێوازانەی کە هەزارەها ساڵە مرۆڤ لەڕێگەیەوە گوزارشتی لە حەزو ئارەزوو و هەست و سۆزەکانی کردووە، زۆرن ئەو کەسانەی کە لەمیانەی نووسینەکانیانەوە باسی بەسەرهات و کارەسات و خۆشی و ناخۆشیەکانی ژیانیان کردووە، کەواتە دەکرێت لەکاتی ڕێنماییکردنی دەروونیدا سوود لەم شێوازە وەربگیرێت و داوا لە کەسانی خوێندەواری خاوەن گرفت بکرێت کە خەوو هەست و سۆزوترس و دڵەڕاوکێکانیان بنووسن و بەبێ شەرم و ترس باسیان بکەن. واتا دەکرێت هانی کەسی خاوەن گرفت بدرێت بۆ ئەوەی لەڕێگەی نووسینەوە (بە هەموو شێوەکانیەوە) ئەوەی لەناو مێشک و دڵ و دەروونی هەیە بیخاتە سەر کاغەزو دەریان بڕێت و بەشاراوەیی لەناو دڵ و دەروونیدا نەیان هێڵێتەوە. بێگومان فۆرم و شێوەکانی نووسین زۆرن لەوانە (شیعر و هۆنراوە، گۆڤارو ڕۆژنامە، یادگاری و ژیانی ڕۆژانە، چیرۆکی ژیانی خۆی، دۆکومێنت دەربارەی ڕووداوو بەسەرهاتە ڕاستەقینەکانی ژیانی کەسی خاوەن گرفت، کورتە چیرۆک، ڕۆمان، شانۆگەری.. تاد) کە دوورنییە کەسی خاوەن گرفت زۆر لەبەسەرهات و ترس و گرێ دەروونییەکانی خۆی لەسەر زمانی پاڵەوان و کارەکتەرەکانی ناو نووسینەکانیەوە باس بکات و دەریان ببڕێت کە لەمیانەیانەوە ڕێنماییکاری دەروونی شارەزاییەکی باش دەربارەی باری دەروونی کەسایەتی کەسی خاوەن گرفت پەیدا دەکات.

سەرەڕای ئەوەش شیعرو چیرۆک و ڕۆمان و هەمەجۆرە نووسینەکانی تر جۆرێکە لە چارەسەر کردنی دەروونی و دەبن بەدەروازەیەک بۆ خاڵی کردنەوەی هەڵچوونەکانی ناوەوە فڕێدانیان بۆ جیهانی دەرەوە، بەمەش کەسی خاوەن گرفت دوای نووسینەکانی هەست بەخاوبوونەوەو ئارامی دەروونی دەکات بۆیە زۆر گرنگە لەسەر نووسین هان بدرێن و نەهێڵن فشارو گرفتە دەروونییەکان لەناو دڵ و دەروونیاندا بەخەفەکراوی بمێننەوە.

### چارەسەرو ڕێنمایی
### بە هەڵپەڕکێ و گۆرانی و مۆسیقا

ولیەم ریچی دەروونزان دەڵێت: (پێوەندییەکی پتەو لەنێوان عەقڵ و جەستەی مرۆڤدا هەیە، ئەو هەست و سۆزو هەڵچوونانەی کە پێوەندییان بە فشارو زەبری دەروونییەوە هەیە، بە بەردەوامی بۆ زۆر بەش و ئەندامی لەش دەڕۆن و لە ئەوێ جێگیر دەبن و دواجاریش جەستەی مرۆڤ تووشی ڕەق بوون و ماسوولکەکانیشی تووشی گرژی دەکەن (manual.p ٦٢,٢٠٠٠) وەک لە ئەنجامی توێژینەوەکان دەرکەوتووە گۆرانی و هەڵپەڕکێ و جووڵەی لەش دەبن بە یارمەتیدەر بۆ خاڵیکردنەوە و فڕێدانی ئەو گرژی و خەم و خەفەتانە و گەڕاندنەوەی لەش بۆ حاڵەتی ئاسایی و خاوبوونەوەی ماسوولکەکان و

هەست کردن بەخۆشی و ئارامی دەروونی، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە ڕێنماییکاری دەروونی لەکاتی ڕێنماییکردن و چارەسەرکردنی گرفتەکان ڕێنمایی کەسی خاوەن گرفت بکات و لەسەر خاوبوونەوەی ماسوولکەکان و بە ئاکام گەیاندنی کۆمەڵێک چالاکی جووڵەیی و بەشداربوون لەبۆنەو هەڵپەڕکێ و شایی و خۆشیەکانی خزم و کەس و دۆست و برادەر هانی بدات، لەبەر ئەوەی گوێگرتن لەمۆسیقاو وتنی گۆرانی و بەشداربوون لە هەڵپەڕکێ وشایی و چالاکی تری جووڵەیی خۆشی و شادی لەدڵ و دەروونی مرۆڤ بەگشتی و کەسی خاوەن گرفت بەتایبەتی دروست دەکات لەزۆر خەم و خەفەت و دڵەڕاوکێ ڕزگاری دەکات و هاوسەنگی لەنێوان جیهانی ناوەوە و جیهانی دەرەوە بۆ دروست دەکات، لەلایەکی تریشەوە جووڵەی ئەندامەکانی لەش دەبێتە هۆی لێک هەڵوەشاندن و پەرتەوازەکردنی ئەو یادگاری و هەڵچوونانەی کە لەئەنجامی توندوتیژی و زەبرو هێدمەی دەروونییەوە دروست بوون.

لەڕاستیدا لە ئەنجامی هێدمەو زەبری دەروونییەوە کەڵێن و دەلاقەی گەورە دەکەوێتە نێوان کارو چالاکییەکانی عەقڵ و جەستەی مرۆڤ و پەرتەوازەیان دەکەن و باری دەروونی مرۆڤ و کاری ئاسایی تێک دەدەن، بەڵام وەک دەرکەوتووە هەڵپەڕکێ و گۆرانی و مۆسیقا یەکێکن لەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی گەڕاندنەوەی پێوەندی ئاسایی نێوان جەستەو عەقڵ و پڕکردنەوەی کەلێنەکان و بەخۆراکی عەقڵ و ڕۆح و گیانی مرۆڤ دادەنرێت و دەبێتە هۆی سارێژکردنی ئازارەکانی و بەباکردنی خەمەکان، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە ڕێنماییکاری دەروونی سوود لەو شێوازە وەربگرێت و هانی کەسی خاوەن گرفت بدات بۆ ئەوەی سوودیان لێوەربگرێت و لەژیانی ڕۆژانەیدا بەرجەستەیان بکات و بە ئاکامیان بگەیەنێ، بێگومان زۆر پێویستە کە لە هەمان کاتدا باشیەکانی گۆرانی و هەڵپەڕکێ و مۆسیقاو سوودەکانی بۆ کەسی خاوەن گرفت ڕوون بکرێتەوە بۆ ئەوەی ئەو بڕوایەی لەلا دروست ببێت کە پێویستن بۆ کەم کردنەوەی ئازارەکانی و چاک بوونەوەی لەو زەبرو هێدمە دەروونییەی کە بەدەستییەوە دەناڵێنێ.

لەلایەکی تریشەوە هەندێک جار جووڵەی بێ مەبەست دەبێتە هۆی کردنەوەی یادگاری و ئەو هەڵچوونانەی کە پەیوەستن بە توندوتیژی و زەبری دەروونیەوەو دواجاریش ڕزگار بوون لێیان و چاک بوونەوە لەو زەبرو هێدمەی دەروونییە.

## ڕێنماییکردن و چارەسەر بەهونەر

هونەرو چالاکییەکانی یەکێکی ترە لەو ڕێگاو شێوازانەی کە سوودبەخشە بۆ کەسی خاوەن گرفت و دەتوانێت لەمیانەیەوە گوزارشت لە هەست و سۆز بیروباوەڕو هەڵچوونەکانی بکات و ئارامی دەروونی دەست بکەوێت و لە هەمان کاتدا لەو فشارانەی کە زەبرو هێدمەی دەروونی بۆی دروست کردوون، ڕزگاری بێت، لەبەر ئەوە زۆر گرنگە کە ڕێنماییکاری دەروونی سوودیان لێوەربگرێت و لەکاتی ڕێنماییکردندا بەکاریان بهێنێ و کەسی خاوەن گرفت لەسەر پراکتیزەکردنیان هان بدات.

لەمێژەوە مرۆڤ لەمیانەی وێنەو نیگارو شێوەکارو کاری قوڕو تەباشیرکارییەوە توانیوەیەتی گوزارشت لە بیروبۆچوون و هەست و سۆزەکانی بکات. گومانیشی تێدانییە ڕێنماییکردن و چارەسەرکردن بەهونەر زیاتر بەکەڵک و گونجاوە بۆ منداڵ، بەتایبەتیش ئەو منداڵانەی کە زمانیان و قسەکردنیان کەم و کورتی تێدایەو ناتوانن لەڕێگەیانەوە باسی خەم و خەفەت و هەست و سۆزو هەڵچوونەکانیان بکەن، بەڵام زۆر بەئاسانی لەڕێگەی وێنەکێشان و کاری دەستییەوە دەتوانن گوزارشتیان لێبکەن. دەرکەوتووە هونەر شێوازێکی زۆر سەرکەوتووە بۆ زیاتر زاڵبوون بەسەر ڕووداو و شارەزاییە بە ئازارەکانی ژیان، چونکە دەبێتە هۆی خاڵیکردنەوەی گرژییەکان و گەڕاندنەوەی ململانێ و هەست و سۆزە خەفەکراوەکانی نەستی بۆ بواری هەستی و دووبارە دەرکەوتنیان، کە بەمەش ڕزگاربوون لێیان ئاسانتر دەبێت. هەروەها هونەرو چالاکییەکانی وەک وێنەکێشان و نیگارو کاری دەستیش بۆ گەورەکان بەسوودەو دەتوانن لە ڕێگەیانەوە لەسەرچاوەی ترس و دڵەڕاوکێ کانیان بگەن و بۆ دۆزینەوەی ڕێگاچارەی گونجاو بۆ ململانێکانیان و گەیشتن بەدروستی دەروونی بەکاریان بهێنن.

کەواتە ڕێنماییکارو چارەسەرکاری دەروونی دەتوانن سوود لە وێنەو نیگارەکانی منداڵان بە تایبەتی وەربگرن و لەمیانەیانەوە دەست نیشانی کێشەو ململانێ و ئازارو گرفتە دەروونییەکانیان بکەن، زۆر جار لەمیانەی ڕەسم و وێنەو چالاکییە هونەریەکانی ترەوە دەتوانرێت دەست نیشانی (حەزو، ئارەزوو، خەون، خەیاڵ، ترس، دڵەڕاوکێ، ڕق و کینە، گرفت و بەربەستەکان، ئەوکەسانەی کە ڕقی لێیەتی، خاڵە لاوازو بەهێزەکانی) منداڵ بکرێت، لەبەر ئەوە زۆر پێویستە کاغەزو کارتۆن و قوڕی دەستی و دروست کراوو ماجیک و قەڵەم و تەباشیر، بخرێتە بەردەستی منداڵ و کەسی خاوەن گرفت بۆ ئەوەی وێنەو نیگار دروست بکات و چی حەزی لێدەکات و حەزی لێناکات و ئەوەی کە دەیەوێت لە ڕێگەی وێنەکانیەوە پیشانیان بدات، کە منداڵ بەتایبەتی و گەورە بەگشتی لە دوولاوە قازانجی پێدەگات، لەلایەک ئەو وێنەو نیگارو چالاکیە هونەرییە دەبێت بە دەروازەو هۆکارێک بۆ خاڵیکردنەوەی هەڵچوونەکان و لەلایەکی تریشەوە دەبێت بە کەرەستەیەک بۆ دەست نیشانکردنی گرفتە دەروونییەکان و ئەوشتانەی کەئازاری دەدات و بەدەستیانەوە دەناڵێنێ.

# چەمکی تەوتەم لە فەلسەفەی (دورکهایم)دا

ئازاد خدر

دورکهایم پێی وابوو (تەوتەم)، (یەکەم شێوەی بەرایی ئایین و ژیانی ئایینی بووەو هەموو سرووت و بیروباوەڕە تەوتەمییەکانیش وەک چەند دیاردەیەکی ئایینی بوونە، گرنگترین ئەو سرووتانەش بەشکردنی شتەکانە بۆ شتی موقەددەس و شتی ناموقەددەس) واتە ئایینی تەوتەمی بەڕای ئەم هزرمەندە، کۆنترین شێوەی ئایین بووەو تەوتەمپەرستی سادەترین و سەرەتاییترین شێوەی ئایین بووە. لە ڕاستیدا وشەی تەوتەم وەک واژەیەکی زانستی لەکۆتایی سەدەی هەژدەیەم لەنێو توێژینەوە ئیتنۆگرافییەکاندا بەتایبەتی لای نووسەری هیندی (لۆنگ) بەدیارکەوت. ئەودی کتێبەکەی لە لەندەن لەساڵی (١٧١٩) چاپ کرد. دوایش (فرێزەر) لەبارەی تەوتەمیزمەوە وەک ئاینێک و وەک سیستەمێکی کۆمەڵایەتی نووسی. هەروەها زۆربەی کۆمەڵناسانی وەک (سپێنسەر) و (کارل ستروز) و (لۆریشز) و (موس) و (پالدوین) و (فرانز) و (پێتر بۆردیە) و (پێترس) لەبارەی تەوتەمیزمیان نووسیوە. (دورکهایم)یش ئەو هەوڵانەی تەواوکردووە و توێژینەوەی تێروتەسەلی لەسەر ئایینی بەرایی کۆمەڵگەی کۆنی ئوستورالی کردووە، بۆ ئەوەی شێوە بەراییەکانی هزری ئایینی لە (ئارنتا) بدۆزێتەوە، چونکە بەڕای ئەو (سادەترین شێوەو دیاردەی کۆمەڵایەتییە، چونکە سیستەمی کۆمەڵایەتی لەسەر ڕێتمەکانی خێڵ و هۆزەکان دامەزراوە و خێڵ و هۆزو عەشیرەتیش لەشێوە بەراییەکاندا- لێرە شێوەکە ئوستورالییە- بەبێ تەوتەم دروست نابێ). بەم جۆرە تەوتەم دەبێتە سیمبول و دروشمی خێڵێک، یان عەشیرەتێک بۆ ئەوەی خۆی یاخود ناسنامەی لە عەشیرەتەکانی دیکە جودا بکاتەوە. تەوتەمیش بەپێی هزری کۆلاکتیڤ (جەمعی)ی عەشیرەتێک، جۆرە ڕووەکێک، یان جۆرە ئاژەڵێک، یان جۆرە جەمادێکی بەپیرۆز زانیبێت، ئەوا ئەو جۆرە شتە دەکەنە تەوتەمی خۆیان. دورکهایم دەڵێ (جگە لەتەوتەمی عەشیرەت، تەوتەمی تایبەتی تاکیش هەیە کە لەتەوتەمی تێکڕای عەشیرەتەکە جودایە. بۆ نموونە جاری وا هەبووە تاکێکی عەشیرەت هەڵۆیەکی بۆ خۆی کردۆتە تەوتەم لەبەر ئەوەی هەڵۆ چاوی تیژەو شایەنی پەرستنە نەک کوشتن. هەڵبەتە تەوتەمی فەردی لەتەوتەمی کۆلاکتیڤ جودایە، چونکە تەوتەمی کۆلاکتیڤ وەک میراتێکە بۆ سەرجەم تاکەکانی عەشیرەت و ناتوانن بیگۆڕن، کەچی تەوتەمی فەردی لەئاکامی هەڵبژاردنێکی ئازادانەی تاکێک لەتاکەکانی عەشیرەت دێتە ئاراوە. هەروەها تەوتەمی سێکسیش هەیە، ئەم جۆرە تەوتەمە تەنیا لەهەندێ خێڵی کۆنی ئوسترالیدا بەدی کراوە، لەوێدا وادیارە پیاوان تەوتەمی تایبەتی خۆیان هەبووە، ژنانیش هی خۆیان. تەوتەم لای مرۆڤی کۆن وەک سیمبولێک و دروشمێک، یان چییەک (espece) بووە، واتە جۆرە کیسەڵێک، یان کەنغەرێکی تایبەتی نەبووە، بەڵکو وەک واتاو هێمایەکی گشتگیر بووەو وەک ئاماژەیەکی سیمبولئامێز بۆ هێزێکی غەیبی، یان وێنەیەکی بوونەوەری موقەددەس بووە، واتە تەوتەم وەک سیمبولێک شێوە بینراوەکەی ئەو شتە بووە کە دورکهایم ناوی لێناوە (پرەنسیپی تەوتەمی) ئەوەی بە (بوونێکی تەوتەمی)یەوە پەیوەستە، جاری واش هەبووە (شێوە بینراوەکەی تەوتەم ئەوەی مرۆڤی کۆن لەسەر دارو بەردا نەقشی کردووە، لای پیرۆزتر بووە لەخودی تەوتەمەکە). تەوتەم لەبەر ئەوەی کانگەی ژیانی ئەخلاقی و ڕۆحی عەشیرەت بووە، بۆیە لەپاڵ هێزە ئایینی و موقەددەسەکەی (هێزی ئەخلاقی کۆلاکتیڤیش) هەبووە. پرەنسیپی تەوتەمی شێوەو ڕوخساری جۆراوجۆری هەبووە، بەڵام بەڕای دورکهایم گرنگترین و بەهێزترینیان (مانا) بووە. (مانا) وەک هێزێکی ئایینی و هەژموونی ڕۆحی (فیگەری پرەنسیپی تەوتەمی) بووە. واتە ئاڵای کۆلاکتیڤی عەشیرەت بووە یاخود (سیمبولی خوداوەندی خێڵەکانی میلانێزی) بووە. بۆیە دورکهایم دەگاتە ئەو ئەنجامە کە (لەو سەردەمە

کۆنانەدا خوداوەندی هۆزو عەشیرەت یاخود خوداوەندی تەوتەمی خودی عەشیرەتەکە بووە، ئەوسا خوداوەندو کۆمەڵ یەک شت بووە یاخود هەمان شت بووە). واتە لەو سەردەمانەدا هەر عەشیرەتێک خوداوەندێکی تەوتەمی هەبووە، بەڵام خوداوەندەکە دەرەکی نەبووە، بەڵکو خودی عەشیرەتەکە بووە، بەواتایەکی دیکە لەجیاتی ئەوەی خوداوەندێکی دەرەکی بپەرستێت، خودی خۆی پەرستووە، بەمەش ئایینی تەوتەمی دەبێتە یەکەم ئایین لەمێژووی مرۆڤایەتیدا و یەکەم جۆری (خۆپەرستن)، عەشیرەتی تەوتەمیش بۆ یەکەمجار لەنێو هزری کۆنی سەرەتاییدا توانی (هەستکردن بە خوداوەندیی) لەمێشکی مرۆڤی کۆندا بورووژێنێ، دەڵێ (عەشیرەتی تەوتەمی وەک هێزێکی کۆلاکتیڤی ڕۆحی، هەژموونی ئایینی خۆی بەسەر تاکەکاندا سەپاندووە و وەک هێزێکی لەبن نەهاتووی میتافیزیکی، تاکو ئێستاش لەنێوماندا بیرۆکەی شتی موقەددەس وەک بیرۆکەیەکی سامی لە ئاستیدا دەلەرزین و چۆک دەدەینەوە و دەست بە پاڕانەوە دەکەین، دەمانورووژێنێ).

کەواتە ئەگەر خوداوەندەکەی ئەفلاتوون (خێر) بوو بێت و خوداوەندەکەی ئەرستۆ (هۆی یەکەم: العلة الاولی) و هی (ئیبن سینا)، (واجب الوجود) بوو بێت، ئەوا دیدەکەی (دیکارت) بۆ خوداوەند لە (تەکامول و لاتەناهی)دا بەرجەستە دەبێت و هی (کانت) لە پرەنسیپی تۆتالی لەزەینی مرۆڤدا) بەرجەستە دەبێ، کەچی فەلسەفەکەی دورکهایم لەبیرۆکەی (تەوتەمیزم)دا بەرجەستە دەبێت و لەنێو هۆزو عەشیرەتدا بەدیاردەکەوێت و تاکو ئێستاش درێژەی دەبێت، دەڵێ: (کۆمەڵگە خۆی دەپەرستێت و خودی کۆمەڵ دەبێتە خودی خوداو بابەتی پەرستن و بابەتی پیرۆزی کۆمەڵگە بووەتە تەوەری ئیمان و گەوهەری ئایین و عەقیدە، بیرۆکەی نەمریی کۆمەڵ ڕاڤەی نەمریی خوداو نەمریی نەفسی دەکات). بۆیە هەر بەپێی ئەم لۆژیکە ڕۆحییە یاخود سۆسیۆ ڕۆحییە، دورکهایم گەیشتە ئەم ئەنجامەی (کە نەمریی نەفس وەک ڕەچەڵەکێک، لەنەمریی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەزەلیەتی مانەوەی کۆمەڵایەتییەوە هاتووە. بۆ نموونە مرۆڤی کۆن تێبینی ئەوەی کردووە، کاتێک تاکەکانی عەشیرەتێک دەمرن، عەشیرەتەکە دەمێنێتەوە وێڕای ئەوەی کەسی نەماوەتەوە. هەروەها ئێستاش کاتێک خەڵک دەمرن، بەڵام کۆمەڵگە هەر بەردەوام دەبێت لەژیان و بەنەمریی دەمێنێتەوە. کەواتە نەمریی کۆمەڵگە لێکدانەوەکەی دورکهایم بووە. بۆ بیرۆکەی (نەمریی نەفس).

بەم جۆرە تەوتەمیزم وەک تیۆرێکی کۆزمۆلۆژی لەبارەی بوونی مرۆڤایەتییەوە یەکەم شێوگەی ئایین و پەرستیاری لە ئاوەزی مرۆڤی سەرەتایی، لای دورکهایم بوو بەڕاستییەکی کۆمەڵایەتی نەک ڕاستییەکی ئەزموونگەرییانە: (هەستکردن بەسروشت و بە مەزنی و عاجباتییەکەی سروشت، هەستی کاتی بووەو بەسەر چووە و بەهیچ شێوەیەک نەبۆتە سەرچاوەیەکی ئایینی بۆ دیاردە جێگیرەکان و سروتە هەمیشەییەکانی. سیستەمی سروشت سیستەمێکی ڕێک و پێکە، بەڵام ڕێکوپێکی نابێتە مایەی دروستبوونی هەستی بەهێزی ئایینی و مرۆڤی سەرەتایی ئەو توانستە هزرییەی نەبووە بتوانێت بە ئەزموون و تاقیکردنەوە و تێڕامان لە دیاردە ڕێکوپێک و بەردەوامەکانی سروشت بگاو ئایینێک لەو سیستەمە ساردو سڕەی سروشت بدۆزێتەوە. سەرسام بوون و ئەبڵەقبوون بەشتێک نابێتە هۆی دروستبوونی خوداوەند، واتە سەرسوڕمان بەشتێک نابێتە مایەی پیرۆزبوون و پەرستنی ئەم شتە، بۆیە دەبێ مەسەلەی ورووژان و حەپەسان و سەرسامبوون بەشتێک بەتەواوی لە هەست و بیروبۆچوونی ئایینی جودا بکرێتەوە). ئەم فەلسەفە تەوتەمییەی دورکهایم وەک بۆچوونێکی سۆسیۆلۆژی نەک هەر شرۆڤەیەکی وردبینانە و ژیرە بۆ دیاردە ئایینی و هزرییەکانی مرۆڤی کۆن، بەڵکو ڕاڤەیەکی قووڵیشە لەبارەی سەرچاوە بەراییەکانی هزرو لۆژیک، دەڵێ (هزری لۆژیکی بەپێشەوەچوونی هزری ئایینییەوە بەستراوەتەوە، لەلایەکی دیکەوە بەشێوە بەراییەکانی بیرکردنەوەی کۆمەڵایەتییەوە بەستراوەتەوە. ئەم جۆرە بیرکردنەوەیەش لەئایینی یەکەمی تەوتەمییەوە سەرچاوە دەگرێ، چونکە بیرکردنەوەی ئایینی، بیرکردنەوەیەکی بەکۆمەڵە- کۆلاکتیڤە- و دەربڕی ڕاستییە کۆلاکتیڤەکانە، هەروەها سرووتەکانیشی وەک چەند شێوازێک بۆ پەیڕەوکردنی ئایین، تەنیا لەئامێزی گرووپە کۆمەڵایەتییە کۆلاکتیڤەکاندا دێنە کایەوە، مەبەستیش لەم سرووتانە ورووژاندنی یاخود هێشتنەوە و بونیاتنانی هەندێ دۆخی ئاوەزیی تایبەتی پەیوەست بەم گرووپانە بووە).

ئەگەر بیرکردنەوەی ئایینی- هەروەک دورکهایم دەڵێ- سەرچاوەکەی بیروبۆچوون و بیرکردنەوەی کۆلاکتیڤی ئایینی بووە، ئەوا جگە لە ناوەرۆکە ئایینیەکەی، ناوەرۆکی زمانەوانیشی هەبووە، چونکە مرۆڤی کۆمەڵایەتی بیرکردنەوەکەی لەنێو ئەو بیروبۆچوونانەدا سازش دەبێ (بەتایبەتی ئەو بیروبۆچوونانە) کە لەدواییدا دەبن بەزمان وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی). واتە ئاخاوتن و وشەکان ئەوانەی دیدوبۆچوون و جۆری بیرکردنەوەکان نەخش دەکەن تاکە کەسێک نەیخوڵقاندوون، بەڵکو کۆمەڵگە سازی داون، چونکە (وشەکانی زمان وەک کۆمەڵگە، کۆلاتیڤ و نەگۆڕ و نەمرن). دورکهایم نەک هەر دروستبوونی زمان، بەڵکو بیرۆکە لۆژیکییەکانیش بەچەمکی تەوتەمیزمەوە دەبەستێتەوە، بۆ نموونە سەبارەت بە بیرۆکەی ناکۆکبوون کە بابەتێکی گرنگ و سەرەکییە لەبواری لۆژیکیدا،

دەڵێ (ئەم بیرۆکەیە ئیجتهادێکی ئاوەزی تاکە مرۆڤێک نییەو نەبووە، بەڵکو مۆرکێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی هەیە و بنەچەی ئەم بیرۆکەیە بۆ جیاوازی ئایینی هۆزەکان دەگەڕێتەوە لەنێوان شتی موقەددەس) و شتی ناموقەددەس، لە ژێر ڕۆشنایی ئەم جیاوازیکردنە ئایینییە لەنێوان شتی موقەددەس و ناموقەددەس مرۆڤی سەرەتایی توانی ڕاست و چەوت لێک جودابکاتەوە و ناکۆکی نێوانیان بزانێ). تەنانەت دورکهایم بیرۆکەی ناسنامەشی بەپاشخانە کۆمەڵایەتییەکەوە بەستەوە. واتای (ناسنامە)ی بۆ بیرۆکەی کەسایەتی گەڕاندەوە: (لەژیانی تەوتەمیدا، مرۆڤ خۆی ناناسێتەوە و خۆی فەنا دەکات و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ تەوتەمەکەی نامێنێت و دەبن بەیەک شت، بڕوا بەخۆی دێنێ کە خۆی و تەوتەمەکەی یەک شتن و هەمان کەسایەتی و ناسنامە و چییەتیان هەیە. ئەم پۆلینکردنەی تەوتەم بۆتە هۆی دابەشبوونی خەڵک بەسەر هۆزو خێڵ و تیرەو عەشیرەتەکان، هەرچەندە ئەسڵی مەسەلەکە بەپێچەوانە بووە: ئاوەزی کۆلاکتیڤی خەڵکی سەرەتایی یاخود ئاوەزە کۆلاکتیڤە کۆمەڵایەتییەکەی مرۆڤی کۆن تەوتەمی خولقاندووە و پەرستوێتی و خۆی و ناسنامە و عەشیرەت و چییەتی و تەنانەت ڕەگەزەکەشی پێ خولقاندووە. لە لێکۆڵینەوەی ژیانی خێڵەکی لە ئوسترالیای کۆندا، گەیشتە ئەم ئەنجامە، کە پێوەندییە لۆژیکییەکان یاخود ڕەچەڵەکی کۆنی پێوەندییە لۆژیکییەکانی مرۆڤی کۆن بۆ پێوەندییە خزمایەتییەکانی ئەو سەردەمە دەگەڕێتەوە (ئەوشتانەی کە وەک یەک بوونە یاخود یەک جۆرە بوونە، لای مرۆڤی کۆنی ئوسترالی وەک پێوەندی خزمایەتی لەنێوان تاکەکانی یەک عەشیرەت یاخود یەک گرووپی کۆمەڵایەتی خۆی نواندووە، بەم جۆرە ئەم مرۆڤە وای زانیوە کە ئەم شتە وەک یەکانە خزمن- لە یەک بەرەبابن و خوێن و گۆشتیان تێکەڵە و یەک خێزانن، کەواتە پێوەندییە لۆژیکییەکان لای بۆتە پێوەندییە خزمایەتی و خێزانییەکان: سیستەمی خزمایەتی تەوتەمی سروشتی پێوەندی خێزانی و سۆسیۆلۆژی سازداوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە چوارچێوە لۆژیکییەکان تەواو هاوشێوەی چوارچێوە کۆمەڵایەتییەکان بوونە، هەرچەندە چوارچێوەی دووەم زۆر لەهی یەکەم کۆنتر بووە). دورکهایم لەژێر ڕۆشنایی تیۆری تەوتەمییەکەی هەوڵی دا سۆسیۆلۆژیا شوێنی میتافیزیک بگرێتەوە لە چارەسەرکردنی کێشە لۆژیکییەکان و سەرچاوەی کۆمەڵایەتی بۆ گوتراوە فەلسەفییەکان بدۆزێتەوە.

**سەرچاوە:**

**محاضرات في علم الاجتماع: أ. دوركهايم.**

# جلوبەرگی کوردی لە مێژوودا

**عەباس سلێمان سمایل**



## دەستپێک

جلوبەرگ سەردرای پاراستنی مرۆڤ لە گەرماو سەرما، رۆڵێکی گرنگیشی لە بەهێزکردنی کەسایەتی مرۆڤ و پەیداکردنی رێزو حورمەت لەنێو کۆمەڵدا هەیە، ئیتر جلوبەرگ لەزۆر کۆنەوە بایەخی هەبووەو هەمیشە دەستە جلوبەرگ دەکرایە دیاری لە پاشاو دەرەبەگانەوە بۆ کاسبکاران و هەروەها لەبرادەرێکەوە بۆ برادەرێکی دیکە، مەلاش دوای ئەوەی مۆڵەتی مەلایەتی وەردەگرت، دەستەجلی پێ دەدرا لەلایەن شێخەکەی، یا مامۆستاکەی، جلی سەپان و رێنجبەرو شوانانیش لەسەر خاوەن ماڵ بووە.

ئەمرۆکەش جلوبەرگ رۆڵێکی گرنگی هەیە لە ناساندنی گەلان بەجیهان و بەهێزکردنی هەستی نەتەوایەتی، چونکە جلوبەرگ دیارترین نیشانەی فەرهەنگ و گرنگترین دیاردەی نەتەوایەتی و خێراترین شێوازی نیشاندانی فەرهەنگە کەواتە ئەم کولتوورە راسپاردەو ئەمانەتە لە گرنگ پێدان و زیندوو راگرتنی، بۆیە پێویستە فەرامۆش نەکرێت و هەر هیچ نەبێت جار جارە بەتاییەتی لە ئاهەنگی جەژن و پرسەو سەیران و گەشتوگوزاردا لەبەر بکرێت.

کۆمەڵگای سەرەتایی بەهۆی بیرکردنەوە لە پەیداکردنی خواردن و خۆپاراستنی لە گیاندارانی درندە زۆربیریان لەجلوبەرگ نەکردۆتەوە، هەر کاتێک ئاژەڵێکیان راو بکردبا، کەوڵەکەیان لەبەر دەکرد، هەمیشە جلی پاڵەوانانیشی کەوڵی ئاژەڵی درندە بووە وەک شێرو پڵنگ، دواتر کەوڵەکەیان دەغاراندو رێکیان دەخست و دەیاندووری.

قۆناغی دوورینی جلوبەرگیش بۆ دەوروبەری چوار هەزار ساڵ بەر لەزایینی دەگەرێتەوە، بەڵگەش بۆ ئەمە دۆزینەوەی دەرزی لەهێسک دروست کراوە کە لەگوندی چەرمۆی نزیک چەمچەماڵ دۆزراوەتەوە، دیارە ئەوکاتی کەوڵەکانیان بەدوورایی لەبەرکردووە، ئیتر گەلانی کۆنی کوردستان خاوەن شارستانیەتێک بووینەو کە چوونەتە میسۆبۆتامیاو خوزستان ئەم شارستانیەتەیان لەگەڵ خۆ

گواستۆتەوە، بۆ نموونە جلی سۆمەریەکان هەمان جلی وڵاتی سوبارتوو بووە، کە بریتی بووە لە کەوڵە ئاژەڵێک تا چۆکیان هاتووە و جلی ئافرەتانیشیان هەمان کەوڵ بووە، بەڵام شۆڕتر بووەو سینگ و بەرۆکیشی زیاتر داپۆشیوە و بەردەوامیش ئەم جلوبەرگە لەپێشکەوتن دابووەو جلی پیاوانی ئایینی و پاشاکان نەخش و نیگاریشی لێ کراوە، بۆ نموونە جەمەدانی نەخشی گەورە لە شێوەی تۆری ماسی گرتن، هەروەکو جەمەدانی ئەمڕۆ بەسووفی ڕەش دەنەخشێنراو، جەمەدانی ئەمڕۆش درێژە پێدراوی جەمەدانی (ئاشماخ)ی سۆمەریەکانەو لەزمانی عەرەبی ئەمڕۆش بووەتە یەشماغ، هەروەها سۆمەریەکان لەبەهارو پایز جلی ڕەنگاو ڕەنگیان لەبەردەکردو لەوشکە ساڵیش بەتایبەتی لەهاوینان جلی ڕەشیان لەبەردەکرد، پیاوە ئایینیەکانیش زیاتر جلی سپیان لەبەر دەکرد، دوورنیە جلی سپی ئەمڕۆی پیاوانی ئایینی ئێزدی و ئیسلام و ژنانی ئێزدی ڕەنگدانەوەی جلی سپی ئایینی سۆمەری بێت.

## کەڤناری جلوبەرگی کورد

گەلی کورد بەهۆی کەڤناری لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەکولتورو فۆلکلۆرو ئەنتۆگرافی گەلێک دەوڵەمەندە، لێ بەهۆی نەبوونی کیانی ڕامیاری زۆری لێ دزراوەو لە قالبی گەلانی دیکە بەتایبەتی گەلانی داگیرکار دارێژراوە، چۆن گەلی ئەکەدی هاتە سەر حازرەکی لەڕووخاندنی دەوڵەتی سۆمەری، چی هەبوو لە کولتوورە فۆلکلۆر، ئەنتۆگرافی هەمووی تواندەوە لەقالبی ڕەگەزی ئەکەدی. گەلانی فارس و تورک و عەرەبیش بە هەمان شێوە کولتووری زۆری ئەم گەلە ستەمدیدەیان هەڵلووشی.

فۆلکلۆر مەعنەویە و بریتییە لە شیعرو چیرۆک و داستان و پەندو قسەی نەستەق و،... ئەنتۆگرافی داب و نەریت و ڕێوڕەسم و بوارەکانی ژیانە، بەڵام کولتوور شتی ماددیە وەک نووسین، بەڵگەنامەو شتی لەبەردو دارو قوڕ دروستکراو، کەواتە جلوبەرگیش بە بەشێک لە کولتوور دەژمێردرێت وەک چەکی کۆن، ئامرازەکانی وەک دەستار، جۆنی، دینگ،... کە پێیان دەڵێن کولتووری ماددی. هەڵبەتە کولتووریش راستەوخۆ پەیوەندی بەمێژووەوە هەیە، هەبوونی کولتووری بەهێزیش بەڵگەی پێشکەوتن و کەڤناری گەلە، کولتووری ئەمڕۆی کوردیش درێژە پێدراوی کولتووری گەلانی میسۆپۆتامیاو زاگرۆسە بەتایبەتی سەردەمی میدیەکان، یەک لەوانە جلوبەرگە، هەروەک لە کتێبی (کورش نامە)دا هاتووە کە جلوبەرگی مادەکان بریتی بووە لە شەرواڵێک و کراسێکی شۆڕی ئاودامان، لە هەمان کتێبدا دەڵێت: لەو ڕۆژەی پاشای هەخامەنیشی تاجی پاشایی لەبابل لەسەر نا. جلی مادانی دابەش کردە سەر ئەفسەران، چونکە جلێکی جوان و ڕێک و پێک بووە، کەواتە جلی کوردی هەر لەکۆنەوە شیاوبووە بۆ پێشمەرگایەتی، ئیتر جێگای خۆشحاڵی و شەرەفمەندیە کە سەرکردەی کورد ئەمڕۆ بەجلی کوردییەوە دەبینین لەکۆڕو کۆبوونەوە و سیمینارو پێشوازی گەورە پیاوانی وڵاتان لەسەرەک وەزیران و زاناو بلیمەت و سیاسەتمەداران هەردوو مێژوونووس هیرۆدۆت و سترابۆن دەڵێن: پارسان (فارس) جلوبەرگ و کڵاوی خۆیان لەمادان وەرگرتووە.

بەردە نووسەکان و پەیکەرو کۆتەڵەکان باشترین خزمەتی شوێنەواری جلوبەرگی کەون و دێرین بەرجەستە دەکەن.

هەڵبەتە ئەم شوێنەوارانەش بوونەتە کەرستە بۆ ئەنتۆگرافی لێکۆڵینەوە لەجلوبەرگی کۆنی کوردان. هەر بەهۆی ئەم شوێنەوارانە جلوبەرگی گەلانی کۆنی کوردستان دەخەینەڕوو.

## جلی مادەکان

مادەکان کە باپیرەی کوردانی ئەمڕۆن یەک لەنەتەوە هەرە کۆنەکان و ڕەسەنەکانی ئێرانن، سەرەتا دەوڵەتێکیان بەناوی پێشدادی و دواتر دەوڵەتێکیان بەناو کەیانی و لە ساڵی (٧٠٠ پ.ز) گەورەترین ئیمپراتۆریەتیان بەناوی میدیا دروست کردو لە (٦١٢ پ.ز) بوونەتە بەهێزترین حکومەت لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. دوای ڕووخانیشیان هەخامەنیشیەکان بوونە میراتگری فەرهەنگی ئەم میللەتە، فەردین سادق ئەیوبی بەم جۆرە لەجلی مادەکان دواوە! مادەکان کراسێکی ئاودامانیان لەبەردەکرد، یەخەی کراسەکە خڕو باڵەکانی شۆڕ بوون.

لەژێر ئەم کراسەدا شەرواڵێکی فش لەپێ دەکرا، لەسەرەوە بەرەو خوار، کەم کەمە تەنگ دەبوو، شەرواڵەکە بەدۆخین کۆدەکرایەوە و توندوتۆڵ دەکرا.

کڵاوێک کە ئەم نەتەوەیە لەسەریان دەنا، پتر لە لباد دروست دەکراو خڕبوو. کڵاوەکە لەگەڵ کڵاوی هەخامەنیشیەکان بەراورد دەکرێ و قەراخی بەشی سەرەوەی قیتە و بەرەو پشتەوە چەماوەتەوە، لە هەردوو لاوە دوو کۆتی شۆڕی هەیە، کە لەژێر چناگەدا بەیەک دەگەنەوە و بەشێکی پشتی ملی دادپۆشێ.

دوای گرتنی نەینەوا لە ساڵی (٦١٢ پ.ز) ڕواڵەت

سازی ئاشوریەکان لەگەڵ شارستانیەتەکەیان خزایە ناومالەکان و لەناویاندا رەواجی سەند، لەم روانگەیەوە هێندێ ئالوگۆڕ لەشێوەی جلوبەرگیان بەدی هات. بە چەشنێک جلوبەرگی دەرباری ئاشوریەکان لەنێو پیاوانی گەورەی هۆز باوبووە، لەم سەردەمانەدا (کەوا) جۆرە پێچێکی نەرمی پێ دراو درێژتر کرا تا گۆزینگ و پێ و باڵەکانی پان و پۆڕ کراو توند دەبەسترا، هەڵبەت جەنگاوەرانی ماد هەمان جلوبەرگی سادەی پێشوویان لەبەر دەکرد. دەربارەی پێلاویش، مادەکان دوو جۆر پێلاویان لەپێ دەکرد یەکێکیان پۆزەوانەدار بوو کە دانیشتووانی شاخەکان لەپێیان دەکردو کۆنتر بوو لەوی دیکە، جۆری دووەمیش هەروەک لەتەختی جمشید هەڵکەنراوە، تایبەت بووە بەو مادانەی کە لەپێدەشتەکان ژیاون.

## جلوبەرگی ئەشکانییەکان

جلوبەرگی ئەم گەلە هەر بەهەمان شێوەی جلوبەرگی مادەکانە، بە کەمێک گۆڕانەوە، کراسێک کە ئەشکانیەکان لەبەریان دەکرد تا سەر ئەژنۆ شۆڕ بوو، یەقەیەکی خڕی هەبوو و لەپێشەوە کراوە بوو، قۆڵەکانی شۆڕو زیادەی سەری قۆڵەکان پەنجەکانی دادپۆشی، کراسەکەی لەکەمەر بەرەو خوار لە هەردوولا لۆچی ستوونی هەبوو و لە ئاستی کەمەردا پشتێنێکیان لەسەردەبەست.

شەرواڵی ئەشکانیەکان جیاوازیەکی بنەڕەتی لەتەک شەرواڵی مادەکان هەبوو، دەرپێیەک کە ئەم نەتەوە لەپێیان دەکرد فش بوو و لۆچی هەبوو، لەسەرووی کراسەکە شتێکی وەک سوخمە ئاسا شۆڕیان لەبەر دەکرد، کە هێڵ هێڵ بوو و بەشێمانەی زۆر لەلباد دروست دەکرا، ئەم سوخمەیە بەشێوەی ڕاست و چەپ دەکەوتنە سەریەک و بەپشتێنێک پتەو دەکران.

لەو ئاسەوارە بەجێ ماوانەی کوردستان کە پێوەندی بەم قۆناغەوە هەیە، دەتوانین ئاماژە بە ئاسەوارێک لە بێستوون و ئاسەوارێک لە سەرپێلی زەهاو بکەین.

ئاساوارەکەی بێستوون وێنەی ئەمیرێکی (پارتی)یە کە لە تەنیشت ئاورگەیەک خەریکی ڕازو نیازە.

لە ئاسەوارەکەی سەرپێلی زەهاو، پاشایەکی پارت بەسەر ئەسپەوەیە لەکاتێکدا یەکێک لەنۆکەرەکانی گوڵێکی پێشکەش دەکات، شا کلاوێکی بەسەرەوەیە کە گۆشە شۆڕەکانی کەوتوونەتە سەر شانی و جلوبەرگێکی تەسکی لەبەردایە و دەرپێیەکەی تارادەیەک فشەو چەکمەکانی داپۆشیوە.



## جلوبەرگی ساسانیەکان

لەهێندێ ئاسەواری جێماو لەسەردەمی ساسانیەکاندا شێوەی جلوبەرگیان بەباشی دەردەکەوێ، لەو ئاسەوارانە ئەنجومەنی تاجگوزاری ئەردەشێری دووەمە، ئەم ئاسەوارە لەشاری کرماشان و لە (تاق وەسان) هەڵکەوتووە.

لەم وێنەدا سێ کەس وەستاون و دیلێک لەژێر پێی شادا لەسەر گازی پشت کەوتووە، شا لەنێوە ڕاستدایە و لەلای ڕاستی (ئورمزد) جێگیرە کە تاجێکی قەبەداری بەسەرەوەیەو ڕووی بەرەو شا وەرگێڕاوە، ئاڵقەی پاشایەتی کە شیریتی پێوەیە و تایبەتە بە بنەماڵەی ساسانیەکان پێشکەشی ئەردەشێری دەکات، ئەو کەوایانەی لەبەر شاو (ئورمزد)دایە تا سەر ئەژنۆ شۆڕن، دامەنی کەواکەی شا خڕە.

هەردووکیان شەرواڵیان لەپێ دایە، کە لەناوڕاستەوە

لۆچی هەیە و بەهۆی پەتێک بەگۆزینگی پێوە توندکراون. لەپشتی سەری شادا ژنە خواوەندێک وەستاوە کە جلوبەرگەکەی لەشێوەی جلوبەرگی (ئۆرمزد) دەچێ و بەم لاو ئەولای سەری ڕووناکی تیشکی داوەتەوە، شێوەی دامەنی کەوای (ئەهورامەزدا) دەچێتەوە سەر شێوەی ئەشکانیەکان، هەڵبەت لەم کراسەدا سەرباری لۆچە ستوونیەکانی هەردوولاو ناوەڕاست، شیمانەی هەیە لە پشتەوەش لۆچی هەیە، کەواتە شەرواڵی ساسانیەکانیش لۆچی هەیە و فشە، بەڵام لۆچەکانی لەگەڵ لۆچی شەرواڵی پارتیەکان جیاوازیەکی تایبەتی هەیە، لەوێدا کەمەری شەرواڵەکان بەپێی کەم و زیادبوونی لۆچی شەرواڵەکان تا دوا ڕادە سێ مەتر هەڵدەبژێردرا، ئیتر بەم شێوە بەڵگەنامەکان بۆمان ڕوون دەکەنەوە کە جلی ساساسانیەکان هەمان جلی ئەشکانی و میدیەکانە بەگۆڕانێکی کەم بەردەوامیش لەگۆڕاندا بووە و جلی هەر ناوچەیەکیش کەمێک جیاوازی هەبووە لەگەڵ ناوچەیەکی دیکە.

ئیتر لەشێوەی جۆری جلوبەرگی گەلانی کۆنی کوردستانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە جلوبەرگی ئەمڕۆی گەلی کورد لە جلوبەرگی گەلانی کۆنی کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووەو بەردەوام ڕێکتر بووە، واتە جلوبەرگی ئەمڕۆی کورد پێوەندی بە شارستانیەتی گەلانی کۆنی هیندو ئێرانەوە هەیە و زۆر نزیکیشە لە جلوبەرگی هەندێک لەگەلانی ئێران و ئەفغانستان و قەفقاس و ئەوروپای ڕۆژئاوا وەک بولغارو ئەلبان.

بەڕێز مەجید عارف لەو بڕوایەدایە دەستووری دێرینی ئایینی ئیسلام لەجلوبەرگ، لە کولتووری کوردیەوە هاتبێ، چونکە جاران عەرەب بەهۆی گەرمی خاکەکەی پێویستی بەجلوبەرگی پۆشتە نەبووە، تەنیا کراسێکی شۆڕی لەبەرکردووە بەبێ دەرپێ و سەرپۆش، هەربۆیە تاکو ئەمڕۆ عارەب لەناو کوردان بەو شێوەیە ناسراون، تا ساڵانی بەر لە ڕاپەڕینیش ژمارەیەکی زۆری ئەو عارەبانەی کە حکومەت لەکوردستان جێواری کردبوون، بەبێ دەرپێ بوون، کەوابێ جلی عەرەب جیابووە لەجلی کورد، بەڵام بەهۆی تێکەڵبوون بەتایبەتی تێکەڵبوونی ئەو عارەبانەی کە لە کوردستان نیشتەجێ دەکران، بەهۆی ساردی ناوچەکە بەناچاری پەنایان بۆ دەرپێ و جەمەدانی و فەروەو کەوش و گۆرەوی دەبرد ئافرەتەکانیش پەنایان بۆ کەوێ و بن کەوێ و سەرپۆش و هەوری دەبرد، جاران لەدەشتی قەراج ئافرەتانی کورد کەوێ و بن کەوێیان لەبەر دەکرد، بەڵام ئەو عارەبانەی بەفەرمانی مستەفا عومەری پارێزگاری موسڵ لەدوای ساڵی (١٩٢٤) لە قەراج نیشتەجێ کران، ئافرەتەکانیان تەنیا کراسێکیان لەبەر بوو، جارێکیان عارەبێکی گوندی خەندەکی قەراج کەوێیەک بۆ ژنەکەی دەکڕێت و ژنەکەشی لەبەری ناکات و دەڵێت من دەستووری کوردان لەبەرناکەم، کابراش دەیوت ئێرە ساردە لە بەریکە نەوەک سەرمات دەبێت. ئیتر بەم جۆرە جلی کورد کاری کردە سەر عەرەبی وڵاتانی شام و میسرو یەمەن و تورکی تورکیای ئەمڕۆ.

## جۆرەکانی جلوبەرگ

دوای ئەوەی کۆمەڵگای میللەتی کورد بەرەو قۆناخی کشتوکاڵی دەگوڕێت و سەرەک هۆزەکانی دیوەخان دروست دەکەن و هاتوچۆیان کەمتر دەبێتەوە بەهۆی ئەوەی لەدیوەخانەکەی سەرپەرشتی هۆزەکەی دەکات و بەردەوامیش خواردن و کەلوپەلی ناوماڵی بۆ دێت، بۆیە پێویستی بەجلی کورت و تەسک نییە شەرواڵی پانتر لەبەر دەکات و لەناوچە دەشتاییەکانیش سەرەک هۆزەکان و میرەکان کەواو سەڵتە لەبەردەکەن، واتە لەم قۆناغە جلی میرو دەرەبەگان بەتەواوی جیابووە لەجلی ڕێنجبەرەکان زۆرجاریش ئەگەر میر بچووبایەتە ڕاو و شکار، ئەوا جلی ڕێنجبەری لەبەردەکرد، کەواتە کورتەک و شەرواڵی دەلینگ تەسک کۆنترە لەشاڵ و شەپک، یا لە شەرواڵ دەلینگ فرەوان و کەوێ و سەڵتە، هەندێکیش وای بۆ دەچن دوای ئەوەی شاری نەینەوا لەلایەن میدیەکانەوە ڕزگار دەکرێت، کەوێ و سەڵتە و جلی شۆڕ لەمیرانی ئاشوریەکان تێکەڵ بەمیرانی کورد دەبێت، کڵاوی کوردیش جاران لە لباد دروست دەکرا، بەڵام دواتر لەقۆناغی کشتوکاڵی، میرو دەرەبەگەکان کڵاوی چنراویان لەسەر دەکرد هەندێک لەسوڵتانەکانی عوسمانیش هەمان کڵاوی میرانی کوردیان لەسەر دەنا، نموونەش بۆ ئەمە جلوبەرگ و سەرکڵاوی (محەمەد فاتح)ە کە هەمان جلی کورد بوو. ئیتر هەردوو جۆری جلی کورد (کورتەک و شەرواڵ)ی ڕێنجبەران و (شاڵ و شەپک و کەوێ و سەڵتە)ی میرو دەرەبەگان، بەرەو پێش دەچوو و ڕێکتر دەبوو، بۆ نموونە جاران کورتەک بەشاقەڵ بوو و تا ئەژنۆ شۆڕ بوو، خوری تێدەکرا، دواتر لۆکەو پشتێندێکی گرێچن لەسەری دەبەسترا و تەنیا کڵاوێکی لبادیشیان لەسەری دەکرد، دواتر کڵاوەکە گۆڕانی بەسەرداهات لەجیاتی یەک پارچەیی، دەچندرا، یا لەخوری حوشتر دروست دەکرا، لەدوای ساڵانی بیستەکان لەخامەک دروست دەکراو بەسیم و ئارمووش مێرابەکەی دەنەخشێنرا.



کورتەک و شەروالیش گۆڕانی بەسەرداهات، کورتەک تەنیا لە قوماش دروست دەکراو قۆپچەی تێدێخراو لەجاران کورتتر بوو و دەخرایە ناو شەروالەوە زۆر جۆرە کورتەک و شەروال سەری هەلدا وەک ستارخانی، مورادخانی، دەڵێن مورادخانی لەسەردەمی مورادی چواردەمی، سولتانی عوسمانی سەری هەلداوە، بۆیە بەم ناوە ناسراوە، ستارخانیش هەر جۆرێکی مورادخانییە. جلی میرو دەرەبەگەکانیش بەردەوام لەکری باش و نایاب دروست دەکراو بە ئارمووش دەنەخشێنراو کلاوەکەشی دەنەخشێنراو (مشکی)یشی لێ دەئالاند، جارانیش تەنیا کلاو لەسەردەکرا، کاتێک دەبوو بەشەڕ هەربابوو پشدێنەکەی کە بە جەمەدانی ناسرابوو، لەسەری دەپێچا بۆ ئەوەی کلاوەکەی لەشەڕ نەکەوێتە خوارەوە و سەریشی لەشکان بپارێزێ. جلی پیاوانی ئایینیش جلی شۆڕ بوودو سەرپێچیشیان مشکی، یا جەمەدانی بوو بەم دواییەش بەچەفیەی سپی یا عەمامە گۆڕا. زۆر لە پیاوانی ئایینی و ئاغاکان ئێلەگیشیان لەبەردەکرد، میرەکان و کێخواو مەلا و بەتەمەنەکان فەقیانەیان دەبەست، هەروەها ئافرەتانیش دەڵێن ئەم فەقیانە بەم دواییە بەکاریگەری ئایینی ئیسلام خزیوەتە نێو پۆشاکی کوردییەوە.

### بەشەکانی جلی کوردی

١- جل
٢- یاریدەدەری جل
٣- خشل

**بەناوبانگترین جۆرەکانی جلی پیاوانی کوردی بریتییە لە:**

١- کورتەک و شەرواڵ و ڕانک و چۆغە، ئەمەش جۆرەکەی لەناوچەیەک بۆ ناوچەیەکی دیکە دەگۆڕێ بۆ نموونە: شێوەی مورادخانی، ستارخانی، هەورامی، دزەییاتی،...

٢- شاڵ و شەپکی ئاکرەیی، شاڵ و شەپکی شێخانی، شاڵ و شەپکی زاخۆیی و هەکاری و جزیری و تیاری.

٣- ئێلەگ و شەروالی جزیرەو بۆتان، ئاڤرینی، ئورفەیی، دیلۆکی، قارسی، دیاربەکری، زازایی،...

٤- شەرواڵ و ئێلەگی لوری، بەختیاری، مەمسانی، کیوەگلو.

**بەناوبانگترین جۆرەکانی جلی ئافرەتانی کوردی بریتییە لە:**

١- کراسی بە ئەنگوچک و ئێلەگ و کەواو بن کەوای سۆرانی.

٢- کراس و پشبێندو کۆلوانەی موکریان.

### جلوبەرگی پیاوانی بادینان

١- پەشمەو بەرگوز، یا شاڵ و شەپک. جاران دەوڵەمەندەکان لەبەریان دەکرد بەهۆی گرانبەهایی، چونکە ئەم جلوبەرگە لەمووی بزنە مەرەز دروست کراوەو چەند باریکیش برێسرێ بەنرخترە، دەڵێن لەزۆر کۆنەوە کوردانی ئێزدی، میهرپەرست، ڕۆژ پەرست، زەردەشتی، جوولەکە دروستیان کردووە و دوای ئەوەی بەشێکی زۆری جوولەکەی کوردستان دەبن بەمەسیحی، ئیتر بەردەوام دەبن لەسەر ئەم کارەیان. دوای ئەوەی کارگەی میری لەجیاتی (کر) قوماشی تایبەت بەم شاڵ و شەپکەی دروست کرد، نرخی ئەم جۆرەیان هەرزان بووەو هەموو کەسێک دەیتوانی پەشمەو بەرگوز لەبەر بکات، هەڵبەتە جاران میرەکان و دەوڵەمەندەکان دەشیان نەخشاند بە ئاوریشم، پشتێنی ئافرەتان و پیاوان هەر بەخۆیان لە ئاوریشم دروستیان دەکرد. لە هەندێک لەناوچەکانی

کوردستانی باکوور لە هەمان ئاوریشم سەرپێچیشیان دروست دەکرد، بەڵام دوای ئەوەی قوماش هەرزان بوو، بەزۆری خەڵک قوماش دەکەن بەپشتێن بەهۆی هەرزانی.
(کەرک)یش کە کارگەچی دروستی دەکرد، لەوەرزی سەرما لەبەردەکرا.
سەرپێچیش لە ئاوریشم دروست دەکرا، یا مشکی بوو دواتر جەمەدانی جێگای گرتەوە. کڵاویش جاران لبادو دواتر لەخوری ڕەنگاو ڕەنگ دروست دەکراو فەقیانەش ڕۆڵی هەبوو لەپۆشین. کەوشیش زیاتر کڵاش بوو لە لوڕستان (گێوە)یان پێ دەوت.
جلی کوردی دەشتاییەکانی جزیرەو بۆتان و ئورفەو کوردستانی سووریا، جلی پیاوانیان شەرواڵەکەی ناوپستێری شۆڕەو پێچەوانەی ناوچەکانی سەرووترە، ئێلەگ لەبەردەکەن، سەرپۆشیشی جەمەدانییە، جارانیش کەوایەک لەسەر ئێلەگەکە لەبەر دەکراو ئەمرۆکەش زستانان فەروە لەجیاتی کەوا کە لەبەر دەکرێت، ئافرەتەکانیشیان کراسی بە ئەنگوچک و کەوتی بێ قۆڵی سورمەیی نەخشێنراو لەبەردەکەن و سەرپۆشی ئاوریشمی سپی و سۆر لەسەر دەپێچن.

### یاریدەدەرەکانی جلی ئافرەتانی کورد

١- سەرکڵاو، پێچ و کڵاو، هەوری و کڵاو، شەدەو کڵاو، تاسی خۆشناوان، لەچک و سەرپۆش، سەردەو سەروین و کۆچکە، هەوری..
٢- یاریدەدەری جلی پیاوانی کورد:
مێزەری هەجیجی، کڵاوی لبادی ئێزدیانی چیای شنگار، کلێتە، کڵاو و دەسماڵ، فێس و دەسرۆک، کڵاو و جەمەدانی، مشکی،..
٣- پژدێن (پشتێن)، شاڵ بۆ ئافرەتان.
٤- کۆڵوانە (سەرشانی، چارۆگە، چارۆگ) بۆ ئافرەتان.
٥- بەرهەڵبێنەو بووزەڵە بۆ ئافرەتان.
٦- پووزەوانە (زەنگاڵ) بۆ پیاوان.
٧- گۆرەوی (گۆراو،گۆری) بۆ ژنان و ئافرەتان.
٨- فەرەنجی (فەرەجی، کوڵەباڵ) و پەستەک و کەپەنک، قاپووت.
٩- کڵاش، کاڵەو خامینە، کەوش چەکمە، کڵاشی هەرسبینی.
خشڵی کوردی: ئەمەش زۆرتر جلی ژنانە دەگرێتەوە بەناوبانگترین خشڵی ژنانە بریتییە لە: گێلگێلە، گوڵەنگ، پوولەکە، لاگیرە، دەرزی، کۆترۆکە، لاسەرە، ژێرچەنە، لووتەوانە و خەزێم، گوارە، ملوانکە، نووشتووی باڵاژن، بازن، پاموورە، ئەنگوستیلە، تاکەتارانی و قەران و ئەشرەفی لیرە.

### جلی دانیشتووانی دەشتی هەولێر

جلی پیاوان: دوای ئەوەی کوڕان تەمەنی (٧ - ٨)ساڵی تەواو دەکەن، کراسی ئاوداماں لەبەر دەکەنەوە و کورتەک و شەرواڵیان پێ لەبەر دەکەن و دوای ئەوەی تەمەنیان دەگاتە (١٠ - ١٢) ساڵان پشتێن دەبەستن و لەتەمەنی (٢٥) ساڵی بەسەرەوە کڵاو و جەمەدانی لەسەری دەکەن، جا جلی پیاوانی ئەم دەشتە زۆر نزیکە لەجلی پیاوانی موکریان تەنیا ئەوە نەبێ دەشتی هەولێر جەمەدانی لەجیاتی چەفیەی چیتی موکریانی لەسەر دەکەن، هەروەها مشکی و کەوێ و سەڵتەش کاریگەری جلی ئوستانی کەرکوکە لەسەر ناوچەکە.
زیاتریش دەوڵەمەندان و ئاغاو کوێخواکان مشکییان لەسەر دەناو کەوێ و سەڵتەیان لەبەردەکرد، سەڵتەش بەم دواییە بەرەو چاکێتی ئەوروپی گۆڕا.
دانیشتووانە هەژارەکەش شەرواڵێکی لەپێ دەکردو کورتەکێکی بەشاقەڵی پڕ لە لۆکەی لەبەردەکردو بەسەر شەرواڵەکەیدا شۆڕی دەکردەوە و لای چەپی دەخستە سەر لای ڕاستی و ئینجا پشتێنی زۆر بەتوندی لەسەر دەبەستا هەتا کورتەکەکە درەنەیێت، چونکە قۆپچەی پێوە نەبوو، زستانانیش پیاو ماقووڵان فەروەیان لەبەر دەکردو کرمانجەکانیش کەرک و ئەوانەی لەبەرمەری بوون قاپووتیان لەبەر دەکرد. لەدوای دروستبوونی وڵاتی عێراق و دوای ئەوەی شا فەیسەڵی یەکەم ژمارەیەک لە عەبای عارەبی دابەشی سەر ئاغاو شێخەکانی کوردستان کرد، ئەویش بوو بە مۆدەو تاکو ئەمڕۆش هەندێک لە شێخ و ئاغا و مەلا و دەوڵەمەندان عەبای عارەبی لەبەر دەکەن. پێڵاوەکانیشیان بەخۆیان لەخوری ڕێسراو دەچنی و پێستەشیان دەکردە بنەکەی. بەم دواییەش تایەی ئۆتومبێلیان بەتەنکی هەر دەبری و دەیانکردە بنی کڵاش.
شەوانەش بەدەرپێ و کراس دەخەوتن کە هەردووکی لەتۆلە، یا چاوپان دروست کراوبوون، بێجامەش لەدوای چلەکان و پەنجاکان پەیدابوو بەرەبەرە جێگای دەرپێی گرتەوە.
ئیتر بەگشتی هەبووەکانی دەشتی هەولێر جلی پۆشتەو گرانبەهایان لەبەردەکرد، بەتایبەتی ئاغاکان و کێخوا و شێخ و دەوڵەمەندەکان. کاسبکارانی دەوڵەمەندیش هەمیشە جلی باشیان لەبەر دەکرد، بۆ نموونە حاجی سمایلی باپیرم و قادر سوراحی باوکی بەهۆی کاری قاچاخیانەوە هەبوو بوونەو هەمیشە دوو جۆر دەستە

جلیان هەبووە، جۆرێکیان ڕانک و چۆغەبوو کە بۆکاری بازرگانی بێتورێن و پشدەرو سنەو موکریان لەبەریان دەکردو، کەوێ و سەڵتەشیان لەکاری ساغکردنەوەی کەلوپەلەکانیان لەجزیرەو عەننەو ڕاوە و حەسەکەی سوریا لەبەردەکرد، هەروەها دانیشتووانی گوندی قورشاغلو بەهۆی ئەوەی کوورەی گەچیان هەبووە و خەریکی گەچ فرۆشتن بووینە، هەمیشە دەوڵەمەندو پۆشتەبووینە لەناو هەموو شایی و پرسەیەک دیاربوون. ئیتر دوای ساڵانی هەفتاکان، دەشتی هەولێر بەگشتی دەوڵەمەند دەبن و مەگەر بەدەگمەن هەژار ببینێت، جا خەڵکەکە هەمووی پۆشتە دەبن و کرمانجان جیا ناکەیتەوە لەشێخ و کێخواو ئاغاکان.

## جلی ئافرەتانی دەشتی هەولێر

ئافرەتانی کورد بەهۆی یەکسانیان لەگەڵ پیاوان، جلوبەرگیان هەمیشە ڕێک و پێک بووەو پۆشتە بووینە، بەڵام ئەوانەی کە لەدەشتەکان نیشتەجێ دەبوون، ئافرەتیان بە کەمتر دەهاتە پێش چاو بۆیە ئافرەت بەپلە دوو دادەنراو هەموو شتێکی لەپیاو کەمتر بوو، هەتا لە جلوبەرگیش ستەمی لێ دەکراو زۆربەی ئافرەتانی دەشتاییەکان بێ پێلاوبوون، بەتایبەتی ئافرەتانی دەشتی هەولێر، ئیتر بەشێوەیەکی گشتی ئافرەتانی دەشتی هەولێر جلەکانیان بەخۆیان بەدەرزی و داو دەدووری و تەنیا کورتەکە بەلۆکەکانیان نەبێت، ژنە جوولەکە بۆیان دەدوورین و بەسیم دەیان نەخشاند، جا بە پێویستم زانی بابەتەکەی مامۆستا عەزیزی مەلا ڕەش لەژێر ناوی کورتە باسێکی جلوبەرگی ژنانی دەشتی هەولێر کە لەگۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژ (٢) دایبەزاندبوو، لەبارەی جلی ئافرەتانی، ئەم دەشتە بهێنمە خوارەوە کە بابەتێکی زۆر تێروتەسەلە.

## کورتە باسێکی جلوبەرگی ژنانی دەشتی هەولێر

دەشتی هەولێر ناوچەی قەراج و کەندیناوە و شەمامک و سەنیەو مرکیە و پشتەرێ و بەرڕێ و بەڕانەتی دەگرێتەوە. شمەکی ئافرەتانی ئەو ناوچانە یەک تەرزەو جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە باس بکرێت، ئەویش بەم چەشنەیە.

**یەکەم**: کراس: یەکجار گەورەبوو (١٤) تا (١٦) گەز قوماشی دەویست.

گەز: ئامێرێکی پێوانەیە و لەمەتر گچکەترە.

کراسەکە نزیکەی مەترو نیوێک لەباڵای ئافرەتەکە درێژتربوو، لەلای درێژییەوە لەقەدی دوو «تیرێژ»ی سێگۆشەیی هەڵدەبڕاو پانایییەکەی لەلای سنگی دەکرایەوە و لەگەڵ دامێنی دەیەخرا، لای سنگ تەسک دەبووەوە و دامێنیشی زۆر بەرین.

ئافرەت بۆ ئەوەی پێی هەڵبگیرێت. پشتێنێکی باریک (سەرکەلە)، یان پارچە قوماشێکی باریکی لەپشت دەبەستاو کراسەکەی ئەوەندە لەژێر پشتێنەکە هەڵدەکێشا تا دامێنەکە لەگەڵ پێی ڕێک دەکەوت، دوو قەدە کراسەکەش دەبێ لە ئەژنۆ ڕەت بدات، کە پێی دەگوترا: «باخەڵ» واتە باخەڵ شۆڕە کە ئەو سەردەم زۆر پەسند بوو.

کلکە ئەنگوچک زۆر درێژ بوو و سەرەکانیان بەیەکەوە گرێ دەدراو لەسەر دەستڕۆک ئاوا دەکراو لەپشتەوە بەسەر چارۆگەی مل شۆڕ دەبووەوە.

ئەمەی باسمان کرد، کراسی ئافرەتی گەورەبوو، بۆ کیژی پارچەڵە بێ باخەڵ بوو، هەڵبڕینی کراسی دووەم یەک تیرێژی بوو کە پێی دەگوترا (شەیتان بڕ).

لەشەستەکان بەسەرەوە ئافرەتە گەنجەکانیش کراسی بەباخەڵیان فڕێ دا، ئەمڕۆ تاک و لۆک لای ئەو ژنە بە تەمەنانەی کە خۆیان بەبنەماڵە لەقەڵەم دەدەن ماوە. لەبەر ئەوە کراسەکە قوماشی زۆری دەویست، هەندە ئافرەتیش لەبەر نەبوونی بۆی نەدەلوا چواردە پازدە گەز قوماش بکرێت و پشت و قۆڵی کراسەکەشی کە دەکەونە ژێر کورتەکەوە قوماشێکی کۆنی تێدەبردەوە.

ئەو قوماشەی دەکرایە کراس، بەزۆری قوماشی جورجێت و کودەری و چیت-ی تەنک بوون، ئەگەر ئەستوور بووایە هەڵگرتنی قورس دەبوو.

**دووەم**: بن کراس کە لەبریتی فانیلەی ئەمڕۆ قوماشێکی تەنک و سپی دەکرایە بن کراس، هەندێ جار ڕەنگاو ڕەنگیش دەکرا.

**سێیەم**: کەوێ، ئەوەندە شۆڕ بوو داوێنی دەگەیشتە پاشپانی ئەمەیان دوو جۆر بوو:

أ- کەوای سێ پارچەیی، قوماشەکە دەکرایە سێ پارچە، هەر پارچەیەک دەکرایە ئاتەکێک.

ب- کەوای نۆ پارچەیی، شەش پارچە دەکرایە هەردوو ئاتەکی پێشەوەو سێش ئاتەکی پاشەوە.

**چوارەم**: بن کەوێ (کورتەک) لەبەر ئەوەی ژێر کەوا لەبەردەکرا، بەزۆری پێی دەگوترا بنکەوێ.

قوماشی بەرو پشتی کورتەک یەک بابەت بووەو لۆکەی تێدەکراو بەنەقەڵی شاش دەدوورا، هەردوو ئاتەکی پێشەوە کە لە بەبەرکردندا بەدەرەوە بوون، لەگەڵ سەرقۆڵەکانی قوماشی جوان و ڕەنگاوڕەنگ و نایابی لێدەدراو لێوارەکەشی بە قەیتانی سیم و ئارمووش

دەنەخشێندرا.

**پێنجەم**: سەرکەوێ: لە کورتەک درێژترو لەکەوا کورتتر بوو و دامێنی دەنەخشێندرا، ئەمەش بەزۆری ژنە ناودارەکان لەسەرکەوێ لەبەریان دەکرد.

**شەشەم**: دەسرۆک: بریتیی بوو لەهیزار «هیزار قوماشێکی تایبەت بۆ دەسترۆک دروست کرابوو، چوار قەد لەکڵاوی سەردەپێچرا»، هێندەجار هەوری سرکەییش دەکرایە دەسترۆک، کڵاوەکە لێوار ڕەق و توندو سەریان، هەندێ جار سەری کڵاوەکە دراوی زێڕ، یان زیوی تێدەیەخرا، ئەگەرنا پارچە خامەکی بەسەردا هەڵدەکێشرا، کلکە ئەنگوچکی هیزار بە ئارمووش و سیم چەشنی کەژی بە عەردی دروست دەکراو پێی دەگوترا «لفکە» سەرەکانیشی گوڵینگیان پێوە شۆڕ دەکراوە، گوڵینگی هەوری پێی دەگوترا «سوارە و پیادە» هێندە جار بۆ جوانی لەبریتی سوارەو پیادە «قۆتیاس»ی پێوە دەکرا، قۆتیاس خشڵێکی زیوبوو.

**حەفتەم**: چارۆگ لەسەر شمەکان لەبەر دەکراو جلوبەرگەکانی دیکەی لە پشتەوە دادەپۆشت.

**هەشتەم**: (دەرپێ) لەبەر باری ئەدەبی (ئاوەڵکراس)ی لەجیاتی بەکاردەهات ئەمەش سێ جۆر بوو:

أ- ئاوەڵکراسەکە سەرتاپا لەیەک قوماشی ڕەنگاوڕەنگ دروست دەکرا، ب- دەلینگەکانی تا ئەژنۆ قوماشێکی جوان و ڕەنگاو ڕەنگ، ئەوی دی قوماشێکی سادەو عادی بوو، ج- سەرتاپای چاوپان بوو، یان قوماشێکی سادەی لەخم دراو.

هەندە ئافرەت بەتایبەتی ڕەوەندەکان مەترێک زیاتر لەبەژنی خۆیان دروست دەکرد دەلینگەکانیان هەڵدەوێزنی و خرەدەکردەوە تا لە سەرەوەی گۆزینگ وەک خڵخاڵ ڕادەوەستا.

**نۆیەم**: جەفیەو چەفتە: چەفیە پارچە قوماشێکی سێگۆشەیی بوو ئافرەت لەسەری دەبەستا. چەفتە لەم دواییە پەیدابووە. درێژو گوڵینگدارەو لەبریتی لەسەر دەکرێت.

**دەیەم**: سوخمەو هێلەک: هەردووک شێوەیان یەک بوو، لەسەر کراس لەبەردەکرا، تەنیا سوخمە پێشەوەی قوماشێکی باش و جوان بوو ئەوەی دیکە ئایری، کەچی هێلەک یەک قوماش بوو.

**پەراوێزەکان:**

* جلی گەلی ئەرمەنی میللی نزیکایەتیەکی هەیە لەگەڵ جلی کوردی، چۆغەییێکی خەت خەت لەبەردەکەن، پشتێنەکەشیان سەرێکی تا ئەژنۆ شۆڕ بۆوەتەوە، کەرکەشیان وەکو فەرو وایە، خوریەکەی ڕووی لەدەرەوەیە.

* جلی تیاریەکانیش هەمان شاڵ و شەپکە و زیاتر لە کوردان دەینەخشێنن و کڵاوێکی ڕەشیش لەسەری دەکەن، دوورنییە هەمان کڵاوی هەخامەنشیەکان بێت، کە بەکڵاوی (تیاری) ئەوکاتی دەناسرا، کەوابێ دوور نییە بەهۆی ئەوەی ئەم کڵاوە فارسییەیان لەسەری ناوە بەناوی (تیاری) ناسراون، هەروەها هەموو مەسیحیەکانی کوردستان هەمان جلوبەرگی ناوچەکانی کوردستان لەبەر دەکەن.

تیارییەکان چەند پەڕەمووچەیەکیش لەگەڵ کڵاوەکانیان دەبەستن ئەمەش جاران میرانی کوردو گەلانی ناوچەکە دەیانبەستا.

* جلوبەرگی درزیەکان هەمان جلوبەرگی کوردانی ئوستانی حەلەب و دیلۆک-ە، مێژوونووسان دەڵێن کاتی خۆی درزیەکان لەولاتی ئێران چوونە شام.

* کورتەکی ستارخانی هەمان کورتەکی مورادخانییە، تەنیا جیاوازییەکەی ئەوەیە کە دوو ڕیز قۆپچەی لێدەدرێت.

* کورتەک: دوور نییە ناوی کورتەک لەتەکە تەک (شۆڕبوونەوە) هاتبێت لەبەرئەوەی جاران بەسەر شەرواڵدا شۆڕدەکرایەوە و نەدەخرا ناو شەرواڵ. شەرواڵ: شەرواڵ لەسەرواڵ= سەرواڵا هاتووە، چونکە سەرەکەی واڵایە و بەدۆخین کۆ دەکرێتەوە و دەبەسترێت؛ لەنێو عەرەبدا هەر بە (سروال) ماوەتەوە کەچی لەنێو کوردان بووەتە شەرواڵ.

چەفیە: چەفیە بریتییە لە پارچە چیتێک و دوای ڕیشدارکردنی، ناوچەی موکریان لەجیاتی جەمەدانی و مشکی لەسەری دەکەن، جاران لەدەشتی هەولێر چەفیە زۆر لەسەری دەکرا، بەڵام ئەمڕۆ بەدەگمەنیش نابینی کەسێک چەفیە لەسەری بکات.

دوورنییە چەفیە لەکۆفی هاتبێت، هەرچەندە کۆفی لەدەشتی هەولێر بەکڵاو و جەمەدانی قیت دەگوترێت، دەڵێی کۆفی هێنایتە سەرچاوی یا تیلاکی لێ خوار کردووە واتە شەدەکەی سەری قیت کردووە، یا خواری کردووە، واتە کڵاو و جەمەدانیەکەی کەمێک بۆ لایەکی سەری لارکردۆتەوە. هەندێکیش دەڵێن کۆفی لە وشەی کوفە (شاری کوفە) هاتووە، لەبەر ئەوەی لەسەردەمی

ساسانییەکان تا کۆتایی عەباسیەکان فەیلی نشینی بووە و بەناوبانگ بوو بەدروستکردنی کۆفی.

* جلوبەرگی سۆمەریەکان: سۆمەریەکان لەوەرزی بەهارو زستان جلی ڕەنگاوڕەنگیان لەبەر دەکرد بەهۆی خێرو بەرەکەتی باران و بووژانەوەی زەوی، بەڵام پیاوە ئایینیەکان جلی سپیان لەبەر دەکرد، سەرپۆشەکەشیان هەر سپی بوو، هەندێک لەپیاوانی ئایینی قوماشێکی سپی نەخشێنراو بەداوی ڕەش لەشێوەی تۆڕی ماسی گرتنیان لەبەر کردووە کە واتای خێرو بەرەکەتی گەیاندووە.

* جاران لەدەشتی هەولێر لەهاوینان کراسێکی لەتۆلە دروستکراویان لەبەر دەکرد کە تا سەرچۆک دەهات و لەژێرەوەش دەرپێی سپیان لەپێ دەکرد تاکو ئەمرۆش هەندێک لەپیرە پیاوەکان لەکاتی نووستن، ئەم جلە لەبەردەکەن. لەبادینانیش هەمان جلیان لەبەر دەکرد، بەڵام هەر بەم جلەش دەچوونە ناو ئاوایی و دۆخینەکانیشیان بەسووفی ڕەنگاو ڕەنگ دەنەخشاندو بەریان دەداوە.

مەجید عارف-یش نووسیویەتی و دەڵێ: لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا بەهاوین کراس وەکو سەربەرگ لەبەردەکرا، ئەوساکە کورد (ژێرکراس)ێکی سپی بێ قۆڵیان لەبەر دەکرد. کە ئەمڕۆ لەناوچەی سلێمانی لەبەر دەکرێ و پێی دەگوترێ فانیلە.

* کورتەکی بە کەتافە بەم دواییە لەشۆڕشی ئەیلوول لەنێو پێشمەرگە سەری هەڵدا و دواتر بوو بە مۆدە.

* پشتێن، یا پژدێن، شێتک: پشتێن و جەمەدانی بەگشتی چەند بەرەو ناوچە شاخاوییەکان بڕۆی، گەورەترو قەفی زیاتر دەبێت و جامانە بەخڕو توندی لەسەر دەکرێت زۆرجار دوو جامانە، یا جامەنەیەک و مشکیەک لەسەر دەبەسترێت کەچی لەدەشتەکان یەک جامانی بەخاوی لەسەر دەکەن، لالچکێکی بەسەر رووومەتدا دێتە خوارەوە و لچکێکیش بەپشتەوە داشۆڕ دەکرێتەوە، پشتێنی ناوچە شاخاویەکان بەتایبەتی بادینان بەقەفە، بەڵام لەناوچە دەشتاییەکان بەبێ گرێ، یا قەف پشتێنی لەپشت دەبەستراو کەمێکیش بەشلی، پشتێنی گەورەش سوودی هەیە بۆ سەرماو خۆپاراستن لەشەڕ.

* گۆریە: (گۆرەوی، گۆرە): ژنان لەخوری ڕێسراو بەنەخش دروست دەکەن لە زستانان لەپێ دەکرێت و بەلەک پێچی ئەستووریش لەسەرەوەی گۆریەکە دەبەستێ کە لەزاخۆ پێی دەڵێن (ساق) و لە سلێمانی-یش پێی دەگوترێت «پووزەوانە».

پێڵاو: جاران خەڵک خۆی کڵاشی لە خوری ڕێسراو دروست دەکرد، بەم دواییە تایەی ئوتومبێلیان بۆینەکەی بەکاردەهێنا، دەیانوت پێشتریش پێستەیان دەکرد بنی کڵاش، مەجید عارفیش دەڵێت جاران لەناوچەی سلێمانی جۆرە پێڵاوێ هەبوو هەمووی لەیەک پارچە پێستەی بڕاو دروست دەکراو، قەیتانی قایشی هەبوو، کە لەناوەڕاستی بەلەک قایم دەکرا، کە پێی دەگوترا (کاڵەو پێتاو) ئەمەش تایبەت بوو زیاتر بۆ سەربەفر.

* دەرپێ: (ئاوەڵکراس- هەڤۆل): دەرپێی ئافرەتان بەشی سەرەوەی تۆلەیە و بەشی خوارەوە کوتاڵێکی گرانبەهای ڕەنگاو ڕەنگە. بەشی سەرەوە دەرناکەوێ، بەڵام بەشی خوارەوە کە بەلاستیکێک کۆدەکرێتەوە بەدەردەکەوێت کە پێی دەڵێن دەلینگ.

* کەلەنگوچک (فەقیانە، لەوەندی)، جاران لەسەردەستی کراس دەدووراو لەکاتی نوێژ کردن ئافرەتان دەیانکردەوە، بەڵام پیاوان بەردەوام لە باسکیان لوول دەدا، بەم دواییە [illegible]ەنجان بۆ جوانی کەلەنگوچکیان لەکراس، یا لەکورتەک بەقولابە قایم دەکرد.

* سەڵتە: سەڵتە کەمێک لە سوخمە درێژترە و بەسیم دەنەخشێنرێت ئافرەتانی دەشتی هەولێر وەک ئافرەتانی سلێمانی و کەرکووک لەسەر سوخمە، یا بەبێ سوخمە لەبەری دەکەن.

چارۆگ: چارۆگە بریتییە لە دەسماڵێکی گەورە و لەسەر دەبەسترێت و تا پاشپانی درێژ دەبێتەوە و دوا جلی ئافرەتانە، بەڵام ئەگەر کارێکیان هەبووایە، ئەوا بەرامپیل ڕاست و چۆپ لەسەر چارۆگ لەبەر دەکەن، زۆرجار لچکێکی چارۆگی دەخرێتە سەر بۆ ئەوەی لەگەرمای هاوین ئافرەتان بپارێزێ، لە باژێرانیش ئافرەتان عەبا لەسەر هەموو جلەکانیان لەبەر دەکەن بەم دواییە گوندنشینانیش عەبایان لەبەر دەکرد بەهۆی تێکەڵ بوونیان بە شارەکان، دوای ڕاپەڕینیش جلی عەرەبی فەلەستینی بەناو موحەجەبە، یاحجاب لە ڕێگای حزبە ئیسلامیەکان خزایە نێو ئافرەتانەوە و بووە هۆی بنکۆڵکردنی کولتووری کوردی و سستکردنی هەستی نەتەوایەتی لەنێو ئافرەتان.

* جلوبەرگی منداڵان: دوای ئەوەی منداڵان تەمەنیان لە (٧-٨) ساڵان تێدەپەڕێ، جلوبەرگی گەورانیان لەبەر دەکرد، بەڵام کوران جامانەیان نەدەبەستاو کچانیش بێ سەرپۆش بوون.

* ئەمرۆکەش بەداخەوە خەڵک بەرە بەرە واز لە جلی کوردی دەهێنێت، دەتوانم بڵێم لەنێو شاری سلێمانی ئەوانەی جلی کوردی لەبەر دەکەن لە ٢٠٪ تێپەڕ ناکات

و ئەوانەی لە هەولێرو دهۆکیش جلی کوردی لەبەر دەکەن لە ٥٠ ٪ تێناپەڕێ و ئەوانەی لەکەرکووک و مووسڵ و خانەقین و مەندەلی نیشتەجێن، بەدەگمەن جلی کوردی لەبەر دەکەن سەرەڕای ئەوەی جلی عەرەبی کاری لێ کردوونەو دیزداشەش لەبەر دەکەن.

ژمارەیەکی دەگمەنیش لەدانیشتووانی هەولێر- دهۆک، سلێمانی دیزداشە بۆ خەوتن لەبەر دەکەن، ئەمانەش خاوەن هەستێکی نەتەوایەتی زۆر بێ هێزن و تا ئەمڕۆش وادەزانن. لەسەردەمی دیکتاتۆر دەژین و ئەنفال و کیماباران و کوشتن و بڕینی بەعس هیچ کاری لێ نەکردوون.

* خەرقە: خەرقە جۆرە پۆشاکێکی دەرویشانەیە وەک لەم لاوکەدا ناوی هاتووە: حەجاوان زمزمە- موهراوان کانییە سپییە لیسێ وان خەرقەیە.

* جلوبەرگیش دیارترین نیشانەی فەرهەنگ و گرنگترین دیاردەی نەتەوایەتی و خێراترین شێوازی نیشاندانی فەرهەنگ و جلوبەرگە، هیوادارم هانی کارمەندان و قوتابیان و مامۆستایان بدرێت لەدەوامی ڕەسمی و لە فەرمانگەکان و دەزگاکان و قوتابخانەکان، دەوام بەجلی کوردی بکەن و، ئەم جلوبەرگەش وەک جلی جیهانی ئاسایی بێت لەدەوامکردندا.

**سەرچاوەکان**


١- جە و مەودا و ئەرکێ شوێنەواران د کەلەپورێ کوردی دا ب١-ب٢/ کامەران مەلا خەلیل مشەختی/ گۆڤاری مەتین، ژ(١٢١-١٢٢)/ ٢٠٠٢.

٢- مێژووی جلو بەرگی کوردی/ فەردین سادق ئەیوبی/ و- دەستەی نووسەران/ گۆڤاری ئاوێنە.

٣- جلوبەرگی دەستکردی هەورامانی/ ئا. جەلیل عەباسی/ گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژ(٢)، ٢٠٠١.

٤- کۆمەڵی لادێی کوردستانی هاوچەرخی عێراق بەرامبەر بەنوێبوونەوە/ پرۆفیسۆر دکتۆر لیژەک ژێگیل/ و. لە ئینگلیزییەوە- عەزیز گەردی/ چاپی یەکەم/ ١٩٩١.

٥- فەرهەنگی کلتووری کرماشان/ هەڤرس/ ژ(٢)، ٢٠٠١.

٦- کورتە باسێکی جلوبەرگی ژنانی دەشتی هەولێر/ عەزیزی مەلا ڕەش/ گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر/ ژ(١)، ٢٠٠٠.

٧- الاصول العراقية للشماغ و الكوفية. د. فيصل جواد/ مجلة التراث الشعبي- العدد الرابع- لسنة ٢٠٠٢.

# عەبدولواحید حاجی ئاغا مستەفا

**باکووری**

**(٢ - ٢)**



کاک ساجیدی کوری هونەرمەند فەرمووی: «بەڵێ راستە. جا با من، ئەوەی پێویستە سەبارەت بەژیانی چالاکییەکانی باوکمت بۆ بگێرمەوە.

باوکم، خوای لێخۆش بێ، ناوی (عەبدولواحیدی کوری حاجی ئاغا مستەفای کوری ئاغا محەمەد)ە دایکی ناوی (زێنەبە کچی مەلا مەحموودی حەکیم)ە. باوکم لەشاری (کۆیە) لەساڵی (١٨٩٨ز) لەدایک بووە. (تێبینییەک لەمنەوە: مامۆستا عوسمان شارباژێری، لەنووسینێکیدا، ساڵی (١٨٨٦ز)ی داناوە وەک ساڵی لەدایک بوونی عەبدولواحیدی مۆسیقازان- باکووری).

کاک ساجید، بەردەوام بوو لەگێرانەوەکەو وتی: رەحمەتی باوکم، لەقوتابخانەی سەرەتایی، لەکۆیەی خوێندووە دوای خوێندنی لەسوختەخانەی (مەلا عەلی، باوکی مەلا محەمەدی مزگەوتی (منارە)، هەر لەکۆیە). لەپێش سەفەر بەلگدا (واتا شەری یەکەمی جیهان) بۆ ماودیەک قوتابخانە داخرا. ئینجا لە ساڵی (١٩٠٠ز) دیسان کرایەوە، وەک مامۆستا (رەحمەتی) تایەر ئەحمەد حەویزی، لە کتێبی (مێژووی کۆیە)دا دەری بریوە.

لەبەر ئەوەی باوکم حەزی لەخوێندن بوو، پێوەندی بە (قەشە سوورە)«١» کرد، بۆ خوێندنی زمانی بیانی، وەک (زمانی یۆنانی) لەدوای تەواوکردنی خوێندنی سەرەتایی لە (کۆیە)«٢»دا، ئینجا لەگەڵ (حاجی ئاغا مستەفا)ی باوکی، دەچێتە شاری (مووسڵ) و لەقوتابخانەی ناوەندی لەوێ، دوو ساڵ دەوام دەکات«٣» و لەماڵی دوو برادەری باوکی کە ناویان (حاجی تالیب و حاجی جاسمی نەجەفی) بوون، دەمێنێتەوە. ئەو دوو کەسەش بازرگان بوون و لەگەڵ باپیرم سەفەری ئەستەمبوڵ و تاران و بەغدایان دەکرد، بۆ کاری کرین و فرۆشتن. هەر بۆیە، لەسەفەرێکی باوکی بۆ تورکیا، عەبدولواحیدیش لەگەڵ خۆی دەباو لەوێ دەینێرێتە قوتابخانەی (روشدیەی عەسکەری)، لە ئەستەمبوڵ، خوێندنی سەربازی لەوێ تەواو دەکات و دەبێتە ئەفسەرێکی سوپای عوسمانی(٤) و بەشداری لەجەنگی یەکەمی جیهانی دەکات. تا لەشەرێک لە بەرەی (چەنە قەلعە) بەسەختی بریندار دەبێ و رەوانەی نەخۆشخانەی ئەستەمبوڵ دەکرێ بۆ چارەسەرکردنی. ئیتر لەو نەخۆشخانەیە، وەک وتمان، تیپی مۆسیقا هەبوو. باوکیشم ئەو هەوەسەی هەبوو، بۆیە چاک فێر دەبێ و ئیتر هەر لەناو سوپای عوسمانی

دەمێنێتەوە، تا رووخانی دەوڵەتەکەیان. ئەویش سەرهەڵدەگرێ و بەرەو (سووریا) دەڕوات و لێرەشدا لەسوپای عەرەبی دەبێ بە ئەندام وەک ئەفسەرێکی عێراقی و لەگەڵ هاتنی (مەلیک فەیسەڵی یەکەم) و هەڵبژاردنی وەک (شا) بۆ مەملەکەتی عێراق (لەساڵی ١٩٢١ لە ٢٣ی ئاب- باکووری) ئەویش دێتەوە عێراق و لەفەوجی ئیمام مووسا (الکاظم)- (یەکەم فەوج بوو وەک ناوک (نواة)ی سوپای عێراقی، لە هەمان ساڵ دامەزرا- باکووری)- ئینجا کاک ساجید لەقسەکانی بەردەوام بوو، وتی: لەساڵی (١٩٢٤) باوکم بۆ شاری (پێنجوێن) گوێزرایەوە و ساڵێک لەوێ مایەوە لەگەڵ سوپای عێراقی، دوایی گوێزرایەوە بۆ شاری (سلێمانی) و بەپلەی (ڕەئیس) واتا سێ (نەجمە) لەسەر شانی دەبەستێ، ئەمڕۆ پێی دەڵێن (نەقیب، لە سوپای عێراقی مایەوە.

ڕۆژێک لە گۆڕەپانی مەشقی سەربازی و لەکاتی مەشق کردندا، لەسلێمانی، وا ڕوودەدا کە لەگەڵ لێپرسراوە، ئەفسەرە ئینگلیزەکەی کە لەوێ ئامادەبوو، لەگەڵ (ڕەئیس= نەقیب) عەبدولواحید، مشتومڕێکی توند پەیدا دەبێ، دیارە ئینگلیزەکە ئەمەی پێ ناخۆش دەبێ. چۆن ئەفسەرێکی کورد لەڕوویدا قسەی وا توند بکات و هاوار بکات هەر لەوێ، دەست درێژ دەکات بۆ سەرشانی و هەرسێ ئەستێرەکان لەشانی دەپچڕێنێ و لێی دەکاتە (ڕەسمیات) و دەیگەڕێننەوە بۆ پلەی (نائب ظابط). واتا (جێگری ئەفسەر).

لێرەدا، کەمێک دەرفەت وەردەگرم و بەلێبووردن لە کاک ساجید، بۆ ئیسپاتی ئەم قسەیەش، نموونەی بەڵگەیەکی تر دەهێنمەوە کە ئینگلیزەکان ئەوسا حوکمی عێراقیان دەکرد (لەژێر پەردەوە)، نەک (شا فەیسەڵ) و پیاوانی دەوروبەری خۆی. بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێ کە، ئینگلیزەکان، لەوسەردەمەی ڕابردوودا، هەرچەندە مرۆڤی ئیشکەریان خۆش دەویست و پێشیان دەخست، بەڵام لەسەر شتێکی زۆر کەم، یان هەڵەیەکی کە بەئەنقەستیش نەبووبێ، ئیتر ئەوکەسە هەر سزا دەدرێ و چاوی لێ ناپۆشرێ. جا نموونەکە ئەمەی خوارەوەیە: لەکتێبی (الموسیقی فـي بلاد الرافدين) کە لەدانانی (قانوونژەنی) عێراقی ناسراو (سالم حسين الامير)ەو لەبەغدا لەساڵی (١٩٩٩) چاپ و بڵاوی کردەوە و لەژێر سەردێڕی- الموسيقى العسكرية في العراق- لاپەڕە (٢٠٧)دا، نووسیویەتی: «تعود فكرة انشاء الموسيقى العسكرية في الجيش العراقي الي العام ١٩٢٣... وتم استقدام (س. أ. كلفيلد) وهو نائب ضابط بريطاني (منح) رتبة رئيس اول (راند) للقيام بهذه المهمة. فسافر الى الموصل.. واتصل ببعض المتقاعدين (کەمێک کورتی دەکەمەوە-باکووری)، الموسيقيين... و وجد منهم تجاوبا... و تطوع بعض الاحداث (واتا منداڵ- باکووری)، ليتم تدريبهم، ليكونوا نواة اول جوق موسيقي. ولم يكونوا يعرفون كتابة و قراءة (النوتة الموسيقية الحديثة)، فاستخدم (عبدالواحيد مصطفى)، الذي علم ضباط الصف الاخرين، الآلات الموسيقية النحاسية و الهوائية. وجرى التدريب مدة (٦) أشهر (شهور نووسراوە- باکووری)، تم خلالها وضع (السلام الملكي و سلام الامراء- وهو مقدمة مارش في المدفعية البريطانية، كما ذكر العقيد سعيد قاسم العبيدي).

هەڵبەتە، هەموومان، ئەوانەی تەمەنیان پەنجا ساڵ زیاترە، کە لەزەمانی پاشایەتی ژیاون دەزانن، کاتێ (پاشا= مەلیک) لەشوێنێک ئامادەبووایە، بۆ هەر مەبەستێکی (ڕەسمی)، دەبووایە (جۆقێکی سەربازی) سڵاوی پاشایەتی (السلام الملكي) لێبدرابایە و هەموو ئامادەبووان، گەورە و بچووک، ڕادەوەستانە سەرپێیان، تا مۆسیقایەکە تەواو دەبوو، ئینجا مەلیک دادەنیشت و لەدوای ئەو، هەریەک لەشوێنی خۆی، دادەنیشت. لەکۆتایی مەراسیمەکەدا، دیسان دەبووایە سەلامی مەلیکی لێبدرێ، بەڕاوەستانەوە، ئینجا کە مەلیک دەڕۆیشت، خەڵکەکەش بڵاوەیان لێ دەکرد. تەنانەت لەسینەماکانیشدا، پێش ئەوەی فیلمەکە نیشان بدرێ، مەلیک لەسەر شاشەکە دەردەچوو و بەیداغی عێراقی پاشایەتیش، لەدواوەی، لەسەر شاشەکە دەلەرییەوە و لەهەمان کاتا سڵاوی مەلیکی لێ دەدرا، دوایی فیلمەکە نمایش دەکرا. هەروەها لەکۆتایی فیلمەکە، دیسان، دەبووایە سڵاوەکە لێبدرێ و خەڵکەکە هەریەکەو لەسەر کورسییەکەی خۆی هەڵدەستایەوە و لەبەردەم کورسییەکەی دەوەستا. کە سڵاو تەواو دەبوو، ئینجا عالەمەکە سینەماکەیان چۆڵ دەکرد. سڵاوی مەلیکی لەزەمانی دامەزراندنی حکوومەتی عێراقی لەژێر ئاڵای مەلیک فەیسەڵی یەکەمەوە (دامەزرێنەری حوکمی وەتەنی لەعێراق) و ئینجا هاتنی مەلیک غازی، دوای مردنی باوکی- واتا فەیسەڵی یەکەم و هەروەها، دانیشتنی مەلیک فەیسەڵی دووەم، لەدوای کوشتنی باوکی (کە غازی بوو) تا شۆڕشی (١٤ی تەمووز، بەسەرۆکایەتی (عەبدولکەریم قاسم) کە مەلیک فەیسەڵ کوژرا و ڕژێمی پاشایەتی لەعێراق کۆتایی هات و سڵاوی کۆماری دانرا- دەڵێم بەدرێژایی (٣٧) ساڵ سڵاوی

مەلیکی لێ دەدرا و کەسیش نەیدەزانی ئەم (سەلامە گرنگە) ئەفسەرێکی مۆسیقاژەنی کورد، چەند گەنجێکی فێرە مۆسیقا کردوون و ئینجا مەشقیان لەسەر ئەم سەلامە کردووە بەرابەرایەتی (عەبدولواحیدی حاجی ئاغا مستەفا)ی کورد و (کۆیی)ش کە ئەفسەرێکی عەسکەری عێراقی بوو و خەریکی مۆسیقا فێرکردن بوو بۆ دامەزراندنی (جۆقی مۆسیقای عەسکەری). کەس باسی نەکردووە و ناوی نەهێناوە تا لەو سالانەدا، ئەم کتێبە بلاوکرایەوە دیارە ئەوەندەش خوێنەری کورد نەیان بینیوە و نەشیان خوێندووەتەوە.

جا مەبەستم ئەمە لێرەدا، کەچی لەسلێمانی، ئەفسەرێکی تری خوێری، کەخۆی بە (زل) زانیوە.. ئەو تەعەدایەی لەمامۆستای گەورە... مۆسیقازان عەبدولواحید کردووە، وەک کاک ساجید باسی بۆ کردین.

با دیسان بگەڕێینەوە سەرحەکایەتەکە و مامۆستا ساجید، کە فەرمووی: «لە سلێمانی باوکم دەچێتە لای بەڕێوەبەری پەروەردە، کە ئەوسا ناوی (مدیر المعارف) بوو و پێی دەڵێ کەوا بەنیازە، ئەگەر ڕێی پێ بدرێ- قوتابیانی سلێمانی، ئەوانەی ئارەزووی فێربوونی مۆسیقایان هەیە، خولی فێرکردنیان بۆ بکاتەوە بەخۆڕایی، فێری ژەنینی ئامێری مۆسیقایان بکات. بێگومان، بەڕێوەبەرو لێپرسراوانی مەعاریف زۆر دڵخۆش دەبن و ئاگادارییەکە لەڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٣٢)ی سالی یەکەمی- سالی ١٩٢٦دا- بەم جۆرە بلاوکراوەتەوە:

(بۆ ئەهالی ی سلێمانی موحتەرەم)

«زابتێکی فەوجی چوارەم، جەنابی (واحید ئەفەندی کوڕی ئاغا مستەفا، خەلقی کویسنجق کە لە (باندی مەلیکی)دا موعەلیمی موزیقە بووە، ئەمە سالێکە- (واتا لە ١٩٢٥ تا دەرچوونی ئەو ژمارە لە ١٩٢٦- باکووری) مەجانەن (نووسراوە: مەجانن- بە تەلەبەی مەکتەب دەرسی فەننی مۆزیقا تەدریس ئەکا. تەشویق و ئیتمئنانی ئەم (ذاتە)زاتە، بوو بەباعیسی جەسارەتی هێنانی ئەم باندو مۆزیقەیە بەغیرەتێکی بێ میسالەوە. تەعەهودی فەرمووە کە هەتا لێرەبێ، هەروا بە مەجانی تەعلیمی مۆزیقە بە تەلەبە بکا. هەیئەتی موعلمین وە تەلەبە بە کەمالی حورمەت ئەم زاتە حەمییە تمندە و سنعەتکارە تەقدیم ئەهالی ی موحتەرەم ئەکات.»

خواجە ئەفەندی، کابرایێکی جوولەکە بوو، مالی خۆی بەخشی و تەرخانی کرد بۆ گوتنەوەی دەرسی مۆسیقا تیایدا، لەدوای دەوام، واتا دوای نیوەڕۆیان دەستی بە مۆسیقا گوتنەوە دەکرد، لەو مالە (تێبینییەکی خۆم: بیستوومە و خوێندوومەتەوە کەوا، ناودار: ئەحمەد خواجەش مالی خۆی کردووەتە (قوتابخانە)- جا نازانم چ جۆرە بەستنەوەیەک و جۆرە عیلاقەتێک لەنێوان ئەم دوو ناوە: خواجە ئەفەندی، کە کاک ساجید دەڵێ جوو بوو، ئەحمەد خواجەش، بەناوی ڕا دیارە (جوو) نەبوو چ پێوەندیەک هەیە؟ (حەزم دەکرد بزانم- باکووری).

کاک ساجید دەڵێ: بۆ کڕینی ئامێری مۆسیقا، ئاهەنگێک ڕێک دەخەن لەگەڵ (مستەفا مەزهەر)ی خوالیخۆشبوو، کە بەڕێوەبەری مەعاریف بوو، لەو ئاهەنگە شانۆگەرییەک لەلایەن قوتابخانەوە، بەناوی: -نەتیجەی سەفاهەت و سەعی- پێشکەش دەکەن و بەپارەی بلیتی ئەو ئاهەنگە ژمارەیەکی باش ئامێری مۆسیقا دەکڕن. شانۆگەرییەکەش شەوی (شەممە- ١٩٢٦/٧/٢٧ لەحەوشی قوتابخانە ئەنجام دراوە) ئەم قوتابیانەی ناویان لەخوارەوەیە و ژمارەیەکی دیکەش ناویان نەنووسراوە، لەنواندنی شانۆگەرییەکە بەشداریان کردووە:

١- ڕەفیق چالاک.
٢- شاکر فەتاح.
٣- ئاوڕەحمانی میرزا عەبدوڵلا.
٤- جەلال مەجید سەلیم ئاغا.
٥- جەمال مەجید سەلیم ئاغا.
٦- ڕەحمان کەریم.
٧- ڕەحیم کەریم.
٨- سالح عەلی.
٩- ئەحمەدی میرزا مارف.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم و بۆ بڕوای خوێنەران و سەلماندنی ئەم ڕووداوانە، دیسان، تاوێک بە نووسینی تر خەریک ببین و قسەکانی کاک ساجید، جارێ بە شەکربربینەوە.

لەسەر لاپەڕەکانی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)ی ژمارە (١٠٦)ی سالی (١٩٨٥) مامۆستا (عوسمان شارباژێری)ش ئەم ڕووداوانەی گێڕاوەتەوە، لەژێر ناونیشانی (کاروانی مۆسیقاو گۆرانی، لەشاری سلێمانی) پێم باشە بۆ خوێنەری ئازیز، کورتەیەکی بگوازمەوە ئێرە: «عەبدولواحید حاجی مستەفا ١٨٨٦-١٩٧٣)، خەلکی شاری کۆیەیە، لە ئەستەمبوڵ بروانامەی کۆلێژی سوپایی وەرگرتووە، هەر لەویش فێری مۆسیقا بووە، پیانۆژانێکی شارەزا بووە. کە گەڕاوەتەوە عێراق، ناردوویانەتە سلێمانی. لەوێ تیپێکی مۆسیقا

پێک دێنێ کە لەسەر (نۆتە)ی تازە بوو، لەماڵی خواجە ئەفەندی، کە نزیکی مزگەوتی گەورە بوو و ماڵی خواجە ئەفەندی بووە (قوتابخانەی مۆسیقا). نزیکەی پەنجا قوتابییەکی هەبووە، لەوانە: مامۆستا شاکر فەتاح، رەفیق چالاک و... ئیتر بوون.

(کاک عوسمان ناڵێ خواجە ئەفەندی جوو بوو-باکووری) دوایی، کە ئینگلیزەکان هاتن و سلێمانیان داگیرکرد، قوتابخانەکەیان تێک دا و مامۆستا عەبدولواحیدیش لەسەر چالاکییە هونەری و نەتەوەییەکانی، (نەفی) دەکرێ بۆ (فاو).»

مامۆستا ئەحمەد خواجەش، ئاوا باسی ئەو هونەرمەندە دەکاو دەڵێ: «ئەمە راستە. (عەبدولواحید) دەرسی مۆسیقای بەقوتابیان ئەووت» هەروەها دەڵێ: «عەبدولواحید، لەسلێمانی ئافرەتێکی خواست کە ناوی (صدیقە خان) بوو، ئامۆزای باوکم بوو.» (کاک ساجید وتی: نەخێر ئەو ژنەی نەبووە- باکووری).

مامۆستا (شاکر فەتاح)یش بەم جۆرە، چالاکییەکان دەگێڕێتەوە: ئەو تیپە مۆسیقایە ساڵی (١٩٢٦-١٩٢٧) بوو، چەند ئامێرێکی مۆسیقا کران بە پارەی پێشکەشکردنی شانۆگەرییەک و مامۆستا (عەبدولواحید حاجی مستەفا) وانەی مۆسیقای فێر ئەکردین، کە لەو رۆژەدا مۆسیقا لێدان یەکجار عەیب بوو، بەڵام من یەکەمین کەس بووم چووم و ئالەتی (قرناتە)م دەست دایە کە فێر بم. لە ئەندامانی ئەم تیپەش: رەحیم کەریم، کە ئێستا (زەعیم)ی موتەقاعیدە هەروەها (رەمزی قەزاز)، (جەمال مەجید) و ئەفسەر (جەلال مەجیدی برای و فایق زێوەر.. ئەوەی شایانی باسە.. شەوی شەمووی رابووردوو (٢٧ تەمووز ١٩٢٦)- لەبینای مەکتەبدا لەژێر عینوانی (نەتیجەی سەفاهەت و سەعی) روایەیەک تەمسیل کرا.. حەقیقەتەن زۆر جوان. تەمسیل کرا.. بۆ کڕینی ئالاتی مۆسیقا».

بگەڕێینەوە لای کاک ساجید و بزانین چی دیکەی پێیە لەم باسە شیرین و گرنگ و خزمەت کردنە. کاک ساجید بەم جۆرە، درێژەی بە قسەکانی دەدات و دەڵێت: دوای ئەوەی ئەو قوتابیانە فێری ئەو ئامێرە مۆسیقایانە بوون و دوای مەشقێکی زۆر لەخانووەکەی (خواجە ئەفەندی)، ئینجا هەموو رۆژی (پێنج شەمووان)ی تەرخان کرد بۆ چوونە دەرەوەی شار، بەناو کۆڵانەکانی سلێمانیدا، لەگەڵ قوتابیەکانی بەدەم سروود گوتندا و ژەنینی مۆسیقا دەڕۆیشتن. جا ژن و منداڵ و پیاو لەماڵەکانیان دەهاتنە دەرەوەو هەندێک بەدوایاندا دەڕۆیشتن بەخۆشی و دەم بەپێکەنینەوە، گوێ رایەڵی ئەم بەزمە دەبوون.

کاک ساجید دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من، بۆ خۆم، کاتێ لەپۆلی پێنجی سەرەتایی بووم، باوکم پیانۆیەکی (هەمبانە)ی هەبوو، کە بەپێ ئیشی دەکرد.. دەمدیت سروودەکانی دەگوتەوە و فرمێسکی بەچاواندا دەهاتنە خوار!

ئینجا هەندێ لەو سروودانەی ناو هێناون کە ئەمانەبوون:

١- کابرا مەڕوانە ماڵ خانەی وێرانی من. شیعری (ئەسیری).

٢- لەزەمانی ئینتیباهی میللەتی رووی سەر زەمین. شیعری (زێوەر).

٣- ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی رۆحی شیرینی منی. شیعری (زێوەر).

٤- چەند (یا هەند) شیرینە لام داروبەردی وەتەنم. شیعری (زێوەر).

٥- وەتەن بە جەننەت ناگۆڕینەوە شیعری (رەفیق حیلمی).

کاک عەبدولواحید، بەدرێژایی ژیانی ئامێری قەوان، کە پێیان دەگوت (سندوقی قەوان، یان گراما فۆن)ی هەبووە و قەوانی گۆرانیبێژانی وەک (دایکی جەمال و مەلا کەریم و ئیدیکەشی هەبووە و هەمیشە گوێی لێ رادەگرتن.

لێرەدا قسەکانی مامۆستا ساجید تەواو بوون.

کاک ولیەم یۆحەننا، مۆسیقاژەن و هونەرمەندی گەورە، لە سلێمانی، لەلایەن هەردوو شاعیران: قوبادی جەلی زادە و لەتیف هەڵمەت، چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا دەکەن کە لە گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ)ی ژمارە (٢)، ساڵی ١٩٩٧)دا بڵاوکراوەتەوە: لەپرسیارێکدا کە لەمامۆستا ولیەمی دەکەن: کە ئەمە دەقەکەیەتی: پرسیار: ئایا یەکەم کەسێ کە هونەرمەند بووبێ و بایەخی بە ئاوازو گۆرانی (کوردی) دابێ، لەسلێمانیدا، کێ بووە؟

مامۆستا ولیەم، یەکسەر، لەوەڵامدا دەڵێ: وەکو زارەکی و هەندێ سەرچاوەی نووسراویش روونی دەکەنەوە کە یەکەم هونەرمەند کە لە سلێمانیدا بایەخی بەئاوازو گۆرانی کوردی دابێ، هونەرمەند مامۆستا (عەبدولواحید مستەفا) بووە.. ئەم هونەرمەندە لەسەرەتادا ئەفسەر بووە لەسوپای تورکدا لە تورکیا. کاتێ کە گەڕاوەتەوە هەوڵی داوەو تیپێکی گۆرانی و مۆسیقای دامەزراندووە لەسلێمانی.

ماوە بڵێم کەوا، بەداخەوە، ئەم هونەرمەندە گەورەیە، شتێکی ئەوتۆی بۆ نەکراوە، نە لەسلێمانی و نە لەکۆیە.

زۆر پشتگوێ خراوە و چ هونەرمەندێک، یان تیپێک، ڕۆژێ لە ڕۆژان، ناوی ئەو مرۆڤە دڵسۆزەیان نەهێناوە، کە تەمەنی خۆی بۆ خزمەتی هونەری مۆسیقا تەرخان کردووەو بەبێ موقابیل، قوتابیانی فێرە مۆسیقا کردووە. کە دوای ئەو، ئەو قوتابیانە هونەرمەندی نەوەی پاش (ئەو)یان لێ کەوتەوە..

هەر ئەو ڕووحیەتەی عەبدولواحیدیش بووە، کە بوویتە هاندەرێک بۆ گەنجای وەچەی پاش (قوتابخانەکەی ماڵی خواجە ئەفەندی) تا هەوڵدەن ئامێری مۆسیقا بەکاربێنن و هەر ئەوانیش بوون، کە یەکەم خول (دەورەی) مۆسیقا بەشێوەیەکی ڕەسمی و ڕێک و پێک لەساڵی (١٩٤٧) لەسلێمانی کرایەوە و مامۆستایانی مۆسیقای ناوداری عێراقی بێن لەو خولە دەرسی مۆسیقا بڵێنەوە، قوتابیانی وەک شەماڵ سائیب و قادر دیلان و حەمە ساڵح دیلان و بەهجەت ڕەشید و ڕەفیق چالاک.. هەستن بەدامەزراندنی تیپی مۆسیقای مەولەوی لەناوەڕاستی پەنجاکان و ئینجا دامەزراندنی کۆمەڵەی هونەرە جوانەکان و ئینجا دامەزراندنی تیپی مۆسیقای سلێمانی... و تا ئەمڕۆش مۆسیقا لە سلێمانی و کۆیە و هەولێر هەروا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، گەشتر دەبێت و مۆسیقاژەنی چاکتر هەڵدەکەون.

ئێستا ئەگەر ئەم پرسیارە دووبارە بکەمەوە:

– ئایا یەکەم مۆسیقازان، یان مۆسیقاژەن، یان مۆسیقاناس لە کوردستان کێ بوو؟ پێتان وا نییە ئەگەر لەوەڵامدا بڵێین: خوالێخۆشبوو (عەبدولوحید حاجی ئاغا مستەفا) بوو، وەڵامەکەمان لەسەدا سەد ڕاستە؟ هەر چ نەبێ تا ڕۆژی ئەمڕۆ کە جارێ لەپێشتر.. واتا پێش ئەو مرۆڤە، کەسی تر نەبووە؟

ئەم هونەرمەندە دڵسۆزە کە ئەو خزمەتە گەورەیەی کردووە، لەژیانیدا هەر (ڕاونراوە) و لەشارەکانی کوردستانیان نەهێشتووە وەزیفە ببینێ، بۆیە هەر لەباشووری عێراق، ساڵانی تەمەنی بەسەر بردووە، سێ ژنی هێناوە. یەکەمیان ناوی (فەهیمە سەعید) بووە، کە کاک ساجید لەم ژنەیەتی. کە ئەو قسەیەی (ئەحمەد خواجە)م بۆ خوێندەوە کە دەڵێ ژنێکی لەسلێمانی هێنا ناوی (صدیقە خان) بوو، ئامۆزای باوکم بوو، کاک ساجید وتی: ئەم شتە ڕاست نییە. یەکەم ژنی، دایکم بوو و ئێمە چوار براینە لەم ژنەی: ئەمجەد گەورەکەیان، وەفاتی کردووە. مونەیەد، ئەمیش وەفاتی کردووە (خوایان لێ خۆشبێ). جەمال، لە ژیانە و لە هەولێرە

لێم پرسی لەساڵانی (٩٥٧-٩٥٩) کە دەڵێی لە (کۆیە) بوویت، ماڵی باوکت لەکوێ بوون؟ فەرمووی لە دیوانیە بوون، چونکە هەر لەسەرەتاوە نەفی ئەوێ کراو ئیتر ئێمەش لەوێ بووین- کاک ساجید قوتابخانەکانی سەرەتایی و ناوەندی و (دارالمعلمین)ی هەر لەدیوانیە تەواوکردووە، ئینجا لەسەر داوای خۆی، بۆ کۆیە گوازراوەتەوەو ماڵی باوکی لەدیوانیە مانەوە و قەت نەگەڕایەوە کۆیە، بەڵکو لەدوا ساڵانی تەمەنی هاتەوە سلێمانی و هەر لەوێ، لەڕۆژی (١٦)ی مانگی ئاداری ساڵی (١٩٧٥) کۆچی دوایی کرد، کاتێک کاک ساجید پێشمەرگە بوو، لەچیا بوو، کە هەواڵی بۆ هات کەوا باوکی کۆچی دوایی کردووە و تەنانەت لەڕێوڕەسمی ناشتنیش لەکۆیە، نەیدیتووە و بۆی نەلواوە- هەزار سڵاو لەگیانی پاکی بێت.

**پەراوێزەکان:**

١- قەشە سوورە- ناوی قەشە (پۆلص عوجمایا) بوو خەڵکی (عەنکاوە) بوو. لەساڵی (١٩٤٧) خۆم لەعەنکاوە بووم، ئەو خوالێخۆشبووەم بینیوە. مرۆڤێکی ڕۆشنبیر بوو. هەمیشە گەنجەکان سەردانیان دەکرد، منیش لەگەڵیاندا دەچوومە لای، لەژوورەکەی خۆی کە لەناو کەنیسەی عەنکاوە بوو- زۆرتر بەلای ئیشتراکیەت و شیوعیەت مەیلی هەبوو!

٢-٣-٤- کاک ساجید مێژوو و ساڵەکانی ئەم ڕووداوانەی دیاری نەکردبوو.

**سەرچاوەکان:**

**١- عوسمان شارباژێری: گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ژمارە (١٠٦) ساڵی (١٩٨٥).**

**٢- کتێبی (شاری سلێمانی) دانانی: ئەکرەمی مەحموودی ساڵحی ڕەشە- ١٩٨٩.**

**٣- کتێبی (الموسیقی و الغناء في بلاد الرافدین)/ ١٩٩٩.**

**٤- کتێبی: سلێمانی شارە گەشاوەکەم/ بەرگی(٣) جەمال بابان/ ساڵی ٢٠٠٠.**

**٥- گۆڤاری (گەلاوێژی نوێ) ژ(٢) دیمانە لەگەڵ هونەرمەند (ولیەم یوحەننا)/١٩٩٧.**

**٦- چاوپێکەوتنی خۆم لەگەڵ بەڕێز ساجید عەبدولواحید، لەڕۆژی ٢٠٠٤/١/٣١.**

# درامانووسانی جیهان

مەهدی مەجید جاف
(سوید)

**«بەشی دووەم»**

۱۵- ژان ڕاسین Jean Racine

ژان ڕاسین، شاعیر و درامانووسی ڕیالستی فەرەنسایی لە ساڵی (۱٦۳۹ز)دا، لە دایک بووە. سەرەتای ژیانی ژان ڕاسین بە تراژیدیای ناهەموار دەست پێ دەکات، ئەو کە منداڵێکی ساوا دەبێت دایک و باوکی دەمرن و لە نازی دایک و باوکی بێبەش دەبێت. لە دوای کۆچی دوایی ئەوان داپیرە و باپیرەی دەیگرنە خۆ و دەیخەنە بەر خوێندن و هەرچییەکیان لە دەست هات وەک داپیرە و باپیرەیەکی دڵسۆز بۆیان کرد و درێخییان نەکرد.

لە تەمەنی شازدە ساڵیشدا باپیرە خۆشەویستەکەی دەمرێت و ناچار دەبێت بۆ شاری (پورت ڕیالی) بۆ لای خزم و کەسی کۆچ بکات تا لەوێ یارمەتی بدەن.

لە بەهاری ساڵی (۱٦۵۸ز)دا لوئی چوارەم، پاشای فەرەنسا ژنێکی ئیسپانی خواست و لە فەرەنسا کرا بە شایی و ئاهەنگ، ڕاسین ئەو کاتە تەمەنی تەنیا نۆزدە بەهار بوو، لەو بۆنە مەزنەدا شیعرێکی زۆری جوانی بەو بۆنەیەوە نووسی و پێشکەشی پاشای کرد و بەدیاری بۆی نارد، ئەم شیعرە ناسک و عاشقانە بوو، جێی سەرنج و حەزی شا و شاژن بوو و لەبری ئەوە پاشا خەڵاتێکی سکەیی بە ڕاسینی لاو بەخشی.

ئەو کاتە ڕاسین قوتابی بوو لە بەشی فەلسەفە، ئەم خەڵاتە نەک هەر هاندەرێک بوو بۆ ڕاسین، بەڵکو بووە هۆی ئەوەی لە ڕێگەی ئەم خەڵاتەوە کۆمەڵێ هونەرمەند و نووسەری ناوداری وەک مۆلیێر و لافونتاین و چەندانی تر بناسێت.

لە ساڵی (۱٦٦۲ز) و لە تەمەنی (۲٤) ساڵیدا خوێندنی لە بەشەکانی ئەدەبیات و فەلسەفە و زانیاری ئیلاهیدا تەواو کرد.

ساڵی (۱٦٦٤ز)، یەکەمین شانۆنامەی بەناوی (Lathebaid) دەنووسێ و لەسەر شانۆی پاشایی (سەڵتەنەتی) پێشکەش بە بینەرانێکی زۆر دەکرێت و جێی ڕەزامەندییان دەبێت.

دووەمین بەرهەمی درامی ڕاسین شانۆنامەی (ئەسکەندەری گەورەیە) کە ساڵی (۱٦٦۵ز)دا نووسیویەتی. پاش دوو هەفتە لە پێشکەشکردنی شانۆنامەی ئەسکەندەری گەورە، ژان ڕاسین مۆڵەتی پێشکەش کردنی بۆ گرووپێکی تر وەرگرت کە لەگەڵ گرووپەکەی مۆلیێردا دژایەتی و ڕکەبەرایەتییان هەبوو، نەک هەر ئەوەش بگرە ژان ڕاسین داوای لە (مادوازیل دوپاک) خانمە ئەکتەری لێهاتووی گرووپەکەی مۆلیێر کرد کە وەک ئەکتەرێک لە پێشکەشکردنی شانۆنامەکەیدا بەشداری بکات. ئەمە بووە هۆی ناکۆکی و لێکگرژبوونی ڕاسین و مۆلیێر تا کۆتایی ژیانیان.

شانۆنامەی (ئەندرۆماک) کە لە ساڵی (۱٦٦۷ز)، نووسی لەسەر شانۆی شاری پاریس پێشکەش کرا و ژان ڕاسین ناوبانگی وەک درامانووسێکی لێهاتوو لە پاش پێشکەشکردنی ئەو شانۆنامەیەوە بڵاوبووەوە.

مێژوونووسان باوەڕیان وایە کە شانۆنامەی (ئەندۆماک) بەیەکێک لە بەرهەمە بەهێز و بەنرخەکانی ڕاسین دادەنرێت و ئەم شانۆنامەیەشی لە شانۆنامەیەکی نووسەری یۆنانی یۆرپیدسەوە وەرگرتووە. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژان ڕاسینی لێهاتوو خۆشەویستتر و بەناوبانگتر دەبوو. لە گەرمەی ئەم ئەفراندنانەدا چەند درامایەکی تری

نووسی وەک :
١- شانۆنامەی بریتانیکۆس.
٢- شانۆنامەی برەنیس.
٣- شانۆنامەی ئەڤجینیا.
٤- شانۆنامەی (فیدرا).
شانۆنامەی (فیدرا) بە شاکارترین بەرهەمی ژان ڕاسین دادەنرێت.
لە ساڵی (١٦٧٣ز)دا ژان ڕاسین بوو بە ئەندامی هونەرمەندان و نووسەرانی فەرەنسا و بۆ ماوەیەکیش لە دراما نووسین گۆشەگیر کەوت.
بە فەرمانی لوئی پاشا ژان ڕاسین کرا بە نووسەر و لێپرسراوی شانۆی کۆشک، ئەو بە هاندان و خواستی مادام دومنتای خێزانی لوئی پاشا کە ژنێکی هونەر دۆست و زیرەک بوو ژان ڕاسین چەند شانۆنامەکی نووسی وەک شانۆنامەی (ئاتاکی).
ژان ڕاسین لە ساڵی (١٦٦٨ز)دا درامایەکی کۆمیدیی بە ناوی (لیتی گانت)ەوە نووسی کە لە شانۆنامەیەکی کۆمیدیی ئەرستۆفانیسەوە وەری گرتووە. ژان ڕاسین بە درێژایی تەمەنی بەرهەمە یۆنانی و ڕۆمییەکانی خوێندۆتەوە و بەهرەی لێوەرگرتوون.
لە ساڵی (١٦٦٩ز)دا ژان ڕاسینی مەزن و شکۆدار کۆچی دوایی کرد.

## ١٦- مۆلێر Moliere

ژان باتیست پوکلن، کە بە مۆلێر ناسراوە لە پازدەی ڕێبەندانی ساڵی (١٦٢٢ز)دا لە شاری پاریس لەدایک بووە. باوکی مۆلێر لە سەردەمی لوئی سیازدەیەمدا وەک فرۆشیارێک بازرگانی دەکرد.
مۆلێر ژیانی منداڵیەتیی لە شاری پاریس بەسەر دەباو لە تەمەنی دە ساڵیدا دایکی میهرەبانی کۆچی دوایی دەکات و ئەم ڕووداوە زۆر کار لە مۆلێر دەکات.
لە تەمەنی لاویدا سەرقاڵی خوێندن و جارجاریش لە کاری بازرگانی کردندا یارمەتی باوکی دەدا و بە هیوای ئەوەی لە پاشەڕۆژدا ببێتە بازرگان، پاشان لە بەشی (حقووقدا) دەستی بە خوێندن کرد و بە سەرکەوتوویی تەواوی کرد و لە دوای ئەوە یەک دوو جارێک پلانی بۆ بازرگانی کردن دارشت، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. بۆ ماوەیەک لە کۆشکی پاشایەتیدا وەک خزمەتکارێکی تایبەتی لوئی پاشا کاری دەکرد. لە ڕێگەی هاوڕێکانییەوە بە گرووپە شانۆییەکان ئاشنا بوو.
مۆلێر خواست و ئامادەیی ئەوە بوو کە لە بواری هونەری شانۆدا ژیانی بەسەر بەرێت و چیتر بیر لە کاری بازرگانی کردن نەکاتەوە هەر بۆیە داوای لە باوکی کرد کە بەشی خۆی لە میراتییەکەی دایکی بداتێ تا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا هۆڵێکی شانۆیی بکرن.
گرووپی شانۆی بژار پێوەندییان بە مۆلێرەوە کردو گرووپێکی نوێیان بە ناوی (گرووپی شانۆی ناودار) دروست کرد، سەرەتای دەستپێکردنی کاری دراما لە گرووپە نوێکەدا بە تەنگ و چەڵەمە و دەردەسەری بوو، لە پێشکەشکردنی یەکەمین بەرهەمدا سەرکەوتوو نەبوون و بەرهەمەکەیان لە لایەن بینەرانەوە پێشوازی لێ نەکرا. ئەم گیروگرفتانە مۆلێریان لە کاروانی هونەری دراما لانەداو بەردەوام بوو لە گەیاندنی پەیامە مەزنەکەی و ئەو بڕیارەی دا لەگەڵ گرووپە شانۆییەکەیدا بۆ شارەکانی تری فەرەنسا کۆچ بکەن و لەوێ شانۆنامەکانیان پێشکەش بکەن، ئەم کۆچە دوازدە ساڵی ڕەبەق درێژەی هەبوو. لەماوەی ئەم دوازدە ساڵەدا چەندان شانۆنامەیان لە شارەکانی فەرەنسا پێشکەش بە بینەران کرد و مۆلێریش وەک هونەرمەندێکی مەزن ناوبانگی دەرکرد.
مۆلێر هەر لەسەرەتای کار لەتەک گرووپی شانۆی بژاردا ئاشقی (مادلین بژار ) بوو، لە دواییدا خواستی و بوونە هاوسەر و هاوپیشەی یەکتر لە ساڵی (١٦٥٨ز)دا کاتێک کە تەمەنی لە سی و شەش بەهار تێنەدەپەڕی بەناوبانگێکی زۆر و ئەزموونێکی فرەوە هاتەوە شاری پاریسی ڕازاوە و دڵگیرەوە و یەکەمین شانۆنامەی خۆی بەناوی (دکتۆری هەڵاتوو)ەوە لەسەر شانۆ پێشکەش کرد. کە سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا.
لە دواییشدا چەند شانۆنامەیەکی کۆمیدی تری نووسی وەک :
- شانۆنامەی (دکتۆری عەشق)
- شانۆنامەی (فێرگەی پیاوان)
- شانۆنامەی (فێرگەی ژنان)
شانۆنامەی فێرگەی ژنان زۆر سەکەوتنی بەدەست هێنا و مۆلێر بڕی هەزار فرانکی ئەو کاتەی وەک خەڵات بۆ باشترین نووسەری کۆمیدی پێبەخشرا.
شانۆنامەی (هاوسەری خەیاڵی) لە ساڵی (١٦٦٠ز)، خرایە سەر شانۆ و پاش پێنج شەو لە پێشکەشکردنی قەدەغە کرا و نەیانهێشت چیتر پێشکەش بکرێت، چونکە لە حزووری پاشادا هێرش و سووکایەتی بە دایکی پاشا دەکرد.
شانۆنامەی (ژنهێنانی بەزۆر) و شانۆنامەی (دۆن ژوان) پاش ئەوەی کە پازدە شەو لە پێشکەش کردن بەردەوام بوون ئەمانیش ڕێگەی پێشکەشکردنیان لێگیرا.
ساڵی (١٦٦٥ز)، مۆلێر بوو بە لێپرسراوی شانۆی سەڵتەنەتی و چەند شانۆنامەیەکی بەپێزتری نووسی وەک:
- شانۆنامەی (میزانتروپ)

- شانۆنامەی (دکتۆری تێلا)
- شانۆنامەی (ئامفی تریون)
- شانۆنامەی (پیسکە، ڕەزیل)
- شانۆنامەی (شاری جەنتلمن)
-شانۆنامەی (ژنانی دانا)
-شانۆنامەی (نەخۆشی خەیاڵی)

لە ساڵەکانی کۆتایی ژیانیدا مۆلێر تووشی نەخۆشی بوو و لە مادلین بژاری هاوسەی جیا بوونەوە، ئارماندۆ بژار کە خوشکی مادلین بژار بوو، خواستی و لەم ژیانە تازەیەشدا هەر خۆش بەخت نەبوو. ئەمانە لە لایەک و لە لایەکی ترەوە کێشەو رکەبەرایەتی مۆلێر لە گەڵ ڕاسین وای لە مۆلێر دەکرد کە ئازارێکی زۆر بچێژێت.

دوا بەرهەمی درامی مۆلێر شانۆنامەی (نەخۆشی خەیاڵی)یە کە لە مانگی ڕەشەمەی ساڵی (١٦٧٣ز)، خرایە سەر شانۆ و سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێنا.

مۆلێر ڕۆڵی (ئارگنی) لە شانۆنامەکەدا دەبینی و لە چواردەیەمین شەوی پێشکەشکردنی شانۆنامەکەدا مۆلێر دووچار و ڕووبەڕووی نەخۆشییەکەی بووەوە و خوێنێکی زۆری هەڵهێنایەوە، بردیانە ناو جێگا و چیترو هەرگیزاو هەرگیز نەیتوانی هەستێتەوە، هەر هەمان شەو گیانی پیرۆزی لە لەشی ماندووی جیابووەوە و کۆچی دوایی کرد.

## ١٧- لیسنگ Lessing

گوتهۆڵد ئیفراهیم لیسنگ، کە بە لیسنگ ناسراوە لە بیست و دووی مانگی خەرمانانی ساڵی (١٧٢٩ز)، لە ناوچەی کامنتس ساکسونی لە وڵاتی ئەڵمان و لە خێزانێکی ئایینی لە دایک بووە. باو باپیرانی قەشە و باوکیشی هەر وەک ئەوان قەشەیەکی پرۆتستانتی کلیسا بووە.

لیسنگ خوێندنی سەرەتایی لە هەمان ناوچە تەواو کرد و پاشان بۆ خوێندنی باڵا باوکی ناردیە زانکۆی لایبزک لە بەشی ئالیهاتدا، بە ئومێدی ئەوەی لە پاشەڕۆژدا بێتە پیاوێکی ئایینی بەتوانا و کاری قەشەیی بکات.

لیسنگ هەر زوو لە زانکۆ هەستی بەوە کرد کە حەز و خواستی لەسەر خوێندنی ئایینی نییە و بە ڕووی هونەر و ئەدەبیاتدا بایدایەوە، لە هونەریشدا زیاتر خولیای هونەری مەزنی شانۆ بوو.

لە سەرەتادا پلانی ئەوە بوو کە وەک مۆلێر پیشەی نووسەر و ئەکتەری هەڵبژێرێت، هەر بۆ ئەم مەبەستە زۆربەی کاتەکانی خۆی لە باتی لە کونجی تاریک و تەسکی کلیسا بەسەر ببات لە دنیای ڕوون و بەرفراوانی شانۆکان و بە تایبەت شانۆی (کارولین نیبر) دەگوزەراند.

لە ساڵی (١٧٤٨ز)دا شانۆنامەیەکی کۆمیدی بە ناوی (خوێندکاری جوان - لاو ) دەنووسێت، لەو شانۆنامەیەدا زۆر زیرەکانە سووکایەتی و ڕەخنە لە نەریتە کۆنەکانی کۆمەڵگا دەگرێت. لە هەندێ شوێنیش ڕەخنە لە بۆچوونە هاوچەرخەکان دەگرێت.

پاش ساڵێک دوو شانۆنامەی تری نووسی، شانۆنامەی (گیانی ئازاد) و شانۆنامەی (فۆدین)، لە پاش ئەم کارانەوە دایک و باوکی زۆر لێی ڕەنجان و ئارەزوویان نەدەکرد کە لیسنگ درێژە بە کاری شانۆ بدات، لیسنگیش بەو داخوازییەی ئەوان قایل نەبوو، بڕیاریشی دابوو کە بیر لە کار و باری ئایینی و کلێسا نەکاتەوە. پاش گتفوگۆ و مشتومڕێکی زۆر بڕیاریان دا کە لیسنگ ڕەوانەی شاری لایبزک بکەن بە مەبەستی ئەوەی کە لە بەشی پزیشکیدا درێژە بە خوێندن بدات.

لیسنگ ناچار بوو بە داخوازییەکەیان ڕازی بێت، بەڵام ئەو هەر بیر و خۆشەویستی لای هونەری پیرۆزی شانۆ بوو، هەر بۆیە پاش دوو ساڵان وازی لە خوێندنی پزیشکی هێناو گەڕایەوە شاری بەرلین و لەوێ سەرقاڵی نووسینی وتاری ڕەخنەیی و کاری وەرگێران بوو بۆ ڕۆژنامەکان.

پاشان کۆمەڵە شیعرێک و شانۆنامەیەکی بە ناوی (سارا سامسۆنی خانم) بڵاو کردەوە و لە ساڵی (١٧٥٨ز) دەستی بەبڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی کولتووری کرد و ئەو بۆ یەکەمین جار ولیام شەکسپیری مەزنی بە خوێنەرانی ئەڵمانی ناساند.

لە ساڵی (١٧٦٧ز)، لیسنگ لە شاری هامبۆرگ نیشتەجێ بوو، لەوێ وەک ڕاوێژکاری ئەدەبی و ڕەخنەیی لە شانۆی هامبۆرگ کاری دەست پێکرد و لە هەمان ساڵیشدا شانۆنامەیەکی کۆمیدی بە ناوی (مینیافۆن بارنهلم) نووسی و بڵاوی کردەوە. ئەم شانۆنامەیە بە یەکێک لە شاکارە کۆمیدییەکانی ئەدەبیاتی ئەڵمانی دادەنرێت، لیسنگ لەم شانۆنامەیەدا دژایەتی و ناڕەزایی خۆی بەرامبەر ئەو شەڕە درێژخایەنە، ئەو شەڕە براکوژییەی کە ویلایەتی ئەڵمانی گرتبووەوە، لەوێشدا خیانەتکاران و شەڕخوازەکان تاوانبار دەکات.

لە هامبۆرگ لیسنگ وەک نووسەرێکی خاوەن فکر و هونەرمەندێکی داهێنەر ناو و ناوبانگی دەرکرد و هەر لەوێ کتێبێکی بە ناوی (دراماکانی هامبۆرگ) بڵاوکردەوە، لەو کتێبەدا ڕەخنە و بۆچوونەکانی خۆی بۆ دروستبوونی شانۆی ئەڵمان ڕوون دەکاتەوە.

لە ساڵی (١٧٧٢ز)، شانۆنامەی ئمیلیا گالتی (نووسی و هەر لەم ساڵەدا و لە تەمەنی چل و حەوت ساڵیدا ژنی هێنا ، بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە لە پاش دوو ساڵان ژن و منداڵە تاقانەکەی مردن. ئەم کارەساتە ناهەموارە زۆر کاری لە فکر و بۆچوونەکانی کرد و ئەم

ڕووداوە وای لێکرد کە شانۆنامەی (ناتانی هۆشمەند) بنووسێت.

لیسنگی بلیمەت لە تەمەنی (٥٢) ساڵیدا و لە ساڵی (١٧٨١ز)، کۆچی دوایی کرد و کاروانە مەزنەکەی شانۆی بەجێهێشت.

### ١٨- گۆتە Johann Wolfgnd Goethe

یوهان والفگند گۆتە، شاعیر و درامانووس و هونەرمەندی ناسراو لە بیست و هەشتی خەزەڵوەری ساڵی (١٧٤٩ز)، لە شاری فرانکفۆرت لە وڵاتی ئاڵمان لە دایک بووە. باوکی یاریدەدەری کۆشکی پاشایی و دایکی یەکێک لە نەجیبزادەکانی ئەڵمان بووە.

یوهان لای مامۆستای تایبەت کە دایک و باوکی بۆیان گرتبوو، خوێندنی سەرەتایی دەست پێکرد. لە تەمەنی شازدە ساڵیدا لە بەشی حقووق و هونەردا، لە شاری لایبزیک دەستی بە خوێندن کرد و پاش سێ ساڵان بۆ شاری فرانکفۆرت گەڕایەوە.

لەو ماوەیەدا یوهان کاتێکی زۆری بۆ خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ولیەم شەکسپیر تەرخان کرد. لە ساڵی (١٧٧٣ز)دا شانۆنامەی (پرۆمیتە) ی نووسی کە لە شانۆنامەیەکی نووسەری مەزنی یۆنانی ئەسخیلۆسەوە وەری گرتبوو. لە ساڵی (١٧٧٥ز)دا، (کارل ئاوگوست) کە میر و فرمانڕەوای شاری وایمار بوو، داوای لە گۆتە کرد کە وەک ڕاوێژکارێک یارمەتی بدات. لەو ڕۆژەوە کە زیاتر لە نیو سەدە دەکات، گۆتە ڕاوێژکاری میری وایمار و نووسەری دراما و شانۆکار بوو.

کاری شانۆیی ئەو سەرەتا لەگەڵ تیپێکی ئەماتۆر و پاشانیش بوو بە خاوەنی باشترین گرووپی درامیی خۆی. گۆتە لە وایمار دەسەڵاتدار و لێپرسراوی کولتووری بوو. هەر لەو ماوەیەدا بە هەڵبژاردن بوو بە نوێنەری ئەنجومەن. بۆ ماوەیەکیش لێپرسراوی کتێبخانەی سەڵتەنەتی بوو. گۆتە لەگەڵ ئەم قەرەباڵغیەدا زیاتر کاتەکانی خۆی بۆ شانۆ و ئەدەبیات تەرخان دەکرد.

گۆتە تا کۆتایی ژیانی بنە و بانەی ژیانی هەر لە وایمار بوو، بۆ چەند جارێک سەفەری دەرەوەی وڵاتی کردووە، بۆ ماوەی دوو ساڵ (١٧٨٧-١٧٨٨) لە ئیتاڵیا ژیاوە. ئەو سەفەرە بۆ گۆتە زۆر سوودی ڕۆشنبیری و فکری هەبووە.

یوهان گۆتە لە تەمەنی بیست و چوار ساڵیدا شانۆنامەی (گوترفون برلیشتین) ی نووسی کە بە شانۆنامەکی مێژوویی دادەنرێت و باسی قارەمانان و سەردارانی ئەڵمان لە سەدەی شازدەیەم دەکات و بە یەکێک لە بەرهەمە شاکارەکان و دیارەکانی بزووتنەوەی (گێژا و شاڵاو) دادەنرێت.

ئەم بزووتنەوەیە کە ناوەرۆکێکی ڕۆمانتیکی هەبوو لە ساڵەکانی (١٧٧٠ز) لە ئەڵمانیا سەری هەڵدا و تا ساڵی (١٨٣٠) بەردەوام بوو.

گۆتە لە ساڵی (١٧٩١ز)دا بوو بە لێپرسراوی شانۆی سەڵتەنەتی و بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ ئەمە یەکێک بوو لە کارەکانی. گۆتە شانۆی ئەڵمانی بەرەوپێش برد و کارێکی زۆر گەورەی کردە سەر شانۆی ڕۆژئاوا، ئەو قۆناغەش بە سەردەمی شانۆی وایمار ناسراوە، لەبەر ئەوەی شاری وایمار چالاکترین شاری ئەڵمانیا بوو لە بزووتنەوەی شانۆدا و گۆتەش زۆربەی بەرهەمەکانی خۆی و بەرهەمی نووسەرە جیهانییەکانی لەوێ خستووەتە سەر شانۆ.

بەرهەمەکانی گۆتە دەکرێن بە چوار جۆرەوە :

جۆری یەکەم : بەرهەمە تراژیدییەکان.

جۆری دووەم : بەرهەمە فەلسەفییەکان.

جۆری سێیەم : بەرهەمە ئەفسانەییەکان.

جۆری چوارەم : بەرهەمە کۆمیدییەکان.

یوهان گۆتە چەند درامایەکی تری نووسیوە وەک:

- شانۆنامەی (ڤیتر).
- شانۆنامەی (سیلا).
- شانۆنامەی (ئیگمەنت).
- شانۆنامەی (ئەڤجینیا لە نورس).
- شانۆنامەی (تەبیعەتی عاشقان).
- شانۆنامەی (کلاڤیگۆ).
- شانۆنامەی (ئیروین و ئیلمیر).



گۆتە

ناسراوترین بەرهەمی گۆتە شانۆنامەی (فاوست)ە کە لە شانۆنامەی (دکتۆر فاوست) ی کرستۆفەر مارلۆوە وەریگرتووە.

ئەوەی شایانی باسە کە گۆتە زۆر حەز و ئارەزووی لە خوێندنەوەی شیعرەکانی شاعیری گەورەی ئێرانی (حافزی شیرازی) کردووە.

گۆتەی مەزن لە ساڵی (١٨٣٨ز)داو لە گەرمەی کاری هونەریدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی شاری وایمار بە خاکیان سپارد.

١٩- شیللەر (Schiller)

یوهان کریستۆف فرێدریش ڤۆن شیللەر، شاعیر و درامانووسی بەناوبانگی ئەڵمانی لە مانگی نۆڤەمبەری (١٧٥٩ز)، لە یوتمبرگ لە ئەڵمانیا لە دایک بووە. باوکی شیللەر دکتۆری جەڕاح (نوژدار) دەبێت و پاشان بۆ جێبەجێ کردنی خزمەتی سەربازی کاری دکتۆری لە سوپادا ئەنجام دەدات لەدواییدا دەبێتە سەرپەرشکەری باخچەی پاشا لە یوتمبرگ.

یوهان هەر لە منداڵییەوە حەزێکی یەکجار زۆری لە شیعر و نووسین دەبێت. کاتێ کە تەمەنی نۆ ساڵان دەبێت، بۆ یەکەم جار لە بینینی شانۆنامەیەکدا بەشدار دەبێت و سەرنجی بۆ شانۆ رادەکێشرێت. بۆ ماوەی حەوت ساڵ لە قوتابخانەیەکدا کە تایبەت بۆ منداڵانی لێپرساوانی وڵات دەبێت، لە بەشی حقووقدا دەرس دەخوێنێت هەر لەم ساڵانەدا بە بەرهەمە ئەدەبییەکانی ژان ژاک رۆسۆ و ولیەم شەکسپیر و گۆتە ئاشنا دەبێت.

یوهان واز لە خوێندنی (حقووق) دەهێنێت و لە بەشی پزیشکیدا دەست بە خوێندن دەکاتەوە. پاشان وەک دکتۆر لە سوپادا دەست بەکارکردن دەکات. هەر لەم ساڵانەدا بزووتنەوەی (گێژەن و شاڵاو) کە لە نێوان نەوەی نوێی ئەڵمانیدا رەگ و ریشە دادەکوتێت. ناوی ئەم بزووتنەوەیە لە شانۆنامەی (گێژەن و شاڵاو) ی کلنگری شاعیری ئەڵمانیەوە وەردەگیرێت و دەبێتە هۆی هێنانە کایەی رێبازێکی نوێ لە دراما نووسیندا، پەیرەوکەرانی ئەم رێبازە دژی دابونەریتی کۆن و یاساییەکانی ئەڵمانیا خەبات دەکەن.

شیللەری لاو بە هاوبیر و لایەنگریان دەبێت. لە ساڵی (١٦٨١ز)، شانۆنامەی (دزەکان) بڵاودەکاتەوە و پاش ساڵێک لەسەر شانۆی شاری منهایم پێشکەش دەکرێت و سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست دەهێنێت. لە دواییدا بە فرمانی شازادەی یوتمبرگ ئەو رێبازە شۆڕشگێڕە ئەدەبییە قەدەغە دەکرێت لە بەر ئەوە شیللەر بۆ شاری مانهایم کۆچ دەکات، لەوێ وەک درامانووسێک لە شانۆی



شیللەر

منهایمدا دەست بە کاردەکات و شانۆنامەی (مەکری عشق) و شانۆنامەی (توئە فیسۆ) بۆ ئەو شانۆیە دەنووسێت و دیوانە شیعرێکیش بڵاودەکاتەوە. پاش ماوەیەکی کەم دەبێتە بەڕێوەبەری شانۆی کۆشک. لە ساڵی (١٧٨٥ز)، بۆ شاری لایپزیک کۆچ دەکات ؛ لەوێ بە (ئمانوئێل کانت)ی فەیلەسووف ئاشنا دەبێت و دەست بە خوێندنەوەی فەلسەفە دەکات.

بۆ نووسینی شانۆنامەی (دۆن کارلۆس) بۆ ماوەی نۆ ساڵ دەست بە خوێندنەوەی مێژوو دەکات. بەرهەمی ئەو نۆ ساڵ خوێندنەوەیە کتێبی (شۆڕشی هۆڵەند) و کتێبی (شەڕی سی ساڵە) یە کە ناوبانگی شیللەری وەک مێژوونووس بە ئەڵمانیادا بڵاودەکاتەوە و بۆ زانکۆی (ینا) وەک مامۆستای مێژوو میوانداری دەکرێت. لە ساڵی (١٧٩٩ز)، زانکۆی (ینا)ش بەجێ دەهێڵێت. شیللەری هەژار و دەست کورت لە ساڵی (١٧٨٧ز)، لە شانۆی شاری هامبۆرگ وەک درامانووسێک کاری دەست دەکەوێت.

لە مانگی کانوونی یەکەم ١٧٨٨ز، گۆتە و شیللەر چاویان بە یەکتر دەکەوێت ؛ ئەوکاتە شیللەر لە تەمەنی بیست و نۆ ساڵیدا و گۆتە لە تەمەنی سی و نۆ ساڵیدا دەبێت. هەردووک دەبنە هاورێ و هاوکاری یەکتر و لەو ماوەیەدا شیللەر چەند درامایەکی بە پێز دەنووسێت کە

بریتین لەمانەی خوارەوە :
١ - شانۆنامەی ماری ستیوارت.
٢ - شانۆنامەی کیژەی ئاورلێان.
٣ - شانۆنامەی تریلۆژی والنشتین کە پێکهاتووە لە:
أ - شانۆنامەی کامپی والێنستین.
ب - شانۆنامەی پێکۆلۆمین.
س - شانۆنامەی مردنی والنشتین.
٤ - شانۆنامەی بووکی مێسینا.

شیللەری کۆڵنەدەر و تێکۆشەر لە ساڵانی کۆتایی ژیانیدا بە ئازاری نەخۆشی سیلەوە لاواز و ماندوو دەتلێتەوە، تا چارەنووسی لە مانگی مایس (١٨٠٥)ز، کۆتایی پێدێت و دڵە مەزنەکەی لە لێدان دەکەوێت و دەمرێت.

## ٢٠- کلایست (Kleist)

شاعیر و شانۆنامەنووسی ئاڵمانی ولیام هێنریش ڤۆن کلایست لە هەژدەی تشرینی یەکەم ساڵی ١٧٧٧ ز، لە شاری فرانکفۆرت لە خێزانێکی نەجیبزادە و خانەدان لە دایک بووە. کلایست خوێندنی سەرەتایی لە ماڵەوە لە بەردەم مامۆستای تایبەتیدا تەواو کردووە. لە ساڵی ١٧٨٨ز، کاتێ تەمەنی یازدە ساڵ دەبێت، باوکی دەمرێت و پێنج ساڵ دواتر دایکی میهرەبانیشی کۆچی دوایی دەکات.

لە ساڵی ١٧٩٢ ز، دەست بە خزمەتی سەربازی دەکات : لە شەڕێکدا کە دژی سوپای فەرەنسی دەبێت بەشداری دەکات و بەهۆی ڕۆڵی چالاک و سەرکەوتووانەی لە شەڕەکەدا، لە خولی خوێندنی باڵای سەربازی وەردەگیرێت .

پاش ماوەیەک بۆی دەرکەوت کە حەز و ئارەزووی لە پەیرەو و یاسای سوپا نییە و لە ساڵی ١٧٩٩ ز، وازی لێدەهێنێت. پاشان لە بەشی فەلسەفە و مێژوودا لە زانکۆ وەردەگیرێت، پاش ماوەیەک بەهۆی ماندوویی دەروونی و لەشیەوە ناتوانێت درێژە بە خوێندنەکەی بدات و وازی لێ دەهێنێت. لە ساڵی ١٨٠١ ز، بۆ بەدەست هێنانی کار بۆ پاریس سەفەر دەکات. لەوێ بیر و بارەڕی ژان ژاک ڕۆسۆ کاری تێدەکات و سەرقاڵی خوێندنەوە دەبێت.

لەدواییدا ڕێگای سویسرا دەگرێتە بەر، هەر لەوێش ژن دەهێنێت و ئاشنایەتی لەگەڵ تیپە شانۆییەکانی سویسرا پەیدا دەکات و یەکەم هەنگاو وەک ئەکتەر لەسەر شانۆ دەردەکەوێت. کلایست لە ئەڵمانیا شان بە شانی گۆتە و شیللەری مەزن لە گۆڕەپانی هونەری پیرۆزی شانۆییدا قۆڵی لێ هەڵدەماڵێت و دەست بە کار دەکات. دووبارە بۆ فەرەنسا کۆچ دەکات و لەو کاتەدا فەرەنسا لەگەڵ وڵاتی ئینگلیزدا لە شەڕێکی ناهەمواردا دەبێت، کلایست دڵسۆزی خۆی بۆ فەرەنسیەکان دەسەلمێنێت و دژی سوپای ئینگلیز بەشداری شەڕەکە دەکات و لە ئەنجامدا بریندار دەبێت و برینەکەی کەساسی دەکات، بۆ ماوەیەک، ژیان لە نەخۆشخانەدا بەسەر دەبات لە ساڵی ١٨٠٤ ز، بۆ ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە و یەکەمین شانۆنامەی بە ناوی خێزانی (شروفن شتاین) و لە ساڵی ١٨٠٦ ز، شانۆنامەی (ئامفی تریونی) دەنووسێت.

لە ساڵی ١٨٠٥ ز، کە فەرەنسییەکان شاری بەرلین داگیر دەکەن، کلایست بە تاوانی سیخوڕی دەگیرێت و لە زیندانی دەکەن، پاش ماوەیەک ئازاد دەکرێت. لە هەمان ساڵدا (شانۆنامەی پانتە زیلە) دەنووسێت و لەگەڵ نووسەرێکدا کە ناوی ئادەم مولر دەبێت، گۆڤارێک بەناوی فیبوس بڵاودەکەنەوە، بەڵام لەبەر دەستکورتی دارایی لە بڵاوکردنەوە ڕادەگیرێت : پاش ماوەیەکی کەم شانۆنامەی (گۆزەی شکاو) دەنووسێت.

داگیرکردنی ئەڵمانیا لە لایەن ناپلیۆنەوە کلایست بێزار و تووڕە دەکات و شانۆنامەی (شەڕی ئارمینۆس) بەرهەمی ئەم نارەزاییە دەبێت کە زۆر بە سەختی هێرش دەکاتە سەر ناپلیۆن. ئەم شانۆگەرییە لە ساڵی ١٨٠٩ ز، دەخرێتە سەر شانۆ، بەداخەوە سەرکەوتنێکی ئەوتۆ بەدەست ناهێنێت و لەلایەکی ترەوە سەرکەوتنەکانی ناپلیۆن کلایست ڕەشبینتر دەکەن، لەبەر ئەوە بە ناچاری سەری خۆی بۆ شاری پراگ هەڵدەگرێت، خۆشبەختانە لەوێ لویسی شاژن دەیگرێتە خۆی و لە هەژاری و دەردەسەری ڕزگاری دەکات. لە ساڵی ١٨١٠ز، شانۆنامەی (کاترین ڤۆن هیلبرون) و شانۆنامەی (شازادەی هامبور) دەنووسێت.

لە ئۆکتۆبەری ١٨١٠ز، بۆ شاری بەرلین دەگەڕێتەوە، لەوێ بۆ یەکەمین جار بەرهەمەکانی چاپ دەکات و شان بە شانی هونەر چالاکی سیاسی خۆی پەرە پێدەدات و ڕۆژنامەیەک بەناوی (سەردەمی بەرلین) بڵاودەکاتەوە و وتاری دژی ناپلیۆنی تێدا چاپ دەکات. پاش شەش مانگ لەژێر زۆری سانسۆردا ڕۆژنامەکە ڕادەگیرێت. لە مانگی تشرینی دووەمی ١٨١١ز، کلایستی کۆڵنەدەر و تێکۆشەر لە تەمەنی (٣٥)ساڵیدا دەمرێت و ماڵ ئاوایی لە شانۆ و ژیان دەکات.

## ٢١- بوخنەر (Buchner)

کارل جۆرج بوخنەر شانۆنامەنووسی بەناوبانگی ئەڵمانی لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨١٣ز، لە نزیکی دارمستات چاوی بە دنیا هەڵهێناوە. پاش تەواو

کردنی خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە بەشی پزیشکی و فەلسەفە لە شاری گێسین دەست بە خوێندن دەکات. هەر لەم شارەدا بە کۆمەڵێ لە شۆڕشگێڕانی نهێنی ئاشنا دەبێت و بیروباوەڕی خۆی لە ئایدیالیستییەوە بۆ شۆڕشگێڕی دەگۆڕێت، زیاتر لە ئازار و ئەشکەنجەی زوڵم لێکراوان دەگات و بە نهێنی لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا کار دەکات.

ساڵی ١٨٣٥ز، بە تۆمەتی سەرپێچی لە یاسا تاوانبار دەکرێت، بۆ ڕزگاربوون لە دەست پۆلیسی وڵاتی مێترنیخ بەنهێنی بەرەو ستراوسبۆرگ دەڕوات. کاتێ لە سەر سنووری ئالستیان دەبێت، لە نووسینی شانۆنامەی (مردنی دانتون) دەبێتەوە. بۆخنەر لە ستراوسبۆرگ بۆ پێشبڕکێیەکی شانۆیی شانۆنامەی ((لیۆنس ولێنا)) دەنووسێت ؛ ئەم شانۆنامەیە بە یەکێک لە کۆمیدییە بەناوبانگەکانی ئەڵمانی دادەنرێت. پاش چەند ساڵێ پڕ لە چالاکی و خەباتی ئازادیخوازانە بۆ زوریخ کۆچ دەکات، لەوێ ژیانێکی ئارام و خۆش بەسەر دەبات و کاتەکانی خۆی بۆ خوێندنەوەی زانیاری و نووسین تەرخان دەکات و شانۆنامەی (پێدروئارتینۆ) و شانۆنامەی (ڤیتزک) دەنووسێت.

لە مانگی تشرینی دووەمی ١٨٣٦ز، بڕوانامەی دکتۆرای پێدەبەخشرێت و بۆ سویسرا سەفەر دەکات و لە زانکۆی زوریخ وەک مامۆستا دەرس دەڵێتەوە. پاش چەند مانگێک، بوخنەر هاوڕێکانی ئاگادار دەکاتەوە کە بەو نزیکانە لە نووسینی سێ شانۆنامە دەبێتەوە، یەکەمیان ون بووە، دووەمیان بە ناوی (پێدرۆ ئارتینۆ) یە کە لە دوا ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانیدا نووسیویەتی، چەند کاتژمێرێک پێش مردنی بە هاوسەرەکەی دەدات و داوای لێدەکات بە کەسێکی تری نەدات، سێهەمینیان شانۆنامەی (یوتزک)ە. بوخنەر دواجار کورتە چیرۆکێک بە ناوی (لێنز) دەنووسێت کە توانای داهێنان و بە سەلیقەیی ئەو لە دراما نووسیندا نیشان دەدات.

تا بوخنەری لاو لە ژیاندا دەبێت، وەک سەربازێکی نەناسراو بەرهەمەکانی لەسەر شانۆ پێشکەش بە بینەران ناکرێن ؛ لە پاش مردنیەوە تا ئەمڕۆ شانۆنامەکانی لە سەر تەختەی شانۆکانی جیهان پێشکەش بە بینەران دەکرێن. بوخنەری مەزن لە مانگی شوباتی ١٨٣٧ز، و لە تەمەنی ٢٤ ساڵیدا بە نەخۆشی تیفۆس دەمرێت و ماڵئاوایی لە ژیان دەکات.

### ٢٢- ستریندبێری (Strindberg)

یوهان ئاوگوست ستریندبێری، شانۆنامەنووس و شاعیر و ڕۆمانووسی بە ناوبانگی سویدی لە ڕۆژی بیست و دووی مانگی کانوونی دووەمی ١٨٤٩ ز، لە شاری ستۆکهۆڵم لە دایک بووە. باوکی کرێکارێکی کەشتیوانی دەبێت و دایکیشی لە قاوەخانەیەک کاردەکات. ژیانی منداڵیەتی بە ئازار و دەردەسەرییەوە بەسەر دەچێت، گیروگرفتی ئابووری ژیانی خێزانێکی یازدە کەسی سەختی و دژواری بۆ ژیانیان دروست دەکەن. لە تەمەنی سێزدە ساڵیدا دایکی دڵسۆزی دەمرێت و پاش ماوەیەک باوکی ژنە خزمەتکارێکی تر دەخوازێت.

باوەژن هیچ ناز و میهرێک بە ستریندبێری نادات و بگرە دەردەسەریشی بۆ دروست دەکات، ئەمەش بەشێوەیەک لە بەرهەمەکانیدا ڕەنگ دەدەنەوە. بە دەردەسەری و بێزاریەوە خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکات و پاشانیش لە زانکۆ وەردەگیرێت. ماوەیەک بۆ دابینکردنی ژیانی ڕۆژانە و خوێندنەکەی کار دەکات.

خوێندن و کارکردن بە یەکەوە بۆی سەخت دەبێت، ناچار واز لە خوێندن دەهێنێ و بۆ ماوەی پێنج ساڵ وەک مامۆستا کاردەکات، لەم ماوەیەدا خۆی لە بواری نووسیندا تاقی دەکاتەوە، دووبارە لە زانکۆ دەست بە خوێندن دەکاتەوە خواست و ئارەزووی زیاتری بۆ نووسین دێتە سەر، بەو مەبەستەی مەشخەڵێ ئاگرینی دەروونی بهێنێتە سەر زمان و بیکاتە پەیام. یەکەمین شانۆنامەی بە ناوی (ئۆلۆفی مامۆستا)یە شەش مانگ پاش نووسینی دەخرێتە سەر تەختەی شانۆ.

ستریندبێری بۆ ماوەیەک دەست بەکاری ڕۆژنامەنووسی دەکات و دەبینێت نانی ژیانی نادات، بۆیە بە دوای کارێکی تردادەگەڕێت،لە کتێبخانەی پاشایی لە ستۆکهۆڵم کاری دەست کەوت و فرەتر کاتی بۆ خوێندنەوە و نووسین دەڕەخسێت. لە ساڵی ١٨٧٠ ز، لە تەمەنی بیست و یەک ساڵیدا خەڵاتی ئەکادیمی سویدی وەرگرت و شێوەیەکی نوێ و کاریگەر لە درامانووسیندا دەهێنێتە ئاراوە. ستریندبێری سێ جار ژن دەهێنێت، یەکەمیان لە ساڵی ١٨٧٧ز، دەبێت و لەساڵی ١٨٨٣ ز، لە یەکتر جیادەبنەوە. لە هەمان ساڵدا بۆ سەردانی مەڵبەندە هونەرییەکانی ئەورووپا بۆ چەند وڵاتێک سەفەر دەکات و بۆ ماوەیەک لە سویسرا دەمێنێتەوە لەوێ ڕۆمانی (زەماوەند) دەنووسێت و پاش ماوەیەک کۆتایی بە گەشتە پڕ بایەخەکەی دەهێنێت و بۆ سوید دەگەڕێتەوە. ساڵی ١٨٨٧ ز، شانۆنامەی (باوک) دەنووسێت و بە سەرکەوتوویی دەخرێتە سەر شانۆ. لە شانۆنامە بەناوبانگەکانی تری وەک:

١ - شانۆنامەی سەمای مەرگ.

٢ - شانۆنامەی خەون.

٣ -شانۆنامەی سوناتی تارمایی.

٤ - شانۆنامەی داخوازیکەران.
٥ - شانۆنامەی خانم ژولیە.
٦ - شانۆنامەی بەرەو دیمەشق.
٧ - شانۆنامەی دانپیانانی گێلێک.
٨ - شانۆنامەی دۆزەخ.

ڕێگای دیمەشق شانۆنامەیەکی ڕەمزی و سێ بەشییە واتە تریلۆژییە. ئەم درامانەشی لە کاتی ڕۆژ ئاوابوونی تەمەنی پڕ لە تراژیدیایدا دەنووسێت. ستریندبێری داهێنەر ساڵەکانی ١٩٠٠ ز، شانۆی دێسا لە شاری ستۆکهۆلم دادەمەزرێنێ و بەرهەمەکانی خۆی تێیدا پێشکەش بە بینەران دەکات.

ساڵەکانی کۆتایی تەمەنی بە تەنیایی و هێمنی بەسەر دەبات، لە چواردەی مانگی مایسی ١٩١٢ز، مۆمی تەمەنی دەکوژێتەوە و ماڵئاوایی لە شانۆ و ژیان دەکات.

٢٣- هێنریک ئیبسن (Henrik Ibsen)

شانۆنامەنووسی بەناوبانگ و ناو پرشنگداری نەرویژی لە ساڵی ١٨٢٨ ز، لە شارێکی بچووکی باشووری نەرویژ کە ناوی سکینە، چاوی بە دنیا هەڵهێناوە.

باوکی یەکێک لە بازرگانەکانی نەرویژ دەبێت. هێنریک سەردەمی منداڵیەتی خۆی لە گوند بەسەر دەبات و لە گەڵ کولتووری گوندیدا ئاشنایەتی و پێوەندی پەیدا دەکات. زۆر نابات باوکی لە بازرگانیدا زەرەر دەکات و هەژاری و نارەحەتی ناوچاویان دەگرێت. لەبەر دەستکورتی و بە ناچاری لە کەلاوەیەکدا ژیان بەسەر دەبەن. هێنریکی منداڵ هێدی هێدی بە ژیانی هەژاری ڕادێت و زۆر حەز لە وێنە کێشان دەکات، ماوەیەک سەرگەرمی ئەم هونەرە دەبێت، پاشان لەبەر نەبوونی توانای دارایی و دەستکورتی وازی لێ دەهێنێت.

لە تەمەنی پازدە ساڵیدا لە دوکانێکی دەرمانفرۆشیدا بۆ ماوەی پێنج ساڵی ڕەبەق کار دەکات و لەولاشەوە خۆی بۆ خوێندن و تاقیکردنەوەی زانکۆ ئامادە دەکات. ماوەیەک بە خوێندنەوەی مێژووی ڕۆم و وتارەکانی سیسرونی وتاربێژ و سیاسەتمەداری ناسراوی ڕۆم و ڕووداوەکانی شۆڕشی فەرەنسی ساڵی ١٨٤٨ ز، سەرگەرم دەبێت. خوێندنەوەی ئەوانە کاری تێدەکەن کە شانۆنامەی (کاتیلنا) لە ساڵی ١٨٥٠ ز، بنووسێت. بە هاوکاری یەکێک لە هاوڕێکانی لە شانۆیەکی شاری بێرگن کاری دەست دەکەوێت و بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە گەرمی سەرقاڵی کاری شانۆ دەبێت و لەوماوەیەدا چەند شانۆنامەیەک دەنووسێت و لەسەر ئەو شانۆیە نیشان دەدرێت . پاش پێنج ساڵ کارکردن شانۆکە هەرەس دێنێت و دادەخرێت. هێنریکی داهێنەر جۆرێکی نوێی هێنایە هونەری شانۆوە کاتێ کە لە شانۆی شاری کریستیانا (کە ئەمڕۆ بە ئۆسلۆ ناو دەبرێت) کار دەکات. لەو ساڵانەدا ژن دەهێنێت و پاش ماوەیەک بۆی دەردەکەوێت کە لە ژیانی ژن و مێردایەتیدا ئاسوودە و خۆشحاڵ نابێت، لەشانۆنامەی (کۆمیدیای عەشق) دا سووکایەتی بە ژیانی خێزانداری دەکات، شانۆگەرییەکە دەبێتە هۆی ئاژاوە و نارەزایی بینەران، تا لە ئەنجامدا ڕێ لە نیشاندانی دەگیرێت.

لە زۆربەی دراماکاندارەخنەی لە خوونەریتی کۆن و خراپی کۆمەلایەتی و ڕووداوی سیاسی دەگرێت. لە ساڵی١٨٦٤ ز، کە تەمەنی سی و شەش ساڵ دەبێت لە داخ و ڕقی فەرمانڕەوایانی وڵات نیشتمان بەجێ دەهێڵێ و بۆماوەی چوار ساڵ لە ئیتالیا ژیان بەسەر دەبات. لە ئیتالیا شانۆنامەی (براند) و شانۆنامەی (پێرگنت) دەنووسێت. لەم درامایانەدا توانایی ئەو لە نووسین و داهێناندا نیشان دەدات و بەتوندی هێرش دەباتە سەر دەسەلاتدارانی نەرویژ. لە ساڵی ١٨٧٩ ز، شانۆنامەی (ماڵی بووکەڵە) و ساڵێک دواتر شانۆنامەی (تارماییەکان) دەنووسێت. لە ساڵی ١٨٨٢ ز، شانۆنامەی (دوژمنی گەل) و لە ساڵی ١٨٨٤ شانۆنامەی (مراوی ڕەمەکی)، دەنووسێت. ئەم درامایانە ئاوێنەی بیر و فکری هێنریکی مەزن و دڵسۆزی گەلن. هێنریک ئازار و ماندوبوونی زۆری بە نووسینی دراماکانییەوە دەچێشت، جاری وا هەبووە مانگان و ساڵان مەستی بیرکردنەوە دەبوو. لە شانۆنامەکانی تری ئیبسێن:

١ - شانۆنامەی معمار.
٢ - شانۆنامەی هێدا گابلێر.
٣ - شانۆنامەی ئینگری خانم.
٤ - شانۆنامەی داخوازیانی تاج و تەخت.
٥ - شانۆنامەی میوانداری سولهاگ.
٦ - شانۆنامەی ئیمپراتۆر و مەزنی.
٧ - شانۆنامەی ڕوس مێرس هۆلم.
٨ - شانۆنامەی جان گابریل بورکمان.
٩ - شانۆنامەی ڤیکینگەکان لە هێلگلاند.
١٠ - شانۆنامەی دکتۆر ستۆکمان.

هێنریکی مەزن هەمیشە سەرقاڵی خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە دەبێت، بە چاوی ڕەخنەوە سەیری ڕووداوەکان دەکات. ئەم هونەرمەندە نەمرەی کە هەمیشە دراماکانی لەسەر شانۆکانی جیهان نیشان دەدرێن، لە بیست و سێی مانگی مایسی ١٩٠٦ ز، لە شاری ئۆسلۆ دڵە پڕ میهرەکەی لە لێدان دەوەستێت و دەمرێ.

# دوو چیرۆكنووس لەبارەی ئەدەبی منداڵانەوە دەدوێن

لای هەموومان ئاشكرایە منداڵانی كورد لە هەموو كایەكانی وەك (نووسین، هونەر، رۆژنامەگەری) تا بە ئەمڕۆكە دەگات كارێكی بەرچاو و شایەنی باسیان بۆ نەكراوە، تا ئەو كەلێنە گرنگانەیان بۆ پڕ بكرێتەوە، ئەوە باسی پەروەردەیەكی سەردەمیانە و هاوچەرخ ناكەین كە چەند تێیدا كەمتەرخەمین، ئەوەی لەو بوارەشدا كراوە زیاتر كاری پەرشوبلاو و تاكەكەسین، كە پێویستە بۆ لەمەولا نەك خۆمانی لێ نەبوێرین، بگرە بە بەرنامەیەكی تێروتەسەلەوە كاری بۆ بكەین و بەپێی پێویست جێ پەنجەمان بەسەر كەسایەتی پیاوان و ژنانی پاشەڕۆژدەوە هەبێ.. لەم راپرسینەدا دوو چیرۆكنووسی دیار و بەرچاوی شاری سلێمانیمان بەسەركردەوە كە خۆیشیان كەم تا زۆر بەشدارییان لەو بوارەدا هەیە..

سەرەتا لە بەڕێز (ئەحمەد سەید عەلی بەرزنجی)یمان پرسی ئەدەبی منداڵان چۆن سوود لە ئەفسانە و داستان و حیكایەتی كوردی وەردەگرێ.. لە وەڵامدا گوتی:

– بەر لە هەمووشتێ ئەم سێ توخمە لە ڕەگەزە ئەدەبییە كەلەپوورییەكان بە سەرەتای سەرهەڵدانی ئەدەب دادەنرێن و دیارە ئەم سەرەتایەش تابلێی سادەو ساكارەو لەگەڵ هۆش و بیركردنەوەو بۆچوونی ئینسانی سەردەمی خۆیدا گونجاون و دووربوون لە قورسی و ئاڵۆزی و تەم و مژەوە.

كە ئەم لایەنە تایبەتیانەی ئەوسێ ڕەگەزەمان باسكرد، ئەوا لە خۆیانەوە دەبنە تایبەتمەندییەكانی چۆنێتی نووسینی ئەدەبی منداڵان، یانیش بە مانایەكی تر ئەفسانەو داستان و حیكایەت (لەلای هەر میللەت و نەتەوەیەك) باشترین زەخیرەی پێكهاتنی ئەدەبی منداڵانەو لەمەودایەكی فراوان و باڵادا دەتوانرێ سوودیان لێ وەرگیرێ و ببنە سەرچاوەو هەوێنێ بۆ پێكهێنانی ئەو ئەدەبە بەگشتی و ماددەیەكی لەبارو دەوڵەمەند لە شانۆی منداڵاندا.



كوردیش، هەروەك هەموو نەتەوە ڕۆژهەڵاتییە دێرینەكان بەپێی سروشتی وڵاتەكەی و پێوەندیی پتەوی هەزاران ساڵەی لەگەڵ گەلانی دراوسێ و ڕۆژهەڵاتی دووردا، دەبینین خاوەنی دەیان ئەفسانەو داستان و حیكایەتی بەبرشت و بەرزە، هەر ئەوەندەشی لەو نەتەوانەی دەوروبەرییەوە بۆ ماوەتەوەو وەك جۆگەیەكی سەرەكی ڕژاوەتە ڕووباری ئەو كەلەپوورە دەوڵەمەندەیەوە.

جا لێرەدا پرسیارێ خۆی دەسەپێنێ: ئایا تاچ رادەیەك نووسەرو خاوەن قەڵەمی كورد (لە بواری ئەدەبی منداڵاندا) توانیویەتی سوود لەم سامانە بە نرخە وەرگرێ و لە ئەدەبێكی منداڵاندا بیرەخسێنێ و بیخاتە سەر سامانی ئەدەبەكەی بەگشتی؟

وەلاّم بۆ ئەم پرسیارە (بەداخەوە) دڵ خۆش ناکاو ئەوەمان نادات بەدەستەوە کە کۆمەڵە بەرهەمێ بژمێرین و وەک نموونە کە نووسەری کورد کردوویانە بابەتێک و پێشکەشی منداڵانی کردبن، سا وەک نووسین یان لەسەر شانۆ.

ئەم کەم تەرخەمییە نەک ئەدەبی منداڵان بەتەنیا دەگرێتەوە بەڵکو لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا بەگشتی ئەم دیاردەیە دەبینین و دیارە ئەمەش ئەنگییەکە لە ئەدەبەکەماندا.

میللەتانی تر لایەکی چاکیان لەم بوارە کردۆتەوە، سەدان کتێب و شانۆنامەو فیلمی کارتۆنی لە چوارچێوەی ئەقڵ و بیرو مەودای بۆچوونی منداڵدا پێشکەش کراوەو خراوەتە بەر چاو و دەستی منداڵان، بۆ جاری سێیەمە کە ئەفسانەی (کچە پاشاو حەوت کورتە بالاّ) لە شێوەی فیلمێکی کارتۆندا بە زنجیرە، لە کەناڵە تەلەفیزیۆنییە جیهانییەکانەوە پیشان دەدرێ، ئەمجارەیان لەبەرگێکی بەرزی دەربڕین و هونەری ڕەسمکردنی بەرزدا کە هەشت هونەرمەندی وڵاتی رووسیا تێیدا بەشدار بوون... ئەمە وەک نموونەیەک کە ژیان و ژیاریی گەلان تا بەرەو پێشەوە بروا، ناتوانێ دەستبەرداری ئەو سامانە بەنرخە بەرزانەی مرۆڤایەتی ببێ و هەر بە سەرچاوەیەکی بەبرشت دەمێننەوە.

* ڕۆژنامەو گۆڤاری منداڵان و چۆنێتییان؟

– پرۆژەی دامەزراندنی دەزگایەکی تایبەت بە چاپەمەنی بۆ منداڵان، کارێکی قورس و گرانە، چونکە مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵدا خۆی لە خۆیدا لەباری و شارەزایی و لێ زانینی دەوێ، ئەی ئاخۆ ئەگەر مەسەلەکە پێوەندیی بە دامەزراوێکی بواری ئەدەبی منداڵانەوە هەبێ؟

ئەم لایەنە (دەرکردنی ڕۆژنامەو گۆڤار بۆ منداڵ) تا ئێستاش لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا هەر جێگای تێرامان و لێکۆڵینەوەیەو بەڕای خۆیان نەگەیشتوونەتە ئەو ئاستەی کە بەشێوەیەکی دروست بۆ منداڵ بنووسن و بدوێن و ڕەسم بکەن (بچنە ناو ئەقڵ و ویژدان و دنیا سەیرەکەیەوە).

(إصدار مطبوع للأطفال) یەکێکە لەو لێکۆڵینەوەو نامە دوکتۆراییەی کە (منصور البكري) لە زانکۆی شتوتگارتی ئەڵمانی پێشکەشی کردووە، لەم ساڵانەی دواییدا، ئەو بە گەواهی سەرچاوەو شارەزایانی (٣٥) مەڵبەندی ئەدەبی منداڵان، سەرەنجام دەگاتە ئەوەی کە مامۆستاکەی (ماریا منتسووری) پێی دەڵێ: دنیای گەورەکان هێشتا بەزەیی بە دنیای بچووکەکاندا نەهاتۆتەوە، نووسین بۆیان و دوان لەگەڵیان هێشتا زۆری ماوە.

ئەگەر ئەمە بکەینە نموونەیەک لەلای گەلانی پێشکەوتوو، ئاخۆ ئێمە دەبێ چۆن بجووڵێین و بیر لە پرۆژەیەکی بلاوکراوەی منداڵان بکەینەوە؟

من ناڵێم ئێمە با لە هەموو بارەیەکەوە تەواو بین، چونکە نە ئەمە دەکرێ و نە لە تواناشدایە، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە: ڕەچاوکردنی بنەما سەرەتاییەکانی (نووسین و ڕەسمکردن و چاپکردن بۆ منداڵ) با پشت گوێ نەخەین، چاوخشاندنێک بە (هەنگ و پەپوولەو جریوەو...) ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە منداڵی بەسەزمان لە میحنەتدایە بەدەست ئەو گۆڤارانەی بە بیرو بۆچوونێکی (گەورە)وە نووسراو و چاپکراون، بەلاّم بەناوی ناهەق ناوی (منداڵان) یان لێ نراوە... من تەنیا پێشنیارێ دەکەم بۆ ئەوە بر[illegible] ڤارێ[illegible]ی تایبەت بە منداڵ دەردەکەن کە با بگەڕێنەوە بۆ تاقیکردنەوەکەی (ماکسیم گۆرکی) زیاتر لە حەفتا ساڵ لەمەوبەر کە کاتێ ویستیان گۆڤارێ بۆ منداڵان دەرکەن، پرسیارێکی لە ڕۆژنامەکانی ئەو [illegible] منداڵان کرد: چیتان بۆ بنووسین؟ لە دوای بلاوبوونەوەی ئەمە، سەدان و هەزاران نامەی منداڵانیان بۆ هات و هەر یەکە شتێکی داوادەکردو شتێکی پێشنیار دەکرد، هەمووشیان بەشداربوون لەو پرۆژە مەزنەدا.

گۆرکی وتەنی: جێگای خەوش و نیگەرانی نییە گەر پیاو بگەڕێتەوە بۆ پرس و ڕاکردن لە منداڵان و دوایی بە قسەشیان بکات، چونکە ئەوان خۆیان دەزانن چییان دەوێ.

* ئەوەی نووسراوە لە ئەدەبی منداڵان لەلای خۆمان تا چ ڕادەیەک خزمەتی بەو ئەدەبە کردووە؟

– لەلای خۆمان، وەک لە لێکۆڵینەوەی (ئەدەبی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژ)دا هەر لەم گۆڤارەدا وتوومە کە ئەدەبی منداڵانی کورد ڕەگ و بنەمای لەوکاتانەوە سەری هەڵداوە کە لە گوێ ئاگردانەکانی باپیرەو نەنکەکانی جگەر گۆشەکانیان پێ دەکردنە خەو، لە دوای سییەکانی ئەم چەرخەشەوە نووسین و نامیلکەو کتێبی تایبەت بە منداڵ کەوتە ناوناوانەوە، لە حەفتاکانیشەوە گۆڤاری تایبەت بە منداڵان و کۆمەڵە چیرۆک و شانۆ و شانۆگەریی منداڵان سەریان هەڵداو ئیدی کەم کەم نووسین بۆ منداڵ پەرەی دەسەند.

هەرچەند لەچاو گەلانی دراوسێ و دووردا ئەوەی هەیە

لەو جۆرە ئەدەبە هێشتا زۆر کەمە، بەڵام ناوبەناو بەرهەمی چاک و پوختیشی تێدایە کە دەشێ ببنە بنەمای نووسینێکی پوخت بۆ منداڵانی کورد.

ئەوەی جێی سەرنجە لەو جۆرە نووسینەدا ئەوەیە کە نووسەرەکانی (نووسین بۆ منداڵ و نووسین بۆ گەورە) تێکەڵ دەکەن و زۆرجار ڕەگەزەکەیان لەبیر دەچێ و زۆر بەرهەمی منداڵ هەیە کە هەر بەناو بۆ منداڵە، ئەگینا لە گەورەکانەوە نێزیکترە.

* کەی بەرهەمی نووسراو بۆ منداڵ دەگاتە ئەوەی کە مەبەستەکەی بپێکێ. چۆن بۆ منداڵ بنووسرێ؟

– یەکێ لەو دەردانەی تووشی نووسینی تایبەت بە منداڵان بووە ئەوە بوو کە لە کۆتایی وەڵامی پرسیاری پێشوودا دەستنیشان کرا، ئەویش ئەوەبوو جیاوازی نەکردنی نووسەر لەنێوان نووسین بۆ منداڵ یا گەورە، کە نووسەر بە بێهوودە دەستی دایە قەڵەم و هەر بەمەبەستی ئەوەی کە بەرهەمێک بدات، دیارە لە مەبەستی بنیاتنەرانە دوورەوە دەکەوێت، منداڵ وەک گەورە نییە، توندوتیژی لەبیروبۆچوونی نووسەردا نابێ تێکەڵ بە شیعرێ یا چیرۆکێ بکرێ و بە (منداڵەکان..) دەستی بداتێ و ناوی (شیعر بۆ منداڵان)ی لێ بنێ.

نووسەری وامان هەیە دەیەوێ منداڵەکانیش والێ بکات وەک خۆی بیر بکەنەوە، لەمەدا دەڵێم وازیان لێ بهێنن، دنیا جوان و ڕەنگینەکەیان تێک مەدەن، ڕێنماییەکی کەم و باوەشێنێکی زۆر، تا پەڕە ناسکەکانی خونچەی هەست و بۆچوونیان کەم کەم لەسەرەخۆ بگەشێتەوە.

خۆ ئێمە نامانەوێ (طلائع) و (فتوە)کانی جاران دووبارەکەینەوە، با منداڵەکان بە گوڵ و درەخت و شاخ و بەفرو خوڕەی ئاو و شمشاڵی شوانەکان ئاشنابن، با لە ئەفسانەو حیکایەتە کۆنەکانەوە مانای نرخ و بەهای مرۆڤانەی خۆیان بزانن و وڵات و لانەی خۆیان خۆشبوێ.

دیارە دەبێ وەستایانەش دەست ببرێ بۆ ئەو ئەفسانەو حیکایەتە کەلەپوورییانەو بە دیقەتەوە هەڵیان بژێرین، حیکایەتی سەرکەوتوو ئەوەیە کە سەرنجی منداڵان ڕاکێشێ بۆ لای خۆی و هەستی خۆشی و شادی تێدا بەرپا بکات و وا بکات کە حەز بە پەیبردن بەشتە شاراوەو نهێنییەکان بکات و گیانی پرسیارکردنی تێدا بژیەنێ.

زۆربەی ئەفسانەکان کۆتاییەکی خەمناک و حەسرەتبار دەدەن بەدەستەوە. بەڵام حیکایەتەکان، بەزۆری، کۆتاییەکی خۆش و بەختەوەر ئامێز دەهێننەدی، ئا لەم زانینەوە دەتوانین لەو دوو لایەنەدا کامیان بکەینە زادەی بەرهەمێکی ئەدەبی (چیرۆک، شیعر، شانۆگەری) بۆ منداڵان و ڕەخساندنی.. کە ئەمە دەڵێم دەبێ لە دەوروبەرو ڕووداوە بەرچاوەکانی ڕۆژانەو دیاردەکانی ژیانی سەردەمیشمان چیرۆک و بابەتی واقیعی و ڕیالیزمی بقۆزینەوەو بیانکەینە هەوێنی نووسینەکانمان، چونکە چیرۆکی واقیعی لایەنە هوشیارو ئەقڵ ئامێزەکانی ژیان دەپێکێ و منداڵیش (لە پلەوقۆناغێکی باڵایدا) زیاتر سوودی لێ وەردەگرێ و دەبێتە شتێکی نموونەیی لە بیرو هەستیدا، بەڵام هەرچی حیکایەتە (بەتایبەت خەرافییەکانی)، ئەوە بەشی سۆزو هەستی منداڵ دەبزوێنێ، بۆیە ئەمانەش لە تەمەنێکی دیاریکراوی منداڵیدا) پێویستن، چونکە مرۆڤ تێیاندا پاڵەوانی سەرەکییە بە هەموو پێداویستی و بەگژداچوون و خواستەکانییەوە.

کە ئێمە جەخت لەسەر ئەم ڕێنماییانە دەکەینەوە بۆ نووسینی سوودمەند لە ئەدەبی منداڵدا، دەبێ لەوەش بێ ئاگا نەبین کە دنیای ئەمڕۆ ئەو دنیایەی (٢٠-٣٠) ساڵ لەمەوبەر نییە، منداڵی ئەمڕۆ ئاسۆی بیرو زانین و شارەزابوونی گەلێ فراوانترە، دنیاکەی دوێنێ ئەگەر ناوماڵ و قوتابخانەو کۆڵانی گەڕەک و شارەکەی بووبێ، ئەمڕۆ هەموو گۆی زەوی و هەسارەو مانگ و ئاسمان دنیای ئەوەو مەودای بیرکردنەوەی بە ئەندازەی فراوانی ئەوانەن.

هۆی ئەمەش دیارە، ئەو پێشکەوتن و شۆڕشە کاریگەرەی لە دنیای ڕاگەیاندن و گەیاندندا بەرپابووە، کۆمپیوتەرو (یارییەکانی منداڵان کە لە بنەمای ئەم زانستەوەن) سەتەلایت و تەلەفزیۆن... ئەمانە هەمووی زادەی زانستی بیری منداڵی ئەمڕۆن.

بۆیە دەبێ بابەتەکانی نووسینی تایبەت بەمنداڵی ئەمڕۆ بەدەرنەبێ لە پێناسین و باسکردن و ڕاڤەکردن و ئاشناکردنیان بەمانە، ئەم ئەرکەش لە ڕێی (وەرگێڕان)ەوە زیاتر دێتەدی، چونکە هێشتا ئەم زانستییانە لەلای نووسەرانمان نادیارو تەماوین، بۆیە لایەنی وەرگێڕانیش لەو بابەتە گرنگ و ناسکانەیە کە گۆڤاری تایبەت بە منداڵان دەبێ گرنگیی پێ بدات و بەگوێرەیەک کە هەموو ژمارەیەک بەدەرنەبێ لە باسێک لەو باسانە، خۆ ئەگەر لەڕێی چیرۆکیشەوە بێ یان وەک باسێکی ئاسانکراوی ڕوون و ئاشکرا.

**لەبارەی ئاست و کاریگەریی ڕۆژنامەگەری منداڵان بەسەر منداڵی کوردەوە بەڕێز (ڕەوف حەسەن) گوتی:**

پێم سەیرە (سەروتار) لە ڕۆژنامەدا هەبێت.. کە بەڕاستی کەس بایەخی پێنادات. کەچی لە (ڕۆژنامە) یان (گۆڤاری) منداڵاندا گەلێ جار سەروتار دەبینم.. بێگومان ئەوکارە لەوپەڕی نامۆبوونەودیە بە جیهانی منداڵان و سایکۆلۆژیتیی منداڵ.. چونکە منداڵ نەک هەر بەلایدا ناچێت.. بەڵکو گومان لە بابەتەکانی دیکەش پەیدا دەکات کە دیارە ئەو دەزگایەی چاپەمەنییەکەی بۆ دەردەکات.. نەخشەو پیلانێکی خراپی لەژێر سەردایەو جیهانە پڕ لە بەرائەت و خۆڕسکییەکەی لێدەشێوێنێت.. بۆیە یەکسەر گشت ئامۆژگارییەکانی نێو سەر وتارەکەو تەنانەت هی نێو بابەتەکانی دیکەش ڕەت دەکاتەوە..

منداڵ لەنێو ڕۆژنامەگەریی تایبەت بەخۆیدا بەپلەی یەکەم ئەو هەواڵانەی دەوێت کە باس لە کردارو ڕەفتارە سەیروسەمەرەکانی منداڵانی وڵاتان و دەوروبەری خۆی دەکات.. ئەمجا ئەو بابەتانەی لە فیلمەکارتۆنی و لەجیهانی ئاژەڵ و باڵندەو دەریاو ئاسماندا ڕوویان داوە.. کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە ڕەفتارە گرینگ و سەرسوڕهێنەردکان سوود وەردەگرێت و لاساییشیان دەکاتەودو ڕەفتارە ناپەسەندەکانیش ڕەت دەکاتەوە..

جیهانی ڕۆژنامەگەریی منداڵ نەک هەر پێویستە پڕ لەوێنەی سەرنجڕاکێش بێت.. بەڵکو وێنەکانیش پڕ لە جووڵەو زیندەگی بن. ئەو دیمەنی سروشتی جوانی پێ باش نییە.. دەخوازێت ئەو وێنە سروشتییە پڕ لە سیحرو پەنهانی بێت.. کە سەیری کرد یەکسەر بەهەست و نەستەوە بچێتە نێویەوەو تێیدا بەدووی نهێنییەکاندا بگەڕێت.

چ لە ڕۆژنامەی تایبەت بەخۆی و چ لەگشت بەرنامەکاندا کە تایبەتن بەمنداڵ.. منداڵ بەدووی زانستدا دەگەڕێت.. هەزاران پرسیاری لایەو وەڵامی هیچیانی لا نییە.. دەزانێت و لە ئاوێنەدا دەبینێت دووچاوی هەیە.. یان دوو گوێی هەیە.. دەستیشیان لێدەدات.. بەڵام هەرگیز ناخوازێت وەک چۆن لەوانەی (زانیاری)دا باسیان لێوە دەکرێت، ئاوا فێربێت.. بەو ویشکی وبرینگییە.. بەڵکو دەخوازێت جیهانێک دروستکرابێت ناوی جیهانی چاوبێت.. خۆی بچێتە نێوی و تێیدا هەموو کون و کەلەبەرەکانی بپشکنێ.. جا ئەمە بە واقیعی بێت یان لە تەلەڤزیۆندا یاخود لە شانۆدا.. ئەو حەز دەکات لەڕێی یاریکردنەوەو بە ناڕاستەوخۆ وەڵامی پرسیارەکانی چنگکەوێت.

منداڵ شتە بێ هەست و مردووەکانی نێو سروشت تێکرا بە زیندوو دەزانێت... دەیەوێت قسەیان لەگەڵدا بکات.. هەموویان بجووڵێن و هەست بەشتەکان بکەن.. ئەو چەقۆیەی دەستی بریندار کردووە.. یان ئەو بەردەی پێی لێیهەڵکەوتووە.. یان ئەو زۆپایەی کراسەکەی سووتاندووە.. تۆڵەیان لێبکاتەوە، بەچەپۆک یان بەدار (تەع) یان بکات (لێیان بدات).. یاخود ئەو شتانەی دڵخۆشی کردوون لە باوەشیان بخات و بیانشوات و خۆشەویستیی خۆیان بۆ دەربڕێت.

منداڵ دەخوازێت مانگ و ئەستێرەو خۆرو ڕەشەباو بەفرو باران و تەرزە.. بدوێن و نهێنی دەربڕن.. ئەدی نابینی شاعیر هەیە بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت چۆتە نێو ئەو جیهانەوەو جریوەی ئەستێرەکان دەبیسێ.. بەفر دێنێتە زمان.. ئاه و ناڵەی مانگ و تەنیایی شەو دەلاوێنێتەوە!! یاخود پارچە شووشەیەک دێنێتە زمان!

ڕۆژنامەگەریی منداڵ پێویستی بەوە نییە باسی جیاوازیی چینایەتی و چەوساندنەوەی مرۆڤ بەدەستی مرۆڤی بۆ بکەین.. ئەو دەیەوێت چیرۆکی پڕ لە سیحرو تۆڵەی ئەو منداڵ و دایک و باوکانە بیسێت کە چۆن برسی و ڕدش و ڕووت کراون و.. چۆن پاشاو میران ئازاریان دەددن و خوێنیان دەمژن.. ئەوجا چۆن تۆڵەیان لێدەسێنرێتەوەو ئەگەر کۆتایی چیرۆکەکان بەوجۆرە نەبن دوور نییە منداڵ تووشی خەمۆکی و نەخۆشیی دەروونی دیکە بێن.. بۆیێ دەبێت ئەو منداڵەی لەسەرما ڕەق دەبێتەوە.. یان لەبرسا دەمرێت.. بەپێچەوانەی یاسای سروشتیی مەرگ.. دەبێت لەکۆتاییدا زیندوو بێتەوە، بە



بەرگی جوان و خۆراکی چاک شادبێتەوە، واتا بەگشتی نابێت ئەو ئاژەڵ و باڵندەو مرۆڤ و بووکەشووشانەی منداڵ هۆگریان دەبێت بمرن، بسووتێن، بکوژرێن و دوایی بۆ هەتاهەتا نەمێنن، چونکە ئەو وەک فیلمە کارتۆنییەکان دەیانبینێ و ئەگەر دەبابەش بەسەریاندا بڕوات و پان و پلشیش ببنەوە.. هەر بە گوژمێک، یان خۆ ڕاوەشاندنێک، وەک خۆیان لێدێتەوەو جارێکی دی دەچنەوە نێو شەڕەشەق و زۆرانبازییەکانەوە.

منداڵ حەزی لە باسی نیشتمانپەروەری نییە.. بڕوای بەجوگرافیا نییە.. سروودو چەمکە نیشتمانییەکان بەزۆر لەبەر دەکات و ناشزانێ یاخود هەست بە واتاکانی ناکات.. نەتەوەش هەروەها.. ئەو تەنیا لە ماڵ و خانوو، یان ژوورەکەیان تێدەگات.. ئەوە نیشتمانە گچکەکەیەتی و نەتەوەش دایک و باوک و خوشک و براو هەندێ لە منداڵەکانی گەڕەکەکەیەتی.

ئیدی ئەوەی وەزعیان لێ تێکدەدات دوژمن و داگیرکەرە.. ئەگەر لەگەڕەکێکی دیکەشەوە بێت.. ولاتپارێزی لای منداڵ لە پارێزگاری کردنی ژوورو خانووەکەیان و کەس و کارییەوەیە بەرامبەر شالاوی گەلەگورگ. واتا منداڵ دوو جیهانی یەکلاکەرەوەی هەیە.. جیهانی خۆشەویستی: گشت ئەوانەی خۆشی دەوێن.. بەگیاندارو بێگیانەوە.. جیهانی ڕق.. لە گشت ئەوانەی دژیانن یان ئازاریان دەدەن.. واتا جیهانێکی بێلایەن نییە.. یان (میکی)یە، یان (ماوس)ە.. یاخود یان (پەپوولە)یە یان (گورگ).

منداڵ دەخوازێت دراو لە ئارادا نەبێت و هەرچی شتێک لە بازاڕدا هەیەو حەزی لێیەتی بەخۆڕایی بێت.. کە دەست دەداتە مۆزێک، تۆپێک، بووکە شووشەیەک.. شەمەندەفەرێکی منداڵانە.. نوقڵێک سەعاتێک..... تاد، دووکاندار لە دەستی دەسێنێتەوە، بەرامبەر جیهان تووڕە دەبێت.. دەگری.. و ڕک دەگرێت.. گرۆزی دەکات.. ئیلاو بیللا هەر دەیەوێت و دەیەوێت.. کە دواجار بەدەستی ناکات..ئەوسا بێدەنگ هەست بە دڕندەیی ژیان دەکات.. کە دەرگە داخراوەکان دەبینێ و ڕێی نادەن لێیانەوە بچێتە ژوور.. هەست بە خنکاندنی ئازادییەکان دەکات.. دەخوازێت ببێتە دەعبایەکی نەهێنی.. وزەی لە ڕادەبەدەری هەبێت.. تا بە ڕێگەی تایبەتی خۆی دەرگە داخراوەکان ببڕێت و ئەو دیوبان تەی بکات.. لە شارێکەوە بفڕێت بۆ ئەوی دی و بەزووترین کات و بەبێ لەمپەرو ڕێگر بگاتە لای کەسێکی زیندانیکراوی، یان دوورە ولاتی..

منداڵ لەوە بێگومانە کە گیانداران (ئاژەڵ و باڵندەو مێروو...) دەدوێن.. ئەمە خۆی لەخۆیدا هیچ سیحرێکی تێدا نییە.. بەڵکو چاوەڕوانی کاروفرمان و ڕەفتاری لە ئاسایی بەدەرو سەرسوڕهێنەریشیان لێ دەکات.. ئەو چاوەڕوانیی ئەو کۆترە.. یان ئەو قازەیە کە بە ئاسانی ئەم دەخاتە سەر شاپەڕی باڵی.. یان ملی و بەسەلامەتی دەیگەیەنێتە ئەو جێیەی مەبەستێتی.. دەخوازێت هەر چەند تاڵە موویەکی ئەسپی باو بۆرانت هەڵکرووزاند.. ئامادەبێت ڕێگەی حەوشەو حەوت ڕۆژی بە ساتەوەختێک بۆ ببڕێت.. چاوەڕوانی ئەو هەڵۆو بازەیە ژووری کچە پاشای لە شیرین خەودا بۆ بێنێتە ماڵەوە.. ئەمە جگە لەوەی خەیاڵی منداڵ.. ئەندێشەکانی منداڵ گەورەو گەورەتر دەکات و بچووکیش بچووکتر.. بۆیێ هەر بەخەیاڵ دەچێتە ئەو شارانەوە کە مرۆڤەکان تێیدا بالایان بەقەد کەوچکێکی چێشتە.. یان قەڵەمێکە.. یان مۆزێکەو.. شارەکەیان بە کولیرەیێک تێر دەکات.. هەندێکیان لەسەر لەپی دەستی ڕادەگرێت و ئاخاوتنی سیحراوییان لەگەڵدا دەکات.. خۆی دەبێتە پاڵەوانێک و بە دوو تەختە گەورەترین پردیان لەسەر جۆگەیێک بۆ دادەنێت و بەرەو شاری دوژمنەکانیان بەدووی خۆیان دەخات و بەسەریاندا سەریان دەخات.. یان ئەو ئاژەڵە دڕندانەیان بۆ لەناو دەبات کە جێی مەترسین و بەری خۆری لێگرتوون.. یان سەرچاوەی ئاوی لێگرتوون..

ئەمجۆرە خەیاڵ و ئەندێشانەو هەزارەهای دیکەی لەمانەش سەیرو سەمەرەتر.. دەبنە بنەمای دروستبوونی ئەو سیحرە ئەبەدییەی لە چیرۆک و ئەفسانەو حیکایەت و شیعرو شانۆیی منداڵاندا هەیە.. هەروەک چۆن بەشەرییەت لە قۆناغی منداڵیدا.. لەسەردەمانی گریک و بەر لە گریکیشدا.. چ لە داستانەکان و ئەفسانەکاندا و چ لە ئایینەکاندا ئەو سیحرە ئەبەدییەی خوڵقاندووە..

ئەسپی باو بۆران.. چەرخ و فەلەکی پیرێژن.. دێوەکەی نێو چرای سەندوباد (سندباد).. ئەسپەکەی تەروادە.. پەری و فریشتەکانی نێو حیکایەت و داستانەکان.. دێوەکەی سلێمان.. کلاوی سەخری جن.. زۆرانبازیی نێو خواوەندەکان.. گای باڵدار (الثورالمجنح)، کێوی قوللەی قاف دۆناو دۆنی مرۆڤ.. قامچی بەدەعەجانی کردن.. ئاوێنەی جیهانبین.

شارو ولاتی بن زەوی.. کاسەسەری قسەکەر.. سێوی ئاوسکەر.. دەنگە هەناری ئاوسکەر.. ژیان لە ورگی نەهەنگدا.. نەخنکان لە ئاوداو نەسووتان لە ئاگرداو..... هەزاران هەزار ئەفسانەی دیکە.. لە

ئەندێشەو خەونەکانی منداڵیدا دروستکراون و ئەفراندنی پڕ لە فانتازیای ئەوتۆیان بەرهەمهێناوە کە دواتر تێزو چەمکی فەلسەفیشیان لەسەر بنیات بنرێت و لە دواترینیشدا لە جیهانی زانست و تەکنۆلۆژیادا سەرتاپایان ببنە هەقیقەتی زانستی.

بەواتایەکی ڕوونتر و کورتتر.. ئەندێشەو خەیاڵی منداڵیی مرۆڤ و منداڵیش بەگشتی هێندەی پابەندی شتە سیحر ئامێزو سەرسورهێنەرە کانە.. هێندەش پابەندی کەشفکردنی نهێنییەکانە.. نهێنییەکانی سروشت و گەردوون و ژیان.. نهێنییەکانی زانست..

منداڵ دەیەوێت کاتژمێرەکەی دەستی، ئوتومبێلە گچکەکەی بووکە شووشە خلەخلکەرو گۆرانیبێژەکەی.. کە بەپاتری کاردەکەن.. دەخوازێت هەڵیانبوەشێنێت.. بزانێت چییان تێدایە.. چۆن کاردەکەن.. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێ کە منداڵ شەیدای زانستە... ئەگەر بۆی ڕوون نەکردێتەوە ئەوا خۆی لە زەینی خۆیدا تەفسیری سەیرو سەمەرەی بۆ دەکات و بەهیچ بابەتێکی زانستی ویشک و برینگ قایل نابێت.. ئەگەر بەتاقیکردنەوە نیشانی نەدەیت چۆن ئاو بە گەرمی دەبێتە هەڵم و بەسەر قاپی مەنجەڵەکەوە تنۆک تنۆک بە بەرچاوییەوە نەیەتە خوارەوە (نەبارێ)، یان دوو تەلی ساردو گەرمی کارەبا لەیەک نەدات و چەخماخەکە نەبینێ.. ئەوا تەفسیری باران و هەورە بروسکە هەر بە دەست فریشتەکان و قامچییەکانەوە دەمێنێتەوەو گەلێکیش پێی شادمانە.

ئەو دەخوازێت زانست بە گەمەکردن فێربێت.. پێدەچێت ئەم سەردەمە.. (سەردەمی کۆمپیوتەرو یارییەکانی کۆمپیووتەرو گەمەکانی ئینتەرنێت و ڕۆبۆت و.. ئامێرە ئۆتۆماتیکییەکان و.. تاد..) بەشی هەرە سەرەکیی حەزو ئارەزووەکانی منداڵ دابین بکات و بیانکاتە هاوڕێی تەمەنی خۆی.. چونکە هەریەکەیان دەوری دێوێک.. فریشتەیەک.. دەعبایەکی سیحری و بە وزەیەکی لە ڕادەبەدەر دەبینن.

ئەم گەمانە.. ئەو ئەندێشانە.. سەرجەم زیندەودرو ڕووەک و مادده ئەفسانەیی و پڕ لە سیحرەکان.. تا توخمی عەفەوییەت و بەرائەتیان پێوەبێت.. تا لە نکاوکاریی (مفاجاَة) و شادی بەخشینداین.. تا بە ئاسانی بەدەست منداڵەوە بێن.. تا بە تامەزرۆیی و پەرۆشەوە لەگەڵیدا بژین.. تا لەزەینیدا جێگە بگرن.. تا بە گوێگرتن بۆ بەسەرهاتەکانیان بە تاسەوە بێت.. ئەوا نەک هەر بەهاو کاریگەرێتییان لای منداڵ بزر نابێت.. بەڵکو لە تەمەنێکی هەورازتریشدا هەر لە تەکیاندا دژی.بەڵام کە بەرائەتەکەیان بزرکرد.. بوونە کەرەسەیەکی فانتازیایی و هونەری و ئایدیۆلۆژی. لەگەمە قەشەنگ و خۆڕسکەکە دابڕان و.. بوونە گەمەیەکی مەبەست و نەخشەدارو بە ئاسانی بەددست منداڵەوە نەهاتن.. بوونە کەرەسەی تەوزیفکراو لە شانۆو شیعرو ڕۆمان و چیرۆکداو بە زمانێکی دیکەی دوور لە زمانی منداڵ نووسرانەوەو وترانەوەو پێشکەشکران.. واتا ئەوکاتەی سەربەخۆیی و گەمەکارییە ڕەسەنەکەی خۆیان دۆڕان و چوونە خزمەتی مەبەست و کارێکی دیکەوە.. ئەوکاتە لە جیهانی منداڵ دادەبڕێن و دەبنە فەلسەفەو سایکۆلۆژیاو ئایدیۆلۆژیاو.. تاد..

بە پێچەوانەشەوە.. دەشێت ئەوکارە هونەرییە فەنتازیاو ئەفسانە ئامێزانەی کە بیروبۆچوون و داستان و تۆژینەوەی جۆراوجۆریان تێکەڵاو کراون.. جارێکی دی لەو مەبەستە ڕاستەوخۆیانەی خۆیان دابڕبکرێن و بەشێوازە بەرائەتئامێزەکەی خۆی و بەزمانێکی دی وەک شانۆ و چیرۆک و شیعرو حکایەت لەتەک منداڵدا بخرێنەوە گەمەکردنە قەشەنگەکەی خۆیان.

سەرجەمی ئەم گەمە کردنە منداڵانەییانە.. ئەم تەیکردنە منداڵانەییەی جیهان و نهێنییەکان.. کاری هەموو نووسەرێک نین.. ئەو نووسەرەی نەتوانێت خۆی لەگشت مەبەست و ئایدیۆلۆژیا جۆربەجۆرەکان قوتار بکات.. ئەو نووسەرەی نەتوانێت وەک منداڵ وڕک لە تاجی سەری پاشاکان بگرێت و لەسەریان داینەکەنێت.. ئەو نووسەردی نەتوانێت پەتی دیلانێ لە کەوانەی پرچی ئایشێ و فاتمە (پەڵکە زێڕینە) هەڵخات و نەتوانێ بەسەریدا خلیسکێنە بکات.. ئەوەی نەتوانێ لە ژوورەکەیدا گەمە لەگەڵ چەپکە تیشکی لوولەییدا بکات.... ئەوەی نەزانێت چۆن ئەوبەردەی باڵی چۆلەکەیەکی پێکاوە (تەعی) بکات و.. ئەو شووشەیەی پەنجەی منداڵێکی بڕیوە بەتۆڵە سەندنەوە بیشکێنێ و ئەوەی نەتوانێ قسە لەگەڵ ئەو دەرمانە تاڵەدا بکات و لەبەر چاوی منداڵ شیرینی بکات... ئەوە... ئەوە.. هەرگیز نابێتە نووسەری ئەدەبیات و هونەری منداڵ و تا هەتایە لە چەمکە پەتییە قێزەوەندەکاندا دەخولێتەوەو بەهۆنراوەی نیشتمانی و نەتەوەیی و ئامۆژگاریکردنی (مامۆستا خۆشویستێ و نیشتمانی ئاو کەوسەرو بەرد گەوهەر پاراستنەوە دەگیرسێتەوە).

ئا: (ڕامان)

# سەعید قەزاز و ڕۆڵی لە سیاسەتی عێراقدا

لێدوانی:
حەسەن مەحموود حەمەکەریم
(سلێمانی)

هیچ گومانێ نییە کە نامەی دکتۆراو ماستەرنامەکان لەم ماوەیەدا هەنگاوی مەزنیان نا بەرامبەر مێژووی کوردو ژیانی هەندێ سیاسی، بەتایبەت دوای ئاشکرابوونی بەڵگەنامە دبلۆماسیەکانی ڕۆژئاوا بەتایبەتتر بەریتانی و ئەمریکی و بەڵگەنامەکانی کۆشکەکانی شاهانی عێراق و وەزارەتی ناوخۆ و ڕاپۆرتە دبلۆماسییەکانی سەردەمی پاشایەتی، ئەوە مەودای فراوان کرد بۆ زیاتر شارەزابوون لەلاپەڕە نهێنییەکانی ژیانی زۆر لەکەسایەتییە سیاسییەکانی کورد کە ماوەیەک بوو بە ئاڵۆزی مابوونەوە.

ماستەرنامەی (سعید قزاز.. و دوره في سياسة العراق حتى عام ١٩٥٩) کە بەعەرەبی نووسراوە، یەکەم بابەتە کە بەدرێژی لەسەر ئەو کەسایەتیە کوردە نووسرابێ و هەموو لایەنەکانی ژیانی لەخۆگرتبێت، لە نووسینی (عبدالرحمن ادريس البياتي) لە (٢١٣) لاپەڕە و بەقەبارەی تەواو ساڵی (٢٠٠١ چاپی یەکەم)ی لەچاپخانەی (دار الفاس للنشر و التوزيع) لە (بیروت) دەرچووە. سەعید قەزاز ناوی تەواوی (محەمەد سەعید مەجید ئەحمەد حەسەن قەزاز)ە لە بنەماڵەیەکی ناوداری کورد لە ساڵی (١٩٠٤) لەشاری سلێمانی لەدایک بووە، دوای ئەوەی لە حوجرە قورئانی خوێندووە، چووەتە قوتابخانەی ڕەشیدیە پاشان بۆ ئامادەیی سلێمانی و ساڵی (١٩١٧) تەواوی کرد، گرنگی بەخوێندنەوە و لێکۆڵینەوە دەدا، بووە مامۆستای زمانی ئینگلیزی لە سلێمانی، ڕۆژنامەکانی ئەوکاتە باسی زیرەکی قەزازیان دەکرد، لە (١٩٢٤)دا کرایە نووسەری سەرپەرشتیاری ئیداری ئینگلیز لە سلێمانی، لەبەر زیرەکی و وریایی بەرزکرایەوە بۆ وەرگێڕی متەسەرڕفی لیوای سلێمانی لە (١٩٢٨)دا، پاشان بووە نووسەر لە بەشی هەواڵگری نهێنی وەزارەتی ناوخۆ، پاشان بەوەزیفە گوازرایەوە بۆ حیللە و پاشتر کەرکووک لە (١٩٣٣)دا، ئەم گۆڕانکاری و وەزیفە گرنگانە فێری زۆر شتی کرد، پلە بەپلە بەرزتر دەبووەوە هەتا بووە مودیر ناحیەی تکریت و پاشان توزخورماتوو لە (١٩٣٤)دا، پاشان لە بازیان و دواتر بەرزبووەوە بۆ قائیمقامی قەزای کیل لە (١٩٣٥)دا، پاشان بووەوە بە مودیر ناحیەی بازیان و وەکیل قائمقامی هەڵەبجە، پاشان بووە قۆمیسەری سنووری عێراق- ئێران لەهێڵی هەڵەبجە، ساڵی (١٩٣٦) ژنی هێناو منداڵێکی بوو بەناوی پەریخان، پاشتر بوودوە مودیر ناحیەی بازیان و دواتر شەقڵاوە و تانجەرۆ، پاشان بووەوە قائمقامی هەڵەبجە لە (١٩٣٧)دا، پاشان قائمقامی زاخۆ و دواتر کفری لە (١٩٤١)دا، ئەم جووڵانەوانە زیاتر ناساندی و بەرچاوی ڕووناکتر کردەوە،



پاشان بووه بریکاری بەڕێوەبەری گشتی وەزارەتی ناوخۆ لە بەغداد کە پلەیەکی بەرز بوو، ئەوکات هەندێ بارزانی دوورخرابوونەوە لێبوردنی بۆ دەرکردن وناردرانەوە بارزان ساڵی (١٩٤٢)، پاشتر بووە وەکیلی متەسەڕفی هەولێر لە (١٩٤٤)دا، حکومەت ناردی بۆ وتوویژ لەگەڵ سەرکردەی شۆڕشی کورد مەلا مستەفا بارزانی ساڵی (١٩٤٥) پاشان بووە متەسەڕفی لیوای هەولێر ساڵی (١٩٤٦)، دواتر بووە سەرپەرشتیاری ئیداری وەزارەتی ناوخۆ، پاشتر متەسەڕفی کووت و پاشتر کەرکووک و دواتر موسڵ، (١٩٤٩)، ساڵی (١٩٥٠) چوو بۆ ئەمەریکا هەتا سەیری شێوازی ئیداری دیموکراتی ئەمریکا بکات، پێی سەرسام بوو، ساڵی (١٩٥٢) بووە وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی، ساڵی (١٩٥٣) بووە بەڕێوەبەری گشتی بەندەرەکانی عێراق کە بۆ یەکەم جار بووە عێراقیەک ئەو پۆستە وەربگرێ، لە (١/ئەیلوول/١٩٥٣)دا بووە وەزیری ناوخۆ، ساڵی (١٩٥٥) چووە پاکستان بۆ بەستنی (میساق بغداد)، کە شۆڕشی (١٤/ تەمووز/١٩٥٨) قەوما و پاشایەتی لەناوبرد، زۆر لەسەرانی پاشایەتی گیران و درانە دادگای عەسکەری بەناوی (دادگای شەعب) و دوای چەندین دانیشتن بڕیاری لە سێدارەدانی زۆریان درا و لە ناویاندا قەزاز یەکێک بوو کە لە (٢٠/ئەیلوول/ ١٩٥٩) بڕیارەکە جێبەجێ کرا. زیاد لە سێ ساڵ لەخزمەتی دەوڵەتی عێراقدا کاری کرد، لەو ماوەیەدا توانایی و لێوەشاوەیی و پاکی زۆری لێ دەرکەوت، ڕاوبۆچوونەکانی بەروون و ئاشکرا لە ئەزموون و بیرۆکەی ڕۆژئاوا سەرچاوەی گرتبوو پێی سەرسام بوو، ئەوە وای کردبوو کە ببێتە یەکێک لەنزیکەکانی نووری سەعید کە زۆر بەچری لەکاروباری ناوخۆدا پشتی پێ دەبەست، ئەوەش بەڕوونی لەدوژمنایەتی سەرسەختانەی دژ بەشیوعیەکاندا دەردەکەوت، لەپاڵ ئەوەدا لە بۆچوونە سیاسییەکانیدا تەواو سەربەخۆ و لەبڕیار وەرگرتن و جێبەجێکردنی فرماندا بێلایەنی زۆری پێوە دیار بووە.

کتێبەکە سەرەتا بەپێشەکیەکی درێژی مامۆستا (کەمال مەزهەر) دەست پێدەکات لە (لا١٥-٣٥)، بەناوی (سعید قزاز امام محکمة التاریخ) کە لە ڕێکەوتننامەی سەعد ئابادو بەغدادەوە دەست پێدەکات و کاریگەریان لەسەر سیاسەتی عێراق و ناوچەکە، پاشان باسی ڕۆڵی حوکمی عێراق دەکات هەر لە پاشایەتیەوە تا دواتر کە لەگەڵ ڕای جەماوەردا نەبووە، دەڵێ هەڵەی کوشندەی ڕژێمی پاشایەتی عێراق لەوەدابووە کە ممارسەی دیموکراتی دەکرد، بەڵام هەڵوێستی بەرامبەر دیموکراتی لەوەدابوو کە دەسەپا لەسەرەوە بۆ خوارەوە نەک بە پێچەوانەوە (لا١٨) پاشان باس لە پێکهێنانی مەجلسی تەئسیسی و سەردەمی نووری سەعید دەکات و ڕۆڵی سەعید قەزاز باس دەکات تا وەرگرتنی پۆستی وەزیری ناوخۆ، لە مەجلسی نوابداو بە (صوت جمهوری من فعل) وەسفی دەکات (لا١٩) پاشان حاڵەتی عێراق دەکات کە قەزاز لەو کەش و هەوا سیاسیە توندەدا دەرکەوت، نوێنەری ڕژێمی پاشایەتی بوو بە هەردوو دیوی باش و خراپی بە قەناعەتەوەو پەنجەشی خستووەتە سەر زۆر لایەنی خراپەی ڕژێم و بەدووری نەزانیوە کە پاشایەتی بڕووخێ لەپێش (چواردەی تەمووزی ٩٥٨)دا، هەڵوێستی مەردانەی زۆری بووە دژ بە دەرەبەگ کە بڕبڕەی پاشایەتی بووە، کەمال مەزهەری هەق بێژ، لەگەڵ ئەوەی تەواو دژو پێچەوانەی یەک بوون لە بۆچووندا لەگەڵ قەزازدا، ئەوە ڕێگر نابێت لەوەی هەقی چاک نەڵێ بۆ قەزاز (لا٣٥)..

پاشان نووسەر لە پێشەکیەکەی خۆیدا (لا٣٦-٤٠) دەڵێ (لەبەر ڕۆڵی گرنگی سیاسی ناوخۆ و دەرەوەی قەزاز ئەم بابەتەم هەڵبژارد) پاشتر سەرچاوەکان ڕوون دەکاتەوە کە لەمەلەفەکانی وەزارەتی ناوخۆ و بەڵگەنامەو ئیزبارەکان دەستی کەوتووە کە زۆربەی تا ئیستەش بڵاونەکراوەتەوە، لەبەڵگەنامەکانی بەریتانی و کتێبخانە تایبەتیەکانی هەندێ کەسایەتی و ڕاپۆرتەکانی مەجلسی وزەراو نواب و ئەعیان و مەجلیس عەسکەری و یاداشتنامەی هەندێ کەسایەتی سیاسی و هەندێ ماستەرنامە و دکتۆرای بڵاونەبووەوەی تایبەت بە باسەکە بەعەرەبی و کوردی و هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامەی عەرەبی و کوردی سوودی بینیوە.. کتێبەکە لەچوار بەش پێک هاتووە بەم جۆرە:

بەشی یەکەمی بەناوی (ژیانی قەزاز هەر لەسەرەتاوە هەتا ساڵی (١٩٥٣) کە (لا ٤٥-٧٧) دەگرێتەوە و تیایدا باس لە دایکبوون و گەشەکردن و زرووفی کۆمەلایەتی و سیاسی دەکات کە دەوری دابوو و باسی سەرەتای چوونە ناو کاری وەزیفی و ئەو پلەو پایە ئیداریانە دەکات کە پێی گەیشتبوو هەتا گەیشتە پلەی وەزیری کاروباری کۆمەلایەتی و ڕۆڵی لەسەرپەرشتی بەندەرەکانی عێراق بینی بەو سیفەتەی یەکەم بەڕێوەبەری گشتی عێراقی بوو لەو پێکهاتە نوێیەدا.

بەشی دووەم بەناوی (چالاکیە سیاسیەکانی قەزاز لە (١٦/ ئەیلوول/ ١٩٣٥ هەتا ١٧/ حوزەیرانی ١٩٥٤) ئەم بەشە لە (لا ٨٧-١١١)ی گرتووەتەوە کە تیایدا باس لە وەرگرتنی پۆستی وەزیری ناوخۆ دەکات، باسی هەڵوێستی قەزاز دەکات لەمانگرتنی کرێکارانی شەریکەی نەوتی بەسرە لەساڵی (١٩٥٣)دا ڕۆڵی گرنگی لەسەرکەوتنی بەسەر لافاوە مەزنەکەی ساڵی (١٩٥٤) کە خەریک بوو بەغداد داپۆشێت و ڕۆڵی لە هەڵبژاردنەکەی نەوابی ساڵی (١٩٥٤).

بەشی سێیەم بەناوی (ڕۆڵی سەعید قەزاز لە هەردوو وەزارەتی دوازدە و سێزدەی نووری سەعید لە بەرواری ٣ئاب ١٩٥٤-٨ حوزەیران ١٩٥٧) کە(ل ١١٢-١٦٥) گرتووەتەوە و تێیدا باس لەو هەموو ڕووداو و گۆڕانکاریە سیاسیە دەکات کە قەزاز تێیدا ڕۆڵی سەرەکی بینیوە، هەر لەوەرگرتنی پۆستی وەزیری ناوخۆ و ڕۆڵی لە ئیدارەکردنی ناوخۆ و سیاسەتی دەرەوەی عێراق، ڕۆڵی قەزاز لەبەرزکردنەوەی ئاستی ئیداری و خزمەتکردن لە وەزارەتی ناوخۆدا.

بەشی چوارەم کە بەشی کۆتاییە بەناوی (ڕۆڵی سیاسی سەعید قەزاز لە ساڵی ١٩٥٨) کە (لا ١٧٥-٢١١)ی گرتووەتەوە، پاشان باسی دوارۆژەکانی قەزاز دەکات دوای شۆڕشی (١٤ تەمموز ١٩٥٨)، باسی گرتنی و وەستانی لەبەردەم دادگای سەربازی (مەحکەمەی گەل) کە پاشان حوکمی لەسێدارەیان بەسەر قەزازدادا و لە (٢٠/ ئەیلوول ١٩٥٩)دا جێبەجێ کرا، پاشان باس لەو نارەزاییانە دەکات کە دژی لە سێدارەدانەکە دەربرا، هەندێکیش وەک چەپەکان پێخۆش بوونیان دەربڕی بوو.

پاشان نووسەر لە (لا ٢٠٧- ٢٠٩)دا بە (کۆتاییەک) ئەنجامی باسەکە ڕوون دەکاتەوە. پاشتر (دوا وتە) لەنووسینی (محەمەد خەفاف) کە (لا ٢١١-٢١٣) دەگرێتەوە کە کۆتایی کتێبەیە.

دەستخۆشیەکی زۆر بەنووسەری بەڕێزی ڕەگەز عەرەب کە لەباتی کوردێک ئەم هەموو زانیاریە بەنرخەی لەسەر کەسایەتیەکی سیاسی کورد کۆکردووەتەوە و پێشکەشی کردووە، خۆزگە لەسەر کەسایەتییە کوردەکانی تر بەم جۆرە دەنووسرا وەک ئەحمەد موختار بابان و عومەر نەزمی و ماجید مستەفا و تۆفیق وەهبی و نووری سەعید و زۆری تر کە پلەو پایەی بەرزیان لە حکومەتەکانی پاشایەتی و کۆماری عێراقدا بینیوە، ماوەتەوە هەندێ تێبینی لەسەر چەند لایەنێکی ئەم نووسراوە مەزنە دەربڕین، وادیارە بەداخەوە کتێبەکە لەعێراقدا بە ڕۆنیۆ، یان لەبەرگرتنەوە لەبەر ئەسڵەکەی چاپی بێرووت وێنەکرابێ، چونکە ئەوچاپەی کەوتە بەر دەستم زۆر ناشرین و لێڵ دەنوێنی، دەبوو نووسەر بەگوێرەی توانا چەند وێنەیەکی سەعید قەزاز و خێزانی و بەتەنیاو لەگەڵ دەستە براکانی لە وەزیر و پاشاو کەسایەتییەکانی ئەوکاتەی بهێنایە، یان وێنەی لەبەرگرتنەوەی هەندێ لە بەڵگەنامە و ڕاپۆرت و ئیزبارە و نامە ڕەسمیەکانی نیشان بدایە لەگەڵ چۆنیەتی دەسکەوتنیان، هەندێ هەڵە هەیە لە ساڵەکاندا ڕەنگە هەڵەی چاپ بێت، نووسەر چاکی نەپێواوە بۆ کورد بە گومانەوە باسی مێژووی کورد دەکات، ئەویش ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە نووسەر سەرەتاییەو بە حەساسیەتەوە کاری لەگەڵ بابەتەکەدا کردووە، یان لەبەر کەم زانیاری خۆی، زانیاری شێوێنراوی هێناوە، بۆ نموونە باسی شێخ مەحموودی بە هەڵهاتوو و بەکرێگیراو (لا٥٦) کردووە، نازانێ کە شێخی نەمر بەرگری زۆری لە خاک و خەڵکی عێراق کردووەو شەهیدی زۆری داوە، لە کوردستانەوە گەیشتۆتە بەسرەو شوعەیبە و لەگەڵ برا عەرەبەکانی دژی ئینگلیز شەڕی کردووە کە جێی پیاهەڵدانی زۆر لە مێژوونووسانی عەرەب و ڕۆژئاوا بووە کە هەندێ لە ڕۆژئاواییەکان شێخیان بەغاریبالدی ڕۆژهەڵات شوبهاندووە لەبەرپاکی و و ئازایی، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ڕۆشنبیری عەرەب هیچ نازانن لەمێژووی کورد، یان کەمێکی لەڕووە شێوێنراوەکەی دەزانن، هەق وایە نێزیک بینەوە و بخوێننەوە، چونکە ئەو نزیک بوونەوە زەرەری کەمترە لە قازانجی و بەهەڵەش ناکەون، یان مەلا مستەفا بارزانی تاوانبارکردووە لە (لا٦٠-٦١)دا، نازانێ کە ئەو چەندە هەوڵی داوە لەگەڵ حکومەتە عێراقییەکاندا هەتا مافی کورد پارێزراو بێت وەک برا عەرەبەکانیان، بەڵام هیچیان بە کورد ڕازی نەبوون و بەشەڕ ناچاریان کردووە... لەدێڕی (٣ لاپەڕە ٧٦)دا بەهەڵە ساڵی (١٩٥١)ی هێناوە، لە ڕاستیدا ساڵی (١٩٥٢) ڕاستە. لەلاپەڕە (١٨٤)دا دەڵێ مەلا مستەفا دوای شۆڕشی (١٤)ی تەمموز کە لەکوردستانی عێراقەوە گەڕایەوە بەغداد، ئەوە ڕاست نییە، بەڵکو ئەو لە سۆڤیەتی جارانەوە گەڕایەوە بەغداد، لەگەڵ هەندێ شتی ورد کە قابیلی باس کردن نییە.

# فەرووغ فەروخزاد ژنێکی تەنیا

ن: سیروس تاهباز
وەرگێڕ: سۆران عەبدوڵڵا نەقشبەندی
لێدوانی: دیاری عەبدوڵڵا مەحموود
(سلێمانی)

لێدوان لە شیعر لێدوانە لە خودی ژیان و بەهاو ڕۆڵی مرۆڤ و سەرجەم بوونەوەر.. ئەگەر فەیلەسووفەکان بەدرێژایی مێژووی ژیانی مرۆڤایەتی زۆر بە دەگمەن لەسەر ئەو چەمکانە تەبابووبن، ئەوا هەموو شاعیران بە درێژایی مێژوو لەسەر ئەوە هاوڕا بوون و لە جۆرەها زمانی مرۆڤایەتی باسیان لە ئەگەرەکانی ڕۆڵی مرۆڤ و ماناو ئەزموونەکانی ژیان و ئینسانیبوونی شاعیرو مرۆڤەکان کردووە.. دەکرێت بە ئاسانی خەمەکانی ژیان و ئەندێشەکانی مرۆڤایەتی لە شیعری هەر شاعیرێکی ئەم گۆی زەوییەدا بەدی بکەین و وێنەکانی ژیانی هەر گەل و میللەتێک دەکرێت ڕۆح بکاتە بەر شیعری هەر شاعیرێک لە شاعیرانی ئەم سەر زەمینە، بۆیە ئێمە چەندە چێژ لە شیعری کوردی وەردەگرین، هێندەش چێژ تەنانەت لە مۆسیقاو ئاماژەکانی شاعیرێکی دیکەی ئەم سەر زەوییە دەبینین ئەگەرچی لە شیعرەکەش حاڵی نەبین.

شارەزایی شاعیران لە شیعری شاعیرانی جیهان بۆ خۆی دەبێتە ژانرێک لە ژانرەکانی دەوڵەمەندکردنی ئەزموونی شیعری یەکتری.. هەر لەم ڕوانگەیەشەوەیە کە خوێندنەوەی ژیان و بەرهەمی شیعری شاعیرانی جیهان بۆ شاعیران و ئەدەبدۆستانی کورد، یەکێک دەبێت لە پێویستیە هەنووکەییەکان.. من تا داغستانەکەی ڕەسووڵ حەمزاتۆڤم نەخوێندەوە، نەمزانی لەم ڕووی زەوییەدا مرۆڤی دیکەش هەن کە زۆر لە ئێمە زیاتر شاخ و کێوەکانی وڵاتەکەیان خۆشتر دەوێ.. تا شیعرەکانی ڕامبۆم نەخوێندەوە، نەمدەزانی شاعیر دەتوانێت بەکەمترین ئەزموونی شیعری ببێتە سیمبۆلی وڵاتەکەی..

لەبەر ئەوە هەر هەوڵێک بۆ نووسینی ژیاننامەی شاعیران و وەرگێڕانی ژیان و بەرهەمەکانیان بەزمانی کوردی یەک لەو هەنگاوانە دەبێت کە بەشدار دەبێت لە بونیادی شیعری کوردیدا، بەوەش نووسەر یاخود وەرگێڕ پشکێک لە ئەرکی نەتەوایەتی خۆی جێبەجێ دەکات. دەخوازم ئەم کتێبەی (سۆران عەبدوڵڵا نەقشبەندی) لەو بوارەدا بەهەند وەربگیرێت.

کتێبەکە لە پێشەکیەکی کاک ئازاد بەرزنجی و یاداشتێکی کاک سۆران خۆی کە دەکرێت بە پێشەکی دووەمی برای وەرگێڕ دابنرێت، هەروەها پێشەکیەکی (سیروس تاهباز)ی نووسەری کتێبەکە لەژێر ناوی «بەناوی تۆ.. گێڕانەوەیەک سەبارەت بە ڕۆژانی ڕابردوو»ەو لە پێنج بەشی سەرەکی پێکهاتووە کە هەر بەشەو ناونیشانی تایبەت بەخۆی هەیە. وێڕای لاپەڕەی پەراوێزەکان و ئەلبومی ژنێکی تەنیا کە چەند لاپەڕەیەکی تایبەتە بەوێنەکانی فەرووغ و چەند کارێکی هونەری، بەهەموو ئەمانە، کتێبەکە گەیشتۆتە (١١٨) لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندی.



لە پێشەکی سەرەکی کتێبەکەدا کاک ئازاد بەرزنجی ئاماژە بە چوار خاڵی سەرەکی دەدات سەبارەت بە پێویست بوونی ناسینی فەرووغ لای شاعیران و خوێنەرانی کورد.. یەکەمیان ئەوەیە کە فەرووغ هەوڵی بەشیعرکردنی ژیان و بەژیان کردنی شیعری داوە.. لەم بارەیەشەوە وتەیەکی ناسکی فەرووغی هێناوەتەوە کە دەڵێت: «من باوەڕم بەشتێکی تریش هەیە، کە ئەویش شاعیر بوونە لە هەموو ساتەکانی ژیاندا، شاعیر بوون، واتە ئینسانبوون، کەسانێک دەناسم کە ڕەفتاری ژیانی ڕۆژانەیان هیچ پێوەندییەکی بە شیعرەکانیانەوە نییە، واتە بەتەنیا کاتێک شیعر دەنووسن شاعیرن. دوای ئەوە شاعیریەتییان تەواو دەبێت».

لە خاڵی دووهەمدا باس لە تایبەتمەندێتییەکی شیعری فەرووغ دەکات کە بریتییە لە سادەیی لە ڕواڵەت و قووڵی لە بونیاددا.

لە خاڵی سێهەمیشدا باس لەوە دەکات کە شیعری ئەم شاعیرە لێوان لێوە لە خۆشەویستی و یاخیبوون، خۆشەویستی بۆ ژیان و یاخیبوونیش لە نەریتە باوەکان.

لە خاڵی چوارەمیشدا ئازاد بەرزنجی ئاماژە بەوە دەکات کە شیعری فەرووغ قۆناغێکی مۆدێرنەیە لە شیعری فارسیداو بۆ ئەوەش چووە کە بەبێ ناسینی ئەزموونی شیعری ئەم شاعیرە، ناتوانین مێژووی هاوچەرخی شیعری فارسی بناسین.

کاک سۆرانیش باس لە یادەوەریی خۆی دەکات لەکاتی هەوڵەکانیدا بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبەو لەناوەڕۆکی پێشەکیەکەیدا باسێک لە زمان و جیهانبینی و ڕوئیای شاعیرانە دەکات.. هەروەها چەند پرسیارێکی گرنگ دەخولقێنێ و لە بەشێکیدا دەڵێت: ئایا شێوە پرکردنەوەو ئەندێشەکردنێک هەیە کە بەشێوە بیرکردنەوەو ئەندێشەی شاعیرانە ناوزەد بکرێت؟ ئایا شێوە ژیانکردنێک هەیە کە بتوانین بەژیانی شاعیرانە ناوی بەرین؟ ئایا فەزا، یان مەودای کاری هونەری شاعیر مەودایەکی کاتی و وەختییە یاخود شاعیر پێویستە هەر چرکەساتێکی پڕ بێت لە ڕوئیای شاعیرانەو بەمانایەک شاعیرانە بژی؟.... تاد، پرسیارەکان کە کاک سۆران دەڵێت لەم کتێبەدا وەڵامەکانی دەخوێنرێتەوە.

هەروەها (سیروس تاهباز)ی نووسەری کتێبەکەش لە دەقی پێشەکیەکەیدا باس لە چۆنێتی ناسینی فەرووغ دەکات، وێڕای ڕازاندنەوەی گۆڤاری «ئارش»ی ئەدەبی بەشیعرە گەورەکانی ئەم ژنە شاعیرە.. سیروس لەم پێشەکیەدا دەڵێت: «بە باوەڕی من شیعری بەهادار بەتێپەڕینی کات و زەمەن زیاترو چاکتر خەڵکی لێی تێدەگەن، واتە لەدوای ئەو مانایەی کە بەشێوەیەکی ئاگایانە لەهەر شیعرێکی باڵادا هەیەو بە هەمان ئەو خوێندنەوەیەی یەکەم جار قابیلی تێگەیشتنە، واتایەکی پەنهان و حەشاردراویش هەیە کە دەق و زەمینەی مێژوویی بوونی ئەو بەرهەمە بەدەستیەوە دەدات کە تەنیا بە تێپەڕینی زەمان و کۆتایی ئەو سەردەمە بەدەست دێت. بەدەربرینێکی تر، تا ئەو کاتەی کە لەنێو ڕووداوەکەداین هۆشیاریی ئێمە سەبارەت بە بەرهەمێکی باڵا هێندە کامڵ نییەو بە تێپەڕینی زەمان دەتوانین زیاترو باشتر پێی بگەین».

کتێبەکەش بریتییە لە دیمانەیەک لەگەڵ فەرووغ و چەند باسێکی دیکە لەمەڕ شیعرو سەفەری ئەم شاعیرە لە دووتوێی ئەزموونێکی نوێی شیعری فارسیدا. وێڕای چەند نموونەیەک لە شیعرەکانی کە بەکورتی لێدوانیان لەسەر کراوە.

دوایی پێشەکیەکەی نووسەر دێت و بەکورتی چەند قۆناغێکی ژیان و بەرهەمە هونەری و ئەدەبیەکانی ئەم شاعیرە باس دەکات کە منیش بە پێویستی دەزانم چەند خاڵێکی گرنگی لێ دیاری بکەم لەوانەش.

* فەرووغ لە (١٣)ی مانگی دەی ساڵی (١٩٥٢) لە خێزانێکی مامناوەندی لە شاری تاران لەدایک بووە.

* لە تەمەنی (١٣ یان ١٤) ساڵیەوە کەوتۆتە غەزەل نووسین کە ئەم غەزەلانەی بەچاپ نەگەیاندوون.

* لە ساڵی (١٩٥٦)دا یەکەمین کۆمەڵە شیعری خۆی بەناوی «ئەسیر»ەوە بڵاوکردۆتەوە کە بریتی بووە لە (٤٤) پارچە شیعر.

* دووەمین کۆمەڵە شیعری خۆی ساڵێک پاش ئەو بەناونیشانی «دیوار»ەوە بڵاوکردەوە کە بریتییە لە (٣٢) شیعر.

* هەر لە هەمان ساڵیشدا سێهەمین کۆمەڵە شیعری بەناوی «یاخیبوون» بڵاوکردۆتەوە کە (١٧) شیعری لەخۆ گرتووە.

* ئەم خانمە شاعیرە دواتر لە «گوڵستان فیلم»دا کاری کردووەو دواتریش لە چەند کورتە فیلمێکدا وەک ئامادەکارو ئەکتەر بەشداری کردووە.. وەک کورتە فیلمی «داخوازی» بۆ کۆمپانیای فیلمی میللی کەنەدا و لەساڵی (١٩٦٢)یشدا بەشی دووەمی فیلمی «دۆکیۆمێنتی» ئاو و گەرما» ئامادەکردو لە فیلمی «شەپۆل و مەرجان و خارا» هاوکار بووەو هەروەها فیلمێکی یەک دەقیقەیی لەبارەی لاپەڕەی پێداویستییەکانی گەردوونەوە ئامادە کرد. لە ساڵی (١٩٦٣)یشدا فیلمی «ماڵەکە ڕەشە»ی لە جەزامخانەی تەبرێزدا لە بارەی ژیانی جەزامییەکان ئامادە کرد.. ئەم فیلمە خەڵاتی باشترین فیلمی دۆکیۆمێنتی لە فیستیڤاڵی «ئوبەرهاوزن»دا وەرگرت.. ئەمەو چەندەها بەرهەمی دیکە کە نووسەر لەم پەرەگرافەی ژیانی فەرووغدا ئاماژەی پێ کردووە، دیارە وەرگێڕ لەم کتێبەدا ساڵەکانی نەکردووە بەزایینی.

لە بەشی گفتوگۆی فەرووغ لەگەڵ م. ئازاددا، ئەم

شاعیرە گەورەیە ئاماژە بە شاعیران «نیما» و «شاملوو» و «ئیخوان» و چەند شاعیرێکی دیکەی ئێران دەکات کە کاریگەریی تەواویان لەسەر شیعری ئەم هەبووە. ئەوەتا سەبارەت بە «نیما» دەڵێت: «نیما بۆمن سەرەتایەک بوو، نیما شاعیرێک بوو، کە من لە شیعرەکانیدا بۆ یەکەمین جار فەزایەکی فکریم تێدا بینی و جۆرێک لەکەماڵی مرۆیی، وەکو حافز. من کە خوێنەربووم هەستم کرد ڕووبەڕووی ئادەمێکم نەک مشتێ هەستی ڕووکەشی و وشە گەلێکی سواوی ڕۆژانە» دواتر ڕاشکاوانە ئاماژە دەکات کە نیما نەبۆتە قۆناغێک لە قۆناغەکانی لاسایی کردنەوەی شیعری لەشیعرەکانیدا، بەڵکو دەڵێت: «نیما چاوی منی کردەوەو پێی وتم: ببینە، بەڵام خۆم چۆنیەتی دیتن و فێربووم، لە پێش نیماوە شاملوو بوو، شاملوو زۆر گرنگ بوو.

دواتر هەر لەم بەشەدا چەند پرسیارێکی گرنگ ئاراستەی فەرووغ دەکرێت سەبارەت بەجیهانی شیعرو ڕەخنەو زمان، هەروەها هەندێک لە شیعرەکانی شاعیر خۆی کە تێیدا ڕاشکاوانە ڕەخنە لەسەرجەمی شیعرەکانی دەگرێت و پێی وایە کە دەکرا باشتر بوونایە، دیارە لەم گفتوگۆیەدا خواستێک هەیە بۆ دیاریکردنی شیعری شیاو و چاک، بەڵام پێ دەچێت م. ئازاد نەیتوانیبێت لەزاری فەرووغ خۆیەوە ئەو ئامانجە بەدی بهێنێ. هەر بۆیەشە خۆی لە کۆتاییدا دەڵێت:

«بە بۆچوونی من هێندە بەسە کە لەنێو دەفتەرێکی شیعریدا هەشت پارچە، دە پارچە شیعری چاک هەبێت. مەبەستم لەشیعری چاکە.. تاد.. دواتر دیمانەی سیروس تاهبازی نووسەری ئەم کتێبە دێت لەگەڵ فەرووغدا کە تێیدا لێی دەپرسێت: بۆچی شیعر دەڵێیت و لە شیعردا بەدوای چ شتێکدا دەگەڕێیت؟

فەرووغ گەرچی پێی وایە کە پرسیاری شیعر بۆچی لەگەڵ خودی شیعردا یەک ناگرنەوە، بەڵام لە دەقی وەڵامەکانیدا دەبینیت ئاماژە بە چەند جۆرە شیعرێک دەکات، کە تەنانەت هەندێک لەو شیعرانە بە بێهوودەو بگرە فێڵ و تەڵەکەش ناوزەد دەکات، بەتایبەتی کە خوێنەر لە گەشتەکەیدا بەو شیعرانەدا هیچی دەست ناکەوێت و فەرووغ شیعرەکە بەخودانی دوو دەروازەی سەرەتاو کۆتایی ناودەبات کە هەردوو دەروازەکە کراوەن و نە لەمسەرو نە لەوسەریش خوێنەر هیچی لێ دەست ناکەوێت.. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژە دەکات کە شیعریش هەن کە ئەسڵەن نە دەرگان و نەکراوەن و نەداخراون، بەڵکو لە بنەڕەتدا چوار چێوەیەکیان نییە. یەک ڕێگەیان هەیە، درێژ یاخود کورت- ئەو ئاماژە دەکات کە خوێنەر لە سەفەریدا لەم شیعرانەدا ماندوو نابێت هەردەم و هەموو ساتێک شتی نوێی تێدا بەدی دەکات کە ڕەنگە پێشتریش بەسەریدا گوزەری کردبێت، بەڵام هەستی پێ نەکردبێت... تاد، دیمانەکە لە بەشی «چەند تایبەتمەندییەکی شیعری»یشدا تاهباز بەم دوو دێڕە دەست پێ دەکات «دڵی فرووغ دڵێکی گەرم بوو، کە یەکەمجار بۆ هەمیشە بریندار بوو و ئەم برینە خوێناویەش، سەرچاوەو وزە بەخشی تەواوی شیعرەکانی بوو، دواتریش چەند کۆپلە شیعرێک دەکاتە بەڵگەو نموونەی بۆچوونەکانی فەرووغ هەمیشە بەدوای ڕێگەیەکدا دەگەڕا بۆ دەرچوون لە سنووری سەردەم و زەمان و ئەمەش واتە شاعیر بوون لە هەموو چرکە ساتەکانی ژیاندا:

**ڕەنگە حەقیقەت ئەو دوو دەستە لاوە بوو بێت**
**ئەو دوو دەستەلاوەی**
**کە لەژێر بارینی یەکبینەی بەفرێکا نێژران و**
**ساڵێکی دیکەش کاتێ بەهار**
**لەگەڵ ئاسمانی ئەودیو پەنجەرەکەدا ئەخەوتێ و**
**فوارەی سەوزی لاسکە سوکەکان**
**لە جەستەیدا هەڵئەقوڵێن**
**شکۆفە ئەکەن**
**ئەی یار، ئەی ؟قانەترین یار**
**«باوەڕ بێێن بەسەرەتای وەرزی سارد»**

پەیامی دەربازبوون لە فەزاکانی سەردەم و زەمان هەر لە شیعری «باوەڕبێێن»دا نەهاتووە، بەڵکو هەمان پەیام لەشیعری «لە دایکبوونێکی تر»یشدا هاتووە کە فەرووغ دەڵێت: دەکرێت ئەم شیعرە سەرەتایەکی لێوە بونیاد بنرێت».

**من پەرییەکی بچکۆلەی غەمگین دەناسم**
**کە لە ئۆقیانووسدا مەنزڵی هەیەو**
**دڵیشی ئارام ئارام**
**لە دار نەیەکی بچکۆلە لێدەدات**
**ئەو پەرییە بچکۆلە غەمگینەی**
**کە شەو بە ماچێک دەمرێت و**
**بەیانیانیش بە ماچێک دێتە دنیاوە.. تاد**

شیعرەکان کە چەند نموونەیەکن لە شیعری فەرووغ و لێدوانەکانی لەگەڵ خودی خۆی و سیاسەت و فیکرو مرۆڤەکانی ڕۆژگارو جیهان.

دوابەشی ئەم کتێبە بریتییە لە سەفەرنامەی فەرووغ بۆ ئیتالیاو ئەزموونەکانی لەم سەفەرەدا کە لێرە بەپێویستی نازانم باس لە مەغزاکانی ئەم سەفەرەیە بکەم و باسەکە بۆ خوێنەر بەجێ دەهێڵم.

لە کۆتاییدا ئەوە دووپات دەکەمەوە کە ناسین و ناساندنی شاعیرانی جیهان بەگشتی و شاعیرانی دەوروبەرمان بەتایبەتی کە کولتوورێکی هاوبەش و نزیکمان لەگەڵ یەک هەیە، یەکێکە لە ئەرکە سەرەکییەکان بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی کوردی و فراوانکردنی فیکرو فەلسەفەو جیهانبینی شاعیرانمان.

# ئابووری کوردستانی باشوور

لێدوانی: جەلال سنجاوی

ئابووری کـوردسـتـانی باشـوور، کـە لێکۆڵینەوەیەکی ئابووریە لەبارەی هەرێمی کوردستانی عێراقەوە، کتێبێکی قەوارە ناوەندی (١٢٨) لاپەڕەیە و لەسـاڵی (٢٠٠٣) بەهاوکـاری وەزارەتی ڕۆشنبـیـری حکومـەتی هەرێمی کوردستان لە هەولێری پایتەخت چاپ کراوە.

ئەم کـتـێـبە دەسـتـەبژێرە لێکۆڵینەوەیەکی ئابووریە و تایبـەتە بەهەرێمی کوردستـانی عـێراق، سـەرچاوەیەکی دەگمەن و دانسقەیە بۆ ئابووریناسـان و ڕامیـارمـەندان و کـاریگەرییـەکی چاکی بۆ یارمـەتی خوێندکـارانی بیـانی و لاوانی ڕۆشنبـیـری کـورد هەیە، چونکە پەنجـەرە و دەروازەیەکی ڕووناک و پێـویست لەسـەر ناوچەیەکی زۆر تایبـەتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین دەکاتەوە کە پتر لەدە سـاڵە لەژێر سـایەی ئەزمـوونێکی دیموکـراتی ژیانی ئاشـتی و برایەتی بەسەر دەبات.

ئەم کـتـێـبە ناوازەیە، نامـەی مـاسـتـەری کـاک (خەسـرەو پیـرباڵ)ە کـە لە زانکۆی تەکنیکی لاهتی لە وڵاتی فـینلەندە پێـشـکەشی کـردووە و کـاک (ئیسماعیل خەلیل هەژار)یش وەری گێڕاوەتە سەر زمانی پاکی باوان.

لە لاپەڕە (١١)ی پێشـەکی کـتـێبـەکەدا نووسـراوە لەلایەن خـاتوو دکـتـۆرە (کـارۆڵ ئۆلڕێ) پرۆفیـسـۆری زانکۆی واشنتن لە ئەمەریکاو لەپەرەگـرافێکدا دەڵێ:

«لێکۆڵینەوەکەی بەڕێز خەسرەو پیـرباڵ، تەنیـا زانیاری کـاریگەرو بەسوود نین، بەڵکو زانیـارییـەکانی جگە لەوەش هاندەرێکی ڕێک و پێکن لەگـیـانی گـەشـبـینی ئایندەو وزەو وریایی دەورووژێنێ وەک هەمـوو لاوێکی کـوردی ڕۆشنبیری پێگەیشتووی سەردەمی تازەی نەوەی کورد هەوڵی داوە دڵسـۆزانە کارگوزاری کۆمەڵگەکەی بکات بەشێوەیەکی سوود بەخش و زانستیانە، بۆیە لێکۆڵینەوەکـەی دەروازەیەکی ڕووناک و پێـویسـت لەسـەر نـاوچەیەکی زۆر تایبـەت دەکـاتەوە». لێکۆڵینەوەکە بەکۆمـەڵێکی چاک لەسەرچاوەو پەراوێز بەهێزکراوە و بەگشتی باسی ئابووری هەرێمی کوردسـتـان دەکەن و لەکۆتایی کـتێبەکەشدا حەوت نەخشـە ڕیزبەند کراون کە تایبەتن بەهەرێمی کوردستـانی عێراق و نەخشـەی بەڕێوەبەرایەتی هەرێم و شـوێنی نیشـتـەجێبوونی کوردەکان لەکوردسـتـانی گـەورەو کانە نەوتیەکان لەکوردستـانی عێراق و کانە نەوتیـەکان و بۆریەکانی نەوت لەکوردسـتـانی عێراق و نەخشـەی بەڕێوەبەرایەتی عێراق بـەپێـی دابـەشـکـردنـی (UN) و شـوێنەکـانی بەعـەرەبکـردنـی ناوچە کـورد نشـینەکانی کوردستـانی عێراق.

بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە، نووسەر بابەتەکەی لەسەر پێنج بەش دابەش کـردووە و بەتێرو تەسـەلی لەهەر بابەتێک دواوە و زۆر نموونەی هاوچەرخی بۆ

ئابووری کوردستانی باشوور

لێکۆڵینەوەیەکی ئابووریە
دەربارەی هەرێمی کوردستانی عێراق

خەسرۆ پیرباڵ

کوردستان ٢٠٠٣

هێناوەتەوە و تێزەکەی پتر دەوڵەمەند کردووە.
لە بەشی یەکەمدا کە تایبەتە بە مەبەست و ئامانجەکان و سنووری لێکۆڵینەوەکە نووسەر ئاماژە بە کلیلی دەروازەکان و بنەتای پێکهاتەی لێکۆڵینەوەکەی دەدات و دەڵێ: «ئەم لێکۆڵینەوە وا دارێژراوە کە وەک پەرتووکێک هێڵی دۆزینەوەی رێگای بازرگانی ئاسان بکات بۆ ئەو کەسانەی چاو دەگێرن بۆ دۆزینەوەی ناوچەکانی بازرگانی و بەرژەوەندییان لەبازرگانیکردن لەگەڵ کوردستاندا هەیە، بەتایبەتی وڵاتانی ئەورووپا کە زۆر لەبارەی کێشەی کوردستانەوە نازانن و شارەزا نین..».
لەلاپەڕە (٢٢)ی ئەم کتێبە ناوازەیەدا و لە بەشی دووەم، نووسەر باسی کوردستان و نەتەوەی کورد دەکات و دەڵێ: (سەرەتای کورد دەگەڕێتەوە بۆ هۆزەکانی هیندو ئەورووپییەکان و لەوێوە کۆچیان کردووە بۆ کوردستان و تێکەڵاوی دانیشتووانی ناوچەکە بوون و هەر لە کوردستانی ئێستا بوونەتە هاونیشتمانی ئەو وڵاتەو، وڵاتەکە بەپانتایی سەرانسەری خۆی بەناوی ئەوانەوە ناونراوە (کوردستان- وڵاتی نوردان)، رەگەزو رەسەنی کوردیش دەگەڕێتەوە بۆ میدییەکان و ئیمپراتۆریەتی میدیا، ئەو هۆزەی کە لە (٢٠٠٠) ساڵ پێش مەسیح لەناوەندی ئاسیاوە بەرەو ئێران هاتوون و لەکوردستان ژیانیان بەسەر بردووە و توانیان ئیمپراتۆریەتێکی گەورە دابمەزرێنن و ئەزموونێکی دیموکراتی بەرفراوان دابهێنن لەو قۆناغە مێژووییە دواکەوتووەی مرۆڤایەتی...».
هەروا نووسەر باسی جوگرافیای رامیاری کوردستان و سنوورو ئاین و دانیشتووانی کوردستان و سیستەمی خوێندن و پەروەردەیی و پرۆژەی رژێمی خوێندنی باڵا و دیالێکتەکانی زمانی کوردی دەکات، چونکە زمان هەموو کاتێ کاریگەرییێکی گرنگی هەبووە بۆ نەتەوەی کورد لە هەموو سەردەمێکدا و لەتێکرای بەشەکانی کوردستان جێگای بایەخدان و خۆشەویستییان بووە، وەک خۆشەویستی خاک و وڵاتەکەیان.
بەشی سێیەمی لێکۆڵینەوەکە تەرخان کراوە بۆ ئابووری کوردستان بەتایبەتی نەوت و کانزا گرانبەهاکان و رۆڵیان لەبەرزکردنەوەی بژێوی دانیشتووانی کورد و کاریگەری لە ئاستی ئابووری نەتەوایەتی و هاوسەنگ کردنی ئاسایشی خۆراک و ناوێتە بوونی بە ئاسایشی نەتەوەیی، چونکە نەوت رۆڵێکی زۆر گرنگ و دەگمەن دەبینێت لەبواری ئابووری کوردستاندا و وڵاتی کوزدان بەنەوت و کانزا گرانبەهاکان دەوڵەمەندە بەتایبەتی چاڵە نەوتیەکانی کەرکوکی دڵی کوردستان و خانەقین و کەندیناوەی باشووری هەولێری پایتەخت، تارادەیەک نەوتی کوردستان لەچوار وڵاتی ئەورووپی بەناوبانگ بازاڕو کڕیاری هەیە وەک- فەرەنسا، ئیتالیا، هۆڵەنداو ئەڵمانیا.
لە لاپەڕە (٤٧) نووسەر باسی چالاکیە بازرگانییەکانی کوردستانی عیراق دەکات و ئەو رازە دەدرکێنێ کە: «بازرگانی رۆڵێکی گرنگی هەیە لە گەشەسەندنی ئابووری کوردستانی عیراق و کەرتی بازرگانی لەکوردستاندا ئێستا رۆڵێکی زۆر پێشەنگ و قەشەنگ دەبینێ و بە رێکوپێکی رۆڵی خۆی پیادە دەکا، بەتایبەتی لەدوای دەستبەکار بوونی بڕیاری نەوت بەرامبەر خۆراک، کەرتی تایبەت و هەندێ کۆمپانیای بیانی گەلێ کاری بازرگانیان بە ئەنجام گەیاندووە، ئێستاکە پتر لە (١٣) کۆمپانیای بیانی و کوردی لە وڵاتەکە بازرگانی دەکەن» وێرای ئەوەش نووسەر باسی بڕیاری سزا ئابوورییەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عێراق و کوردستان دەکات دوای شەڕی کەنداو هەروا باسی چالاکییەکانی هێنان و هەناردنە دەرەوە لەکوردستانی عێراق و بازرگانیکردن لەرێگای تورکیاو گواستنەوەو رێگاوبانی هەرێمی کوردستانی عیراق دەکات.
لێرەدا ناکرێ نکۆڵی لەو راستیەش بکرێ کە ئابووری هەرێمی کوردستان گەلێک گیروگرفتی هەیە و ئاستەنگەکانی ئابووریشی کاریگەرییەکی خراپی هەیە لەسەر حکومەتی هەرێمی کوردستان و ناوچەکە، بەڵام بڕیاری (٩٨٦)ی نەوت- بەرامبەر خۆراک رۆڵێکی زۆر باشی هەیە بۆ چارەسەر کردن و تواندنەوەی بەربەستکردن و بەرەنگاربوونەوەی کێشە ئابوورییەکانی کوردستانی عێراق، تەنیا بە (١٣٪) داهاتی ئەو پرۆگرامە لەداهاتی نەوت کاروبارێکی زۆر رێکوپێک و بەکەڵک ئەنجام دراوە بەشێوەیەکی گورج و گۆڵ و خێرایانە، لەوانەش ئاوەدانکردنەوەو نۆژەنکردنەوە لەهەموو بوارەکانی کاری رۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، ئاوەدانکردنەوە و دروستکردنی قوتابخانە و نەخۆشخانە و خانوو و بەنداوەکان و کەرتی کشتوکاڵی و پیشەسازی و رێگاکانی هاتووچۆ.
لەچوارەم بەشی لێکۆڵینەوەکەدا نووسەر باسی بازرگانی کوردستانی عیراق و رێنمایی و ئاسانکاری و گیروگرفتەکانی دەکات لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە کوردستانی عیراق.
نووسەر لە لاپەڕە (٧٩)ی کتێبەکەیدا و لەبابەتی کورد و بازرگانی لە پەیڤێکدا دەڵێ: «کورد گەلێکی رۆژهەڵاتین، ئەوان رێڕەو و رێبازێکی جیاوازی خۆیان

هەیە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری ئابووری، بەتایبەتی لەبوارەکانی بازرگانی، کوردەکان بەگشتی زۆر بەرزو بەڕێزەوە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ بەرامبەریان وەدی دێنن و بەشێوەیەکی زۆر بەرەوشت و خوویەکی بەرزەوە کارەکانیان ئەنجام دەدەن و گیانی برایەتی و هەماهەنگی و هاریکاری لەنێوان بازرگانە کوردەکان وەک هی وڵاتانی تر وایە، ئەگەر زۆر باشتر نەبێت».

هەروا نووسەر لە لاپەڕە (٨٢) باسی بۆنەو یادەوەرییەکانی ساڵانەی کوردەکان دەکات کە زۆر پێویستە بزانرێ، چونکە بە زانینیان ئاسانکارییەکی زۆر بۆ بازرگانەکان بەرجەستە دەبێت لە ئاییندەدا وەک ڕۆژی پیرۆزی جەژنی نەورۆزو ڕۆژەکانی هەینی و یادەوەری شاری هەڵەبجە و ڕۆژی ئەنفالەکان و بزرکردنی هەشت هەزار هاووڵاتی بارزانی و... تد.

کاک خەسرەو پیربال لە لاپەڕە (٨٦-٨٧) بەتێروتەسەلی باسی شوێن و ڕۆڵی ئافرەتی کورد دەکات لە هەموو بوارەکانی پەروەردەیی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بازرگانی، چونکە «لەکوردستاندا ئێستا زۆر ئافرەتی کورد ئەندامن لەڕێکخراوە جیهانییە بەرزەکان هاوکارن و هەمان هەنگیەکی زۆر پتەو دەکەن شان بەشانی پیاوانی کورد، ئەوان تێدەکۆشن لەپێناو ئەنجامدانی کارگوزاری باش بۆ بەرچاو خستنی ڕۆڵی ئافرەتی کورد لەهەموو دامودەزگاکانی ناوخۆ و جیهانیدا و ڕۆڵێکی بەرچاویان هەیە لە پەرلەمانی کوردستاندا». لەبارەی پێوەندییەکانی بازرگانی لەکوردستاندا زۆر بە ڕێکوپێکی ئەنجام دەدرێت لەڕێگای نامەناردن بۆ کوردستان، یا لە ڕێگای تەلەفۆن و فاکسی نێودەوڵەتی، چونکە ئێستا لەکوردستاندا کارگوزاری نامەناردن لەناوەخۆ بەباشی بەڕێوە دەچێت، هەروەها ڕۆژانە کوردستانی عێراق بەستراوەتەوە بەڕێگای گواستنەوەی تورکیا لەوێشەوە بۆ هەموو وڵاتانی جیهان، بۆ ئەوەی نامەی بازرگانیت هەبێ، یان هەر شتێک بتەوێ بگات بە بازرگانی کورد، زۆر بە ئاسانی دەتوانیت لەم ڕێگایەوە بیگەیەنیتە هەر بازرگانێکی بیانی لەهەر وڵاتێکی تر بێت. هەروەها بازرگانە بیانییەکان دەتوانن نامەکانیان بۆ بازرگانە کوردەکان ڕەوانە بکەن لە هەر شوێنێکی کوردستان بێت، ئەمەش ئاسانکاریە بۆ کەرتی بازرگانی. ئێستا لەکوردستانی عێراقدا تەلەفۆن و فاکسیش بە بەردەوامی شەو و ڕۆژ لەهەردوو کەرتەکانی گشتی و کۆمپانیا تایبەتییەکاندا کارگوزاری پێشکەش بەهاووڵاتیانی ناوخۆ و بیانی دەکەن، هەروا لە کوردستانی عێراقدا (ئەنتەرنێت) هەیە و ڕۆژانە سەدان پێوەندی و ئیمەیل بەهۆی ئینتەرنێتەوە ئەنجام دەدرێ و زۆربەی بازرگانانیش ئینتەرنێتیان هەیە و باری کاروباری ئەنتەرنێت لەکوردستاندا لەزۆر دەوڵەتانی دراوسێ ئاسانترو هەرزانترەو بەئاسانیش دەست دەکەوێت و زیاتریش لەپەرەسەندن و پێشکەوتن دایە. لەپێنجەم بەشی ئەم کتێبە دەگمەنەدا نووسەر چەپکێک سەرنج و پێشنیارەکانی لێکۆڵینەوەکەی دەخاتە بەر دیدی ڕۆشنبیران و بازرگانی کاران، هەندێ لەو سەرنج و پێشنیارانەش لەپێناو سوودی گشتی ئاراستەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کراوە، دیارە ئەم پەیڤانەش نیاز پاکی نووسەر دەردەخات بۆ بەرژەوەندی نەتەوەکەی پوختەی سەرنجەکانی نووسەر لەنێوان لاپەڕەی (٩٢-٩٦)ە نووسەر دەڵێ:

«پیادە کردنی بڕیاری ٩٨٦ زۆر گرنگە بۆ کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی چەسپاو بەردەوام بێت و ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی پێویستە زۆر گرنگی بەو خاڵانە بدات کە پابەندە بەگەلی کورد بۆ چەسپاندنی بەشی تەواوی کوردستان لەداهاتی نەوت، هەروا پێویستە بواری ڕامیاری ئاسایش و دارایی و ئابووریش بە بەردەوامی چەسپاو بێت و دوور بێت لەهەموو لەرزین، جگە لەمەش دامەزراندنی وەزارەتێکی تایبەت بەدارشتنی نەخشەو پلان و ئامارەکان زۆر پێویستە لەهەرێمی کوردستان، دیارە گرنگیدان بەکەرتی تایبەتیش مەسەلەیەکی زۆر سوود بەخشە هەموو ئەزموونەکانیش ئەو ڕاستییەیان سەلماندووە، هەروا مەسەلەی ئامرازەکانی گواستنەوەو ڕێگاوبان زۆر گرنگە بۆ بازرگانی نێودەوڵەتی، بۆیە باشکردنی ڕێگاوبانەکانی هەرێم لەگەڵ تورکیا و سوریا و ئێران لەسەر ئاستی سیاسی دەکرێت پێشنیار بکرێت و پردێک دروست بکرێت لەسەر ئاوی فیشخابوور کە هەرێمی کوردستان بەستێتەوە بەکۆماری سووریا».

لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا کاک خەسرەو پیربال مەبەستی لێکۆڵینەوەکەی دەردەخات و بەم شێوەیە هانی بازرگانەکان دەدات: «هەواڵی تازەمان بۆ بازرگان و کۆمپانیاکانی وڵاتە ئەوروپییەکان ئەوەیە کە هەرێمی کوردستان وڵاتێکی ڕێکوپێک و ئاسایش و ئارامی بەتەواوی باڵی بەسەردا ڕاکێشاوە و وڵاتێکی دەوڵەمەندەو کاروباری بازرگانی زۆر بە ئاسانی تێدا ئەنجام دەدرێ و قازانجی باشیشی لەبازرگانیکردن لەگەڵیدا وەدەست دێت و هەلێکی زۆر باش و بەرفراوان ڕەخساوە بۆ بازرگانیکردن لەگەڵیدا..».

# بۆ گێڕانەوەی مێژوو ڕاستگۆیی و شارەزایی پێویستە

جەلیل عەباسی

لە لاپەڕە (٢٣٣-٢٣٨)ی ژمارە (٦٦)ی گۆڤاری ڕاماندا بابەتێکم خوێندەوە بە قەڵەمی کاک (حەیدەر لوتفی نیا) بەناونیشانی «هەڵچوون و داچوونی خواوەندان لە چاخی پۆلی تێئیسمدا». چەند پەرەگرافێکی بابەتەکە سەرنجیان ڕاکێشام و هەستم بەوە کرد کە نووسەر لە چەند جێگایەکدا تووشی هەڵەبووە، بۆیە بە پێویستم زانی هەوڵی ڕاستکردنەوەیان بدەم تا ئاستی ڕوانینی خوێنەری کورد ڕوونتر ببێتەوە و (ڕاستی)ش وەکو خۆی پیشان بدرێت و مێژووی کۆنیش مافی خۆی بدرێتێ:

یەکەم: لە ستوونی دوودمی ل٢٣٣دا نووسراوە: «ئێرانیگەل پێش هاتنی دگەڵ هیندووەکان خواوەندگەلێکی جۆر بەجۆریان دەپەرست..». وەک ئاشکرایە، ئەم ڕستەیە ناتەواوە و هیچ زانیاری و پەیامێک ناداتە دەستەوە، چونکە دەستەواژەیەکی لێ قرتاوە کە دەبوو بکەوتبایە نێوان (پێش هاتنی) و (دگەڵ..)ەوە تا واتای تەواوی هەبێت بەم جۆرە: ئێرانیگەل [تا] پێش هاتنی [زەردەشت و ئایینی مەزدیەسنا] لەگەڵ هیندووەکاندا..

دووەم: لە ستوونی دووەمی ل٢٣٤دا باسی مەلەک تاووس دەکات و لە کۆتاییەکەیدا دەڵێت: «... هەروەها پێوەندی و هاوشێوەیەکی زۆر دە نێوان ئەو [مەلەک تاووس] و ئەهوورامەزدا دەبینرێ»، لێرەدا پێویست بوو ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر ئەو لێکچوون و پێوەندییە هەبووبا کەچی بەداخەوە خۆی لێ لاداوە، ئەویش ئەوەیە کە ئایینی ئیزەدی بەشێکی جیاکراوەو دابڕاوە لە ئایینی مەزدیەسنا کە پاش دابڕان و لادان لەو ئایینە هەندێ تایبەتمەندی و ناونیشان و هێماو ڕێسای جیاوازی لە خۆی گرتووە و لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانیوە هەر بەتەواوەتی لە بنەماکەی داببڕێت، بۆیە دەبینین ئەو چەشنە پێوەندی و لێکچوونە لە زۆر بواردا بەدی دەکرێت کە پیشاندەری ئاستی سەرەوەی ڕادەی کاریگەریی گەوهەری بنەماکەیە کە بەسەریەوە ماوەتەوە. ئەم بۆچوونە بۆ پێڕەوانی ئایینی (ئەهلی حەق)یش هەر بەم شێوەیە دەردەچێت.

سێیەم: لە ستوونی دووەمی ل٢٣٥دا باسی وشەی (درۆزن) دەکات و بەناوی دێوێک دەیناسێنێ. دەبێ بڵێم (دێو) و (درۆ) لە ئایینی زەردەشتدا دوو شتی جیان. دێو لە ئاڤێستادا یەک ناوی گشتی هەیە (دەئێڤە) کە بۆ هەموو دێوەکان بەکاردێت. دێو بکەرە (فاعل) بەڵام درۆ کار (فعل)ە، پاشان (دروجی) نییە، بەڵکو (دورڤەج)ە ئەویش نەک بەواتای درۆزن، بەڵکو بەواتای هەمان (درۆ)، درۆزن دەبێتە (دردگڤەت) و درۆخواز دەبێتە (درەگڤائو) و خودی درۆش دەبێتە (دورڤەج) کە ئەویش بەرنامە و یاسای دێوەکانە بۆ فریودانی مرۆڤ و تێکدانی ژیان، لە ئاڤێستا دەڵێین (دێوی درۆم واتە ئەو دێوەی کە درۆ (ئامێری فریودان) بەکاردێنێ.

چواردم: لە ستوونی سێیەمی هەمان لاپەڕەدا باسی وشەی (مەزن) دەکات و دەڵێ: «.. لە ئاڤێستادا (Mazen) بەمانای گەورەیە کە دە ئەسڵدا پەسەندی بڕێک لە دێوەکانی هەیکەلی و ترسێنەرە». ڕاستە (مەزن) واتە گەورە، وشەکە لە ڕیشەی (مەزدا)وە وەرگیراوە و هەر تەنیاش وەکو سیفەتێک دەدرێتە پاڵ یەزدان- خوا، نەک دێوی گەورەو..! کە دەڵێین ئاهوورای

مەزن یا یەزدانی مەزن، واتە ئاهوورا یا یەزدانی گەورە و پیرۆز. لێرەدا وشەی گەورە بە مەبەستی زل و زەبەللاح نەهاتووە، بەڵکو واتای باڵا دەست و بەتوانا (قادر) دەگەیەنێت.

پێنجەم: لە ستوونی دووەمی ل٢٣٦دا باسی وشەی (جەهی) دەکات و دەڵێت: «... بەپێی ئەفسانەگەلی زەرتوشتی ژنەکان لە ئەوە [جەهی] پێک هاتوون...» و دواییش ئاماژەی بەوەداوە کە لە بەرهەمێکی (میهرداد بەهار)ی وەرگرتووە. دەبێ بڵێم لە ئایینی پیرۆزی زەردەشتدا ئافرەت شان بەشانی پیاو بەمرۆڤ ناو دەبرێت و رێزی لێدەگیرێت و نەک هەر ئامێرو سەرچاوەی خراپە نییە، بەڵکو بە سەرچاوەی ئەفراندن و راستی و خۆشەویستی پیرۆز دادەنرێت و هیچ کات هیچ سووکایەتی یا بە کەم زانینێک لە ئایینی ئەهوورایی‌دا رووبەرووی ژن نەبۆتەوە و سەرچاوە و بنەمای مرۆڤیش دەگەرێتەوە سەر (مەشی و مەشیانە) کە دواتر لە عەرەبیدا بوونەتە (ئادەم و حەوا)، لە ئایینی مەزدیەسنادا هەر ئەوەندە هەیە کە وەک چۆن پیاوی راستگۆ و پیاوی درۆزن یاخود پیاو چاک و پیاو خراپ هەیە، بۆ ئافرەتیش هەروا، واتە ئافرەتی چاک و ئافرەتی خراپیش هەیە کە لە ئاڤێستادا سیفەتی (جەهی-جەهیکا)ی دراوەتە پاڵ ئافرەتی خراپ و سیفەتی (نائیری- نا ئیریکا)ش بۆ ئافرەتی چاک بەکارهاتووە. ئەوەش بڵێم کە دەبوو نووسەر ئەوەی بزانیبا کە (میهردار بەهار) بۆ لکاندنی قسەکەی تەنیا پشتی بە هەندێ گێرانەوەی سەرزارەکی ناو رەمەکی جەماوەری زەردەشتی بەستووە کە لەناو خودی زەردەشتییەکاندا جێی بروا و متمانەنین، بە داخەوە ناوبراو وەکو لێکۆڵەرێک لە لێکۆڵینەوەکانیدا خاوەنی سەرنجێکی وردنەبووە و زۆرجار خۆی تووشی هەڵە کردووە و بۆ وێنەش من لە شوێنی دیکەدا لەسەر (بابا تاهیری عوریان)دکەیم نووسیوە و هەوڵم داوە هەڵەکانی راست بکەمەوە و....، مەبەستم لە هێنانەوەی ئەم نموونەیەش ئەوەبوو کە بڵێم ناتوانین بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی هەر تەنیا پشت بە بۆچوونەکانی ناوبراو ببەستین و بڕوایان پێ بکەین، بەڵکو دەبێ بەدوای بەڵگەو فاکتەری راستەقینە و زانستی تردا بگەرێین.

شەشەم: لە دێری ١٢ی ستوونی یەکەمی ل٢٣٧دا دەنووسێت: «هورمۆز یان ئەهوورا مەزدا کە هاوکات دەگەڵ ئەهریمەن لە لەشی (زروان)ەوە لە دایکبوونە و دەسەلاتی دنیای بەدەستەوە گرت» [؟!!!] هەموو لایەکمان دەزانین کە ئەوکەسەی خۆی لە باس و بابەتی مێژوویی دەدات، ئەرکێکی قورس و گرانی لەسەر شانەو دەبێ هەست بە بەرپرسیارێتی بکات و خەرمانی زانیارییەکانی خۆی دەوڵەمەندتر بکات و بە قووڵی بچێتە ناخی مەسەلەکانەوە و بیانخاتە ژێر تیشکی سەرنج و نیگایەکی وردبین و راستیخوازانەوە تاتووشی هەڵە نەبێت و نەبێتە هۆی ئاوەژووکردنی راستییەکانی مێژوو. دەبوو کاک حەیدەر ئەو راستەقینە بەدیهی و هەرە سەرەکییەی بزانیبا کە مەزدا ئەهوورا خواوەندە، یەزدانی تاقانەیە، خالقی ئەزەلی و ئەبەدییە و لە دایک نەبووە و نەخولقاوە، ئەویش هاوکات لەگەڵ ئەهریمەندا!! نووسەر لەو پەرەگرافەیدا تووشی هەڵەیەکی زەق و گەورە و چەواشەکارانە بووە، ئەمە جگە لەوەی کە ناوی کورت کراوەی مەزدایشی هەر بە هەڵە نووسیوە، واتە نووسیویەتی «هورمۆز» کەچی راستییەکەی (هورمز) یاخود (هورمزد)ە کە کورتکراوەی ناوی تەواوی (ئەهوورەمەزدە)یە. پاشان نووسەر ئەو راستییەی لەبیرکردووە کە ئەهریمەن لە ئاڤێستادا (ئەنگەرەمینو)یە و نەک لەگەڵ ئەهوورادا، بەڵکو هاوکات لەگەڵ (سپەنتامینو)دا بەدیهاتوون و بەدوو هەمزادی دووانە ناودەبرێن کە یەکیان پاک و پیرۆزە و یەکیان خراپ و نەگریس، ئەنگەرەمینو، واتە رۆحی ناپاک (شەڕ) و سپەنتامینو واتە رۆحی خێر (چاکە). ئەم دوو هەمزادە هەمیشە لە شەڕدان و لە ئەنجامدا سپەنتامینو بەسەر ئەنگەرەمینودا سەردەکەوێت و شەڕو ناپاکی و.. کۆتایی دێت. نووسەر تووشی هەڵەیەکی زەقتریش بووە کە ئەویش هێنانە ئارای (تناسخ) و تێکەڵکردنی ئایینی زروانی و زەردەشتییە لە حاڵێکدا ئایینی زەردەشت دژی ئایینەکانی زروانی و میترایی سەری هەڵدا و یەک لەو دیاردانەش کە لەواندا هەبوو و زەردەشت پووچەڵی کردەوە هەمان بروا بە (تناسخ) بوو. ئیدی چۆن دەبێ لە خۆمانەوە و نا وشیارانە مێژوو بشێوێنین و مەزدای پیرۆز بەزادەی زروان و هەمزادی ئەهریمەن بزانین و شتێ کە زەردەشت پشتی لێکردووە بیساوینەوە بەسەر ئایینەکەیداو ئەو قودسیەت و پیرۆزی و مەزنایەتییە بەو ئوسلووبە نا شایستە پێشێل بکەین؟!

حەوتەم: لە ستوونی دووەمی هەمان لاپەڕەدا دەقی شیعرێکی هەورامی کۆنی بە نموونە هێناوەتەوە و بەمجۆرەی نووسیوەتەوە:

**«هورموزگان رمان ئاتران کوژان**
**وێشان شاردەوە گەورەی گەورەکان**
**رەوشت زەردوەشتەرمانەوە بێ کەس**
**بزیکانیکا هورموزدوە هیچ کەس»!**

نازانم نووسەری بابەتکە ئەم شیعرەی لە کوێ و لە کێ وەرگرتووە، ئەوەندە دەڵێم کە شیعرەکەی بەناتەواوی هێناوەتەوە و شێواندوویەتی و تیایدا تووشی هەڵە بۆتەوە، لێرەدا دەقی تەواوی شیعرەکە بەدروستی دەنووسمەوە:

**«هورمزگان رمان ئاتران کوژان**
**وێشان شاردەوە گەورە گەورەکان**

**زورکار ئارەب کردنا خاپوور**
**گنائی پالە هەتا شارەزوور**
**شەن و کەنیکا وەدیل بشینا**
**مەرد ئازا تلیا وەرووی هوینا**
**رەوشت زەردەشت مانەوە بێکەس**
**بزیکا نیکا هورمزوە هیچکەس».**

سەبارەت بەم شیعرە پێویستە بڵێم سەرەڕای هەموو ئەو قسـانەی لە بواری زمـانەوە لە سـەری کـراون، ئاوێنەیەکە بۆ پیشاندان و نواندنی قۆناغێک لە مێژووی نەتەوەکـەمـان کـە بەداخـەوە لەم بوارەدا نـاگـونجـێت و دەخوازێ بەجیا و بەچڕوپڕی شی بکرێتەوە، هیوادارم لە دەرفەتێکی دیکەدا بتوانم ئاوڕی لێ بدەمەوە و لە سەری بنووسم و بەڵگەی دوو سـەدە بێـدەنگی ئەم نەتەوەیە بهێنمەوە دەنگ!.

لێرەشدا دێمە سەر هەڵەیەکی زەقی خودی گۆڤاری رامان، هەڵەیەک کە چەندین جار لە چەندین ژمارەی ئەو گۆڤارە بەرێزەدا دووپات بۆتەوە، ئەمەش لە حاڵێکدایە کە بۆ خۆم چەند جار لەگەڵ هاوڕێیان لە راماندا باسم کـردووە و پێم ڕاگـەیاندوون کـە ئەوە هەڵەیە پێـویسـتـە ڕاستی بکەنەوە کەچی بەداخەوە لەم ژمارەیەشدا هەر لە سـەری ڕۆیشـتـوون و لە بابەتەکـەی کـاک حـەیدەریشـدا تووشی بوونەتەوە. ئەو هەڵەیەش وێنەیەکـە کـە لە لای چەپی ل٢٣٥ی راماندا چاپ کراوە و لەژێریدا نووسراوە: «ئەهوورامەزدا»!! ئەمەش لە ڕاسـتیـدا هەڵەیەکی زەق و ناحەزە و ڕاستەقـینەیەکی ئاشکرای مێژوویش ئاوەژوو دەکـات سـەرەڕای ئەوەی کە هانی هەندێ مـێژوو نووسی مێژوونەناس و چەواشەکارو ناحەزیش دەدات کە زۆرترو بێ شەرمانەتریش ڕاستییە مێژووییەکانمان ئاوەژوو بکەن و بکەونە تانەو توانج و سـووکـایەتیکردن بە ئایینێکی پیرۆز کە وەک ڕچەشکێن و پێشـەنگ و سەرقافڵەی هەر هەموو دینە یەکتاپەرستەکان و وەک یەکەمین قوتابخانەی ڕاسـتی و پـاکی و هەسـتی مـرۆڤـانە دەبێ شـانازی پێـوە بکرێت و ببـووژێنرێتـەوە. لێـرەدا بۆ دەرخـسـتن و ڕوونکردنەوەی فـەلسـەفـەی ئەو وێنەیە و ئاشنابوونی زۆرترین خوێنەری کـورد لەگەڵ ئەو هێـمـایەدا [حـەزیش دەکـەم ئەم ڕوونکردنەوەیە بۆ دواجارو هەمـیـشـە بێت] دەڵێم: ئاهوورامـەزدا، نـاوی پیـرۆزی یەزدان (خـالـق، خـوای تاقـانە)یە لە ئایینی پیرۆزی ئەشوو زەردەشـتـدا. ئەشوو زەردەشـتی ڤـەخشـوەر بۆ یەکـەمجـار باسی خـوای تاقـانە و دینی تاقـانە پەرسـتی هێنایە گـۆڕێ و ناوی «مـــەزدا ئەهوورە»ی بۆ خـــوای تاقـــانە دانا بەواتای سەروەری زانا و دۆستی مەزن. دیارە خوای تاقانەش نە وێنەی هەیە و نە سـیـمـایەکی مـادی، ئەهوورامـەزدا نە خـوای دەسکردە نە یەک لە چەندین خـوا یۆنانیـیـەکـەی جاران و نەش بتە تاوەکو پەیکەرو رەسم و سیمای مادی هەبێت، ئەو وێنەیەش کـە بەداخـەوە بە ناشـارەزایی دەدرێتـە پاڵ ئەهوورامـەزدا، لە ڕاسـتیـدا سـەمبـول و هێمایەکی پیرۆزی ئایینی زەردەشتییە کە پێی دەگوترێ: (فرەوەهرە) یاخود (فـرەوەشی) کـە ئەویش هەمـان بەشی مـینویی (غـەیرە مـادی)ی گـیـانلەبەرانە کـە دواتر لە ئیسلامدا بۆتە (ڕۆح)، فرەوەشی واتای هەڵگرو پارێزەر دەدات کـە فـەلسـەفـەیەکی تایبـەتی بۆ دانراوە و بۆ پیشـاندان و شـیکردنەوەی ئەو پەیام و فـەلسـەفـەیەش بەپێی سێ بنەمای ڕەسەنی زەردەشتی ئەو پەیکەرەیەی بۆ دروست کـراوە و بۆتە هێـمـا. ئەگـەر بەوردی سـەرنجی پەیکەرەی فرەوەهرە بدەین دەبینین: مرۆڤێکە کە سـەر، دووباڵ و دوو قـاچی هەنە و حـەڵقـەیەکی بچـووک لە دەستی و حەڵقەیەکی گەورەشی لە کەمەردایە هەر کام لەو نیشانەگەلەش واتایەکی هەیە کە من لێرەدا زۆر بەکورتی و وەک ناسـاندنێکی سـەرەتایی ئامـاژەیان پێـدەکـەم: (سـەر= ئەندێشـەی چاک+ دووباڵ= هێـزی پێـشکەوت، ورە و توانا+ سێ خەتی ناو باڵەکان= ڕەفتارو گفتەو هزری چاک+ ئەڵقەی بچووک= ژینی مرۆڤ+ حەڵقەی گـەورە= جیـ[illegible] + دوو قـاچ= سپـەنتـامـینو و ئەنگەرەمینو+ [illegible]ـی خوارەوەی باڵەکان= ڕەفتارو گفتەو هزری خراپ) واتاکەشی دەڵێ: «مرۆڤ بەزانست و تاقـیـکاری و ورەی بەرز خـۆی پێش دەخـات، دەبێ ئەندێشە [illegible]ـتارو کرداری چاک بێت و هەوڵ بدات بۆ ئا[illegible] [illegible]ـستنی جیهان و دێوی درۆ و وێرانی لەنێو بەرێت و بەم چەشنە ژیان پڕ دەبێ لە بەخـتـیـاری و خـۆشـەویسـتی و مـرۆڤ دەگـاتە قـۆناغی کـەمـال و پێگەیشـتـوویی و ژیانی بەخـتـەوەر و هەتا هەتایی دەسـتـەبەر دەکـات کـە ئەویش یەکـێکە لە باشـترین و پیرۆزترین بەخششەکانی مەزدائەهوورا بە مرۆڤی چاک و پێـرەوی ڕاستی و ئەندێشـەی چاک و خـۆشـەویسـتی و ڕاستی خوازی. کەوابوو پێویستە وردترو ژیرانەتر بیر لە شتەکان بکەینەوە و هەوڵ بدەین ڕاستییەکان وەک خۆیان بنوێنین و هەوڵیش بدەین ژیرانەترو دڵسـۆزانەتر ڕازو ڕەمـزی هەرە قـووڵ و دێرینەی ناو کـولتـوورو کـەلەپووری خـۆمـان دەربخـەین و زیندوویان بکەینەوە و نەوەکـانی دواتریشمان لە سەریان ڕابهێنین. لە کۆتاییدا دەبێ بڵێم کە وەکو پێشتریش گوتم زۆر بە کورتی باسی ئەو هێمایەم کرد، چونکە بەتێرو تەسەلی لە بەرگی یەکەمی ئاڤێستادا لە سـەریم نووسـیـوە کـە هیـوادارم زووتر درزێکی لێ بکرێتەوە تا ڕووناکی چاپ و بڵاوبوونەوە بەخۆوە ببینێت و ببێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەری ڕۆشنبیری کورد زۆرترو باشتر مێژووی دێرینی خۆی بناسێتەوە و...

مەزدائەهوورەی مەزن و ئەشووزەردەشتی ڤەخشوەر پشتیوانمان بن.

# کەریم سۆفی:
# دەکرێ هەندێک لە دەقە وەرگێڕدراوەکان لەدوای وەرگێڕاندا بەتاموچێژتر بکرێن

**کەریم سۆفی سالی (١٩٥٣) لە هەولێر لەدایک بووە. سالی (١٩٨٠) کولێژی ئادابی بەشی زمانی فارسی لەبەغدا تەواوکردووە.**

**لە سەرەتای حەفتایەکان بەشیعر لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ناوی خۆی ئاشنای خوێنەران کرد، دواتر وەک وەرگێڕێکی جێگای باوەڕ بەرهەمێکی زۆرو زەبەندی لە زمانی فارسی و عەرەبییەوە وەرگێڕاوەو لێرەو لەوێ بلاوی کردوونەتەوە، لەم دیمانە کورتەدا هەندێک لە ڕازەکانی بواری کارکردنی دەدرکێنێت.**

* یەکەم بەرهەمی وەرگێڕراوت لە زمانی فارسییەوە چی بوو؟ کەی؟

– یەکەمین بەرهەم کە وەرم گێڕاوە، شیعرێکی مندالان بوو بەناوی (کچە جووتیارێ) کە شیعری (جەباری باغچەبان)ە و لە زمانی فارسییەوە بەشیعر وەرم گێڕاوەو لە پاشکۆ کوردیەکەی ڕۆژنامەی عێراق ژ (٢٦) مایسی/ ١٩٧٩ بلاوکراوەتەوە.

* هەندێک لەکارە وەرگێڕدراوەکان تام و چێژی خۆیان لە دەست دەدەن، تۆ دەڵێی چی؟

– بەلای منەوە، ئەم پرسیارە ئەگەر بە ئاوەژووش بکرێت، هەر ڕاستە، چونکە لە کردەی وەرگێڕاندا، کاتی خۆی ڕایەکم کەوتووەتە بەرچاو- کە تا ڕاددەیەکی زۆر لەگەڵیدام دەڵێ: (هەندێ جار وەرگێڕان، یان لە دەقە سەرەکییەکە بەهێزتر دەبێت، یان بێهێزتر) واتە مادام وەرگێڕانە، مەحاڵە وەک میلی تەرازوو لە ئاستی دەقەکەدا بووەستێت و عەیاری تێک نەچێت. مەسەلەی تام و چێژیش، وەنەبێت لە هەموو حاڵەتەکانی وەرگێڕان و جۆراوجۆری بابەتەکاندا وەکو یەک بێت، چونکە زۆر هۆکارو ئامرازو حاڵەت دەخزێنە ناو پرۆسەکەو ڕۆڵی خۆیان دەبینن و کاریگەری و شوێنەواری خۆیان لەسەر دەقە وەرگێڕدراوەکە بەجێ دەهێڵن، بەتایبەتی لە دەقە ئەدەبی و هونەرییەکاندا، بۆیە دەکرێ هەندێک لە دەقە وەرگێڕدراوەکان لە دوای وەرگێڕاندا بەتام و چێژتر بکرێن، یان بە پێچەوانەوە. ئەو حاڵەتانەش، ئەو کاتەی هەستی پێدەکرێت کە خوێنەری بەسەلیقە بابەتەکە بە هەردوو زمان بخوێنێتەوە. ئەمەش وەنەبێت کارێکی چەسپاوونەگۆڕ بێت، بەڵکو زیاتر ڕێژەییە.

بۆ نموونە، ئەگەرچی (داغستانی من)ی ڕەسووڵ حەمزاتۆڤ کە د. عەزیز گەردی لە زمانی ئینگلیزیەوە کردوویەتی بە کوردی، واتە لە زمانی سەرەکی دەقەکەوە نییە، بەلام کارامەیی و دەستڕەنگینی و پسپۆرایەتی وەرگێڕ بە مانا کولتووری و کەلەپوورییەکەی نەک ئەکادیمییەکەی، توانیویەتی بەرگێکی کوردەوارییانەی



ئەوتۆی لەبەر بکات لەکاتی خوێندنەوەیدا، هەست نەکەیت ئەمە وەرگێڕانە.

هەروەها ڕۆمانی (ئەفسانەی چیای ئاگری و کوێر ئۆغلی و کورتە ڕۆمانی تەنەکە)ی یەشار کەمال، کە مامۆستای خوالێخۆشبوو شوکور مستەفا لە زمانی سەرەکییەوە (تورکی) کردوونیەتی بەکوردی، سەدان ئیدیۆم و قسەی نەستەق و پەندی کوردییان تێدا بەکار هێنراوە کە سیماو خاسیەتێکی زۆر کوردەوارییانەیان بە دەقە وەرگێڕدراوەکان بەخشیوە... نموونەی دیکە هەیە، بەلام مەبەست لێرەدا دەرکەوتنی جێ پەنجەی نەخشاندنی وەرگێڕی سەرکەوتووە کە جۆرە دەوڵەمەندییەک بە زمانی بۆ وەرگێڕدراو دەبەخشێ و خوێنەریش چێژ لە خوێندنەوەی دەقە وەرگێڕدراوەکە وەردەگرێت، واتە نە دەقنووس و نە دەقەکەو نە وەرگێڕو نە خوێنەر، یان گوێگر ڕەنجیان بە بادا ڕوات، ئەمەش خاسیەتێکی ئیجابیانەی وەرگێڕانی سەرکەوتووە.

* چۆن تەماشای گرفتی وەرگێڕان دەکەی؟

– کاری وەرگێڕان، ئیشکردنە لەناو زمان و

ڕەفتارکردنە لەگەڵ وشەو ڕستەو دەستەواژەو شێوازی دەربڕین و... تاد ئینجا ئەم وەرگێڕانە چ لە زمانی یەکەمەوە بێت، یان لە زمانی دووەم، یان سێیەم... تاد هەروەها بەو پێیەی کە هەموو زمانێک خاوەن تایبەتمەندی و دەستوورو ڕێسای ڕستەسازی و وشە ڕۆنان و ئیدیۆم و زاراوەو شێوە دەربڕینی خۆیەتی کە پەیوەست بە دابونەریت و کەلەپوورو کولتووری ئەو کۆمەڵگایەیە کە زمانەکەی تێدا بەکاردێت. ئەوا وەنەبێت بەدیهێنانی ئامانجی وەرگێڕان لە هەموو حاڵەتەکاندا بێ گرفت و گرێ و گۆڵ بێت، بەڵام گرفتەکان لە هەموو حاڵەتەکان وەکو یەک نین، مەسەلەکە ڕێژەییەو هەندێ گرفت گشتییەو هەندێکی دی تایبەتییەو ئەمەش لە وەرگێڕێکەوە بۆ وەرگێڕێکی دی دەگۆڕێ و هەروەها لە زمانێکەوەش بۆ زمانێکی دیکە جیاوازە. مەرج نییە چەند وەرگێڕێک کە لەیەک زمانی دیاریکراو کاری وەرگێڕان ئەنجام دەدەن، گرفتەکانیان وەکو یەک بێت. چونکە کارەکە وێڕای زانین و شارەزایی لە هەردوو زمانەکەو پسپۆڕایەتی لەو بوارەی کە وەرگێڕانەکەی لەسەر ئەنجام دەدەرێت، ئەوا مەسەلەی سەلیقەو زەق و حەزو ئامادەیی دەروونی و خۆشەویستی بۆ کارەکەی و ڕادەی دڵسۆزی و ئەمانەتداری و چەندان پێشینەی دی کە پڕ لە وردەکارین، کاریگەری و ڕۆڵی خۆیان لەم بەستێنەدا دەبینن. پاشان گرفت و حاڵەتەکانی وەرگێڕان بەپێی خاسیەتی زمانەکان و کەسایەتی وەرگێڕ دەگۆڕێن و حاڵەتێکی چەقبەستوو و ڕاگیراو نین.

* پێوەندی نێوان وەرگێڕو فەرهەنگ (قاموس) چۆن دەبینن؟

– ئەگەرچی وەرگێڕ کارامەو لێزان و شارەزاش بێت چ لە ڕووی دەسترۆیشتوویی زمان، چ لە ڕووی پاشخانی کولتووری ئەو بوارەی کە وەرگێڕانی لەسەر ئەنجام دەدات، بەڵام بۆ دڵنیایی زیاترو دوور کەوتنەوەی لە (التباس) لە مانای وشەیەک کە لەنێو ڕستەو دەربڕیندا زیاتر لە مانایەک و حاڵەتێک دەگەیەنێ، یان مانایەکی نزیک و بەناویەکدا چوونیان لێ دەکەوێتەوە، ئەوا وەرگێڕ ناکرێ بەیەکجاری دەستبەرداری فەرهەنگ بێت و بە لەخۆباییبوونەوە نەگەڕێتەوە سەر فەرهەنگ، چونکە لەوانەیە بەپشت بەستن بەلایەنی ڕووکارو دیاری وشە، یان پەرەگراف، وەرگێڕان ئەنجام بدات و بەمەش تووشی هەڵەی وەرگێڕان بێت، بۆیە گەڕانەوە بۆ فەرهەنگ لەکاتی پێویستدا، یان بۆ دڵنیایی، کارێکی لە جێ و شیاوەو نەنگی نییە، هەر لەم سۆنگەیەوە دەڵێم نەبوونی فەرهەنگی گشتی و فەرهەنگی تایبەتمەند لە بوارە جیاجیاکانی زانیاری و ڕۆشنبیری و چالاکییەکانی مرۆڤایەتی، دیسان ئەمەش وەک گرفتێک ڕووبەڕووی وەرگێڕ دەبێتەوە، تا هەندێ جار وا لەوەرگێڕ دەکات کە لە خۆیەوە، یان بێ تێفکرین و پێوانەکردن، زاراوەیەک بە هەوەستی خۆی دابڕێژێ، یان ناوی کەسایەتیەکی هزری و ئەدەبی و ڕۆشنبیری بە چەند شێوەیەک بنووسێتەوە بەمەش جۆرە پەرتەوازەییەک لە بواری یەک خستنی زاراوەو ناوە بیانییەکان دێتە گۆڕێ و لە کۆتاییدا ڕەنگە لەجیاتی سوود گەیاندن، زیان بگەیەنێت.

* لە بارەی ڕەخنەی وەرگێڕانەوە چی دەڵێی؟

– مەسەلەی نەبوونی ڕەخنە، یان ئامادە نەبوونی ڕەخنەی بەراوردکاری لە بواری وەرگێڕاندا بەشێوەیەکی بابەتیانەو زانستیانەی ئەمانەتدار، وای کردووە کە جۆرە زۆری و بۆریەک لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، هەتا بە کتێبیش، بێ منەت ڕێ تەی بکەن و جێیەک بۆ خۆیان لەنێو کتێبخانەو ناوەندی ڕۆشنبیری کوردی داگیر بکەن، لەوانەیە سبەی ڕۆژێ ببنە سەرچاوەی پشت ئەستووریش بۆ زۆر لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەکادیمی کە ڕەنگە لەکاتی دەرکەوتن و ساغبونەوەیاندا جۆرە گرفتێک و نامتمانەییەک لەو نێوانەدا دروست بکەن.

بۆیە کارەکان چەندی پێویستیان بە شارەزایی و پسپۆڕایەتی ولێزانییەوە هەیە، دە ئەوەندەش پێویستیان بەڕەچاوکردنی ئەمانەتداری و دیاریکردنی ئەو سەرچاوانەوە هەیە کە بەدروستی و بەڕوونی بنووسرێنەوە کە وەرگێڕانەکەی لەسەر ئەنجام دراوە، زۆرجاران لەناو لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژدا ناوی دەیان فەیلەسووف و هزرمەندو کەسایەتی ڕۆشنبیری و ئەدەبی دێت و گوتە و قسە بەزاریانەوە دەنووسرێتەوە، کەچی تاک و تەرای لێ دەرچێت، کەس ئاماژە بە پەراوێزێک، یان سەرچاوەیەک ناکات تا بزانین ئەم هزرمەندە، یان فەیلەسووفەی گوتەو قسەکەی بەنموونە هێنراوەتەوە، لەچ سەرچاوەیەکدا، یان بۆنەیەکدا ئەمەی وتووە. بۆ ئاماژەی پێ نادرێ. بەڕاستی ئەمانە کارەساتن و ناپاکین و جۆرە گێرەشێوێنیەکی فیکرین و ڕۆشنبیری سەقەت دروست دەکەن کە جێ بە متمانە لەق دەکات، حاڵەتێکی دیکە کە بەلاي منەوە زۆر گرینگە، لێرەدا حەزدەکەم ئاماژەی پێ بدەم ئەوەیە: کاتێ وەرگێڕێک سەرچاوەکەی بابەتێکی وەرگێڕدراو بە ئەمانەتەوە دەستنیشان دەکات، یان لە پەراوێزدا تێبینی دەنووسێ کە نەک هەر لەبەرژەوەندی حاڵەتی وەرگێڕانەکەدایە، بەڵکو لە بەرژەوەندی ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەشدایە کە بابەتەکان بڵاو دەکەنەوە، بەڵام بەداخەوە دەبینین هەندێک ڕۆژنامە، یان گۆڤار بەبێ پاساو، یان هۆکارو حاڵەتێکی نائاسایی، ڕەچاوی ئەم خاڵە گرینگە ناکەن. بەمەش کەلێنی ڕەخنەگرتنێکی ناوەختەی چاوەڕواننەکراو لەسەر وەرگێڕ دەکەنەوە. بۆیە من بەڕەوای نازانم و ڕۆژنامەو گۆڤاریش بەبێ پاساو و پاسا مافی ئەوەیان نییە لەگەڵ بڵاوکردنەوەی بابەتی وەرگێڕدراوەدا، سەرچاوەکەی کە لەگەڵیدایە، یان ئەو

زمانەی کە دەستنیشان کرایەو وەرگێڕانەکەی لەسەر ئەنجام دراوە، لای بدەن و بلاوی نەکەنەوە، چونکە ئەمە پێچەوانەی عورف و ئەمانەتی گەیاندن و ڕاگەیاندن و بلاوکردنەوەیە، مادام هیچ پاساو، یان هۆکارێکی خزمەتکار بە بەرژەوەندی گشتی لەپشت ئەو مەسەلەیەوە نەبێت.

* ئەدی وەرگێڕان بەدەستکارییەوە؟

مەسەلەی وەرگێڕان بەدەستکارییەوە، ئەگەرچی لەبواری وەرگێڕاندا باوەو بوونی هەیەو هەموومان کەم و زۆر ئیشمان لەسەری کردووە، بەلام ئەویش وەک گرفتێک حالەتی خۆی هەیە، چونکە لەم پەنایەوە، زۆرجاران وەرگێڕ لەجیاتی دەستکاری، خۆی بەسەر پەرەگراف و وشەی زەحمەت دەپەڕێنێتەوە کە ڕەنگە لەم حالەتەدا دەستکارییەکەی لەجێی خۆیدا نەبێت و ئەم دەستکارییەش مەرج نییە بۆ هەموو بابەتێک دەست بدات، بۆ نموونە بابەتێکی مێژوویی، یان بەلگەنامەو دیکیۆمێنت، یان بابەتی زانستی روون.... ڕەنگە دەستکاریکردنیان زۆر پەسند نەبێت، ئەگەرچی دەستکاریکردنیش لە بواری وەرگێڕاندا ڕەنگە هەلومەرج و ئامانج و مەبەستی خۆی تێدا بێت، لەم حالەتانەشدا دەکرێ وەرگێڕ وەک ئەمانەتی ئەدەبی، لە پەراوێزدا قسەی خۆی، یان تێبینی و ڕوونکردنەوە، یان ڕاستکردنەوەو ڕەتدانەوەی خۆی وەک پێویست تۆمار بکات، ئەمەش کاریکەو ئەمینی و بەتەنگەوە هاتنی وەرگێڕ دەخاتە ڕوو لە مەیدانی کارەکەیدا.

* هەست دەکەین خۆت لە قەرەی وەرگێڕانی زۆر لە بوارەکانی نووسین داوە، ئەمەیان لەبەرچی؟

– ڕاستییەکەی لەوەتەی دەستم قەلەمی گرتوودو تاکو ئێستاشی لەگەلدابێت باری گوزەران و قەدەرەکانی ڕۆژگار بۆ من وانە ڕەخساوە کە بتوانم بە بەرنامە ئیش لەسەر وەرگێڕان بکەم، ئەگەرچی خۆم بۆ کاری وەرگێڕان تەرخان کردووە، بەلام وەرگێڕان لەپال کارە وەزیفیەکان، وەکو کاری دووەم و سێیەم ئیشی لەسەرکراوە، ئینجا لەو حالەتەشدا، ئەو بابەتەی خۆم پێم باش بووبێ، یان حەزم کردبێ وەری بگێڕم، یان وام زەن کردبێ شتێکی بەدەر لە سوودگەیاندن نییە بۆ ئەدەب و ڕۆشنبیری نەتەوەکەم و دەرەقەتی هاتبم، ئەوا وەرم گێڕاوە، بۆیە بە خەیالمدا نەهاتووەو بیریشم لێی نەکردووەتەوە ئەمەیان چیرۆکە. یان شیعرە، یان وتارێکی فیکرییە، ئەدەبییە، ڕەخنەییە، مۆسیقاییە، هونەرییە... ئیدی بۆیە بوارەکان جۆراوجۆر دێنە بەرچاو.

**ئا: یاد سابیر**



## عەلی ئەشرەفی دەروێشیان:

# ئومێدەوارم لە دنیادا سانسۆر نەمێنێ

**عەلی ئەشرەفی دەروێشیان نووسەرێکی مەزنی کوردە، لەسەر ئاستی جیهان ناوبانگی هەیە، زۆربەی چیرۆکەکانی بۆ زمانە زیندووەکانی دنیا وەرگێڕدراون، یەکەمین نووسەری کورد بووە کە لە دوای چەندین سال کاروچالاکی لەناو «کانوونی نووسەرانی ئێران» هەبووە و پاشان بۆ ماوەی چەند سالێک لێپرسراوی گشتی کانوونی نووسەرانی ئێران بووە.**

**هەمیشە لە خەباتی بێوچاندا بووە لە پێناوی نەهێشتنی سانسۆرو دەستەبەرکردنی ئازادی ڕادەربڕین تێکۆشانی بەردەوامی هەبووە، بە گفتوگۆیەکی کورت بەسەرمان کردەوە کە ئەمە دەقەکەیەتی:**

* تاچەند ڕاوبۆچوونتان لەگەل ئەوەدایە کە نووسەران لە دەزگاو گرووهی حزبی و سیاسیدا کاربکەن یان هاوکاری بکەن؟

– من بۆ خۆم ئەوە بە باش نازانم، ڕازی نابم هونەرمەندێک لەگەل دەولەت کاربکات و لە خزمەتی سیاسەتی دەولەتدا بێت، ئەمە لێدانی هونەرەکەیەو هونەرمەند خۆی وابەستە دەکات و هیچ کاتێک کاری ئەو هونەرمەندە پێشرەفت ناکات، تەنانەت ئەگەر دەولەتەکە ئازادیخوازو شۆڕشگێڕیش بێت، هەرگیز هاوکاری لەگەل ناکەم. من تەنیا لەگەل جەماوەرم و لە خزمەتی جەماوەریشدام. بڕواشم وایە کە دەبێ هەموو نووسەران لەگەل جەماوەردا بن و خزمەت بە جەماوەر بکەن نەک بە سیاسەت و دەولەت.

* کانوونی نووسەرانی ئێران ئێستا وەزعیان چۆنە،

ئەگەر لەسەر شێوەی کارکردن و جۆری چالاکییەکانیان بدوێی پێمان باشە؟

– ئێستا کانوونی نووسەران چالاکی باشیان هەیە، هەڵبەتە لە زۆر بابەتگەلی رۆژدا و سەبارەت بە رووداوی رۆژانە هەڵوێستیان نیشان داوە، لەم دواییانەدا لە بارەی دەستگیرکردنی نووسەرو رۆژنامەنووس (ناسر زەرەفشان) بەیاننامەیەکمان دەرکرد، هەروەها وەڵامێکی (دکتۆر عەتا ئوڵلای موهاجەرانی) وەزیری پێشووی رۆشنبیران درایەوە، کە ئەو ئێستا لێپرسراوی ناوەندی گفتوگۆی شارستانیەتەکانە، وتبووی کانوونی نووسەرانی ئێران یاسایی نییەو بەرەسمی نەناسراوە، هەروەها لە بارەی مەزلوومیەتی خەڵکی فەلەستینەوە لە بەیاننامەیەکدا نارەزایی خۆمان دەربڕی، چالاکی دیکەمان زۆرە، ساڵێک زیاترە خواستەکانی خۆمان خستۆتە بەردەستی وەزارەتی رۆشنبیری، بەڵام تا ئێستا وەڵام نەدراوینەتەوە.

* وەک دەزانین کانوونی نووسەرانی ئێران «٣٤» ساڵە دامەزراوەو تەنیا کانوونێکە لە ئێراندا کە بە زۆربەی قۆناغەکاندا تێپەڕیوە، هەر لەسەردەمی شا تا پێش و پاش راپەڕینی ئیسلامی هەمیشە چالاکی هەبووەو لە پێناوی نەهێشتنی سانسۆرو بەرگریکردن لە ئازادی بیروڕا دەربڕین خەباتی بێوچانی هەبووە، بەڵام لە هەموو سەردەمەکاندا بەرەسمی لەلایەن دەوڵەتەوە نەناسراوەو ئازادی ئەوتۆی بۆ فەراهەم نەکراوە، هۆکارەکانی رووبەڕووبوونەوەی نێوان کانوون و دەوڵەت بۆچی دەگێڕیتەوە؟

– دەوڵەت و دەسەڵاتی سیاسی هیچ کاتێک حەزیان لێ نییە کۆمەڵە هونەرمەندو نووسەرو شاعیرێک پێکەوە کۆببنەوەو هاوکاری یەکتر بکەن، خاڵی جیاوازیمان و هۆکاری دژایەتیمان ئەوەیە کە ئێمە دژی سانسۆرین، لە پرۆگرامی کانوونی نووسەراندا هاتووە «نابێ کتێب لە پێش چاپکردنی سانسۆر بکرێت..» کتێب چاپ بکرێ لە دوای لە چاپدان ئەگەر یەکێک سکاڵای هەبوو ئەو کاتە نووسەرەکە وەڵام بداتەوە، هەمیشە دەسەڵاتی سیاسی بەرگەی گرووپێک ناگرێت کە لەسەر مەسەلەی ئازادی بیروڕا دژایەتیان بکات، ئێمە دژی سانسۆرکردنین کەسانێکیش هەن ئەمەیان پێ قبووڵ ناکرێت.

* ئاشکرایە کانوونی نووسەرانی ئێران لە سەرەتای دروست بوونییەوە تا ئەمڕۆ کۆمەڵێک نووسەرو رۆشنبیری لێ شەهید کراون، نموونەیان سەعیدی سوڵتان پوورو سەعیدی سیرجانی و ئەحمەدی میر عەلایی ومحەمەدی موختاری و محەمەد جەعفەری پویەندە، ئەمانە شەهیدی رێگەی ئازادیی قەڵەمن تا ئێستا چ دادگایەک لێکۆڵینەوەی لەسەر خوێنی بەناهەق رژاوی ئەم شەهیدانە کردووە؟ چ دەسەڵاتێ بەدوای تاوانبارەکاندا چووە.؟

– هیچ وەڵامێکیان نەبووەو نییە، پیاوکوژانیش بۆ خۆیان لەناو بازاڕدا دەگەڕێن و کەس بەدوایاندا نەچووە، یەکێک لە کارەکانی ئێمە ئەوەیە کە دەمانەوێت ئەوانەی ئەو تاوانەیان ئەنجام داوە سزا بدرێن، ئێمە لە کانووندا یەکێکین لە داواکارانی خوێنی ئەوان، ئەوانە هاوڕێی ئازیزی ئێمە بوون ئەندام بوون لە کانوون دا.

* وەک باس دەکرا لەناو خەڵکیدا گوایە ناوی تۆش لەناو ئەو لیستەیەدا بووە کە دەبوو تیرۆر بکرانایە و دوایی کەشف بوو، تۆ بیرت لەوە نەکردۆتەوە بەسەفەرێ ئێران جێ بهێڵی، یان بڕیارێکی تر بدەیت.؟

– هەرگیز بڕیاری وام نەداوەو ناشیدەم، هەمیشە لە پێناوی ئازادی رادەربڕین خەبات دەکەم و درێژە بە رێگای محەمەدی موختاری و محەمەد جەعفەری پویەندە دەدەم هیوای من هیوای ئەوانە، منیش هەروەک سەعیدی سیرجانی بیر دەکەمەوە، ئومێدەوارم رۆژێک بتوانین حەقی ئەوان بسێنین.

* کارەکانی داهاتووی کانوون چین؟

– ئێمە لە راستیدا ئیجازەمان نییە، بۆ خۆمان جێگەمان نییە، نووسینگەو بینایەو شتگەلمان نییە، ئێستا کتێب فرۆشی (پکا) جێگەیەکی بچکۆلەی پێداوین، مانگی جارێک لەوێدا دادەنیشین و گفتوگۆ دەکەین، ئەگەر بمانەوێ لە بواری شیعرو چیرۆک کۆڕو سیمینار بۆ لاوەکان سازبدەین تا هانیان بدەین، ئەوە جێگەمان گەرەکە.

* ناواخنی ئەو بەیاننامە زۆرانە چین کە تا ئێستا کانوون بە چاپی گەیاندوون، بەتایبەت بەیاننامەی (١٣٤)نووسەر؟

– دەقی (١٣٤)نووسەر کە ساڵی (١٩٩٢) ئێمە چاپمان کرد لە بارودۆخێکی دژواردا بووین، لەسەرەتای کارەکانماندا بووین، واتە لە دوای کوشتنی سەعیدی سیرجانی لە زینداندا، کانوون هێزو وزەی نوێی بەخۆی دا و یەکەمین بەیاننامەمان بەچاپ گەیاند بە نارەزایی دەربڕین و ئەمە لە سەرانسەری جیهان سەدای هەبوو، دوای ئەوە کانوون پشتگیری لە خەڵکی مەزلووم دەکات، هەرچەندە ئەمڕۆ میللەتی فەلەستین کەوتۆتە تەنگانەوەو هیچ چارەیەکیان نییە، بەڵام ئێمە پشتگیری هیچ جۆرە تیرۆرو کوشتارێکی بەکۆمەڵ ناکەین، ئومێدەوارین ئەو گەلە سەرکەوتن وەدەست بهێنێ و ببێتە خاوەنی دەوڵەت، ئەمەش دوا بەیاننامەمان بوو.

* دوا وتەت؟

– ئومێدەوارین ئێمە رۆژێک بتوانین لەگەڵ هەموو گەلانی دنیا بە ئارەزووی ئازادی بیروڕادەربڕین بگەین و سانسۆر لە دنیادا نەمێنێ، چونکە من بڕوام وایە هەموو دواکەوتوویی و بەدبەختییەکان لەناو کۆمەڵگەکانی جیهاندا لەژێر سێبەری سانسۆراندایە، لە شوێنێکدا مرۆڤ نەتوانێ دروست مەبەستی خۆی بگەیەنێ بەدەورووبەرو نەتوانێ قسەی خۆی بکات، ئەو شوێنە پێش ناکەوێ.



# یەکەم کۆنگرەی زانستی نێودەوڵەتی بۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵاتی هەولێر

قەڵاتی هەولێر دەکەوێتە ناوەڕاستی شاری هەولێر کە کۆنترین شاری مێژوویییە لەسەر زەمین و بەر لە (٧٠٠٠) ساڵ، مرۆڤی ئەم وڵاتەی تێدا ژیاوە، بەر لە (٢٠٠٠) ساڵ پ.ز، لەلایەن سۆمەرییەکانەوە بە (ئوربیلیۆم) ناوی براوە، ئاشوورییەکان پاش داگیرکردنی، کردیان بە پایتەختی ئایینی خۆیان و ناویان بە (ئەربائیلو) برد، هەروەها بە (حدیاب) و (ئەی کشان لاما)ش ناسراوە، دواتر بە (ئەربل، ئەربیلا، ئەربیل) و خەڵکی ڕەسەنی ناوچەکەش کە باو و باپیرانی کوردی ئەمڕۆن بەهەولێر ناویان بردووە، لە ساڵی ٣٣١ پ.ز) جەنگێکی سەخت لەلایەن ئەسکەندەری شای گریکەکان و داریۆشی دووەمی شای ئەخمینییەکان لەناوچەی گۆکمیلای نزیک شاری هەولێر ڕووی داوە سەرەنجام، داریۆش خۆی و لەشکرو دەوڵەتەکەی تێداچووە، ڕوو پێوی هەولێر (١١٠٠٠٠م٢) کە لەسەر شێوەی بازنەییە و قەراغەکانی و ناوەندەکەی بەرزترین شوێنە، کە لە تەپۆڵکەیەکی بەرز دەچێ، قەڵات لە سێ گەڕەک پێکدێ (سەرا، تۆپخانە، تەکیە) بەرزی قەڵا لەسەر ئاستی دەریاوە (٤٣١م) و بەرزترین خاڵیش (٤٤م) کە خانووی تێدا نییە، (٢٦م) لەسەر ئاستی شەقامی کوردستانی گەورەو هەروەها پایتەختی سیاسی و ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستانی باشوورە.

لە ڕۆژانی (٢٩-٣١/٣/٢٠٠٤) لەهۆڵی کۆشکی هونەر لەشاری هەولێر، پاش سێ ڕۆژ لە وتوێژی گەرمی بەشداربووان، یەکەم کۆنگرەی زانستی نێودەوڵەتی بۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵاتی دێرینی هەولێر لەلایەن ژمارەیەک ئەکادیمیی و هەولێرشناسان و پسپۆڕانی کوردو عیراقی و بیانییەوە پێشکەش کران و لەکۆتاییدا گەیشتنە چەند دەرەنجام و ڕاسپاردەیەک لەوانە:

- پەلەکردن لە ڕزگاردنی خانووە کۆنەکانی قەڵات لەناوەوە و دەرەوەیدا، بەتایبەتی خانووبەرە کەلەپوورییەکان کەلەلایەن دەوڵەتەوە تاپۆ کراون.
- نۆژەنکردنەوەی سەرجەم ئەو خانووبەرانەی کە لە داوێنی قەڵاتن لەدەرەوە، ئەویش بەچارەسەرکردنی ئەندازیاریی کە بەردەوامی بنکەکەی دابین دەکات و ڕێگا لە داڕمانی خۆڵەکەی دەگرێت، لەگەڵ دەستەیەکی کەلەپووری بۆ هەر خانوویەک،
- تاپۆکردنی خانووە تاپۆ نەکراوەکان لەناو قەڵاتدا.
- ڕووخاندنی دەرگا سەرەکییەکانی باشووری قەڵات کە (دەرگای سەرا)یەو دووبارە کردنەوەی لەسەر بنەما ڕەسەنەکەی و دەستە کۆنەکەی، کە تازەترین خەسڵەتی ئەم دەرگایە بەر لە (١٦٠) ساڵ لەسەردەستی وەستا سمایلی سنەیی دروست کرابوو، لەساڵی (١٩٦٠) ئەم دەرگایە لەلایەن حکومەتی ئەوساوە لابراو دواتر لەسەرەتای ساڵی هەشتاکان بەشێوەی بیناسازی ئاشووری- بابلی دروست کرایەوە.
- دیارکردنی خانووە کەلەپوورییەکان لەپێناو نۆژەنکردنەوەیان.
- دانانی شانۆیەکی هاوینی و زستانی بۆ چالاکییە هونەری و فۆلکلۆرییەکان.
- پێکهێنانی لیژنەیەکی ڕاوێژکاری پسپۆڕی و لیژنەیەکی بەدواداچوون.
- دانانی میکانیزمێکی ڕاپەراندنی پرۆژەکە بەپێی بەراییەکان پلانی بنەڕەتی بۆ پرۆژەکە لە شێوەی قۆناغ بە قۆناغ.
- دانانی بودجەیەک بۆ هەر قۆناغێک.
- کەڵک وەرگرتن لە کەشی ناوچە پەروەردەیی و ڕۆشنبیرییەکان.
- دانانی ناوەندێکی بەڵگەنامەیی بۆ قەڵات کە گشت هۆکارە مێژووییەکانی قەڵات ڕوون دەکاتەوە.
- ئەنجامدانی کاری ئارکیولۆژی (پشکنین) پێویست بۆ بەکارهێنانی شێوازی زانستی بۆ زانینی چینە

شوێنەواری و مێژووییەکان.

- چاوخشــاندنەوە بۆ توانســتی تاپۆکــردنی خانووبەرەکانی ناو قەڵات بەمەبەستی نۆژەنکردنەوەیان، یان سوود وەرگرتن لێیان کە مۆڵکدارە ڕەسەنەکان توانای نۆژەنکردنەوەیان نییە.

- دانانی دیسـپلینی دیارکـراو بۆ نیـشـتـەجێکردنی خێزان و بەکاربردنی خانووبەرەکانی ناو قەڵات.

- بایەخدان بەشوێنی خزمـەتگوزاری گـەشـتـیـاری (بەتاک و کۆمەڵ) لەسەر زەوی دەوروبەری قەڵات.

- ڕێگا نەدان بەدانانی کاری پیشەسازی و پیشەوەری و کۆگای پیس لەدەوروبەری قەڵاتدا.

- دیارکردنی شێوازی کارگێڕی ئاشکرا بۆ دابینکردنی شێوازی بەڕێوەبردنی قەڵا بەمەڵاکات و کـارمەندەکـان، پاش دابەشکردنیان بەپێی پێداویستی کارکردنیان.

- دانانی پـلانێکی تـۆکـــمـــەی ڕاگـــەیاندن و جێبەجێکردنی بەشێوەیەکی بەردەوام بۆ ناساندنی قەڵات و شوێنەوارە مژوویییەکان و پرۆژەکە لەسوودی ئابووری و ڕۆشنبـیـریـیـەکـان بۆ کـۆمـەڵگای هەولێـر بەتایبـەتی و کوردستانیش بەگشتی.

- دانانی قـەڵاتی هەولێـر لە لیـسـتی کـەلەپووری جیـهانی و کاندیدکردنی لەلایەن ڕێکخراوی یۆنسکۆو لیـژنەی کەلەپووری جیـهـانی و پێـوەندیکردن بەدەزگـاو سندووقە دارایە نێودەوڵەتی و حکومیەکان کە بایەخ بە پێـشـکـەشکردنی یارمـەتیــیــە داراییــەکـان دەدەن، بۆ پاککردنەوەی کەلەپووری ڕۆشنبیری لەجیهاندا.

- پێـوەندیکردن بەڕێکـخـراوی یۆنسکۆ و لیـژنەی نێـــودەوڵەتی و حکومی و ناحکومی تایبـــەتمەند بە یارمەتیدانی دارایی.

- دابینـکردنی بودجەی دارایی لەلایەن حکومـەتەوە بۆ بەئەنجام گەیاندنی تێچوونی گشتی و خەرجی ساڵانە بۆ قۆناغەکانی پرۆژەکانی داهاتوو.

- هاندانی کەرتی تایبەتی بۆ وەبەرهێنانی گەشتیاری بەتایبەتیش بۆ موڵکدارانی خانووبەرەکانی قەڵات.

- توێژینەوە لەسەر توانستی سازدانی فیـسـتیـڤاڵی هونەری نێودەوڵەتی ساڵانە بۆ قەڵات و دیارکردنی ئەو داهاتەی کە پرۆژەکە ساڵانە وەچەنگی دەکەوێ.

- ئامـادەکـردن و دانانی لاپەڕەیەکی تایبـەت لەسـەر تۆڕی ئینتـەرنێت بۆ ناساندنی پرۆژەی قـەڵاتی دێرینی هەولێر بەجیهان.

- داواکـردن بۆ هاوکـاریکردنی دارایی بەتایبـەتیش لەلایەن ڕەوەندی کوردییەوە کە لەدەرەوەن.

- دەرکردنی یاسایەک بۆ کارگێڕی و شارەوانی تایبەت بە قەڵاتی هەولێر و ئەوەی تێدا ڕوون بکرێتـەوە و جار بدرێ کـــە ناوچەکـــە تایبـــەتە و هەڵاوێر کـــراوە لە ڕێنماییەکانی شارەوانی و بیناسازی گشتیدا.

- دیارکردنی یاسایەک، یان سیـسـتـەمێک بە پێدانی قـەرزی هاووڵاتیـان هەروەها بەسـوودێکی پشـتگیـری لێ کـــراوەوە لەلایەن شـــارەوانی، یـان حکومـــەت بۆ نۆژەنکردنەوەی خانووبەرەکان و چاککردنەوەیان.

- دەرکردنی یاسایەک بەلێبووردنی باجی خانووبەرە بۆ مـاوەی (١٠) ساڵ بۆ هەرکـەسێک کە ئامادە بێ ئەو خانووانە چاک بکاتەوە بەپێی دیسپلینەکانی فەرمانگەی شوێنەوارو کەلەپوور.

- گــرتدانی کــۆنگرەی دووەمی نێـــودەوڵەتی بۆ نۆژەنکردنەوەی قەڵات لەساڵی (٢٠٠٦) بەو مـەرجەی کە کۆرێکی فرەوان قۆناغ بە قۆناغ لەو کۆنگرەیەدا ساز بدرێ.

- سازدانی کۆبوونەوە بۆ هەڵسـەنگاندن لەهەر شـەش مـانگ جارێک بۆ لیـژنەی بەدواداچوونی زانستی لەنێـو ئەڵقـەکـانی لێکۆڵینەوەدا بۆ مـاوەی یەک ڕۆژ کـە قـۆناغـەکـانی پێـشـڤـەچوونی کـارو ئەگـەرەکـان و چارەسەرکردنیان نیشان بدات.

- چاپکردنی ڕاپۆرتی کارەکان و ئەنجامە قۆناغیەکانی لە بڵاوکـراوە خولەکـیـەکـاندا (بەچەند زمـانێک) کە بە «ڕاپۆرتی قـەڵات» بناسـرێ. سـەرەڕای ئەو هەمـــوو پێـشنیـاره بەجێ و بەسـوودانە لەلایەن ئامـادەبووان و بەشـداربووانەوە، بەڵام پێـشنیـاری بەردەوام بوونەوەی گۆڤاری شانەدەر ئەو گۆڤارەی کە لەپاش ڕاپەڕین لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار (١٤) ژمارەی لێ چاپ و بڵاوکرایەوە- بایەخی بەمێژوو و کـەلەپوورو شوێنەوارە دێرینەکـانی کـوردسـتـان دەدا. باسی لێوە نەکرا.

لەکاتێکدا یەکێک لەپێشنیـارە هەر گرنگەکان بەڕای من دەرچوونەوەی ئەم گۆڤارە و بەردەوامبوونیەتی.

**سەرەنجام**

دەکرێ لە داهاتوویەکی نزیکدا قەڵاتی دێرینی هەولێر بکرێتـە دەڤەرێکی گەشـتیـاری و شوێنەواری و سیـماو خەسڵەتی قۆناغە مێژووییەکانی تێدا بەرجەستە بکرێ کە ئاماژە گەلێک بن بۆ مێژووی کۆنی گەلی کوردستان ئەوانەش هی لەسـەردەمی ئیـمـپـراتۆریەتی مـیـدیاوە تا سەردەمی ئاشووری و کلدانی و عـەرەبە موسلمان و تورکە عوسمانییەکان کە هەریەکەیان بەشێوەیەک لەشێوەکان جێپەنجەی ژیاری خۆیان بۆ بەجێ هێشتـووین، بەڵام لە هەمـووی گـرنگتـر مـۆرکی ڕەسـەنی شـوێنەواری دێرینی کوردەواری ببێتـە مەبەستی سەرەکی، چونکە ئاشکرایە بەدرێژایی سـەردەمـەکانی داگیرکـاری، ئەم شـارە دێرینە، بەڵام هیچ یەکێک لەو دەسـەڵاتدارە بیانیانە نەیانتوانیوە مۆرکی ڕەسـەنی کوردانەی شاری هەولێر بسڕنەوە.

**فەرەیدوون سامان**



# هونەری پۆست مۆدێرنیزم لەپێشانگای (گۆران باباعەلی)دا

ڕۆژانی (٢٨-٣٠/٥/٢٠٠٤)، بەڕێوەبەرایەی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر، یەکەمین پێشانگای تایبەتی هونەرمەندی دووره وڵات (گۆران باباعەلی) کردەوە. گۆرانی باباعەلی، یەکێکە لە نووسەرو هونەرمەندە شێوەکارە دیارەکانی کورد کەچ لەنووسینی فیکری چ لەهونەری شێوەکاریدا یەکێکە لەناوە دیارەکان و جێی پەنجەی بەڕەوتی ڕۆشنبیری کوردییەوە دیارە.

ساڵی (١٩٨٥) پەیمانگای هونەرەجوانەکانی سلێمانی تەواو کردووە، لەساڵی (١٩٩٥)ەوە کاردەکات بۆ بەرهەمهێنانی زنجیرەیەک کاری هونەری تایبەت بەخۆی، ئەم پێشانگایە بەرهەمی ئەو ماندووبوونەیە، گۆران باباعەلی دانیشتووی هۆڵەندایە و قوتابی دواقۆناغە (لەخوێندنی ماستەر) تێزی ماستەرەکەشی لەبارەی (سۆسیۆلۆژیای هونەر)ەوەدیە.

ئەوەی هونەرمەند لەم پێشانگایەدا کردبووی، هەوڵێک بوو بۆ دۆزینەوەی ئسلووبێکی تایبەت بەخۆی کە لەوە و پێش لەهونەری شێوەکاریدا نەبینراوە. ئەم تەکنیکەش کە تابلۆکانی پێ کێشراوە، باشترین بەڵگەی ئەو ڕاستییەن.

لەم پرۆژە درێژ خایەنەدا هونەرمەند هەوڵی داوە کار لەسەر فیکر بکات لەدنیای ڕەنگ وتەکنیکدا. بێگومان فیکریش یەکێکە لەخەسڵەتەکانی هونەری پۆست مۆدێرنیزم کە هونەر لەناوەرۆکدا دەتوانێت شتێک بڵێت. واتە فەلسەفەیەک لەپشتیەوە هەبێت.

لەمەشدا مەرج نییە بەتەنیا شکڵ گرنگ بێت، هێندەی ئەوەی ئیش لەسەر فیکر دەکات لەهونەری شێوەکاریدا، ئەو فیکرەیەش زیاتر لەفیگەری ئەفسانەییدا خۆی دەبینێتەوە کە زیاتر خۆی لەشێوازێک لەکاری زەخرەفەدا پیشان دەدا و ڕەنگیش بالاترین ڕەگەزی تابلۆکانە. ڕەنگی شین زۆرترین پانتایی داگیرکردووە، چونکە دەریاو ئاسمان لەزۆرێک لە تابلۆکاندا ئامادەیە، بەپێی قۆناغەکانیش وردە وردە ڕەنگ بەرەو کەمکردنەوە دەچێت و هەندێک جاریش دەبێتە باکگراوندێکی ڕووکەش. ئەمەش زیاتر شێوازێکە لەکارەکانی وێنەکێشی فەرەنسی (ئیف کراین) کە هونەرمەندیش هەوڵی داوە زیاتر ئەو ئیشکردنەش تێپەڕێنێت و زیاتر لەسێبەری ئەو حاڵەتەدا بمێنێتەوە کە ڕەنگ قورسایی خۆی هەیە.

هونەرمەند لەگەڵ ئەوەی هونەرمەندێکی پرۆفیشناڵە، بەڵام ئێمە زیاتر وەک نووسەرێکی بواری فیکری ڕۆشنبیری ناسیومانە و جگە لەنووسین و وتارە فیکرییەکانی لە گۆڤاری ڕەهەندا، تا ئێستا بەشداری چەند پێشانگایەکی هاوبەشی کردووە لەوانە:

ساڵی (١٩٩٧) بۆن (ئەڵمانیا).

ساڵی (١٩٩٧) ئۆنتاریۆ (کەنەدا) گەلەری لیبۆڤیک.

ساڵی (٢٠٠٠) ئەمستردام (هۆڵەندا) هۆڵی شانۆی ئۆستادە.

ساڵی (٢٠٠٢) تۆکیۆ (یابان) مۆزەخانەی هاما گوچی یۆزۆ.

ساڵی (٢٠٠٤) ئەمستردام (هۆڵەندا) پێشانگاو ئەتەلیێتی کراوە.

لەدەلیلی پێشانگاکەیدا، هونەرمەند سەبارەت بەکارو پرۆژە هونەرییەکانی دەنووسێت: (لە کەنارەکانی فەنتازیاوە سەفەرێک دەست پێ دەکەم بەناو ئۆقیانووسی ڕەنگ و شێوەکاندا بۆ گەڕان بەدوای ماناکانی دنیا، شێوەکان، ڕەنگەکان، فیگەردکان و جووڵەکان، سیستمێکی سیمانتیکی لەکارەکانمدا پێک دێنن بۆ بەرهەمهێنانی دەلالەت، نەک سیمبۆلی نەگۆڕ.

**کەیوان محەمەد**
**(سلێمانی)**





# خاتوو ژیان میرانی.. چوار وەرزی ساڵ بەفۆتۆ بەرجەستە دەکات

خانمە هونەرمەندی فۆتۆگرافی، ژیان میرانی لە (٢٠٠٤/٥/٣٠) لە کۆشکی هونەر لە هەولێر یەکەمین پیشانگەی فۆتۆگرافی تایبەتی خۆی کردەوە بە ناونیشانی «چواروەرزەکانی ساڵ» کە (٤٨) تابلۆی فۆتۆگرافی ڕەنگینی قەبارە شینی (٤٠ × ٥٠سم) گرتبووە خۆ ئەم خانمە هونەرمەندە وەک ئارەزوویەک هاتۆتە نێو جیهانی فۆتۆ، لەگەڵ ئەوەی لەهیچ قوتابخانەو خولێکی هونەری فۆتۆ بەشداری نەکردووە، بەڵام سەلیقەیەکی هونەری چاکی هەیەو هەستی ئەم هونەرە ناسکەی بەرزە، بگرە زۆر لە گرتەکانی پابەندی هەندێ لە ڕێساکانی هونەری فۆتۆگرافی بوون، وەک ڕێسای سێیەک و لایەنی هارمۆنیەت و کۆنتراست لە هەندێ وێنەدا، هەروەها جۆری هاوسەنگی و ئیقاع (ڕیتم) لە هەندێ گرتەی تردا. دیارە عیشقی سروشتی جوان و ڕەنگینی کوردستانیش کاریگەریەکی زۆری بەسەر هونەرمەندەوە هەبووە، بۆیە هاتووە زۆربەی شوێنەکانی لە وەرزە جیاجیاکانی ساڵ گرتووە، هەڵبەتە هەر وەرزێک تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیەو جوانی خۆیشی هەیە، کوردستانیش لە زۆربەی وەرزەکاندا جوانی تایبەتی خۆی هەیە، هە بۆیەش سروشت بۆتە هەوێنی شیعری شاعیرانیشمان، بەڵام دەبێ سروشت بە زمانی فۆتۆ چی بە جەماوەر بڵێ؟ لە گرتەکانی خاتوو ژیاندا هەست بە ناسکی و شەفافیەت دەکرێ، گۆشەنیگای بۆ هەندێ شوێنی باو و دیار هەڵبژاردووە مەگەر چاوی وێنەگری کارامە ئەو گۆشانە بدۆزێتەوە، هەروەک چۆن لە گرتەکانی شوێنەواری (خەنەس)دا بەدیمان کرد لەگەڵ پایزەکانی شەقڵاوەو کۆڕێ. وێنەگرتنی دارەکەی شەکرانیش لە چوار وەرزی ساڵدا کە هەریەکەیان بەرگێک و داڕشتنێکی بەو درەختە مێژووییە بەخشیوە، بەهاو جوانیەکی تایبەتی داوەتێ و حەیران و لاوکەکانی فۆلکلۆریش دێنێتەوە یادمان.

ماوەتەوە بڵێین ژیان خان وەک ئارەزوویەک لە ساڵی (١٩٩٨) دەستی بە وێنەگرتن کردووە، ئەوکات بیری لەوە نەدەکردەوە بۆ مەبەستی خستنەڕوو لە پیشانگەدا بیانگرێت، بەڵام کار بەردەوام بوودو هاندانی دۆست و هاوڕێیانی وایان لێ کرد گولبژێرێک لە وێنەکانی کە شایستەی پیشانگان گەورەی کردن و ئەم پیشانگایەی لێ کەوتەوە. لە وەڵامی چەند پرسیارێکمان وتی: سەرەتا بەکامیرایەکی کۆمپاکتی بچووک وێنەم دەگرت وردە وردە حەزەکانم لەگەڵی گەورە بوون تاوای لێهات کامیرایەکی نیکۆنی پرۆفیشناڵم کڕی و لەگەڵی بەردەوام بووم لە وێنەگرتندا. بۆ هەڵبژاردنی گرتەکان زۆرجار سەر شاخ دەکەوتم، یان هەندێ جار شۆڕدەبوومەوە ناو دۆڵ تا گۆشە نیگایەکی وام بەدڵ بوایە و حەزی تێر بکردمایە، ئینجا چرکەم لە کامیراکەم دەهێناو وێنەکەم دەگرت. هەردەم حەزم لەوەبووە گۆشەی وا هەڵبژێرم کە کەم کەس دیبێتی. جوانی سروشتی کوردستانیش کاریگەری زۆری بەسەرمەوە هەیە هەردەم وێڵم بەدوای جوانیەکان و دەمەوێ ئەوساتە جوانانەی سروشت نەفەوتێن و بەرجەستەیان بکەم بەزمانی فۆتۆ خەڵکانی پێ ئاشنا بکەم.

ئێستاش من خۆم بە قوتابیەکی ئەم هونەرە ناسکە دادەنێم و هەوڵ دەدەم خەونەکانمی پێ بێنمەدی.

**ب. هەوراز**



# بەردەوامی... پێشانگەی فۆتۆگرافی سامی حەمەمۆئمن

ئەمڕۆ فۆتۆگراف پانتاییەکی بەرینی لە هونەری وێنە داگیرکردووە، بەشێوازێک زۆرجار گرتەی وێنەکان کاریگەرترو بەبایەخترن لە وێنە بزۆک و جووڵاوەکانی نێوخودی ژیان، ئیتر بابوەستێت کە ئەمڕۆ [فۆتۆگراف] پاڵپشتێکی زۆر بەهێزی کاری میدیایی و ڕۆژنامەنووسییە، ئەم کارانەش بێ [فۆتۆگراف] هیچ بایەخێکی ڕەونەقداری نییە!!

بەڵام لەپاڵ ئەم ئەرکەی [فۆتۆگراف]دا، دەبینین ئەم هونەرە هەوڵی پەیبردن دەدات بۆ دنیایەکی نامەئلووف و هەست پێنەکراو ئەویش لە سەرەنجامی گەشەسەندن و فراوانبوونیەتی، لەم سۆنگەیەوە هونەرمەندی پەیکەرساز (سامی حەمەمۆئمن) ڕۆژانی (٥-٢٠٠٤/٦/٨) لە هۆڵی مۆزەخانە پێشانگەیەکی تایبەتی بەکارە فۆتۆیەکانی خۆی کردەوە.

ئەوەی لەم پێشانگەیەدا بینیمان (سامی) هونەرمەند هەوڵی دابوو پەی بە نهێنییەک بەرێت لەو دیو عەدەسەی کامێراوە کە بەشێوازێک موفرەدەو کەرەستەکانی ژیان ببینێت کە لەوەوپێش نەبینرابن، بەڵام ئەم هەوڵەی هونەرمەند زیاتر لە فۆرمێکی خۆجوینەوەو خۆدووبارەکردنەوە دابوو بەشێوازێک سەرجەم فۆتۆکانی یەک کەش و سرووتیان هەبوو کە نەیدەتوانی ئەو ئیحا گشتییە ببەخشێت کە لە کارەکانی پێشوویدا هەبوو، بەتایبەتی ئەو پێشانگەیەی کە ساڵی (٢٠٠٢) لە هۆڵی مۆزەخانە کردیەوە سەبارەت بە (شار و ژیان و سرووشتی سەنعا)، دیارە نابێت ئەوەشمان لەبیر بچێت بابەت و ستایلی ئەم دوو پێشانگەیە زۆر جیاوازن، بەڵام ئەوەش ناگەیەنێت کە چێژ لە بینەردا بسڕێتەوەو بینەر هەست بەوە بکات سەرجەم تابلۆکان یەک تابلۆن و بە کۆمپیوتەر دەسکاری کراون.

بۆ ئەم مەبەستەش هونەرمەند زۆر هەوڵی داوە[فۆتۆگراف] لە ڕووی تەکنیک و ڕەنگەوە پەلکێشی کاری وێنەکاری و تەکنیکی حەیەوی ڕەنگ بکات، بەڵام دیسانەوە لەم کارەشیدا سەرکەوتوو نەبووە، چونکە دنیای کۆمپیوتەرو دیجیتاڵ زۆر جیاوازە لە دنیای پڕ لە خەیاڵ و ئەندێشەو ئیستاتیکای هونەرمەند، گەروابێت ئەمڕۆ لە سایەی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو سیستەمی کۆمپیوتەردا بۆشاییەک نەماوەتەوە مرۆڤ پەی پێ نەبردبێ و هیچ نەماوەتەوە پێی نەگات، بەڵام ئایا دیسانەوە ئەو چێژە دەبەخشێ کە لە ناخی هونەرمەندان هەیە؟

لە دەلیلی پێشانگاکەشدا سامی حەمە مۆئمن لە بەشێکیدا دەڵێت: «هەڵبەتە بەکاربردنی کامێرای دیجیتاڵ لەبری کامێرای [35 m m]ە کەم تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ ئاسانی لەبەکارهێنان و هەرزانی لە تێچوونی وێنەگرتن و خێرایی لە ئەنجامداندا، کەمن هەرسێ فاکتەرەکەم بە گونجاو زانیوە، لەڕووی بابەتیشەوە جووڵاندنی ئامێری تۆمارکردنەکەش بەتەواوەتی دژ بە سیستەمی باوی پیادەکراوی وێنەگرتن و نمایشکردنی ڕەهەندێکی تری وێنەیە کە ئەویش ئەو مامەڵە بیۆمۆرفیکەیە لەتەک وێنەکاندا کراوە هیچ کات لەکایەی شێوەکاریەکانی دی بە دوورناگیرێت و بەکاربردنی چەشنێکی دیە لە جوانناسی، بۆیە ئەم کارانە ئەوەندەی لە نیگارێک دەچن، چەند ئەوەندەیەک لە فۆتۆکاری دوورکەوتوونەتەوە».

* سامی حەمە مۆئمن دەرچووی پەیمانگەی هونەرە جوانەکانی سلێمانیە.
* ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی کوردستانە.
* ئەندامی یەکێتی وێنەگرانی کوردستانە.
* تا ئێستا بەشداری چەندین پێشانگەی هاوبەشی کردووەو جگە لەو پێشانگەیەش پێنج پێشانگەی تایبەتی کردووەتەوە کە ئەمانەن:
* ٢٠٠٠ پێشانگەی ئەزموونی گەلەری مۆزەخانە- سلێمانی.
* ٢٠٠٢ پێشانگەی تایبەت بە [ئەخدام] لە یەمەن
* ٢٠٠٢ پێشانگەی تایبەت بەشارو ژیان وسروشتی ئەعزوسەنعاو دوورگەو سوقەترە- هۆڵی مۆزەخانە.
* ٢٠٠٣ پێشانگەی لە کۆشکی ڕۆشنبیری لە دیمەشق- سوریا
* ٢٠٠٣ پێشانگەی فۆتۆگرافی لە فیستیڤاڵی کولتووری کورد- دانیمارک.



# شانۆگەریی ئێمە و ئەوان

ڕۆژی (٥/٦/٢٠٠٤) و ڕۆژانی دوایی لەهۆڵی پەیمانگەی هونەرەجوانەکان/سلێمانی شانۆگەری ئێمە و ئەوان، نمایش کرا کە بەرهەمی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم و بەهاوکاری وەزارەتی ڕۆشنبیری بوو، شانۆگەرییەکەش دەقی (ئەلکسەندەر گۆلمان) و وەرگێڕانی (شیرین.ک) و دەرهێنانی (هادی ئەلمەهدی) بوو، نواندنی عوسمان مەعرووف و نەرمین کاوانی.

بەگشتی ئەم دەقەی ئەلکسەندەر گۆلمان وەک زۆرێک لە دەقەکانی تری لەڕێگەی خێزانێکەوە دەیەوێت لەکۆی کۆمەڵگا بدوێ، کە ئەویش ژیانی هاوسەری نێوان هەردوو کارەکتەر (سامان و سوهەیلە)یە، کە چۆن پێوەندی خێزانیان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی و درۆ بونیاد نراوە و بەردەوام ئەم ژن و مێردە لەپشتەوە خەریکی خیانەت کردنن لەیەکتری، بۆ زۆرێک لە کێشەکان، سوهەیلە سەبەب کاریەتی کە پێشتر سامان بەڵێندەرێکی شارەوانییە و زۆرێک لەپاڵنەرەکانی ژیان وای لێ دەکات کە بەتەنیا لەژیاندا بیر لەسامان و ململانێ بکاتەوە، ئەمە جگە لەوەی ململانێی سیاسی و ئەو حزبەی کە کاری تێدا دەکات هانی دەدات بۆ گەیشتنە پلەی باڵای شارەوانی بەڕێگەیەکی نادروست، لە پشتی هەموو ئەم کێشانەوە، سوهەیلە وەک پاڵنەرێکی سلبی ئامادەیی هەیە، تا کار دەگاتە ئەوەی تاقە کوڕەکەیان بەهۆی ئیش و کاری باوکیەوە هەردوو دەستی لەدەست دەدات، ئیتر هەموو ڕووداوی شانۆگەرییەکە لەم تەوەرەدا دەخولێتەوە و باس لە گرفتی خێزانیکی هاوچەرخ دەکات کە چۆن کێشەو ململانێکانیان دەگاتە ئاستێکی وا جگە لەمادە و سەروەت و سامان، هیچ شتێکی تر بوونی نەبێت. تا دواجار بەهەڵهاتنی سوهەیلە کۆتایی بەڕووداوی شانۆییەکە دێت.

فۆرمی گشتی ئەم نمایشە لەدوو ئاستدا خۆی دەبینێتەوە، ئەویش ئاستی ئەزموونگەری و نمایشی جەماوەرییە، بەشێوازێ دەرهێنەر دەیەوێت لەفۆرمێکی نوێوە بانگهێشتی بینەر بکاتەوە بۆ ناو هۆڵی نمایش بەو شێوازەی کە ماوەیەکە بزووتنەوەی شانۆی کوردی دابڕانێکی سەختی هەیە لەگەڵ بینەردا. بۆیە شێوازی نمایشەکەش شێوازێک بوو لەنێوان کۆمیدی و گاڵتەجاڕیدا، لە نێوان (داریۆفۆو ئارتۆ)دا، بەشێوازێک ئەم نمایشە لێمانەوە نزیک بوو، وات هەست دەکرد لەگەڵ ناختا قسە دەکات، چونکە یەکێک لە ئەرکە بنەڕەتییەکانی شانۆ بریتییە لە قسەکردن لە ئێستاو ئێرەی کۆمەڵگادا.

سەبارەت بەنواندنیش، هەردوو ئەکتەرەکە وەک لەوەو پێش ئەزموونی نواندنمان بینیون، خاوەن توانایەکی لێهاتوون لە بوارەکەی خۆیاندا، بۆیە بەتایبەتی لای عوسمان مەعرووف هەستت بەخۆماندووکردنێکی زۆر دەکرد بۆ بەرجەستەکردنی ڕۆڵی کارەکتەرەکەی، چونکە کارەکتەرەکەی هێڵێکی دیاریکراوی نەبوو، بەڵکو بریتیی بوو لە کۆمەڵێک هەڵچوون و داچوونی جۆراوجۆر، کارەکتەری (نەرمین کاوانی)یش سیمایەکی زۆر تایبەتی هەبوو بەتایبەتی لەو حاڵەتە بێدەنگی و مەنگیانەی کە بە ڕوخسارو ناخیەوە دیاربوو. گرفتی ئەم کارەکتەرانە لەوەدایە کە ئەکتەر بەئاسانی ناتوانێت کۆنترۆڵی بکات.

سەبارەت بەدەرهێنانیش لەبەر ئەوەی دەقەکەی ئەلکسەندەر گۆلمان دەقێکی ریالیزمی ڕەخنەگرانەیە ئەوا شانۆییەکە پێویستی بەدیکۆر و ماڵێکی تەواو دەبوو، چونکە ڕووداوەکان هەمووی لە ماڵێکدایە، بەڵام کە تەختەی شانۆ تەجرید کرابوو لەهەموو دیکۆرو ئێکسوارێک تارادەیەک بۆشاییەکی لەبەردەم بینینی بینەردا دروست دەکرد.

**کاروان جەمال**
**(سلێمانی)**




## پشوویەک لای ڕەنگەکان

ڕۆژانی (٦-٧/٦/٢٠٠٤) لە هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی (٢٧) هونەرمەندی شێوەکاری شاری سلێمانی لەیادی دامەزراندنی (یەکێتی کەمئەندامانی کوردستان] پێشانگەیەکی هاوبەشیان کردووە.

لەم پێشانگەیەدا هەر هونەرمەندەو بەتابلۆیەک و بەسەربەستی تەواوی خۆیەوە تابلۆیەکی وەک گوزارشت لەناخی ئەو مرۆڤە کەمئەندامەی کە ئەندامێک لە ئەندامەکانی جەستەی خۆی لەدەست داوە بەشداری ئەم پێشانگە هاوبەشەیان کردبوو.

ڕەنگە ئێمە لەگرنگی و بایەخی ئەم کارە هاوبەشە بدوێین و خاڵ زۆر بێت بۆ هەڵوێستەکردن، بەڵام زیاتر ئەو خاڵەیە کە ئەم کۆمەڵە هونەرمەندەی بەجیاوازی ڕەنگ و ستایل و ئەوەو ئیشکردنەوە لەم پێشانگە هاوبەشەدا کۆبوونەتەوە.

زۆرێک لە هونەرمەندە بەشداربووەکانی ئەو پێشانگەیەش هونەرمەندی ئەکادیمی و خاوەن تواناو بەهرەی هونەری بەرزن و لەنێوەندی هونەری شێوەکاری کوردیشدا خاوەن دەنگ و پێگەی تایبەتی خۆیانن، دواجار ئیشکردن بۆ بابەتێک، یان بۆ چیرۆک، [ڕووداوێک]ی تایبەتی دیسانەوە ویژدان و هەستی ئەو هونەرمەندانە دەجوولێنێت سەبارەت بەتوێژی کەمئەندامان.

دواتر وەزیفەی هونەرو ڕەنگ وەک لە دەلیلی پێشانگەکەدا هاتووە، هۆکارێکی بەهێزە بۆ گوزارشتکردن لە هەست و ویژدانی هونەرمەند بەرامبەر بەهەر گرفت و کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، پاشان لەڕوویەکی ترەوە مرۆڤ و بەها ئینسانییەکان سەنتەری ئیشکردنی ئەم کارە هاوبەشانەن و جارێکی تر بینەرو خەڵکی ئێمە لەسەر ئەوە ڕادێنێت کە بەهۆکارە هونەری و ئیستاتیکییەکان گوزارشت لە ناخی خۆیان بکەن، نەک شتی تر، ئەمەش یەکێکە لە دیاردە هەرە جوانەکانی ئەم پێشانگە هاوبەشەیە.

مایەی ئاماژە بۆکردنە [یەکێتی کەمئەندامانی کوردستان] لەکاتی دامەزراندنیانەوە ئەمە چەندەمین پێشانگەی هاوبەشیانە و چەندین کاری هونەری وەک [مۆزیک و شانۆ و کۆڕی ڕۆشنبیریان گێڕاوە بۆ خزمەتی کەمئەندامان، ماوەتەوە بڵێین لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەی پێشانگەکەدا هۆڵی مۆزەخانەی سلێمانی جمەی دەهات لە بینەرو خەڵکی ڕۆشنبیر.

**کاروان مەحموود**
**(سلێمانی)**

## ڕەخنە وەک فێرکردنی ڕازە شاراوەکانی هونەر

لەو دیوی بەرگری لە زەروورەتی شیعرو ئەدەب، هەندێ کات ڕەخنەی شاعیران و ئەدیبان ئاراستە بووە بۆ فێرکردن و ڕێنمایی خاوەن زەوقان، یان تەنانەت تەواوی خوێنەرانی بەرهەمە ئەدەبییەکانیش دەگرێتەوە. لە ڕاستیدا لە کۆندا هەندێ لە ئەدیبان و شاعیران چەندین نامەو کتێبیان ڕێکخستووە تاوەکو بەکردەوە ڕێنمایی نووسەری و شاعیری بن بۆ تازەکارەکان. هەڵبەتە ڕەنگە لە ئەمڕۆدا هیچ ڕەخنەگرێکی جددی کاتی خۆی بەم لایەنەی کاری ڕەخنەوە سەرف نەکا، چونکە سەردەمی ئێمە لەو ڕووەوەی کە پەیوەستە بە ئەدەبەوە، هێندەگرنگی بە داهێنان دەدا کە چیدی ناتوانێ کێشەکانی دیکەی پەیوەست بە بنەڕەتی هونەری و یەکێتییەکان وەکو مەرز و سنووری شێواز دەربڕینی شاعیر و نووسەر قەبووڵ بکا. لە ڕاستیدا ئەگەر وتەکەی

سامۆئیل جانسۆن دروست بێ کە لە ڕووی واقیع-بینییەوە دەڵێ «زۆرتر شێوازی کاری نووسەرانە کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی ڕێساکان نەک ئەوەی کە ڕێساکان ڕێنمایی کار و شێوازی کاری ئەوان بن» ئەوا چۆن دەتوانرێ ئەوە قەبووڵ بکرێ کە تازە پێگەیشتووەکان تەنیا لەبەر ئەوەی کە لە ڕووی کاتەوە درەنگتر لە پێشینان هاتوون مافی ئەوەیان نییە بەکردارو شێوازی کاری خۆیان ڕێسای نوێ دروست بکەن و وەک بلێی ئەم کارە تەنیا تایبەت بێ بە ئەوانی پێشوو؟ لەم کاتەدا هەر کەسێ کە شێوازێکی کاری شیاوی هەبێ، دەتوانێ شێوازی کارێک کە بە ڕێسا ناوبراوە بیگۆڕێ بۆ «بێ ڕێسا» و ڕێسایەکی دی لەبری دابنێ. لەم حاڵەتەدا ڕەخنەی هونەری تا ئەو جێیەی کە بریتی بێ لە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەوەی کە بەڕێسای هونەری ناو دەبرێ، چیدی بەڕەخنەیەکی جددی لە قەڵەم نادرێ. لەگەڵ ئەمانەدا ڕەخنەی وێنەیی کە کەسانێکی وەکو تی. ئێس. ئیلیەت و عەزرا پاوەند لە سەردەمی ئێمەدا کاریان پێ کردووە تا ڕادەیەک دەڕوانێتە ئەم فێرکردن و دیاریکردنەی ڕەمزو بنەرەتەکان. ئیلیەت باس لەوە دەکا کە لە ڕەخنە سەرەتاییەکانی عەزراپاوەندا بە زۆری کەسی بەرامبەر بریتی بوو لە «شاعیرێکی لاو کە هێشتا شێوازەکەی فۆرمی خۆی وەرنەگرتبوو» و لە بارەی کارەکەی خۆیەوە بەڕاشکاوی دەڵێ «باشترین بەشی ڕەخنەی ئەدەبی کە من نووسیومە بریتییە لەوەی کە بە شێوەیەکی خودی لە شێوازی کاری منەوە بەرهەم هاتووە» بیری ئەوەی کە شاعیرانی مامۆستا وەزیفەی خۆیان دەزانن لەوەی کە ڕێنمایی تازەکاران بکەن لە نەریتێکی کۆنی کەسانێکەوە سەرچاوە دەگرێ کە لە کۆندا بەردەوام شیعریان وەکو پیشەیەک تەماشا دەکرد یان بە کۆمەڵێک ڕەمز و هونەرێکیان دەزانی ئەوەی مەنوچەهری شەست کەللە بە پێی گێڕانەوەی خاوەنی (راحة الصدور) دەیگێڕێتەوە لەبارەی سەید ئەشرەفی غەزنەوییەوە کە لە قوتابخانەکاندا دەگەڕاو منداڵانی هان دەدا بۆ خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیران لە ڕیزی ئەو کارانەیە کە هۆراس لە ڕێکخستن و پۆلێنکردنی کتێبی هونەری شیعریی خۆیدا مەبەستی بووەو بە سەرنجدانی ئەم مەبەستەش بوو کە ئیسکالیجرۆ، ڕەخنەگرێکی سەردەمی ڕێنیسانسیش لە شیکردنەوەی هونەری شیعردا باسی دەکا کە مەبەستی ئەو دروست کردنی شاعیرە. لە ڕاستیدا بڕوا بوون بەوەی کە ڕەخنەی ئەدەبی وەزیفەی ڕێنمایی و فێرکردنی هونەری لە سەر شانە لە لای زۆربەی ڕەخنەگران بە کارێکی شیاو تەماشا دەکرێ و بەڵام کەسانێک کە ڕەخنە بە دەربڕینی کاریگەرییە کەسییەکان دەزانن لە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمی ئەدەبیدا لە بەر ئەوەی بەزۆری بڕوایان بە بنەما ڕەهاو یەکلاییەکان نییە،، نکوڵی لەوەها وەزیفەیەک دەکەن هەرچەندە ڕەنگە شاعیران و ئەفرێنەرانی بەرهەمی ئەدەبی چەندین خاڵ فێربن لە ڕەخنەکانی ئەم کۆمەڵەش سەبارەت بە ڕەمز و هونەرەکانی خۆیان. بەزۆری ڕەخنەگرەکانی دی لە ڕەخنەگرەکانی ڕێبازی کلاسیکی ئەورووپاوە بگرە تا کەسانێکی رووسیای ئەمڕۆ واقیع خوازی سۆسیالیستی بە تاکە پێوەری هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی دادەنێن لەواقیعی کەمو زۆری ڕەخنەدا (بێجگە لەو سوودە زۆرەی لێی چاوەڕوان دەکەن) هەروەک هۆکارێک بۆ فێرکردنی هونەرو بنەماکانیشی سەیر دەکەن. تەنانەت پەیڤەکەی سەنت بۆڤ-یش کە لەو بڕوایەدا بوو هەڵسەنگاندنی گشتی نووسەر هاوکاری دەکا لە ناسینی کارەکەیدا و وتەکەی ماتیۆ ئارنۆڵد کە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێ بەردەوام کۆششێکی ڕەخنەیی لە پێشتر بێ لە کۆششێکی داهێنەرانەو ڕێنمایی بکا، هەردوو لەسەر هەمان بنەمای تێڕوانین بوو بۆ وەزیفەی ڕەخنە.

**نا/ ئارەزوو جەبار ئەمین**

سەرچاوە: ڕەخنەی ئەدەبی - عبدالحسین زرین کوب

## میتافیزیکی نیچە

یەکێکی تر لە ڕابەرانی فەلسەفەی بوون، فریدریک نیچەیە کە بە ڕەخنەو هەڵسەنگاندنی توندو نەترسانەی فەلسەفە و میتافیزیک و ئەخلاقی نەریتی (تەقلیدی) فەلسەفەی لەچوارچێوەی لێکۆڵینەوە وشکە قوتابخانەیی و زانکۆییەکان وەدەرهێناو خستیە سەر ڕێچکەیەکی نوێ.

یاسپرس، نیچەو کێرکیجارد بەدوو شازو ڕیزپەڕ ناو دەبا و دەڵێ: ناتوانرێ ئەمانە لەژێر هیچ یەک لەناوە دروستکراوەکانی وەکو فەیلەسووف و شاعیرو پێغەمبەرو.. جێ بکرێنەوە. ئەم وتەیە زیاتر لەبارەی نیچەوە گونجاوترە تا کێرکیجارد، چونکە دەتوانرێ هاوشێوە گەلێکی وەکو پاسکال و هامون بۆ کێرکیجارد

بدۆزێتەوە، بەڵام هاوشێوەیەکی دیکە بۆ نیچە پەیدانابێ.

کاریگەری و گرنگی نیچە بەرلەوەی لەدروستکردنی بیرو هزرە تایبەتەکاندا بێ، لە پاڵنان و هاندانیدایە بۆ بیرکردنەوەو زیاتر لەوەی لە دروستکردنی فەلسەفەیەکدا بێ لەڕۆیشتندایە بەرەو ڕێگەیەکی نوێی مومارەسەکردنی فەلسەفی. زمانی ئەو زیاتر زمانی شیعرە تا فەلسەفەو ئاخاوتنی بەپێچەوانەی ئەو نەریتە فەلسەفیەی کە بەسوقرات دەستی پێکرد، زۆر لە ڕێڕەوی بیرکردنەوەی لۆژیکی بەدەرە، لەم ڕوانگەیەوە ئەو دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووفانی پێش سوقرات و تاڕادەیەکی زۆر وەکو کەسانێکی هاوشێوەی هێراکلیت دەدوێ. وەکو ئەو کەسانەی کە تێڕوانینێکی قووڵ لەپەیڤێکی کورتدا دەخەنە ڕوو.

ئەوەی نیچە بەم شێوەیە دەیخاتە ڕوو، بیرگەلێکە کە لەتێڕوانینی قووڵی فەلسەفی و دەروونناسانەوە هەڵقوڵاوە. دەبێت لەنێوان بیرەکانیدا بەتایبەتی جەخت لەسەر ئەم خاڵە بکرێتەوە: بەڵێ وتن بۆ ژیان، گەڕاندنەوەی بەهاکان و ویست بۆ تواناو مرۆڤی باڵا و گەڕانەوەی نەمری.

نیچەش وەکو کیریجارد بەهەڵسەنگاندنی باری مرۆڤی سەردەمی نوێ و داڕووخانە کولتووری و ئەخلاقییەکانی دەست پێ دەکاو بەم شێوەیە دەگاتە دۆزینەوەو دیاریکردنی نەخۆشییەک کە هێشتا لە چاوی هاوسەردەمیەکانی نادیارە. ئەمەش هەمان بێ بەها بوونی بەرزترین بەهاکانە واتە نیهیلیزم، نیچە ئەم بیرۆکەیە لەکتێبی (زانستی شاد) لە چیرۆکی پیاوێکی شێتدا دەخاتە ڕوو کە لەڕۆژی ڕووناکدا فانۆسێکی بە دەستەوەیەو بەرەو بازاڕ هەڵدێ و لەناو سەرسوڕمانی خەڵکانێکی بێ بڕوادا کە بۆ تەماشاکردنی ئەو ڕاوەستابوون و پێدەکەنین هاواری کرد: «من بەدوای خودا دا دەگەڕێم» و لەپاش بیستنی وتە پێکەنیناویەکانی ئەوان کە «ئایا خوداون بووە؟ ئایا بۆ شوێنێکی تر کۆچی کردووە؟ یان ئایا لەترسدا خۆی حەشارداوە؟» پێی وتن: «ئێمە بووین کە ئەومان کوشت. ئێمەی بەدکارترین بەدکار. ئێمە بووین کە ئەو زنجیرەی زەوی بەخۆرەوە دەبەست، پچڕاندمان و ئێستا بەرەو نادیاری دەڕوا. ئایا ئێستا هەست بەسەرما و تاریکی و نەبوون ناکەن؟» ئەوکات پیاوە شێتەکە لەنێوان واق وڕمانی خەڵکەکە کە لەویان دەڕوانی فانۆسەکەی بەزەویدا کێشاو وتی: «من زوو هاتووم و سەردەمی من هێشتا نەهاتووە و ئەم هەواڵە ترسێنەرە هێشتا نەگەیشتووەتە گوێی خەڵکی.»

بەم شێوەیە نیچە زۆر بەر لەکەسانی تر دەرک بەبێ بەهابوونی بەهاکان دەکا، بەڵام ئەویش وەکو کیرکیجارد بانگەشە بەرەو بڕوای لەدەستچوون ناکاو وانەی گەڕانەوە بۆ ڕابردوو ناڵێتەوە و بینینی ئەو ڕووەو ئایندەیە. نیهیلیزم لای ئەو ئەگەر وەکو قۆناغێکی کاتی تەماشا بکرێ نەک تەنیا نەخۆشی نییە، بەڵکو هەر خۆی زەمینەیەکە بۆ کامڵ بوون.

نیچە ئەم خاڵە لەکتێبی «وەهای وت زەردەشت» بەنموونە هێنانەوە دەخاتە ڕوو. لەم نموونەیەدا: گیانی مرۆڤ لەسەرەتادا هاوشێوەی وشترە. وشتریش هێمای بار بردن و گوێڕایەڵی و ڕێزگرتنە لەهێماکۆنەکان. شانازیەکەیشی لەهەڵگرتن و بردنی گرانترین بارەکاندایە واتە باری گرانی بەها هەزار ساڵەکان، بەڵام لەکاتی گۆڕاندا وشتر دەبێتە شێر و بارەگرانەکەیش دەخاتە خوار. باری گران دەچێتە شێوەی ئەژدیهایەک و لەسەر هەریەک لەپولەکەکانی «تۆ دەبێت»ێکی زێڕین دەدرەوشێتەوە و ڕێگە لەشێرەکە دەگرێ. شێرەکە لەگەڵ ئەژدیهاکەدا دەکەوێتە شەڕو دەیبەزێنێ و ئەوکات لەشوێنی هەر «تۆ دەبێت» ێک، «من دەمەوێت»ێک دادەنێ. کاری شێرەکە بریتییە لە «نا وتن» بەرامبەر بە بەها کۆنەکان، بەڵام ئەفراندنی بەهای نوێ لە توانای ئەو دانییە. کەواتە گۆڕانێکی تر پێویستە، گۆڕانێکی تر تاوەکو شێرەکە منداڵ بێتەوە. منداڵ سەرەتایەکی نوێ و بزووتنەوەیەکی نوێیە. منداڵ بێ تاوانی و یاری فەرامۆشییە و ڕەوڕەوەیەکی خود کارە. ئەو «بەڵێی پیرۆز»ە.

منداڵ لەوتەکانی نیچەدا هێمای فەیلەسووفە، فەیلەسووف بەواتایەی کە ئەو پێی دەبەخشێ، واتە ئەفرێنەری بەها نوێیەکان. لێرەوەیە کە ئەو باس لە (گەڕاندنەوەی بەهاکان) دەکاو بە بچووک زانینی هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤی مۆدێرن بەگەورەی دەزانێ و وانەی سەرەوژێری بەهاکان دەڵێتەوە. هەڵبژاردنی ناوی هێمایی زەردەشتیش لێرەوەیە، چونکە لەلایەکەوە زەردەشت یەکەمین کەسە کە نەک تەنیا باسی لە ئەخلاق و چاک و خراپ کردووە، بەڵکو تا بەرزترین شوێنگەی میتافیزیک بەرزی کردووەتەوە و لەم ڕووەشەوەکە دەبێ سەرەوژێر بکرێ. لەلایەکی ترەوە جەختکردنی زەردشت لەسەر بەهایەک کە بەڕاستی بەهایە، واتە (ڕاستی) و هەر ئەم ڕاستیەشە کە هانی دەدا تا ئەو بەهایانەی کە لەڕاستیدا بەهانین و هەر لە بنەڕەتدا دوو ڕوون سەرەو ژێر بکا. بەم شێوەیە وەها دێتە پێش چاو کە نیچە هەمان زەردەشتە. زەردەشتێک کە پاش هەزاران ساڵ گەیشتووەتە بێ بەهابوونی بەهاکان (واتە نیهیلیزم) و ئێستا دەڕوانێتە «لای چاک و خراپ».

نیچە بەهەڵسەنگاندنی سیستەمە ئەخلاقیە جۆراوجۆرەکان لە کتێبی (پەیدابوونی ئەخلاق) و بەتێڕوانینێکی دەروونناسانە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە بەزۆری بنەڕەتی زۆربەی بەهاکان لەڕق و کینەو کەمی و بێ توانایییدایە و بەم چۆنییەتییەش لەچەند ڕوویەکی جیاوازدا دەبینێ: لەبەها زوهدیەکان، واتە ڕوو وەرگێڕان لەدنیاو ناوتن بەژیان، لە بەها مەسیحییەکاندا وەکو «خۆشویستنی دراوسێ»، لە «هاو دەرذی» کە بناغەی ئەخلاقی شۆپنهاوەری مامۆستای پێشوویەتی هەروەها لەبەها کۆمەڵایەتییەکانی ئەمڕۆ، واتە بەهاکانی «شۆڕشی

فـەرەنسـا» و دیموکـراسی و سۆسـیـالیـزم واتە چەمک گـەلێکی وەکـو «یەکـسـانی» و «برایی» و «خـەڵکی بوون»، بەڵام ئەو خاڵەی کە لەپێش چاو ون بووە بریتییە لەبەدگومانی نیچە لەبارەی چاکە درۆیین و دوو ڕووەکان. لە هەمـان کـاتدا هەڵناسێ بەنکۆڵیکردن لە (چاک)ـە ڕاستـەقینەکـان، واتە ئەو چاکـەیەی کـە لە بەتوانایی و لێهاتوویی سەرچاوە دەگرێ. لەم ڕووەوەیە کە لە کتێبی (وەهای وت زەردەشت)دا باس لە چاکەی بەخشندە (خۆ بەخشانە) دەکا. هەروەها هەر لەم ڕووەوەیە کە زەردەشت لەسەرەتای کتێبەکەی خۆیدا، خۆی بە جامێک دەچوێنێ کە لەکاتێدا ئەگەر پڕبێ، پێویستە لێی برژێ. لێرەوەیە کـە لە خـەڵوەتی خـۆی وەدەردێ و بەرەو خـەڵکی دەڕوا تاوەکو لەوەی هەیەتی پێیان ببەخشێ. ئەم بەخشندەییە لە پڕبوونەوەیە. لەڕاستـیـدا ئەم بەخـشـینە بۆ بەخـشین نیـیـە، بەڵکو بۆ بەدەست هێنانە. ئەو بەخشـینەی کـە وەڵامی ویستنی سواڵکەرانەیە، بۆ خۆی لە سواڵکەری و هەژاریە. لێرەوەیە کە زەردەشت لەوەڵامی ئەو قـدیسـەی کە پێی وتبوو: شتێک مەدەرە خەڵکی مەگەر ئەوەی کە بەسواڵکەری لێتیان بووێ و ئەوکاتیش جگە لەوەی وەکو خێردەدرێ بەهەژاران مەیاندەرێ، دەڵێ: نەخێر واناکەم، چونکە هێندە نەدارنیم.

لەم لایەنەشـەوەیە کـە باس «لە خـەڵکی بچـووک» و «چاکە بچووکەکان» دەکا. پەیڤەکـانیشی سـەبارەت بە «مرۆڤی باڵا» هەر لەم واتایەوەتە، مرۆڤ بوون شتێکە کـە دەبێ بەسـەر خـۆیدا زاڵ بێ و زیاتر لەخـۆی بەرەو پێشـەوە هەنگاوبنێ، چونکە بۆ خـۆی مـەبەست نیـیـە، بەڵکو پردێکە لەنێوان گیاندارو مرۆڤی باڵادا، بەڵام ئەم زیادە ڕەویە لە بێ بەها کـردنی جەستـەو خۆ ئازاردان و ناوتن بەژیان نیـیـە، بەڵکو لە بەڵێ وتن دایە بەرامـبـەر ژیان. لێرەوەیە کە نیچە حافزی شیرازی و گۆتە بەمەزن دادەنێ، چونکە لەو بڕوایـەدایە لەگـــەڵ ئەوەی ئەوان مرۆڤـیان لەنێـوان گیـاندارو فـریشـتـەدا داناوە، بەڵام لەم دژیەکەدا پووچبوونی ژیانیـان وەکو ئەنجـام و ئاکـامێک وەدەست نەهێناوە.

نیـچـە بەڵێ وتن بەژیان و تیـۆرێکی دیکەی خـۆی (گـەڕانەوە بۆ نەمـری) دەخـاتە شـێـوەی بەڵێ وتن بەچارەنووس و تەنانەت باس لە (خـۆشـەویسـتی چارەنووس)یش دەکـا. ئەوەی هەیە و ڕوودەدا، چەندین جار بووە و چەندین جاری تریش دەبێ. لەو جێیەوەی کە کات بێ کۆتاییە، بوون (دروستبوون)یش کۆتایی نایە، بەڵام «نوێ بوونەوەی بەردەوام» خـاڵێکی ناکـۆک و دژیەکـە (چونکە تواناکـان بێ سنوورنین) کـەواتە دەبێ باس لە (دووبارە بوونـەوە) و (دووبارە بوونەوەکـــان) بکرێ. لەم ڕوانگەیەوە هیچ شتێک گوزەرا، واتە تەنیا بۆیەک جار نییە. گەردوون ڕەوڕەوەیەکە خاوەن گەڕانێکی نەمرانە.

نیچە نەک تەنیا قەبووڵ کردنی چارەنووس، بەڵکو بە هەرشـێوەیەک بێ وانەی (خـۆشـەویسـتی چارەنووس) دەڵێتەوە. خۆشەویستی چارەنووس هەمان خۆشەویستی نەمریە و هەروەکو لە یەکێک لەشیعـرەکانیدا دەڵێ: ئەوینداری نەمریە.

**و/ لە فارسییەوە: جەباری زەندی**

سەرچاوە: در آمدی به فلسفه، دکتر میر عبدالحسین نقیب زاده.

## مامۆستای مۆسیقای ئایینی

زانای گەورەی مۆسیقا (یۆهان سباستیان باخ)ی ئەڵمانی (١٦٨٥-١٧٥٠) بێشک یەکێکە لە مۆسیقارە بەتواناکانی جیهان و تەنانەت هێندێک لەخاوەن ڕایان لە بتهۆڤن-یشی بەرزتر دەزانن. کاتێک کە باخ لەدنیا دەرچوو، چونکە بەر لە مردنی ئامێری ئۆرگی دەژەنی، لە وڵاتی ئەڵمانیا ناوبانگێکی زۆری هەبوو، بەڵام دوای ئەوەی کە بەرە بەرە لەبایەخی ئامێری ئۆرگ کەم بۆوە، لە ساڵانی دواتردا ناوبانگی سباستیان باخ بەردەوامی نەبوو و زۆر بە زوویی فەرامۆش کراو تا نزیکەی سەد ساڵ لەپاش مردنی ناوی لەنێو ناواندا نەمابوو، تا ئەو وەختەی کە لەسەدەی نۆزدەیەمدا دووکەس لەزانایانی ئەڵمانی بواری مۆسیقا بەناوەکانی (شومن و میندلسۆن) پەیان برد بە بایەخی سباستیان باخ و بەرهەمەکانی ئەویان نەک هەر بە بەرزترین سەرمەشق، بەڵکو بە جوانترین نموونەی مۆسیقایان زانی. هەواڵی ئەم ئاشکرا کردنە بەخێرایی گەیشتە بەریتانیا و لەوێشەوە بۆ سەرانسەری دنیا دەنگی دایەوە.

لەساڵی (١٨٥٠)ی زایینیدا ئەنجوومەنێکی بەنێو بانگ بەناوی (باخ گزل شافت) بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی خولی تەواوی ئەو بەرهەمانەی وی کە لەبەردەستدا بوون، دامەزرا.

دەست بەکاربوونی کارێکی ئاوا مەزنیش پێویستی بەزەمەنێکی چل و نۆ ساڵی هەبوو، لەو کارە گرنگ و بایەخدارەشدا چەندین دەزگای بڵاوکەرەوە وەک چاودێر بەشداربوون.

ئەو دەست بەکاربوونە تێروتەسەل و شکۆدارە کە بۆ ناساندنی ئەو زانایە بلیمەتەی بواری مۆسیقا بەخەڵکی دنیا ئەنجام درا، بەڕادەیەک بوو کە ئەگەرهاتباو یوهان سباستیان باخ بۆ خۆی زیندوو ببوایەوە، لەو کارە سەرسام دەبوو.

**لە فارسییەوە: ئەسکەندەر مەحموود ڕەسووڵ**

سەرچاوە: مجله اطلاعات هفتگی، شماره ٢٤٩٢، ١٤ شهریور ١٣٦٩.

# پێوەندیی نێوان ئەدەب و فەلسەفە

بەردەوام لە ڕێڕەوی هزرو فەلسەفەدا ئەدەب لەنێوان پەیمانداری و بێ پەیمانیدا لە بزاوتندا بووە، بەڵام بەزۆری گومان لەوەدا نییە کە هەردەم پێوەندیی خۆی پاراستووە لەگەڵ چەند درەوشانەوەیەک لە هزرو فەلسەفە، ڕاستە کە هەندێک لە ڕەخنەگران هێشتا نکۆڵی لە پێوەندیی نێوان ئەدەب و هزرو فەلسەفەدا دەکەن.

بۆ نموونە تی. ئێس. ئیلیەت بەشێوەیەکی پەتی بانگەشەی ئەوە دەکا کە شەکسپیرو دانتی هیچ یەکیان بیرکردنەوەی واقیعییان نەخستووەتە ڕوو لە بەرهەمەکانیاندا، ڕەخنەگرێکی تر دەڵێ کە بەشێوەیەکی ئاسایی بیرکردنەوەو بڕواکان لە شیعردا نادروستەو شتێکی کۆنەو هیچ مرۆڤێکی تێگەیشتوو چیدی بۆ ئەوە شیعر ناخوێنێتەوە کە شتێکی لێوە فێربێ واتە شتێک لەو پەیڤانە فێربێ کە شاعیر دەیانڵێ و دەیاندرکێنێ. لەگەڵ ئەمەشدا لە هەموو سەدەکاندا بیری فەلسەفی بەشێکە لە چوارچێوەی هزری و تیشکێکە لە کولتووری سەدەو هەڵبەتە ناتوانرێ وای دابنێین کە نووسەر (شاعیر) دەتوانێ بەشێوەیەکی گشتی بێگانەبێ لەگەڵ کولتوورو فەرهەنگی سەدە یان لەگەڵ سنووری سەردەمی خۆی و بەشێوەیەکی سلبی یان ئیجابی لەژێرکاریگەری ئەم خاڵەدا نەبێ.

بەزۆری بەدوای یەکدا هاتنی قۆناغەکانی مێژووی ئەدەب جۆرێک هەماهەنگی پیشان دەدا لەگەڵ بەدوای یەکداهاتنی بیرە فەلسەفییەکان و ڕەنگە تەنیا لەلای هەندێ کۆمەڵدا ئەم هەماهەنگییە هەست پێ نەکرێ کە بیرە فەلسەفییەکان بەهەندێ هۆی جیاواز لە پەرەسەندن و گەشەکردن وەستاوە. نەک هەر ئەوەی کە تا ئێستا باس کرا لەبارەی پێوەندیی هەندێ فێرکردنی فەلسەفی لەگەڵ بەشێک لە ڕێبازە ئەدەبییەکان جەخت لەسەر ئەم بانگەشەیە دەکەنەوە، بەڵکو ئەو کارانەی دیکەش کە لە بارەی پێوەندی نێوان بەرهەمی نووسەران و بڕواو بیرە فەلسەفییەکان ئەنجام دراوە کەم تا زۆر ئەم ڕاستییە دەسەلمێنن. لەوانە لێکۆڵینەوەکانی ویلهەڵم دیلتای (١٨٣٣- ١٩١١) مێژوونووسی ئەدەب و فەیلەسووفی ئەڵمانی پیشانی دەدەن کە دەتوانرێ سێ جۆر تێڕوانین لە مێژووی هزرو بڕواکان لێک جیا بکرێتەوە: یەکەم- تێڕوانینی هاوەڵانی فەلسەفەی ڕەسەنی بەدی هاتن کە لە دیمقراتییەوە دەست پێ دەکاو تالۆکرسیۆس و لە تۆماس هۆبزەوە تا لایەنگرانی ئنسکلۆپیدیای فەرەنسی دەگرێتەوەو لەنێوان شوێنگەو توانی بڕوای هەستی و مادییش تەشەنەی کردووە. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە تێڕوانینە بەهۆی بارە جەستەیی و مادییەکەی لایەنە ڕوحانییەکان شیکار دەکا. دووەم- تێڕوانینی هاوەڵانی ئایدیالیستی عەینییە کە لە هراکلیتۆسەوە دەست پێ دەکاو هەتا هیگڵ درێژەی هەیەو کەسانێکی وەکو سپینۆزاو لایب نیتس و تەنانەت خودی هیگڵیش پەیوەستن بەم ڕێبازەو ئەم جۆرە تێڕوانینە ڕاستی دەرەکی بە گوزارشتێکی ڕاستی ناوەکی لە قەڵەم دەدا. سێیەم- بریتییە لە تێڕوانینی فەلسەفەی ئایدیالیستی «مەسنەوی» کە لە ئەفلاتوونەوە تا فیختە درێژەی هەیەو بە بڕوای دیلتای فەرمانڕەوایانی سەدەکانی ناوەڕاست و کانت-یش لەم زنجیرەیەن و ئەمانە ڕازین بەجیایی نێوان ڕوح و سروشت. بە بڕوای ویلهەڵم دیلتای لەنێوان نووسەرانی ناودار بەلزاک و ستاندال پەیوەستن بە دەستەی یەکەم و گۆتە پەیوەستە بە دەستەی دووەم و شیلەر بە دەستەی سێیەم.

بێجگە لەمە لەڕووی دۆخە دەروونییەکانەوە ئەوەی لەلای نووسەرانی دەستەی یەکەم زاڵە بریتییە لە زەوقی بورهان و ئیستیدلال و ئەوەی لەلای نووسەرانی دەستەی دووەم زیاتر دیارە ڕووکردنە هەست و شعوورەو ئەوەی لەلای نووسەرانی دەستەی سێیەم زیاتر زاڵەو هەستی پێ دەکرێ بریتییە لە خواست و ئیرادە.

بەم کارە دیلتای توانی ئەم پۆلێنکردنە بەناوی خۆیەوە تۆمار بکاو لەوەو پاش بەپۆلێنی دیلتای ناوی دەرکرد.

**ئا: مەحبووبە محەممەد**

# میر پەنجۆ

## گوتنی: کاوێس ئاغا

دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ،
دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، دەلێ لێ،
دەلێ لێ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، میر پەنجۆ براوۆ.

دەلێ لێ، میر پەنجۆ، ب ڤیلانا (قەلەنی)یێ داکەنم وا ب دارە، دار جگارێ دەستێ (تاورخانێ) منی برا کە کێ (شەمسێ) بابێ (جەمیل)ی، ب شیلازە مۆدیناوی ب کارەبانە دکەونە سەر سمبێلێ تاورخانێ برا مۆدینەکە چەندە ب کاروبارا، لێ، لێ، لێ. بەلێ شەمسێ دێتە (بوورجا بەلەک) د سەکنێ ب سێ دەنگا گاز دکا تاورخانۆ برا ل خەوێ شیرین ڕابە ناف ل عیلو عەشیرەتێ خۆ بدە، عەسکەرێ (تەمبور خانێ ماکۆیێ) عەجەم چار هەزارە، عەسکەرێ برا کێ تە چەند کمکە و بێ نکارە، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، دەلێ، سەرتیب و براوۆ، دەلێ لێ، دەلێ لێ، میر پەنجۆ ب ڤیلانێ قەلەنیێ داکەتم ب هێل و مێلە، سمبێلێ تاورخانێ منی برا نەبوون ئارمووشی بەر دەستێ وان قەزازان، ب علبکێ د فرۆشن تیل ب تێلە، دیرانێ، لێ، لێ.

بەلێ شەمسێ دێتە (بوورجا بەلەک) د سەکنێ ب سێ دەنگا گاز دکا تاورخانۆ برا ل خەوێ شیرین ڕابە، عەسکەرێ (تەمبور خانێ ماکۆ)یێ عەجەم پێنج هەزارە، عەسکەرێ براکێتە چەند کمکە و بێ نکارە، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، دەلۆلۆ، میر پەنجۆ براوۆ.

**فەرهەنگۆک:**

١- میر پەنجۆ: نازناوی (تاهیرخان)ە، سەرۆکی هۆزی حەیدەران بوو.

٢- ڤیلانا قەلەنی یێ: دەشتی قەلەنی یێ، قەلەنی گوندی تاهیرخان بوو، نزیکی شاری ماکۆیە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەزارو پێنج سەد ماڵ بووە.

٣- شەمسێ: خوشکی تاهیر خانە کە لاوکەکەی گوتووە.

٤- تەمبوورخانی ماکۆیێ: سەرۆکی شاری ماکۆیێ عەجەم بووە.

٥- هیل و مێلە: بەشەڕو شۆڕە.

٦- شیلاز: جۆرە دارێکی خەت خەتە، دار جگارەی لێ دروست دەکەن.

- ئەو شەڕە لە (١٣)ی حوزەیرانی ساڵی (١٩٠٠) ڕووی داوە بەهاندانی قائمقامی ڕۆمێ (ساڵح ئەفەندی) دژی میرپەنجۆی ئەویش بە یارمەتی (تەمبوورخانی ماکۆیێ عەجەم) لەژێر سەرکردایەتی (حوسێن بەگی تاگۆری) کە خەڵکی (مووساکەندی) بووە، بەهێزێکی زۆر کە ژمارەیان نزیکی (٥٠٠٠) هەزار سوار بووە و دەورەی گوندیان گرتووە، ئەوکاتە لەشکری میرپەنجۆی بۆ کاری تایبەت دەرچووبوون، میر پەنجۆ بەخۆی و براکەی سەرتیپ و پێنج خولامی کە ژمارەیان حەفت کەس بوو ڕووبەڕووی لەشکری حوسێن بەگی تاگۆری بوونەوە تاکو کوژراون.

ئەوەی دەربارەی میر پەنجۆ باس دەکەن. زۆرجار شان بەشانی ئەرمەنییەکان شەڕی ڕۆم و عەجەمەکانی دەکرد هەروا گوندی ناوبراو جێگەی لێقەوماوان بووە بەتایبەتی ئەرمەنییەکان، هەروا یەکێک لەنەوەکانی بەدرخانییەکان ماوەیەک لای خۆی شاردووەتەوە تا دەرباز بووە، پێش شەهیدبوونی ناواتی فێربوونی زبانی (فەرەنسی) بووە.

- کاوێس ئاغا: هونەرمەندی بەناوبانگی کورد ناوی (کاک وەیس)ە. کوڕی ئەحمەدی کوڕی جەمیلی کوڕی کانەبی (کانۆیە) لە خێڵی هەرکییە و لەتیرەی (مالەبی)یە.

لەکۆمپانیاکان پەنجا لاوک و بەستەو حەیرانی تۆمار کردووە. لەساڵی (١٨٨٩)دا لە (چارچەلی) هەرکیاندا لەدایک بووە. لەساڵی (١٩٣٦) لەگوندی هەرشەم مردووە و گۆڕەکەی لەگۆڕستانی هەرشەمە.

**ئا: جەلال مەلا حەسەن خۆشناو**

**سەرچاوەکان:**


١- سترانی زار گوتنا کوردایە تاریقیێ، لاپەڕە (٣٨، ٣٤١، ٤٨٦)، ئۆردیخانی جەلیلی.

٢- کاسێتی تۆمارکراوی کاوێس ئاغا.

